





# ڕەهەندی تەندروستی
# لە شۆڕشی نوێدا ١٩٧٦ - ١٩٩١

نووسین و ئامادەکردن: گۆران سەلام محەمەد

بیرۆکە و سەرپەرشتیار: خەمینە ساڵح ئەحمەد

بەرگی یەکەم
2022

1

# ڕەهەندی تەندروستی لە شۆڕشی نوێدا

# ١٩٧٦ - ١٩٩١

## بەرگی یەکەم


نووسین و ئامادەکردنی

گۆران سەلام محەمەد

بیرۆکە و سەرپەرشتیار

خەمینە ساڵح ئەحمەد




## مەکتەبی گەشەپێدانی بیر و هۆشیاری

ئۆرگانێکی کەلتوری و پەروەردەییە، بەپێی پەیڕەوی ناوخۆی (ی.ن.ک) پەسەندکراو لە چوارەمین کۆنگرە لە ساڵی ٢٠٢٠ دامەزراوە، ئەرکەکەی بریتییە لەرەخساندنی زەمینەی هۆشیارکردنەوەی فیکری و سیاسی لەسەر بنەماکانی سۆشیالیست دیموکرات، تۆکمەکردنی بەهاکانی دیموکراسی، سیکۆلاریزم، مافی مرۆڤ و دادی کۆمەڵایەتی، تاوتوێکردنی بابەتەکانی بیری هاوچەرخ و دابینکردنی ئەدەبیاتی ڕێکخراوەیی، دەستەبەرکردنی ئامرازەکانی پەروەردەکردن و پێگەیاندنی کادیران لە بوارە جیاجیاکاندا، نووسینەوەی مێژووی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و شۆڕشی نوێ و ڕۆڵی لە بووژاندنەوەی گیانی بەرگری و ئەرشیفکردن و دووبارە چاپکردنەوەی بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.




## بۆردی ئەرشیف و مێژوو

ئۆرگانی مەکتەبی گەشەپێدانی بیروهۆشیارییە، بەپێی مادەی (٤٩) برگەی (ج) لە پەیڕەوی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان (ی.ن.ک) پەسەندکراوی چوارەمین کۆنگرە لە ساڵی ٢٠٢٠ دامەزراوە، ئاماژە بە ماددەی هەشتەم، هەردوو بڕگەی یەکەم و دووەم لە پەیڕەوی کاری مەکتەبی گەشەپێدانی بیروهۆشیاری، ئەرکەکەی ئەرشیفکردن و دۆکیۆمێنتکردنی مێژووی (ی.ن.ک) و شۆڕشی نوێی گەلی کوردستانە، لە ڕێگەی چاپکردنی پەرتووک و نامیلکە و بەرهەمهێنانی فیلمی دۆکیۆمێنتاری تایبەت بە ڕووداو و بەسەرهات و داستانەکانی ئەو قۆناغە و تۆمارکردنی ئەرشیفی زارەکی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان.

زنجیرەی پەرتووک: ٩

**ناسنامەی پەرتووك**

ناوی پەرتووك: ڕەهەندی تەندروستی لە شۆڕشی نوێدا ١٩٧٦ – ١٩٩١

بەرگی یەکەم

نووسین و ئامادەکردن: گۆران سەلام محەمەد

بابەت: مێژوویی ـ بەڵگەنامەیی

بیرۆکە و سەرپەرشتیار: خەمینە ساڵح ئەحمەد

تایپ و زمانەوانی: نووسەر

دیزاینی ناوەڕۆك: نووسەر

دیزاینی بەرگ: هەرێم عوسمان

چاپخانە: حەمدی

شوێنی چاپ: سلێمانی

نۆبەت و ساڵی چاپ: یەکەم، ٢٠٢٢

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (١٦٧٠)ی ساڵی (٢٠٢٢)ی پێ دراوە.

# پێڕست

"شۆڕش بەبێ هەندێک ناوەند و دەزگا ڕەنگە ئەنجام بدرێت، بەڵام
هەرگیز بەبێ ناوەندی تەندروستی و چارەسەرکردن ئەنجام نادرێت"

هەڤاڵ مام جەلال

**پێشکەشە بە:**

- گیانی شەهیدانی پزیشك و کارمەندانی تەندروستی شۆڕش
- گیانی پاکی تەواوی شەهیدانی نیشتیمان.
- پزیشکان و کارمەندانی تەندروستیی شۆڕش.
- کەسوکاری سەربەرزی شەهیدان.
- هەموو ئەو بەڕێزانەی کە لە ڕێگەی یادەوەرییانەوە کۆمەکی ئەم پڕۆژەیەیان کرد.
- بە هەموو ئەو دڵسۆزانەی کە بە هەر جۆرێك بێت لە نووسین و ئامادەکردنی ئەم پەرتووکەدا هاریکار بوون.

## لیستی کورتکراوەکان

| ژمارە | وشە | واتاکەی |
|---|---|---|
| ١ | د | دکتۆر |
| ٢ | ل | لاپەڕە |
| ٣ | چ | چاپ |
| ٤ | س.پ | سەرچاوەی پێشوو |
| ٥ | ب | بەرگ |
| ٦ | ژ | ژمارە |
| ٧ | ی.ن.ك | یەكێتیی نیشتیمانیی كوردستان |
| ٨ | ك.ڕ.ك | كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستان |
| ٩ | ح.د.ك | حیزبی دیموكراتی كوردستان |
| ١٠ | پ.د.ك | پارتی دیموكراتی كوردستان |
| ١١ | ح.ش | حیزبی شیوعی |
| ١٢ | حسك | حیزبی سۆسیالیستی كوردستان |
| ١٣ | سرك | سوپای ڕزگاری كوردستان |
| ١٤ | (KHF) | Kurdistan Health Foundation |
| ١٥ | (KRA) | Kurdistan Relief Association |

## تێبینییەكان

١. **چەمكەكان:** لێرەدا پرسێكی مێژوویی بەكراوەیی دەهێڵینـەوە، كـە بریتییـە لـەو چـەمك و دەســتەواژانەی بــۆ گوزارشــتكردن لــە خــەبات و قوربانیــدانی گــەلی كــورد لــە مێــژوودا بـەكاردەهێنـرێن، وەكـو: (شـۆڕش، جووڵانـەوە، ڕاپـەڕین، بـەرخۆدان، بـزاڤ و سـەرهەڵدان...)، كاری ئێمە لەم پەرتووكەدا ساغكردنەوەی ئەو دەستەواژانە نییـە، بۆیـە پێویسـتە لیژنەیـەك لـە پسـپۆڕانی بـوارە پەیوەندیـدارەكان ئـەو چەمكانە سـاغ بكەنـەوە و مـەرج و پێـوەری بـۆ دابڕێژن.

٢. دكتۆر: لە زۆر شوێندا لەبری وشەی: (پزیشك) بەكارهاتووە، چونكە بـە تـەواوی پزیشكان و كارمەندانی تەندروستی گوتراوە: (دكتـۆر)، ئێمـە نـەمان گۆڕیـوە، لەبەرئـەوەی ڕەنگـە ئـەو كەسە كارمەندێكی تەندروستی بە دكتۆر ناو هێنابێت، ئەگـەر ئێمـە بهاتبـاین بمانگۆڕیبـا بـە (پزیشك)، ئەوا جارێكی دیكە هەڵەیەكی دیكەمان دەكردەوە، هۆكاری ئـەوەش كـە بڕوانامـەی ئەوی دیكەمان لە ئەم نەپرسیوە، ئەوەیە كە مەرج نییە ئـەم زانیـاریی وردی لەسـەر بـەش و بڕوانامەی بەرامبەر هەبووبێت، بۆیە مەرج نییە پزیشكی فەرمی بووبن.

٣. هـەڤاڵ: جگـە لـە پزیشـك و كارمەنـدانی تەندروسـتی، لـە پـێش نـاوی هـەر كارەكتـەرێكی شۆڕشی نوێ، بێ جیاوازیی پلە و بەرپرسیارێتی نازناوی (هەڤاڵ) بەكارهێنراوە.

٤. تەواوی زانیارییەكانی ژیانی تەندروستكاران، وەكو خۆی دانراونەتەوە، بەجۆرێك ئەوانەی لە ژیاندا ماون لە زاری خۆیانەوە، ئەوانەشی شـەهید بـوون، یـان كۆچی دوایـیـان كـردووە لـە زاری هاوڕێ یان كەسی نزیكیانەوە وەرگیراوە، بۆیە جگە لە پرسیارەكان، نووسەر تەنیا كاری نووسینەوە، هەڵەبڕی، زمانەوانیی و خاڵبەندی بۆ چاوپێكەوتنەكان كردووە.

٥. بـێ جیـاوازی پەیوەنـدی بـە پزیشـكان و كارمەنـدانی تەندروسـتیی شـۆڕش و هـاوڕێ و كەسوكاریانەوە كـراوە، بـە دڵنیـایی پەیوەنـدی بـە تـەواوی ئەوانـەی دیكـەوە دەكرێـت و لـە بەرگەكانی دیكەی ئەم پەرتووكەدا بەشدار دەبن، داوا دەكەین خۆشیان پەیوەندی بكەن.

٦. نـاوی پزیشـكان و كارمەنـدانی تەندروسـتی بـێ جیـاوازی بـە ڕیزبەنـدی ئـەلفبای كـوردی دانراون.

## پێشەکی

**فەرید ئەسەسەرد**

ئەم پەرتووکە یەکێ لە پەرتووکە گرنگەکانە کە باسی بوارێکی دیاریکراوی شۆڕش دەکات لە ماوەی ساڵانی ١٩٧٦ – ١٩٩١ دا، کە بواری پزیشکییە. لە ڕاستیدا ئەم بابەتە، بەپێچەوانەی بابەتەکانی ترەوە، زۆر کەمی لەسەر نووسراوە. بۆیە، دەرچوونی پەرتووکێکی دیکۆمێنتار بەو زانیاری و فەبارمیە دەربارەی ئەم بابەتە، بایەخێکی تایبەتی هەیە.

ئاشکرایە کە شۆڕش لە ناوەڕۆکدا پرۆسەیەکی سیاسییە، بەڵام بەکردەوە لایەنی سەربازیی بەسەریدا زاڵە. ئەوەی کە تا ئێستا زۆری لەسەر نووسراوە، دوو بوارە سیاسی و سەربازییەکەی شۆڕشە. بۆیە، دەرچوونی ئەم پەرتووکە کە تایبەت کراوە بە باسکردنی بواری پزیشکەکانی شۆڕش و ڕۆڵیان لە جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەدا کەلێنێکی گەورە لەم بارەیەوە پڕ دەکاتەوە. وەك ئاماژەی پێ درا، بواری پزیشکی لە شۆڕشدا، بە بەراورد لەگەڵ بابەتەکانی تر، کەمتری لەسەر نووسراوە، بەڵام دەبێت ئەم لایەنەی بابەتەکەش لەبەرچاو بگیرێت، کە بەشێکی کەمتەرخەمییەکە بۆ خوودی پزیشکانی شۆڕش دەگەڕێتەوە، کە ئەزموونی خۆیان لە شۆڕشدا نەگێڕاوەتەوە، سەرەڕای گرنگیی بابەتەکە. ئەم پەرتووکە کە بوارێکی گرنگی پشتگوێخراوی سەردەمی شۆڕش دەخاتە بەرچاو، لە پۆلێنکردندا دەشێ بخرێتە ڕیزی ئەو بەرهەمانەی، دوور لە سیاسەت و ململانێ سیاسییەکان، باسی لایەنێکی ژیانی ڕۆژانەی ناو شۆڕش دەکات. ئەم ئەزموونە لە میدیای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا تازە نییە و زۆرتر بۆ (ڕۆژنامەی (ئیتیحاد) دەگەڕێتەوە لە سەرەتای دەرچوونیدا، کاتێك گۆشەیەکی تێدا کرایەوە بە ناوی (ژیانی ڕۆژانە لە شۆڕشی کورددا) کە بۆ گێڕانەوەی بابەتە ناسیاسییەکان لە سایەی شۆڕشدا تەرخان کرا بوو .

پەیوەند بەم پەرتووکە، کارکردن بۆ دابینکردنی کەرستەی پێویست بۆ ئامادەکردنی پەرتووکێکی تایبەت بە پزیشکانی شۆڕش کارێکی ئێجگار قورسە، چونکە زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوەکانی سەرزارەکین. هەموو ئەو پەرتووکانەی کە لە ناوەڕۆکدا پشت بە سەرچاوەی زارەکی دەبەستن، ماندووبوونێکی زۆریان دەوێ، چونکە پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاری پرۆسەیەکی ئاڵۆز و سەخت دەبێت. بەدڵنیاییەوە نەبوون یاخود کەمیی سەرچاوەی نووسراو لەسەر ئەم بابەتە، کارەکە دژوار دەکات و نووسەر ناچار دەکات هانا بەرێت تا زانیاری لە دەمی کارەکتەرەکانەوە وەربگرێت، کە ئەمانەش هەر یەکێکیان لە شوێنێکە و ڕەنگە هەندێکیشیان دەستیان پێ نەگات. سەرەڕای دژواری کارەکە، لانی کەم ئێستا دەتوانین لەوە دڵنیا بین کە بە دەرچوونی ئەم پەرتووکە، سەرچاوەیەکی پوخت و جێ متمانەمان سەبارەت بە توێژی پزیشکانی شۆڕش و بواری پزیشکیی لەبەر دەست دایە. ئەم پەرتووکە تاکە پەرتووکە کە لیستی ناوی تەواوی پزیشکانی شۆڕشی تێدایە و باسی هەموو ئەو نەخۆشخانانەی کردووە کە لەو سەردەمەدا هەبوون، چ نەخۆشخانە ناوەندییەکان و چ لاوەکییەکان.

لە پێشمەرگایەتیدا، بوونی پزیشک بایەخێکی تایبەتی هەیە. ئەو بایەخەش لەوەوە هاتووە کە لە کاتی جەنگدا پزیشکان ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕن. ئەوەی پەیوەندیی بە پزیشکانی شۆڕشی کوردەوە هەیە، پزیشکانی شۆڕشی کورد ڕۆڵێکی کارایان لە فریاکەوتنی بریندارانی هێزی پێشمەرگە هەبووە و بە هۆی ئەوانەوە سەدان پێشمەرگە لە مردن ڕزگار کراون. لە پاڵ خزمەتگوزارییەکانی کاتی شەڕدا، پێشمەرگە لە خزمەتگوزارییە ئاساییەکانی پزیشکان و نەخۆشخانەکانیش سوودمەند بوون لەوانە لە کاتی نەخۆشی ئاسایی، دان کێشان، پێوەدانی مار و دووپشك و هی تر.

لایـەنێکی دیکـەی گرنگـی بابەتەکە ئەوەیـە کـە پزیشکان و نەخۆشخانەکانی شـۆڕش تەنها لە خزمەتی پێشمەرگەدا نـەبوون، بـەڵکو لـە خزمـەتی خـەڵکی دێهاتەکانیشدا بـوون، بەتایبــەتی کــە خــەڵکی ناوچــەکانی ژێــر دەســەڵاتی هێــزی پێشــمەرگە بەتــەواوی لــە خزمەتگوزارییە تەندروستییەکانی دەوڵەت بێبەش بـوون. پشتگوێخستنی ئـەو ناوچانە لـە ڕووی تەندروستییەوە لەلایەن حکومەتـەوە پەیوەنـدیی بـە بـوونی پێشمەرگە و شۆڕشـەوە نییە، بەڵکو ئەو ناوچانە تەنانەت لەو قۆناغانەشدا کە نە پێشمەرگە هـەبوو و نـە شۆڕش، بەتایبەتی لە ساڵانی چلەکان و پەنجاکانی سەدەی ڕابردووەوە، حکومەتی ناوەندی کـەمترین تیمارخانە و نەخۆشخانەی لەو ناوچانە دامەزراندووە و کەمترین پزیشکی بۆ دابینکردوون.

بەشێوەیەکی گشتی، پزیشکان و هەموو کارمەنـدانی پیشە تەندروستییەکان توێـژێکی گرنگی کۆمەڵ پێکدێنن و تەندروستی کۆمەڵ بەم توێژەوە بەستراوەتەوە. پیشـەی پزیشکی لە بنەمادا پیشەیەکی مرۆڤانەیە و مامەڵەی پزیشك لەگەڵ مرۆڤە بـەبێ گوێدانـە ڕەگـەز و زمان و ئاستی کۆمەڵایەتیی. لە شۆڕشدا هەر وابووە. پزیشکانی شـۆڕش لـە کـاتی پێویستدا سەربازە دیلەکانیان تیمـار کـردووە بـەبێ گوێدانـە ئـەوەی کـە ئـەو سـەربازانە ئەوانـەن کـە گونـدەکان دەسـوتێنن و تەقـە لـە گوندنشـینان دەکـەن. لێـرە ڕەهەنـدی مرۆڤانـە بەسـەر ڕەهەندی سیاسیدا زاڵە.

ئەم پەرتووکە کەلێنێکی گەورەی پەرتووکخانەی کوردی پڕ دەکاتەوە و تیشك دەخاتـە سەر ڕۆڵی گرنگی پزیشکان لە شۆڕشی نوێدا.

# ئەم کتێبە بۆ؟

دوای وردبوونـــەوە و تێڕامـــانێکی زۆر لەهەمبـــەر مێـــژوو و خـــەبات و قوربـــانی و داستانەکانی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان، گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە گەلی کورد بەگشتی و شۆڕشی نـوێی گەلەکـەمان بەتایبـەتی، وێـڕای تۆمـارکردنی مێژوویـەکی پـڕ لـە قوربـانی و سەروەریی، کەچی وەکو پێویست ئەرشیف و بەڵگە و دۆکیۆمێنتـەکانی کۆنەکراوەتـەوە و چـاپ و بڵاونەکراوەتـەوە، بۆیـە بڕیارمـدا هـەموو توانـای خـۆم لـە پێنـاوی پاراسـتن و تۆمارکردنی ئەو مێژووە و ئاشناکردنی بە نەوەکانی داهاتوو بخەمەگەڕ.

مێژوو و خەباتی ی.ن.ك، تەنها مێژووی حیزبێك نییـە، بـەڵکو بەشێکی گەورەیـە لـە بەرخۆدان و قارەمانێتی نەتەوەیەك، بۆ ئەو مەبەسـتە بـە گـرنگم زانـی وەکو خـۆی ورد و درشت، ڕووداوەکان لە زاری شایەتحاڵەکان خۆیانەوە تۆمار بکەین، کـە خـوودی خۆشـم وەك شـایەتحاڵێکی بەشـێکی نەهامـەتی و کارەسـاتەکانی نەتـەوەی کـورد، باشـتر لـەوە دەگـەم کـە دەبێـت هـەموو ئـەو ڕووداو و بەسـەرهاتە هەمـەجۆر و کارەسـاتە بێشـومارانە بـە جۆرێـك تۆمـار بکـەین و بنووسـینەوە کـە لـە زۆرتـرین دیـدی جیـاوازەوە سەرچـاوەی گـرتبێ، لەبەرئەوەی بەڕاستی شۆڕش، قوربانی و گیانفیدایی و خۆڕاگریی زۆری پێویست بووە.

کاتێـك لـە هـەر قۆنـاغ و بەسـەرهات و ڕووداوێکـی شـۆڕش ورد دەبینـەوە، دەبیـنین پێشمەرگە و سەرکردەکان چەندە ئەرکیان سەخت و چەندە ڕۆڵیان کاریگەر بووە، ئەوەیشی کـە پـێم وابـوو بـەپێی پێویسـت ڕۆڵ و قوربانییـان ئامـاژەی پێنـەدراوە، یـان ون و فەرامۆشـکراوە، پزیشـك و برینپێچـانی شـۆڕش بـوون. هەربۆیـە بـەباشمان زانـی چ وەك بەرزنرخانـدنی ئـەرك و مانـدووبوون و تێکۆشـانیان، چ وەك تۆمـارکردنی بەشـێکی دیکـەی مێـژوو و سـەروەریی و قوربانییـەکانی ی.ن.ك، دەرفـەتیان بـۆ بڕەخسـێنین تـا لـە زاری خۆیانەوە تەواوی ڕاستییەکان بگەیەننە دەستمان. هەروەها ناکرێت ڕۆڵی توێژەکانی دیکەی بەشـداری شـۆڕش فـەرامۆش بکـەین وەك: (بێتەلـەکان، پارتیزانـەکان، نوسـەر و ئـەدیب،

مامۆستایانی شاخ و دادوەرانی شاخ...هتد)، کە خوا یار بێت هەر یەك لەم توێژانە لە پرۆژەکانی داهاتووماندا، لە زاری خۆیانەوە ڕووداو و بەسەرهاتەکانی شۆڕش دەنووسینەوە و لە دووتوێی چەند پەرتووکێکدا کۆیان دەکەینەوە و چاپیان دەکەین. بە جۆرێك هەر پەرتووکێك باس لە یەکێك لەو توێژانەی شۆڕش دەکات.

لەم پەرتووکەدا تیشك دەخەینە سەر خەبات و تێکۆشانی ئەوانەی پزیشك، یاریدەدەری پزیشك و برینپێچ بوون، واتە هەموو ئەو هەڤاڵانەی لە بواری تەندروستیی شۆڕشدا خزمەتیان کردووە و یارمەتیدەری زۆر گرنگ بوون بۆ بەهێز هێشتنەوەی شۆڕش، بە جۆرێك هەندێك جار خوێنی خۆیان بە پێشمەرگەی بریندار بەخشیوە.

کاری پزیشکی پیشەیەکی دەگمەن و تایبەتە، دەکرا ئەو تێکۆشەرانە لەناو شاردا پاڵپشت بە پیشەکەیان، ژیانێکی شایستە و باش دەستەبەر بکەن و بگوزەرێنن، بەڵام ئەوان ئەو ژیانەیان وەلانا و لە پێناو سەربەخۆیی و سەروەریی میللەتی کورددا شۆڕش و خەباتیان هەڵبژارد. ژیانی خۆیان لەسەر دەستیان دانا و دێ بە دێ و شاخ بە شاخ لەپاڵ هێزەکانی پێشمەرگەدا بوون بە هەتوانی برینەکان. ئەوان ئەو کەسانە بوون کە چەك لە شان بوون و لە کاتی شەڕدا پێشمەرگەی بەجەرگ بوون و لە کاتی پێویستیشدا پزیشکی میهرەبان و تیمارکاری برینەکانی پێشمەرگە گیانفیداکان بوون. بۆیە ڕێزلێنان و بەرزڕاگرتنی ئەو مێژووەی قۆناغی تەمەنیان، کەمترین ئەمەکە، کە ئێمە بتوانین بەشێکی کەم لەو خەباتەی ئەوانی پێ بدەینەوە.

بەو هیوایەم ئەم پەرتووکە جێگەی ڕەزامەندی هەموو لایەك بێت و توانیبێتمان وێنایەکی ڕاستەقینەی ئەو ڕۆژانەی خەبات بخەینە بەر چاوی خوێنەری ئازیز و نەوەی نوێی گەلەکەمان. تا بزانن ئەم ئازادییە بە ئاسانی بەدی نەهاتووە و پارێزگاری لێکردنی ئەرکێکی نیشتیمانی و نەتەوەییە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم زۆر سوپاسی هەموو ئەو هەڤاڵانە بکەم کە کاتی خۆیان تەرخان کرد بۆ ئێمە و هاوکارمان بوون لە گێڕانەوەی بیرەوەری و ڕووداوەکانی ڕابردووی نێو شۆڕشدا، زۆر سوپاسی مامۆستا (گۆران) دەکەم کە ئەرکی نووسین و ئامادەکردنی پەرتووکەکەی لە ئەستۆ گرت و دریغی نەکرد، هەروەها سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی بە وشەیەکیش بێت پشتگیرییان کردین و هاندەرمان بوون.

لێرەوە تەواوی کادیرانی تەندروستی بەشدار نەبوو لەم پەرتووکەدا دڵنیا دەکەمەوە، کە ئەم بەرهەمە درێژەی هەیە و بەرگی دیکەی بە دوادا دێت، هەم خۆمان پەیوەندییان پێوە دەکەین، هەم داوا لەوان دەکەین پەیوەندیمان پێوە بکەن، لە کۆتاییدا زۆر بە پێویستی دەزانم سوپاسی بێپایانم ئاراستەی سەرجەم هەڤاڵانم لە بۆردی ئەرشیف و مێژوو بکەم، کە هەردەم خۆنەویستانە ئەرکەکانی سەرشانی خۆیان ڕادەپەڕێنن و لەم ئەرکە گرنگانەدا بەشداری کاریگەریان هەیە.

**خەمینە ساڵح ئەحمەد**
**ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی ی.ن.ك**
**لێپرسراوی بۆردی ئەرشیف و مێژوو**

## دەستپێك

ڕۆژی ٢٠٢١/١٢/٢٦، کاتژمێر ٣ی پاشنیوەڕۆ، بە ئامادەبوونی ژمارەیەك نووسەر و ڕووناکبیر و ڕۆژنامەنووس لە "سالۆنی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ" لە شاری سلێمانی، کۆڕی ناساندن و بەخشین بۆ حەوت پەرتووکی ئێمە ساز درا، کە سەرجەمیان لە هەمان ساڵدا چاپ کرابوون. دوای چەند وتەیەکی پێویست لەسەر چۆنیەتیی نووسین و گرنگیی ئەرشیف و مێژوو، میوانانی کۆڕەکە ڕاو و بۆچوونی خۆیان خستەڕوو.

ئێمە بێئاگا بووین لەوەی وتەکانی ئێمە و گرنگیی پەرتووکەکان دەبن بە دەستەخوشکی پڕۆژەیەکی دیکەی گرنگی هاوشێوە، کە ماوەیەك بوو کەسێك لە دامەزراوەکەی خۆیەوە پێشمەرگەئاسا و ماندوونەناسانە، وەکو فەرهاد قولێنگی هەڵکۆڵینی کێوی بێستوونی لە شان ناوە و لە هەناویدا بۆ زێڕ و ئەڵماس دەگەڕێت. لە نێو دەریایەك لە قوربانی و بەرخۆدانی گەلەکەماندا وەکو دەریاوانێك لە قووڵاییەکەیدا بە دوای دوڕ و مەرجان و مرواریی شۆڕشدا دەگەڕێت، شەو و ڕۆژی لەسەر یەك ناوە و تەواوی توانا و کاتی خۆی و ستاف و دامەزراوەکەی خستووەتە خزمەتی ئەو پڕۆژانەوە. لێرەوە تێگەیشتبوو کە تاقانەی ئەو بوارە نییە و کەسانێك هەن هەرگیز ناتوانن مێژوو و خەبات و ئەرشیفی گەلەکەیان نادیدە بگرن.

کاتێك دەرگا بە ڕووی سەرنج و ڕووانینی ئامادەبوواندا کرایەوە، داوای لە ئێمە کرد شان بدەینە بەر پڕۆژە گرنگەکانی و هاریکاری بیرۆکە ناوازەکانی بین، کە هەموویان لە بواری پاراستنی ئەرشیف و مێژوو و خەبات و قوربانیدانی گەلەکەماندا بوون. ئەو وتانە کاریگەرترین وتە بوون کە وای کرد هەست بەوە بکەم سەرقاڵی کارێکی بێئەنجام نییم و وەك کۆتا خاڵی بە ئەنجامگەیاندنی کارەکەم لێکم دایەوە. ئەو چرکەساتە ساتی دەرچوونی ماندوویەتیم بوو بە ئامادەکردن و پاراستنی ئەو ئەرشیفانەوە، کە زۆری نەمابوو دەست لە

هەر کارێکی نووسین لەو بوارەدا بەهۆی نادیدەگرتنەوە هەڵبگرم. لێرەوە ئاشنای کەسێک بووم کە هەمان خەمی لە ئەستۆ گرتووە و ماوەی ساڵ و نیوێک بوو بێوچان لەو بوارەدا تێکۆشابوو، ئەمە وای لێ کردم جارێکی دیکە بیر لە پڕکردنی کۆڵەپشتەکەم بکەمەوە و شان بدەمە بەر پرۆژەیەکی دیکەی مێژوویی.

ڕۆژی ٢٠٢٢/١/٨ لە مەکتەبی بیروهۆشیاری و لە بۆردی ئەرشیف و مێژوو، پێشنیاری کارکردن لەگەڵ ئەو ناوەندە گرنگەدا چووە بواری جێبەجێکردنەوە، هەر لەوێ بۆم ڕوون بووەوە کە خاوەنی نزیکەی پازدە پرۆژەی گرنگی زانستییە و سەرجەمیان بریتی بوون لە توێژینەوە لە بواری مێژوو و بە ئەرشیفکردنی خەبات و بەرخۆدان و ڕۆڵی چەندین چینوتوێژ لە شۆڕشی نوێی گەلەکەماندا، بە ڕابەرایەتیی ی.ن.ک، کە نزیکەی چەند دەیەیەکە ئاوڕی زانستی لە ڕۆڵی گرنگیان نەدراوەتەوە، کە بەداخەوە ژمارەیەک لەو شۆڕشگێڕانە ژیانئاواییان کردووە، هەروەها لە سەردەمی شۆڕشدا سەدانی دیکەیان شەهید بوون و مێژووی خەباتیان نەنووسراوەتەوە، خەباتی تەواوی ئەم چینوتوێژانە، تەواوی پرۆژەکانی پێک دەهێنا، لەوانە: "مێژووی ی.ن.ک، پارتیزانەکانی شاخ، نووسەرانی شاخ، ژنانی زیندانی، عەدەد جیهازەکان...) یەکێکی دیکە لەو توێژە گرنگانە، بریتی بوو لە ڕۆڵ و بەرخۆدانی: "پزیشکانی شۆڕش"، پێشنیاری کرد ئێمە ئەرکی توێژینەوە و ئەرشیفکردنی مێژووی ئەو چینە گرنگەی شۆڕش لە ئەستۆ بگرین، بۆیە لە ئێستادا ئەم بەرهەمەی بەردەستی خوێنەر لە ژێر ناوی "**ڕەهەندی تەندروستی لە شۆڕشی نوێدا ١٩٧٦ – ١٩٩١**" یەکێکە لەو چەندین پرۆژە و بەرهەمانەی کە بیرۆکەکەی کەسێک خاوەنداری دەکات، بەدروستی گوزارشتی "کەسی شیاو بۆ شوێنی شیاو" بۆ توانا و ڕۆڵی ئەو دەگونجێت، ئەویش هەڤاڵ: "**خەمینە ساڵح ئەحمەد**"ە.

لێرەوە لەسەر ئەو ماوە مێژووییە واتە ١٩٧٦ - ١٩٩١ دەمەوێت ئەوە بڵێم: مێژوو سەربوردەی ڕابردووە، خەبات و بەرخۆدان ڕەنگی سەوزی ژیانن و بەرگری و قوربانیدان ڕەنگی سووری شۆڕشن، ڕاپەڕینیش (نەخێر)ی گەورەی مێژوو بوو، ئێستا تەنیا کاتی پشوودان نییە لە سایەی شۆڕشدا، بەڵکو هەم ڕۆژی پاراستنی سامان و ئەرشیفی ڕابردووە، هەم ڕۆژی بەرەودان و ڕاستگۆییە لەگەڵ ئامانجەکانی شۆڕشدا، هەروەها گرێدانی پەتی شانازیی ڕابردووە بە پەتی ئاییندەوە، تاکو ببێتە بڵێسەی ڕووناکی بۆ نەوەکانی ئایندە و بەرنامەی ژیان و پلان و ستراتیژی نوێی لەسەر بونیاد بنرێت، تا زیاتر گەشە بکات و بەر بگرێت و لە سایە و سێبەریدا نەوەکانی ئاییندە پشوو بدەن.

شۆڕش واتە جوداکردنەوەی هەموو ئەوانەی کە هەتە لە هیی ئەوی دی، واتە ڕەتکردنەوەی هەموو ئەوانەی کە هەیەتی و هێنانەکایەی هەموو ئەوانەی کە هەتە. شۆڕش وەکو مرۆڤێك لە سەدان دەمار و ماسوولکە پێك هاتووە، هەر توێژێکی شۆڕش دەبن بە دەمار و هەر چینێکی شۆڕش دەبن بە ماسوولکە بۆی. شۆڕش واتە چیا، هەر ڕچەڕێیەکی هەڵزنان بەرەو لووتکە، واتە هەنگاوی شۆڕشگێڕێك. شۆڕش دەریایە و هەر هەنگاوێکی شۆڕشگێڕەکانی دڵۆپێکە، شۆڕش ژیانە و هەناسەی خەباتگێڕ پارسەنگی ژیان و شۆڕش ڕادەگرن. داری شۆڕش هەمان درەختی گوێز و بەڕووە، بە خوێنی خەباتگێڕ تینوویەتیی شکاوە، هەر بۆیە لە تەواوی درەختەکانی دیکە خۆڕاگرترە، شەهیدان دەبن بە ڕەگی و پێشمەرگە و پارتیزانەکانی دەبن بە قەد بۆی.

جا گرنگیی ئەم پەرتووکە لێرەوە بە دیار دەکەوێت، کە خۆی دەبینێتەوە لە ئاودانی درەختی شۆڕش و خەبات و پاراستنی ئەو سەروەرییە نیشتیمانییە و ئەو سەروەتە مرۆییە، ئەم کارە و هاوشێوەکانی وێنەی ئاون بۆ درەختی مێژوو و خەبات و بەرخۆدانی گەلی ئێمە.

سەرەتا ئەم پرۆژەیە بە پلانێك دەستی پێ کرد، کە دەستپێکەکەی بریتی بوو لە پەیوەندیکردن بە ژمارەیەك پێشمەرگەی دێرین و پارتیزان و پزیشکەوە، لە سەرجەم دەڤەرەکاندا، تا ناوی هەموو، یان زۆرینەی ئەو پزیشك و کارمەند و برینپێچانە بە دەست بهێنین، کە لە ڕۆژگاری شۆڕشدا لە خەبات و ئەرکدا بوون و بە سەدان نەشتەرگەرییان بۆ

پێشمەرگە ئەنجام داوە و هەزاران کاری برینپێچییان بۆ پێشمەرگە و هاووڵاتی ئەنجام داوە و بە دەیان کەسیان لە مردن ڕزگار کردووە.

بۆیە ناکرێت ڕۆڵی ئەو چینە گرنگەی شۆڕش هاوشانی سەرجەم چینەکانی دیکە نادیدە بگیرێت، کە لە دوای هەڵایسانی شۆڕشی نوێی گەلەکەمانەوە تا ئێستا ڕۆڵ و کار و خەباتی ئەم چینە نەنووسراوەتەوە و ئەرشیف نەکراوە و نەپارێزراوە، هەروەها هاوشانی پیشەکەیان پێشمەرگە و شۆڕشگێڕ بوون. بەداخەوە ژمارەیەك لەو پزیشکانە شەهید بوون و ژمارەیەکیان لەم ساڵانەی ڕابردوودا بە هۆی بەساڵاچوون و نەخۆشییەوە ژیانئاواییان کردووە.

ئەم چینە هەستیارەی شۆڕش ڕۆڵی سەربازی ونی شۆڕشیان گێڕاوە و دابەش دەبن بۆ چەند بەشێك، بەشێکیان بە فەرمی پزیشك بوون و دەرچووی ناوەندە ئەکادیمی و زانکۆییەکانی کوردستان و عێراق بوون، یان خوێندکاری بەشە پزیشکییەکان بوون و دەستیان لە خوێندن هەڵگرتووە و بوون بە پێشمەرگە و لە شاخ زانستی خۆیان پراکتیزە کردووە. هەندێکی دیکەیان یاریدەدەری پزیشك بوون، هاوشێوەی نموونەی پێشوو، یان بە فەرمی دەرچووی ئەو بەشە بوون، یاخود لە نیوەی ڕێگە لە پێناو شۆڕشدا دەستیان لە خوێندن هەڵگرتووە و ئەوەندەی پێشمەرگەش بوون ڕۆڵی پزیشکیان گێڕاوە. بەشێکی دیکە لەم چینە گرنگەی شۆڕش، دەرچووی خولی خێرای فێربوونی سارێژکاری و برینپێچی و دەرزیلێدان بوون و دابەش کراون بە سەر هەرێم و دەڤەر و مەڵبەند و تیپ و کەرت و مەفرەزەکانی شۆڕشدا، هاوکات بەشێك لەم چینەی دوایی ئەو خولەشیان نەبینیوە و بە ئەزموون و لێهاتوویی و وردبینی و دڵسۆزیی خۆیان فێری سارێژکاری و دەرزیلێدان و برینپێچی بوون.

ئەم چینە گرنگەی شۆڕش، هەم پزیشکی پێشمەرگە بوون، هەم پێشمەرگە بوون، یەکێك لەو پزیشکانە زیاتر لە بیست بوتڵ خوێنی خۆی لەو پێناوەدا بەخشیوە! هەروەها بە هۆی نەبوونی بنکەی تەندروستییەوە لە گوندەکاندا، ئەو پزیشکانە بوون بە فریادڕەسی گوندنشینان، بۆیە کارێکی لەم شێوەیە لەسەر ڕۆڵی نادیدەگیراوی ئەوان هەرچەندە درەنگە، بەڵام هێشتاش سەنگ و گرنگیی زانستی و مێژوویی خۆی هەیە.

سەرەتا بڕیار بوو پەرتووکەکە لە ژێر (ناوی پزیشکانی شۆڕش)، یاخود (مێژووی شۆڕشی نوێ لە زاری پزیشکانی شۆڕشەوە) بێت، بەڵام دواتر ناوەکەیمان گۆڕی، لەبەرئەوەی تەواوی بەشداربووانی پەرتووکەکە پزیشك (طبيب) نین، دواتر ئێمە باسی نەخۆشخانەکان و دەزگای تەندروستیمان کردووە، بۆیە وشەی (تەندروستی) تەواوی ئەوانی دیکە لە هەناویدا جێگە دەکاتەوە، بوارەکە و لایەنەکەش تەندروستییە، بۆیە وشەی (ڕەهەند) وەك پێش ناوی تەندروستی بە گونجاوتر زانرا، ماوەکەش سەردەمی شۆڕشی نوێیە، پێویست بوو ناوی ئەو شۆڕشە و ماوەکەی دابنرێت، لێرەوە سوپاس و پێزانین بۆ بەڕێز (پ.ی.د. هیوا عەزیز سەعید) دووپات دەکەمەوە کە لە جێگیرکردنی ناونیشانەکەدا کۆمەکی زانستی کردین.

شۆڕشی نوێی ساڵی ١٩٧٦ بە ڕابەرایەتیی ی.ن.ك، کە شۆڕشی تەواوی کۆمەڵانی خەڵك بووە، هەموو چین و توێژێك بۆ سەرخستنی ئەو شۆڕشە بەشدار بووە. چەندین پزیشك و کارمەندی تەندروستی لە سەردەمی شۆڕشدا، بۆ پاڵپشتیی شۆڕش نەخۆشخانەکانی شار و مووچە و ژیانی مسۆگەری خۆیان جێ هێشتووە و شانبەشانی پێشمەرگە درێژەیان بە بەرخۆدان داوە. لە دوای ڕاپەڕین و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە تا ئێستا، چەندین نەخۆشخانە کراون بە ناوی نەخۆشخانەکانی شۆڕش و پزیشکانی شۆڕشەوە، لەوانە: (نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر هادی، نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر هێمن، نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر ڕەفیق... هتد). لە کۆتاییدا بەهیواین ئەم بەرهەمە ببێت بە سەرەتایەك بۆ دەیان کاری دیکەی هاوشێوە، هاوکات لە کەموکورتییش بەدەر نییە.

**گۆران سەلام محەمەد**

**بەهاری ٢٠٢٢**

**سلێمانی**

# بەشی یەکەم: پزیشك و نەخۆشخانەکانی شۆڕش

## تەوەری یەکەم: پزیشکی شۆڕش

## تەوەری دووەم: نەخۆشخانەی مەڵبەندەکان (سەرەکییەکان)

## تەوەری سێیەم: نەخۆشخانەکانی دیکە (لاوەکییەکان)

## تەوەری چوارەم: پزیشکی تیپ

## تەوەری یەکەم: پزیشکی شۆڕش

دەستەواژەیەکە لە مانا فراوانەکەیدا ئاماژە بۆ ئەو کادیرانە دەکات، کە لە ماوەی سالانی ۱۹۷٦–۱۹۹۱دا لە پێشمەرگایەتیدا خزمەتگوزاریی پزیشکییان پێشکەش کردووە. دەستەواژەکە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بە پیشە پزیشك بوون، کارمەندی دامەزراوەیەکی پزیشکی، یان بە دەستهێنەری بڕوانامەی پزیشکی بوون و خزمەتگوزاریی پزیشکییان پێشکەش بە هێزی پێشمەرگە و دانیشتوانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگە کردووە و خوودی خۆشیان پێشمەرگە بوون.

لە سەرەتای هەڵگیرساندنی خەباتی چەکداردا لە ساڵی ۱۹۷٦، ئاستەنگێکی زۆر لە بەردەم مەفرەزە سەرەتاییەکاندا بوو، لە هەوڵەکانیاندا بۆ دابینکردنی پێداویستییە پزیشکییەکانیان. لەو قۆناغەدا کەمی ژمارەی پزیشك و برینپێچ و کەمی داو و دەرمان و ئامرازی پزیشکی و نەبوونی شوێنی پێویست بۆ حەوانەوەی نەخۆش و برینداران کێشەیەکی گەورە بوو. ژمارەیەکی کەمی مەفرەزەکان پێداویستییەکانی فریاگوزاریی سەرەتاییان بۆ خۆیان دابین کردووە. کادیرە پزیشکییەکان بە کۆڵەپشتی پڕ پێداویستییەوە فریاگوزارییە سەرەتاییەکانیان، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە و لەگەڵ مەفرەزەکاندا دەسووڕانەوە. نەبوونی بنکەی جێگیر و بە ئەستەم پەیداکردنی دەرمان گەورەترین کێشەی ئەو سەردەمە بوو، سەرباری ئەوەی کە لەو قۆناغەدا هیچ پلانێکی ناوەندی بۆ دابینکردنی پێداویستییە پزیشکییەکان بۆ هێزی پێشمەرگە نەبوو.

لە ساڵی ۱۹۷۸ یەکەم خول بۆ دەرچواندنی چەند فریاگوزارێکی تەندروستی لە ناوزەنگ لەسەر دەستی دکتۆر جەعفەر شەفیعی، ئەندامی سەرکردایەتیی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، ڕێکخرا.

لە ساڵی ۱۹۷۹دا ڕووخانی ڕژێمی شا لە ئێران بەشێکی زۆری کێشەکانی کەمیی دەرمان و چارەسەرکردنی پێشمەرگەی نەخۆش و برینداری چارەسەر کرد. هەر لەو ساڵەدا دکتۆر خدر مەعسوم لێپرسراوی لقی سێی ی.ن.ك لە زەڵێ خولێکی ۲۱ ڕۆژەی بۆ دەرچواندنی فریاگوزاری تەندروستی کردەوە، کە بووە مایەی دابینکردنی ژمارەیەکی نزیك لە بیست

كادیری تەندروستی بۆ هێزی پێشمەرگە. هەر لەو ساڵە بە دواوە، ژمارەیەكی زۆرتری كادیری تەندروستی لە شارەكانەوە پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە كرد. ژمارەیەكی دیكەی كادیرە پزیشكییەكانی ئەوروپاش، گەڕانەوە بۆ كوردستان و لە ڕێگەی ئێرانەوە پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە كرد، لە ناوزەنگ و زەڵێ خزمەتگوزاریی پزیشكییان پێشكەش كردووە.

بوونی كادیری پزیشكی لە ناو هێزی پێشمەرگە ڕۆڵێكی دیاری لە بەرزكردنەوەی ورەی پێشمەرگە و هەستكردنی بە ئاسوودەیی هەبووە، سەرباری ئەوەی كە ئەو كادیرانە لە ڕێگەی ئەو خزمەتگوزارییە تەندروستییانەوە كە پێشكەش بە گوندنشینەكانیان دەكرد، ڕۆڵێكی بەرچاویان لە پتەوكردنی پەیوەندیی نێوان هێزی پێشمەرگە و هاووڵاتیاندا گێڕاوە.

لەگەڵ زیادبوونی چالاكییەكانی هێزی پێشمەرگەدا زیادبوونی ژمارەی كادیری پزیشكی لەناو هێزی پێشمەرگە و بوونی دەرمان و ئامێری پزیشكی و نەخۆشخانە بایەخێكی زۆرتری پەیداكرد.

لە ساڵی ١٩٧٩ نەخۆشخانەیەكی سەرەتایی لە ناوزەنگ كرایەوە و لێپرسراوێتی بەڕێوەبردنی بە دكتۆر شادمان فوئاد مەستی سپێردرا. ساڵی دواتر نەخۆشخانەیەكی ناوەندی بە ناوی نەخۆشخانەی شەهید دكتۆر بەختیار خالید لە قوڵەهەرمێ لە نێوان گوندی شێنێ و زەڵێ كرایەوە كە پێداویستییەكانی هێزی پێشمەرگە و خەڵكی ناوچەكەی تا ئەندازەیەكی باش دابین كرد، هاوینان بەشێكی نەخۆشخانەكە دەیگواستەوە بۆ نۆكان و تووژەڵە و كادیرەكانی لە چەند چادرێكدا ئەركەكانی خۆیان جێبەجێ دەكرد.

لە ساڵی ١٩٨٢ بەدواوە كەمتر پشت بە دەرچواندنی برینپێچی گەڕۆك بۆ هێزی پێشمەرگە بەسترا، ئەویش بەهۆی ئەوەی كە ژمارەیەكی زۆری دەرچووانی كۆلێژ و ئامۆژگا پزیشكییەكان پەیوەندییان بە هێزی پێشمەرگەوە كرد.

لە ساڵی ١٩٨٤ لە كاتی ئاگربڕ و وتووێژی نێوان ی.ن.ك و حكومەتی عێراقدا، چەند كادیرێكی پزیشكی، لەوانە دكتۆر فائق گوڵپی و دكتۆر یوسف محەممەد عەزیز هەلی هێوربوونەوەی ڕەوشی سیاسییان قۆستەوە و بە شێوەیەكی خۆبەخش لە نەخۆشخانەی

سلێمانی کاریان کرد، بەو مەبەستەی کە پەرە بە توانای پزیشکی خۆیان بدەن و خولێکی کردارەکی بۆ فێربوونی ئەزموونی تازە ببینن. ئەم دەستپێشخەرییە کاریگەری زۆری لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی پزیشکی نەخۆشخانەکانی شۆڕش بەجێ هێشت. دوا بە دوای ئەم ئەزموونە، نەخۆشخانەی بەرگەڵوو بووە پێشکەوتووترین نەخۆشخانەی ناوچەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەتی عێراق و نەشتەرگەریی زۆر گەورەی تێدا ئەنجام درا.

لە ساڵی ١٩٨٤ بەشی تەندروستی سەر بە دەزگای بەڕێوەبردنی ی.ن.ك، بڕێکی زۆرتر سەربەخۆیی پێ درا و کرایە دامەزراوەیەك بە ناوی دەزگای تەندروستیی کوردستان و لێپرسراوێتییەکەی بە دکتۆر یوسف محەمەد عەزیز ناسراو بە دکتۆر شوان سپێردرا. ئەم دەزگایە ڕۆڵێکی گەورەی لە پەرەپێدانی کاروباری پزیشکیدا گێڕا و کادیری پزیشکی پێویستی بۆ هێزی پێشمەرگە دابین کرد.

لە قۆناغی پەرەسەندنی جەنگی کیمیاییدا، دەزگاکە چەندین خولی بۆ خۆپاراستن لە چەکی کیمیایی کردەوە و کادیرە شارەزاکانی ئەم بوارەی بە سەر بارەگاکانی هێزی پێشمەرگە و گوندەکاندا دابەش کرد بۆ بڵاوکردنەوەی شارەزایی سەربارەت بە شێوەی خۆپاراستن لە چەکی کیمیایی و چۆنێتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەنگاوتەکانی چەکی کیمیایی.

لە پاڵ دەزگای تەندروستیی کوردستان دەزگایەکی دیکە بە ناوی کۆمەڵەی فریاکەوتنی کوردستان (KRA) کە بەشێکی گرنگی ئەرکەکانی پەیوەندی بە کاروباری تەندروستییەوە هەبوو، لە ساڵی ١٩٨٦دا بە لێپرسراوێتی دکتۆر یوسف محەمەد عەزیز دامەزرا و ژمارەیەکی زۆری ئەو کەسانەی کاریان تێدا کردووە کادیرەکانی دەزگای تەندروستیی کوردستان بوون. ئەم دەزگایە، لەو بەشەی کە پەیوەندی بە کاروباری پزیشکییەوە هەیە، ڕۆڵێکی کارای لە دابینکردنی دەرمان و ئامێری پزیشکی بۆ نەخۆشخانەکان هەبووە[١].

---

[١]- ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، چ٤، ب١، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سەروەری، سلێمانی، ٢٠٢١، ل٤٠١ — ٤٠٣.

## تەوەری دووەم: نەخۆشخانەی مەڵبەندەکان (سەرەکییەکان)

### یەکەم. نەخۆشخانەی بەرگەڵوو:

لە دوای سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە داستانە کەم وێنەکەی (دابان–هەلاج)ی ١٩٨٥/٢/١٥ کە سەرەتای دەستپێکردنەوەی شەڕی نێوان پێشمەرگە و ڕژێمی بەعس بوو دوای گفتوگۆ، دەزگای تەندروستی و نەخۆشخانە تاکو پایزی ١٩٨٥ لە ناوچەی مەرگە و کانی توو و سێروان ماوەتەوە، پاشان سەرکردایەتی بڕیاریدا کە نەخۆشخانەیەکی گەورە لە بەرگەڵوو دروست بکرێت و هەموو بەشەکان لە خۆی بگرێت، ناوچەی بەرگەڵوو ناوچەیەکی شاخاوی سەخت بوو دەکەوتە دامێنی گوندی سەرگەڵوو لە نێوان چیای ژیلوان لە ڕۆژهەلات و دابان لە ڕۆژئاوا، دەستنیشانکردنی ئەو ناوچەیە بۆ دروستکردنی نەخۆشخانە بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە:

١. شوێنێکی شیاو و پتەو بوو، دوورەدەستی ڕژێم بوو، لە ڕووی سەربازییەوە شایستە بوو بۆ نەخۆشخانە
٢. لە ڕووی ژینگەییەوە ئاوهەوایی خۆش و پاك بوو سەرچاوەی ئاوی پاکی خواردنەوەی هەبووە.
٣. تاڕادەیەك ناوەند بوو بۆ هەموو مەڵبەند و تیپەکانی پێشمەرگە ئاسانتر بریندار و نەخۆش دەگەیشتن.
٤. نزیك بوو لە بارەگاکانی سەرکردایەتی ی.ن.ك، بۆ پاراستنی نەخۆشخانەکە پێویست بوو.
٥. نزیك بوو لە شاری سلێمانی و هاتوچۆی زیاتر بە سەرەوە بوو زووتر پێداویستی بە دەست دەگەیشت.

ئەم پزیشکانە (د. شوان، د. هەڵۆ، د. هێرش، د. هێمن ئەحمەد، د. ئاودێر، د. دلێر، د.حسێن حەمەساڵح) کاریان تێدا دەکرد، بەڵام زیاتر (د. شوان و د. هەڵۆ) نەشتەرگەریان

ئەنجام دەدا، لەگەڵ ئەوەی لە نۆرینگەش بەردەوام کاریان دەکرد)، دکتۆرەکانی تریش لە بەشی هەناوی و بەرەکانی شەڕ کاریان دەکرد،

لەو هەلومەرجەدا توانرا نەخۆشخانەیەك دروستبکرێت، کە بتوانێت زۆربەی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان پێشکەش بە هێزی پێشمەرگە و دانیشتوانی ناوچە ئازادکراوەکان بکات، خۆی لە چەند بەشێك دەبینییەوە:

- بەشی نۆرینگەی پزیشکی: ئەم بەشە کە ڕۆژانە ٢٤ کاتژمێری بەردەوام لە کارکردندا بوو بۆ بینینی نەخۆش و برینداری پێشمەرگە و هاووڵاتیانی ناوچەکە، پاش ئەوەی پزیشك نەخۆشەکەی دەبینی بڕیاری دەدا چی بۆ بکرێت بە پێی نەخۆشیەکەی (ئەگەر پێویستی بە پشکنینی تاقیگە هەبووایە ئەوا ڕەوانەی بەشی تاقیگە دەکرا، یان پێویستی بە تیشکی ئیکس هەبووایە ڕەوانەی بەشی تیشك دەکرا ...هتد) ئەو کاتە بڕیاری کۆتای دەدرا، چارەسەری بۆ دەنووسرا و بۆ بەشی دەرمانخانە دەنێردرا دواتر دەرمانیان پێ دەدا و ڕێنماییان دەکرد.
- بەشی تاقیگە و خوێن: لێپرسراوی بەش د. سەردار یاوەر و شەهید بۆتان عوسمان یاریدەدەری بوو، ئەم بەشە زیاتر گرنگی بە وەرگرتنی خوێن بۆ برینداەکان و ئەو کەسانەی کە نەشتەرگەریان بۆ دەکرا جیاکردنەوەی گروپی خوێن و شیکاری نەخۆشییەکان دەستنیشانکردنیان بەشێوەیەکی زانستی.
- بەشی ڕەدهەی نەخۆش و خەوتن: لێپرسراوی بەش د. نەوزاد نوری بووە، ئەم بەشە بۆ مانەوەی بریندار و نەخۆش، یان ئەوانەی کە نەشتەرگەرییان بۆ دەکرا، لە هۆڵێکی درێژی (١٢م × ٤م) و پانی دیوارەکانی ٦٠—٨٠ سم ـ لە بەردی ناوچەکە دروستکراوە ــ سەربیشی زیاد لە ٦٠—٧٠سم گڵ و بەردی لەسەر بووە، ئینجا کۆنکرێتێکی کراوە، خۆی لە شێوەی پەناگایەکدا نیشان دەدا، تاکو ئەگەر بۆردومانیش بکرێت، بریندارەکان نەگوازرێنەوە و زیانمەند نەبن، هەروەها لە ناو خۆشیدا ژووری دەرمانخانەیکی ٣×٤م تێدا بووە، کە هاتوچۆی لە نێواندا دەکرا لە کاتی مەترسیشدا کاری تێدا کراوە، نزیکەی ١٠-١٢ تەختی نەخۆشی تیدابوو، هەموو

دکتۆر و کادیرەکانی تریش جگە لە کاری سەرەکیان کاریان تێدا کردووە شەو و ڕۆژ ئامادەییان هەبووە.

- بەشی تیشکی ئێکس: لێپرسراوی بەش د. بەیان حسێن بووە، لە هەموو کاتەکاندا ئامادەییان بۆ کارکردن هەبووە.
- بەشی نەشتەرگەری گشتی: د. خالید محەمەد ڕەشید لێپرسراوی بەشەکە بووو.

لەناو هەموو نەخۆشخانەکاندا نەخۆشخانەی بەرگەڵوو لە هەموو نەخۆشخانەکانی دیکە پێشکەوتووتر بووە، نەشتەرگەری گەورەی تێدا کراوە و ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگە و هاووڵاتی تێدا چارەسەر کراوە، بە تایبەتی لە کاتی هەڵایسانی ئۆپەراسیۆنە گەورەکانی هێزی پێشمەرگە لە دۆڵی جافایەتیدا، بەشێوەیەکی زۆر تایبەتتر لە سەروبەندی بەڕێوەچوونی ئۆپەراسیۆنی دابان-هەلاج لە ساڵی ١٩٨٥ و شەڕەکانی قەیوان ماوەت لە ساڵی ١٩٨٦دا و لە هەلومەرجی پەرەسەندنی جەنگی کیمیاییدا، خوودی نەخۆشخانەکە چەند جارێك بە فڕۆکە و بە تۆپ و بە چەکی کیمیایی بۆردومان کراوە[٢].

یەکێك لە بەشە گرنگەکانەیش بەشی نەشتەرگەری گشتی بوو، ئەم بەشە لە بینایەکی لە بلۆك دروستکراوی پارێزراو لەسەر ڕووبەری نزیکەی (٢٥٠م) کە لە سێ ژووری ئەندازە جیاواز و گونجاودا بووە، ژووری یەکەمیان (٣×٤م) بووە، بۆ ژووری (چاوەڕوانی نەخۆش) بوو کە بۆ ئامادەکردنی نەخۆش بەکارهاتووە، پێش چوونە ژووری نەشتەرگەری و پاش هێنانە دەرەوەی لە نەشتەرگەری، هەروەها هۆڵێکی (٤×٦م)، تایبەت بوو بە ژووری نەشتەرگەری کە هەموو ئامێر و کەلوپەلی نەشتەرگەری و سڕکردن و دوورینەوەی لە خۆدەگرت، تاکو کۆتایی ئەنفالی یەك دەیان نەشتەرگەری گەورە و بچووکی تێدا ئەنجام دراوە، پێشمەرگە و هاووڵاتیەکی زۆر لە مردن ڕزگار کراوە، هەروەها ژوورێکی تایبەتی تر کە ٣×٤م کە هەر درێژکراوەی هۆڵەکە بووە، دەرگایەك لە نێوانیاندا هەبووە، بۆ ئاسانکاری هاتوچۆ، هەروەها دەرگایەکیش لە ڕووکاری شاخەکەدا بووە، کە نزیك بوو لە پەناگاکە بۆ کاتی پێویست بەکارهاتووە، ئەم ژوورە بۆ ئامێری (ئۆتۆ کلەیف) کە ئامێرێکی مۆدێل نوێی

---

[٢]- ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان: چ٤، ب١، س.پ، ل٨١٥-٨١٦.

هـەڵمی بـووە، بـۆ پاككردنـەوەی كەلوپـەلی نەشـتەرگەری بـەكارهاتووە، لـە هـەمان كاتیشـدا شوێنی خۆ گۆڕینی كارمەند و پزیشكەكانیش بووە پێش نەشتەرگەریدا.

**لە نەخۆشخانەكە دوو جۆر نەشتەرگەری كراوە:**

١. نەشـتەرگەریی ئیمیرجنسـی (كتوپڕەكـان): ئـەم جـۆرە نەشـتەرگەرییە بـۆ ئـەو پێشمەرگە و هاووڵاتیانە دەكرا كە بریندار دەبوون، بە هۆی هێرشەكانی ڕژێم، یان تووشی حاڵەتێكی نەخۆشی وەك ڕیخۆڵە كوێرە دەبـوون و توانـای چوونە شـاریان نەبوو، بۆیە پێویستی دەكرد، كە بەپەلە لە مردن ڕزگار بكرێن نەشتەرگەرییان بۆ كـراوە، لەبـەر نـەبوونی پزیشـكی پسـپۆر لـە بـوارێكی تایبەتیـدا، هـەموو جـۆرە نەشتەرگەرییەكیان ئەنجام داوە، زۆرباش بەڕێوە بـراوە و چاكبوونەوەشـیان ئاسـان بووە.

٢. نەشـتەرگەری سـارد: ئـەم جۆرەیـان پەلـە نـەبووە، بـەڵام پێویسـتی دەكـرد كـە نەشتەرگەری بۆ بكرێت و نەدەتوانرا ماوەیـەكی زۆر بـەو شـێوەیە بمێننـەوە، وەك (نەشتەرگەری گورچیلە و زراو و شكانی ئێسك ...هتد).

پـێش ئـەوەی نەشـتەرگەری بـۆ نەخۆشـێك، یـان برینـدارێك ئـەنجام بـدرێت، دەبـوو پزیشك بڕیاری كۆتـایی بـدات لەسـەر جۆری چارەسـەر و نەشـتەرگەری نەخۆشـەكە، دواتـر هـەموو پێویسـتییەكانی خـوێن و گرتنـی تیشـكی ئـیكس بـۆ سـنگی و چێكی دڵـی كـراوە، هەروەها پێداویستییەكانی دیكەی بۆ جێبەجێ كراوە، پاشان بۆ نەشتەرگەری ئامـادە بـووە، ئینجـا ڕەوانـەی هـۆڵی نەشـتەرگەری كـراوە، هـۆڵی نەشـتەرگەریەكەش بـە هـەموو پێداویستییەكانی لـە ئـامێری بێهۆشـی و كەلوپـەل و كەرەسـتەكانی نەشـتەرگەری تـەعقیم كراو بە ئامێری ئۆتۆكلیف ـ ئامێرێكی پەستێنەری هەڵمی كارەبایی بووە بـۆ پاككردنـەوەی كەلوپەل و كەرەستەی نەشتەرگەری بـەكارهاتووە ـ ئامـادە بـووە، دواتـر ڕێنمـایی نـەخۆش كـراوە بـۆ خـۆ ئامـادەكردن لەسـەر نـەخواردن و خواردنـەوە پـێش نەشـتەرگەری، هـەروەها پسـپۆری سـڕكردن ئامـادە بـووە، كـە نەخۆشـەكە بـۆ نەشـتەرگەری سڕ بكـات، كادیرەكـانی

**دیکەش جگە لە کاری خۆیان بەپێی پێویست کاریان تێدا کردووە، لە دوای نەشتەرگەریش هەمووان ژوورەکانیان خاوێن کردووەتەوە، ئامادەیان کردووە بۆ نەشتەرگەریی دیکە.**

- **بەشی سڕکردنی گشتی: لێپرسراوی بەش د. ئاکۆ سەعید و د. فەرهاد نوری (دانا) بوون، هەمیشە ئامادەبوون بۆ ئەرکەکانیان لە نەشتەرگەرییەکاندا و بەشێوەیەکی زانستیانە سڕکردنی نەخۆشەکەیان کردووە، جگە لە ئەنجامدانی ئەرکی تریش لە ڕەدهە و خەفارەتی شەوانە.**
- **بەشی دەرمان و کۆگای دەرمان: لێپرسراوی بەش د. ئارام ڕۆستەم بووە، ئەرکی گرتن و ڕێکخستن و بە لیستکردن و دابەشکردنی دەرمانەکانی کردووە و بەشێوەیەکی گونجاو پاریزگاری لێ کردوون.**
- **بەشی ددان و ددانسازی: لێپرسراوی بەش د. سەروار تاڵەبانی بووە، لە ڕێکخستن و دامەزراندنی بەشی تەندروستی ددان ڕۆڵێکی زۆری هەبووە، بەدڵسۆزییەوە کارەکەی جێبەجێ کردووە، هەوڵی زۆری داوە کە کادیرەکانی دیکەش ڕابهێنێت تاکو لە کاتی ئامادەنەبوونی خۆیدا نەخۆشخانەکە لە کار بەردەوام بێت، دوای ئەوەی د. سەروار لە نەخۆشخانەکە دەڕوات، د. مەنسوور یوسف عەبدوڵڵا توانیویەتی بەدڵسۆزی لە کارەکانی بەردەوام بێت، هەندێك جاریش شەهید بۆتان عوسمان هاوکاری کردوون.**
- **بەشی کارگێڕی نەخۆشخانە: لە سەرەتادا د. مەنسوور بووە بە لێپرسراوی بەش پاشان د. موحسن عەبدوللەتیف ئەم ئەرکەی لە ئەستۆ گرتووە، جگە لە ئەرکی تەندروستی، ئەرکی ڕێکخستن و دابینکردنی خواردن و پێداویستی نەخۆشخانەکە بووە.**

**جگە لەو پزیشك و کارمەندانەی سەرەوە چەندین کادیر و پێشمەرگەی تر لە نەخۆشخانەی گشتی شۆڕشدا کاریان کردووە، وەك د. هەندرین شاوەیس، کە یەکێك بووە لە کارمەندەکانی تەندروستی، هەروەها دابان خان و سابات خان و گەشاو خان، وەکو کارمەند لە نەخۆشخانەکەدا کاریان کردووە، کە خزمەتێکی باشی نەخۆشخانەکەیان کردووە،**

هەروەها مەفرەزەیەکی پێشمەرگە ئاسایشی نەخۆشخانەیان لە ئەستۆ بووە، هەڤاڵ خدر خەلەکانی سەرپەرشتی کردوون، هەروەها چەند پێشمەرگەش کاروباری ناو نەخۆشخانەیان جێبەجێ کردووە، وەك: (بەختیار کەریم، جەمیل محەمەد ڕەشید، سادقی چریك و مینا خانی خێزانی).

دووەم: نەخۆشخانەی مەڵبەندی یەك

لە ناوچەی قەرەداغ بووە، لەلایەن دکتۆر فائق گوڵپی سەرپەرشتی کراوە، لەگەڵ دکتۆر ناسیح قەرەداغی، دکتۆر جەبار عەبدول نەریمان، دکتۆر جەلال عوسمان، دکتۆر ساجد، دکتۆر جووتیار و دکتۆر شوان بەڕێوە براوە. لەگەڵ کۆمەڵێك لە کارمەندانی تەندروستی کە هەندێکیان لە نەخۆشخانەی مەڵبەند بوون، هەندێکیش بە سەرتیپەکانی مەڵبەندەکە دابەش کرابوون.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٦ادا لە ڕۆژهەڵاتی گوندی بەلەکجاڕدا لە بناری شاخی قۆپی قەراغدا هەڤاڵ لالۆ عەبدولڕەحمان پێنجوێنی کە بەرپرسی بەشی خانووبەرەی مەڵبەندی یەك بووە، بینایەکی باشی بۆ نەخۆشخانە دروستکردووە، دوای تەواو بوون نەخۆشخانەکە لە گوندی سێوسێنانەوە گوێزراوەتەوە، چونکە ناوێکی تایبەتی نەبوو هەر بە شوێنی نەخۆشخانە ناوبانگی دەرکردووە، ئەو پزیشك و کارمەندانەی کاریان تێدا کردووە بریتی بوون لە:

١. دکتۆر حەسەن عەلی سەعید: دەرچووی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی موسڵ بووە، خەڵکی شاری هەڵەبجەیە، تەنها لە نەخۆشخانەی گوندی سێوسێنان کاری کردووە.
٢. دکتۆر ناسیح قەرەداغی: دەرچووی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی بەغداد بووە، دوای ئەوەی نەخۆشخانەکە گوازراوەتەوە بناری قۆپی قەراغ، پەیوەندی بە نەخۆشخانەکەوە کردووە.

٣. دکتۆر جەلال عوسمان: دەرچووی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەدین بووە، خەڵکی شاری سلێمانی بوو، دوای ئەوەی نەخۆشخانەکە گوێزراوەتەوە بناری قۆپی قەراغ پەیوەندی بە نەخۆشخانەکەوە کردووە.

٤. دکتۆر جەبار عەبدول نەریمان: دەرچووی کۆلێژی پزیشکی زانکۆی بەسرە بووە، خەڵکی شاری کەرکووك بووە، زۆربەی کات لە بنکەی تەندروستیی تیپی ٥٧ی سەگرمە لە گوندی مێوڵی ماوەتەوە، ئەو کاتەی نەخۆشخانەکە لە گوندی سێوسێنان بووە، پەیوەندی بە نەخۆشخانکەوە کردووە.

٥. دکتۆر ناجح محەمەد گوڵپی: دەرچووی کۆلێژی پزیشکی ڤێتێرنەری زانکۆی بەغداد بووە، وەك کارمەندی تەندروستی لە نەخۆشخانەکە کاری کردووە، لە ١٩٨٦ پەیوەندی بە نەخۆشخانەکەوە کردووە.

٦. دکتۆر مەحموود: دەرچووی کۆلێژی پزیشکی ڤێتێرنەری زانکۆی بەغداد بووە، خەڵکی شاری کەرکووك بووە، بە نەتەوە تورکمان و بە مەزهەب شیعە بووە، وەك کارمەندی تەندروستی لە نەخۆشخانەکە کاری کردووە.

٧. سەرکەوت زەکی: یاریدەدەری پزیشکی بووە، خەڵکی گوندی سێوسێنان بووە، وەك کارمەندی تەندروستی لە نەخۆشخانەکە کاری کردووە.

٨. جوتیار: ناوی ڕاستەقینەی فارس بووە، خەڵکی گوندی مۆریاس بووە، وەك کارمەندی تەندروستی لە نەخۆشخانەکە کاری کردووە.

٩. شوان: ناوی ڕاستەقینەی جەلال بووە، خەڵکی گوندی خاڵخالانی ناوچەی هەمەوەندی نزیك چەمچەماڵ بووە، یاریدەدەری پزیشك بووە، وەك کارمەندی تەندروستی لە نەخۆشخانەکە کاری کردووە.

١٠. ئیبراهیم محێدین عارف: یاریدەدەری پزیشکی بووە، نووسەر و ڕۆژنامەنووسیش بووە، وەك کارمەندی تەندروستی لە نەخۆشخانەکە کاری کردووە.

١١. بۆتان تاڵەبانی: برینپێچ بووە، خەڵکی شاری کەرکووك بووە، لە نەخۆشخانەی بەرگەڵوو لای دکتۆ سەردار تاڵەبانی پزیشکی ددان بۆ ماوەیەك کاری کردووە، لە ددانسازیدا ئەزموونی وەرگرتبوو، لە نەخۆشخانەی مەڵبەندی یەك بەرپرسی بەشی نەخۆشییەکانی ددان بووە، دواتر گەڕایەوە بۆ عێراق و لەلایەن هێزە سەرکوتکەرەکانی ڕژێمەوە ئەنفال کراوە، تا ئێستا چارەنووسی نازانرێت.

١٢. عوسمان: پێشمەرگە بووە، خەڵکی کەلار بوو، ئامادەیی تەواو کردووە، خولی فریاکەوتنی سەرەتایی پێشمەرگەی بینوە، وەك کارمەندی تەندروستی لە نەخۆشخانەکە کاری کردووە.

١٣. مام برایم: پێشمەرگەیەکی دێرینی ی.ن.ك بووە، خەڵکی نزیك شارۆچکەی دەربەندیخان بووە، بەرپرسی کارگێڕی نەخۆشخانەکە بووە، ماڵی لە گوندی سێوسێنان بووە.

١٤. ڕەحمان: پێشمەرگە بووە، بەرپرسی پاراستنی نەخۆشخانەکە بووە، خەڵکی ناوچەی قەرەداغ بووە.

١٥. بەسام: کوڕێکی گەنج بووە، خەڵکی شاری کەرکووك بووە، دەرچووی زانکۆ بووە، چەکداری فەوجە خەفیفەکان بووە، لە شەڕێکدا بە دیل گیراوە، لەبری زیندانی کراوە بە چێشتلێنەری نەخۆشخانە، لە کاتی ئەنفالدا شەوێك لە نزیك سەنگاو خۆی دزیوەتەوە و گەڕاوەتەوە بۆ ڕیزەکانی ڕژێم.

١٦. مام حەسەن: پێشمەرگەیەکی خەڵکی گوندی سێوسێنان بووە، کاری نانەوایی بۆ نەخۆشخانەکە کردووە، لە کارەساتی کیمیابارانی گوندی سێوسێناندا خێزان و منداڵەکانی هەموو شەهید بوون، خۆشی بریندار بووە.

١٧. عەلی حاجی عەبدوڵڵا: خەڵکی دەربەندیخان بووە لە ساڵی ١٩٨٧ پەیوەندی بە نەخۆشخانەکەوە کردووە، لە چێشتخانەی نەخۆشخانە کاری کردووە.

١٨. عادل: خەڵکی خانەقین بووە، پیشەی یاریدەدەری پزیشک بووە، تا ساڵی ١٩٨٧ لە نەخۆشخانەکە ماوەتەوە.

١٩. نەجم: خەڵکی خانەقین بووە، پیشەی یاریدەدەری پزیشک بووە، لە دوای ساڵی ١٩٨٧ کۆڵی لە پێشمەرگایەتیداوە و گەڕاوەتەوە بۆ خانەقین.

**سێیەم: نەخۆشخانەی مەڵبەندی دوو**

لە گوندی سەرگەڵوو کە تایبەت بە پێشمەرگەکانی مەڵبەندی دوو و تیپەکانی سەر بەو مەڵبەندە، دکتۆر حسێن حمەساڵح، دکتۆر محەمەد ئەمین غەفور، دکتۆر حەسەن عەلی هەڵەبجەیی و کۆمەڵێك کادیری پزیشکی تر کاریان تێدا کردووە.

**چوارەم: نەخۆشخانەی مەڵبەندی سێ**

لە سماقووڵی نزیك سەری ڕەش کە تایبەت بوو بە پێشمەرگەکانی مەڵبەند و تیپەکانی و هاووڵاتیانی سنووری ئەو مەڵبەندە، د. هەڤاڵ، د. جەلیل عەرەب و کۆمەڵێك کارمەندی پێشمەرگە سەرپەرشتیان کردووە.

**پێنجەم: نەخۆشخانەی مەڵبەندی چوار**

لە بالیسان دکتۆر زریان و هاوڕێکانی سەرپەرشتیان کردووە، کە ئەویش تایبەت بوو بە پێشمەرگەی تیپەکانی سەر بەو مەڵبەندە و هاووڵاتیانی ناوچەکە، کە یەکێك بوو لەو نەخۆشخانانەی کە توانایەکی بەرچاوی هەبووە لە خزمەت بە پێشمەرگە و هاووڵاتیان و زۆربەی بەشەکانی خزمەتگوزارییان هەبووە.

**شەشەم: نەخۆشخانەی مەڵبەندی بادینان**

پاش ئاسایی بوونەوەی پەیوەندیەکانی نێوانی ی.ن.ك لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان پ.د.ك و حیزبەکانی دیکەی بەرەی جود، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٧دا سەرکردایەتی ی،ن،ك داوای لە دەزگای تەندروستی کردووە، کە تیمێکی تەندروستی باش لە

دەرمـان و کەلوپـەلی پزیشـکی ئامـادە بکـات بـۆ ڕۆیشـتن بـەرەو بادینـان بـە سەرپەرشـتی شەهیدی ئازاد هەورامی و هەر بەگەیشتنیان نەخۆشـخانەی مەڵبەنـدی بادینـان کراوەتـەوە، کە شەهید دکتۆر هێمن ئەحمەد و هاوڕێکانی لەوانە: دکتۆر وریا عەرەب، دکتۆر ئیسماعیل، دکتۆر شەماڵ ئەحمەد سەرپەرشتیان کردووە، ڕۆڵێکی باشیان گێڕاوە، لە چالاکی پێشمەرگە و چارەسەرکردنیان و بە تایبەتی لـە کـاتی کیمیابـارانکردنی ناوچـەی بادینـان و بـە هانـاوە چوونی پێشمەرگەی گشت لایەنەکان بێ جیاوازی و دانیشتوانی ناوچەکە.

## تەوەری سێیەم: نەخۆشخانەکانی دیکە (لاوەکییەکان)

### یەکەم. بنکەی تەندروستیی گوندی یاخسەمەر

کە تایبەت بوو بە سکرتاریەتی هەڤاڵ مام جەلال و پێشمەرگەکانی ئەو سنوورە و هاووڵاتیان، دکتۆر شاڵاو سەرپەرشتی کردووە.

### دووەم. نەخۆشخانەی کانی زەرد

مزگەوتی کانی زەرد بوو، بەشێوەیەکی کاتی کرابووە نەخۆشخانەی شۆڕش، شەش دکتۆری بیانی، سێ کوڕ و سێ کچ لەگەڵ دکتۆر و برینپێچەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان (ح.د.ك) و نەخۆشخانەی شۆڕش چارەسەری بریندارەکانیان دەکرد، پێشمەرگە بریندارەکانی ئاڵوەتان و کونە مشکە دەگەیەنرانە نەخۆشخانەی کانی زەرد[٣].

### سێیەم. نەخۆشخانەی قوڵەهەرمێ

لە سەرەتادا نەخۆشخانەیەك بەناوی نەخۆشخانەی شۆڕش لە گوندی (قوڵەهەرمێ) لە بناری چیای مامەندەی سنووری عێراق–ئێران دروست دەکرێت، کە یەکێك بووە لە نەخۆشخانە سەرەکییەکانی ئەوکاتی شۆڕش و پیشمەرگایەتی و ڕۆڵێکی گەورە و کاریگەریان هەبووە لە چارەسەر و بەرزکردنەوەی ورەی پێشمەرگە، چەندین دکتۆر و کارمەندی تەندروستی و برینپێچ کاریان تێدا کردووە و خزمەتیان پێشکەش کردووە.

نەخۆشخانەکە لە چەند بەشێك پێکهاتبوو، وەك بەشی چارەسەری نەخۆش، بەشی برینپێچی، بەشی ددان، بەشی تیشك، بەشی تاقیگە و بەشی ڕەدهە بۆ مانەوە و بیمارکردنی بریندار و نەخۆش و حەسانەوەیان، جگە لەوەش بەشێك هەبووە بۆ پاراستنی نەخۆشخانە و خزمەتکردنی برینداران.

---

(٣)– ئازاد سەراوی: خاکپۆشەکان، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٩، ل٢٠٢.

له کۆتایی ساڵی ١٩٨٢دا بەهۆی هێرشەوە بۆ سنووری سەرکردایەتی ی.ن.ك له (ناوزەنگ، زەڵێ و شێنێ) و نزیکیی شوێنی بارەگاکانی ی.ن.ك له هێرشەکان و شەرگەکان، بەناچاری نەخۆشخانەی شۆڕشیش لە قوڵەهەرمێوە گوستراوەتەوە بۆ سەرشیو لە ناوچەی باوزێی سەر بە پشدەر، لەوێش بۆ ماوەیەکی کاتی ماوەتەوە، دیسان گوێزراوەتەوە بۆ ناوچەی شاوڕێ و پڵێنگان لە ناوچەی ئاکۆیان لە ڕانیە، پاش ڕاگەیاندنی گفتوگۆی نێوان ی.ن.ك و حکومەتی عێراق لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣دا نەخۆشخانەکە گوێزراوەتەوە بۆ بەرگەڵوو، پاشان بۆ سووررداش، تا کۆتایی گفتوگۆ لە سووررداش کاری کردووە.

**چوارەم. نەخۆشخانەی سووررداش**

پاش ئەوەی دەست بە گفتوگۆ کرا لەگەڵ حکومەتی عێراق، سەرکردایەتی ی.ن.ك، بڕیاریدا کە نەخۆشخانەیەك لە سووررداش بکرێتەوە، بە هاوکاری بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی سلێمانی و کۆمەڵێك پزیشك و کادیری تەندروستی دڵسۆز، بۆ ئەوەی پێشمەرگەی بریندار، یان نەخۆش نەچنە شارەکان بۆ چارەسەرکردن تا لەگەڵ جاش و چەکدارانی سەر بە حکومەت تووشی کێشە نەبن. ئەم نەخۆشخانەیە لە ماوەی گفتوگۆدا ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لە خزمەتکردن، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی کەوتە خۆڕێکخستنەوەی دامودەزگاکانی، بۆ ئەم مەبەستە یەکێك لە کارەکانی ڕێکخستنەوە و بەرەو پێش بردنی توانای زانستی و پراکتیکی کادیرانی تەندروستی بوو بە هەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستی سلێمانی، چەند دکتۆر و کارمەندێکی تەندروستی ڕەوانەی نەخۆشخانەکانی سلێمانی کران بۆ ڕاهێنان لەسەر نەشتەرگەری و بێهۆشی و چۆنیەتی ئامادەکردنی نەخۆش بۆ نەشتەرگەری و ئامادەکردنی ژووری نەشتەرگەری لەوانە: د. شوان محەمەد عەزیز ئاکرێی، د. فایەق گوڵپی، د.خالد، د. ئاکۆ و شەهید د. شێخ کامیل ـ دواتر دکتۆر کامیل لە کاتی گفتوگۆی ی.ن.ك و حکومەت لە شارۆچکەی دوکان شەهید کراوە ـ ئەم خولە بۆ ماوەی ٦ مانگ زیاتر بەردەوام بووە، لە بەشی نەشتەرگەرییەکان و ڕەدهەکان و فریاگوزاری، زۆرینەی دکتۆر و کارمەندەکانی

نەخۆشخانەکانی سلێمانی بە گیانێکی کوردانە و دڵسۆزانەوە هاوکاریی پزیشکانی شۆڕشیان کردووە، زانیاری زیاتریان پێ داون، کە تاکو کۆتایی گفتوگۆ بەردەوام بووە.

لە لایەکی ترەوە نەخۆشخانەی سووورداش لە ماوەی گفتوگۆدا لە کارکردن بەردەوام بووە، لەلایەن دکتۆرە پێشمەرگەوە بەڕێوەبراوە و تەندروستی سلێمانی هاوکاری کردوون، ڕۆژانە ژمارەیەکی بەرچاو لە نەخۆشی پێشمەرگە و هاووڵاتیان چارەسەر کراون، لەو چارەسەرانە: (نەخۆشییەکانی هەناوی، نەشتەرگەری، نەخۆشی ددان و نەخۆشی ژنان ...هتد)، هەروەها بەشەکانی تیشك و تاقیگە و دەرمانخانە و ڕەدهە بۆ مانەوەی نەخۆش تێدا بووە، هەفتەی دوو ڕۆژ پزیشکی نەشتەرگەریی پسپۆڕ و هەناوی لە سلێمانییەوە لەبەر سەلامەتی گیانی پێشمەرگە چوون بۆ سووورداش، ڕۆژێك پێش ئەوەی دکتۆرەکان بچن کەیسی نەخۆش ئامادە کراوە، تا نەشتەرگەریی، یان چارەسەری هەناوی، یان نەخۆشییەکانی چاویان بۆ بکرێت، هەندێکجار نەخۆشەکان بە نهێنی براونەتە سلێمانی بۆ نەشتەرگەری هەر ئەو ڕۆژە پاش نەشتەرگەری دەبوو بیانگەڕێننەوە بۆ نەخۆشخانەی سووورداش، لەوانە: هەڤاڵ حامیدی حاجی غالی نەشتەرگەری گورچیلەی بۆ کراوە، هەڤاڵ سابیر کۆکەیی نەشتەرگەری غودەی بۆ کراوە، هەر هەمان ڕۆژ هێنراونەتەوە بۆ سووورداش لە ترسی ئەوەی نەك جاش و چەکدارانی سەر بە ڕژێم دەستیان بیانگاتێ و زیانیان پێ بگەیەنن.

## پێنجەم. نەخۆشخانەی مەرگە

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٤ پەیوەندییەکانی ی.ن.ك و ڕژێم بەرەو خراپ بوون چوون، بۆیە بیر لەوە کرایەوە کە نەخۆشخانەی سووورداش بگوازرێتەوە بۆ گوندی مەرگە، ئیدی گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عێراقی کۆتایی هات، سەرکردایەتی دەیزانی کە ڕژێم دوای گفتوگۆ هێز و چەکی قورستر و جۆراوجۆر بەکاردەهێنێت، بۆیە بڕیاری ئەوەیاندا کە نەخۆشخانەیەکی شایستە بۆ ئەو سەردەمە بنیات بنرێت، کە شایستەی ڕۆڵی پێشمەرگە و چالاکیەکانیان و دانیشتوانی سنووری ناوچە ئازاد کراوەکان بێت.

هەر لە ماوەی ئەو چەند مانگەی کە ژوورێکی نەشتەرگەریی لە نەخۆشخانەی شۆڕش لە سوورداش پێکهێنرا بوو، هەموو کەلوپەلەکانی لەلایەن بەڕێوەبەرێتی گشتی تەندروستی سلێمانییەوە بۆ دابین کرابوو، کە لە دوای پچڕانی گفتوگۆی ی.ن.ك و ڕژێم، سوودێکی زۆر لەو خولە بینراوە، گوازراوەتەوە بۆ مەرگە و دواتریش بۆ نەخۆشخانەی گشتی شۆڕش لە بەرگەڵوو، هەتا ئەنفالی یەك کاری پێکراوە.

دکتـۆر شـوان ئـاکرەیی وەك لێپرسـراوی دەزگـای تەندروسـتی کوردسـتان دەسـت نیشانکراوە لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوە سەرپەرشتی دەزگاکەی پێ سپێردراوە، بۆیـە ئـەو پێشـنیاری گواسـتەوەی کەلوپـەلی نەخۆشـخانەی سـوورداش بـۆ مەرگـە کـردووە، کـە چـیتر نەتوانراوە لە سوورداش بەردەوام بین، بۆ ئەو مەبەستەش د. خالید و د. ئاکۆ ڕاسپێردراون کە ئـە و کاتـە لـە مەرگـە بـوون، بچن کەلوپـەلی نـاو نەخۆشـخانەی سوورداش بـە تایبـەتی ژووری نەشتەرگەری بهێنن بۆ گوندی مەرگە، کە ناوچەیەکی دوورەدەسـت و سـەخت بـووە، بەئاسانی ڕژێمی بـەعس دەسـتی پـێ نەگەیشـتووە، بـۆ ڕۆژی دواتـر چوونەتەوە سـوورداش، هەموو ئامێر و دەرمان و کەلوپەلی ژووری نەشتەر گەری کە پێویست بووە بە ئۆتۆمبێلێکی پیکـاپی ٢ تـەنی گواسـتراوەتەوە، هـەڤاڵ مـولازم عومـەر کـە ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی و لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری بووە، لەگەڵ بەشێك لە پێشمەرگەکانی دەستەکەی بۆ کاری تایبەت بە خۆیان لە سوورداش بوون ئاگاداری ئەوەش بوون کە کەلوپەلە پزیشـکییەکان بـۆ مەرگە دەگوازرێنەوە، ئەو کەلوپەل و دەرمانانە لەو ڕۆژەدا گواستنەوەی دەرمان و کەلوپەلی پزیشکی زۆر مەترسیدار بووە، دەبوو لە بازگەی حکومەتەوە دەربازببێت، چونکە ئەگەر لـە بازگەکە پشکنین هەبووایە، لێکۆڵینەوە بکرایە ئەوا دەربازبوون زۆر ئەسـتەم بـووە، چـونکە بردنی دەرمان بۆ ناوچـەی ئـازادکراو نایاسـایی بـووە، لـەو کاتـەدا حـوکمی زۆر قـورس بـوو، هەڤاڵ بەهادینی حەلیم لێپرسراوی دەستەکە بووە ئەو فـەرمانی کەوتنـە ڕێـی دەرکـردووە، بەرەو شارۆچکەی دوکـان ڕۆیشـتوون کـە گەیشـتوون بـە زاڵگەکـە، یـەکێك لـە ئینزیباتـەکان چووتە پێشی ئۆتومبێلەکـە و ئامـاژەی وەسـتانی بـۆ کـردوون، کـە لا بـدەن بـۆ سـەیرکردنی بارەکە و پشکنینی، کە شتەکانی بینیوە زۆر سەری سڕماوە، نیازی هـەبووە دایانگرێـت، لـەو کاتـەدا ئۆتۆمبێلـەکانی هـەڤاڵ مـولازم عومـەر هـاتوون، ئامـاژەی بـۆ کـردوون دانەبـەزن،

ئـەوانیش بـە شـۆفێرەکەیان گووتـوە زوو دەرچـۆ بـا تووشـی کێشـەمان نەکـەن، ئیـدی شۆفێرەکەش گوێی بە سەربازەکان نەداوە و دەرچوون لە شاخی قەرەسردەوە ئـاودیو بـوون، ئیتر ڕانەگیراون تاکو شارەدێی بنگرد و بە سەلامەتی گەیشتوونەتە مەرگە

شوێنەکەی لە بناری چیای ئاسۆس لە سنووری ڕانیە بووە، کە بنکەیەکی ڕێکوپێك لـە بەرد و کۆنکرێتی لێ دروستکرابوو لەگەڵ خانووی تایبەت بۆ ستافی نەخۆشـخانەکە تـوانرا بۆ ماوەیەکیش لەوێ کاربکرێت، تا کۆتایی شەڕی دابان هەلاج لەوێ بەردەوام بووە.

**شەشەم. نەخۆشخانەی سێروان**

بـەهۆی هێرشـی فڕۆکـەوە تۆپـە دوورهاوێـژەکانی حکومـەتی عێـراق ئـیتر نـەتوانراوە نەخۆشـخانەی مەرگـە لـە شـوێنێکی وا کـراوە و دیـاردا کاربکرێـت، بۆیـە بەناچـاری بنکـەی نەخۆشـخانە براوەتـە گونـدەکانی (کـانی تـوو و سـێروان) کـە ناوچـەیەکی سـەخت بـووە لـە ڕووی سـەربازییەوە، هـەروەها چارەسـەری برینـداری لێکـراوە، لـەو بریندارانـەش: (شـەهید عەبـدولڕەحیم سەنگەسـەری سـەرتیپی ٤٣ی ئاسـۆس و هـەڤاڵ حەمـەی فـەرەج ئەنـدامی مەکتەبی عەسکەری و شەهید ئازادی ئەحمەد بەگ و حسین جنوبی و عمر قامیشی).

ناوچـەی مەرگـە کـە تایبـەت بـوو بـەو پێشـمەرگانەی چالاکیان لـەو سنووره هـەبووە، هەروەها ئەو هاووڵاتیانەی لەو سنووره نیشتەجیی بوون، چونکە تا ڕادەیەك دوورەدەست و سەخت بوو بۆ زستان، د. شێرکۆ حەسەن ژاراوەیی سەرپەرشتی کـردووە، هەنـدێك جـاریش لە بەرگەڵووەوە لە کاتی پێویستیدا، دکتۆرەکان چوونەتە ئەوێ بۆ کارکردن.

**حەوتەم. نەخۆشخانەی سوورقاوشان**

سوورقاوشان چەمێکە دەکەوێتە پشتی گوندی عەسکەر و گوندی تەلان لە شوێنێکی تەنگەبەری و دارستاندایە، لە خواروویدا چەمی دوو ئاوان هەیە، دەکەوێتە خوارووی چەمی ڕەزانەوە پێشی گوتراوە چەمی هەناران، پشتی شاخێکی زۆر بەرزە، شوێنێکی پارێزراو و دلگیرە، نەخۆشخانەیەکیان لێ دامەزراندووە، دوو ژوور بووە، ژوورێك بۆ تەداوی و برینپێچی، ژوورەکەی دیکە بۆ خەو تەرخانکراوە، ڕێگای ئۆتۆمبێلی نەبووە، بە پێ، یان بە سواری ولاّخ توانراوە بگەنە ئەوێ.

بەهۆی فراوانی ناوچەی مەلّبەندی دوو چالاکی پێشمەرگە لە چەمی سوورقاوشان بنکەیەکی تەندروستی هەبوو بۆ چارەسەرکردن و تیمارکردنی پێشمەرگە و هاولاّتی ناوچەکە کە دکتۆر تاریق (د.دلّشاد) و شەهید دکتۆر هادی سەرپەرشتیان کردووە، هەروەها کۆمەلّێك کارمەندی تەندروستی لە تیپ و کەرتەکان کاریان تێدا کردووە، لەوانە: شەهید دکتۆر حەمید بارام، شەهید دکتۆر کامەران عەلی، دکتۆر نەوزاد و دکتۆر سەردار.

**جگە لەمانەش چەند نەخۆشخانەیەکی دیکە بوونیان هەبووە لەوانە:**

١. نەخۆشخانەی ناوزەنگ
٢. نەخۆشخانەی گوندی گۆپتەپە
٣. نەخۆشخانەی گوندی خەتێ
٤. نەخۆشخانەی ئەشکەوتی گوندی مەلەکان
٥. نەخۆشخانەکەی دکتۆر هادی لە گوندی مۆردخواردەی بناری خالّخالاّن.

## تەوەری چوارەم: پزیشکی تیپ

تیپەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، پزیشك و یاریدەدەری پزیشك و برینپێچیان هەبووە، پزیشکەکانی تیپ زیاتر یاریدەدەری پزیشك بوون، بەلام لە سنووری خۆیاندا جێگەی پزیشکیان گرتووەتەوە.

دەزگای تەندروستیی پێشمەرگە هاوشانی دەزگاکانی دیکەی (ی.ن.ك) دامەزرا بوو، خزمەتی گەورەی بە هێزی پێشمەرگەی کوردستان کردبوو، دێهاتەکانی سنووری ناوچە ئازادکراوەکانیش وەکو هێزی پێشمەرگە سوودی زۆریان لە نەخۆشخانە و دەزگا تەندروستییەکانی شۆڕش بینیوە، لە سنووری تیپەکانیش بەهەمان شێوە، جگە لە چارەسەر و سارێژکردنی برینەکانی پێشمەرگە، چارەسەری هاوولاتیشیان لە ئەستۆ گرتووە.

نەخۆشخانەکانی شۆڕش توانای نەشتەرگەری و هەندێك چارەسەری دیکەیان هەبوو، پێداویستییەکانی نەخۆشخانەش، دەرمان و دەرزی و پێداویستی دیکە لەلایەن ڕێکخستنەکان، دۆستەکانی شۆڕشەوە دابین کراوە، یان کڕدراوە، هەندێك جاریش پێشمەرگە دەستییان بە سەر بنکەیەکی تەندروستی، یان کۆگایەکی دەرماندا گرتووە و گواستوویانەتەوە بۆ نەخۆشخانەکانی شۆڕش.

نەخۆشخانەی گشتی شۆڕش، یان نەخۆشخانەی مەڵبەندەکان نەیاندەتوانی پێداویستییە پزیشکییەکان بۆ تیپەکانی پێشمەرگە، یان دکتۆری تیپەکان دابین بکەن، ئەگەر هەشبووایە کەم و دیاریکراو بوو، بۆیە تیپەکان لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی شارەوە، یان لە ڕێگەی پەیوەندییەکانی تیپەوە، پێداویستی پزیشکییان لە دەرزی و لەفاف و حەبەوە دابین کردووە[٤].

---

[٤]- ئازاد سەراوی: خاکپۆشەکان، چاپخانەی کارۆ، سلێمانی، ٢٠١٩، ل٣٠٢-٣٠٣.

## بەشی دووەم: دەزگای تەندروستیی کوردستان و ڕێکخراوی فریاکەوتنی کوردستان

### تەوەری یەکەم: دەزگای تەندروستیی کوردستان
### Kurdistan Health Foundation (KHF)

### تەوەری دووەم: قۆناغەکانی کارکردنی دەزگای تەندروستیی کوردستان

١. قۆناغی مەفرەزە سەرەتاییەکان ١٩٧٦–١٩٨٣

٢. قۆناغی گفتوگۆی شۆڕش لەگەڵ حکومەتی عێراق

٣. قۆناغی دوای گفتوگۆ و دامەزراندنی دەزگای تەندروستیی کوردستان (KHF)

٤. کۆمەڵەی فریاکەوتنی کوردستان (KRA) - Kurdistan Relief Association

٥. قۆناغی دوای ئەنفال (سنوور و ئۆردوگاکانی ئێران)

٦. قۆناغی ڕاپەڕینی گەلی کوردستان ١٩٩١

٧. پێکهاتەی دەزگای تەندروستیی کوردستان

٨. کار و چالاکییەکانی دەزگای تەندروستیی کوردستان

٩. ناوی پزیشك و کارمەندانی دەزگای تەندروستیی کوردستان

## تەوەری یەکەم: دەزگای تەندروستیی کوردستان
## Kurdistan Health Foundation (KHF)

دامەزراوەیەکی تەندروستیی بووە، ساڵی ١٩٨٤ لە چوارچێوەی ڕێکخستنەوەی دامودەزگاکانی ی.ن.ك دامەزراوە، لەو ساڵەدا لیژنەیەکی کارگێڕی بەلێپرسراوێتی هەڤاڵ خەسرەو خاڵ بۆ ڕێکخستنەوە و سەرپەرشتیکردنی دامەزراوەکان دامەزرا، لەم چوارچێوەیەدا بەشێك بەناوی بەشی تەندروستی دامەزرا و لێپرسراوێتییەکەی بە دکتۆر یوسف محەمەد عەزیز ناسراوە بە دکتۆر شوان سپێردرا، ئامانجی بەشەکە سەرپەرشتیکردنی دامودەزگا تەندروستییەکان و دابینکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی بووە بۆ هێزی پێشمەرگە و دانیشتوانی ناوچەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی حکومەتی عێراق.

تا ئەو کاتە هیچ دەزگایەکی تایبەتمەند بۆ سەرپەرشتیکردنی دامەزراوە تەندروستییەکان نەبووە، بۆیە پێکهێنانی دەزگاکە لە ڕووی کارگێڕییەوە، هەنگاوێکی پێویست بووە بۆ ڕێکخستنی کاروباری تەندروستی و کۆکردنەوەی هەموو تیمارگە و نەخۆشخانەکان، لەگەڵ دروستکردنی ناوەندێکی کارگێڕی بۆ پزیشکانی شۆڕش، کە لە مەڵبەندەکان و لە ناو هێزی پێشمەرگەدا خزمەتیان دەکرد.

دوا بە دوای پێکهێنانی دەزگاکە، بەرنامەیەك بۆ پێداچوونەوەی شێوەی دابەشبوونی کادیرە پزیشکییەکان دانراوە، بە پێی بەرنامەکە کادیرەکان بەشێوەیەکی گونجاو بە سەر چوار مەڵبەندەکەدا دابەشکراون و بڕیاردراوە لە هەر مەڵبەندێکدا نەخۆشخانەیەك دابمەزرێت، نەخۆشخانەی بەرگەلوو، لە دۆڵی جافەتی بە نەخۆشخانەی ناوەندی دانراوە، بەپێی نەخشەکە بۆ هەر نەخۆشخانەیەك کادیری پزیشکی پێویست دابین کرا و هەروەها بەپێی توانا تیمی سڕکردن و نەشتەرگەری، ڕادیۆلۆژی، تاقیگە، دانسازی، دەرمانخانە و قاوشی مانەوەی نەخۆش دابین کرا، بەپێی بەرنامەکە، کارێکی وا کراوە هەر تیپێك کادیری پزیشکی خۆی هەبێت[٥].

---

[٥]– ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان: چ٤، ب١، س.پ، ل٨١٥.

دەزگاکە لە ١٩٨٥/٤/٢٤ دامەزراوە، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی باشتر لە دەزگای تەندروستی کوردستان بگەین پێویستە بواری تەندروستی لە خەباتی شۆڕشی نوێدا دابەش بکەین بۆ دوو قۆناغ.

## تەوەری دووەم: قۆناغەکانی کارکردنی دەزگای تەندروستیی کوردستان

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە و تێگەیشتن لە سەرەتای دروستبوون و خەباتی دەزگای تەندروستی کوردستان لە شاخ، پێویستە بەپێی مێژوو ئەرك و شێوازی کارکردنی بە سەر چەند قۆناغێکدا دابەش بکەین ئەوانیش:

### ١. قۆناغی مەفرەزە سەرەتاییەکان ١٩٧٦–١٩٨٣

هەلگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێ بەڕابەرایەتی ی.ن.ك لە سەرەتادا لە چەند مەفرەزەیەکی پێشمەرگە پێکهاتبوو، کە ئەرکی سەرەکییان ئەوە بووە بانگەوازی هەلگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێ بە گوێی هاووڵاتیانی شار و گوندەکانی کوردستاندا بدرێت، هەر لە سەرەتاوە لەبەر پێویستی زۆر بە چارەسەرکردن و برینپێچی پێشمەرگە لە کاتی برینداری و نەخۆشی، ژمارەیەك لە پزیشك و کارمەندی تەندروستی پەیوەندی بە شۆڕشەوە دەکەن، ڕۆڵی باشیان دەبێت لە خزمەتکردن و جێبەجێکردنی ئەرکیاندا، جگە لە کاری پزیشکی کاری سیاسی و سەربازیشیان کردووە.

سەرکردایەتی شۆڕش یەکێك لەو دەزگایانەی کە گرنگیان پێ داوە، تەندروستی بووە، کە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆش و برینداری پێشمەرگە و ئەو گوندنشینانەی تریش کە لە ناوچە ئازادکراوەکاندا دوور لە دەستی ڕژێم عێراقی ژیاون، بۆیە بڕیار دراوە بە دروستکردنی نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی لە سنووری سەرکردایەتی ی.ن.ك و ناوچە ئازادکراوەکانی دیکەدا.

لە دوای هەلگیرسانی جەنگی نێوان عێراق–ئێران لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٨٠، حکوومەتی عێراق بەشیکی زۆری هێزە سەربازییەکانی لە کوردستان بۆ بەرەکانی شەڕ کشاندەوە، بە تایبەتی بۆ باشووری عێراق، ناوچەیەکی فراوانی لە هێزە سەربازییەکان چۆڵ کرد، تەنها لە شوێنە ستراتیجی و شاخە بەرزەکان سەربازی هێشتبووەوە، بۆیە سەرکردایەتی شۆڕش بیری لە جێگیرکردن و فراوانکردنی بارەگا و دەزگاکانی تری کردووەتەوە بۆ حەوانەوەی پێشمەرگە و ئەندامانی سەرکردایەتی و بەڕێوەبردنی کارەکانیان بەشێوەیەکی چالاك و باشتر لە جاران.

له ساڵی ١٩٨٢دا سەرکردایەتی ی.ن.ك بڕیاریدا ناوچەکانی سنووری دەسەڵاتی بۆ چوار مەڵبەند دابەش بکات و هەریەکەیان سنووری دەسەڵاتی سیاسیی و سەربازیی و دارایی بۆ دیاری کراوە. لە هەر مەڵبەندێکدا هەوڵی کردنەوەی نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی داوە، بە تایبەتی لە سنووری کەرکووك و گەرمیان و خوشناوەتی و قەرەداغ و شارباژێرو شارەزوور دواتریش بادینان، بۆ هەر مەڵبەندێکیش چەند دکتۆر و کارمەندێکی تەندروستی دەستنیشان کردووە، هەندێك کەرەسە و ئامراز و ئامێریی سەرەتایی کە بۆ ئەو سەردەمەی شۆڕش باش بووە دابین کردووە، جا، یان کڕدراون، یان بەهیمەتی ڕێکخستنەکانی ناوشار دابین کراون، یان هەندێك جاریش لە ئەنجامی چالاکیەکانی پێشمەرگەدا دەستکەوتوون و کاریان پێکراوە و خزمەتێکی بەرچاویان بە پێشمەرگە و دانیشتوانی ناوچەکە گەیاندووە، ئەمەش بووەتە وەرچەرخانێك لە پێشکەوتنی شۆڕشی گەلی کوردستاندا.

### ٢. قۆناغی گفتوگۆی شۆڕش لەگەڵ حکومەتی عێراق

پاش ئەوەی دەست بە گفتوگۆ کرا لەگەڵ حکومەتی عێراق، سەرکردایەتی ی.ن.ك، بڕیاریدا کە نەخۆشخانەیەك لە سووردا ش بکرێتەوە، لە ماوەی گفتوگۆدا ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لە خزمەتکردن، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی کەوتە خۆڕێکخستنەوەی دامودەزگاکانی، بۆ ئەم مەبەستە یەکێك لە کارەکانی ڕێکخستنەوە و بەرەو پێش بردنی توانای زانستی و پراکتیکی کادیرانی تەندروستی بوو بەهەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی گشتی تەندروستی سلێمانی، چەند دکتۆر و کارمەندێکی تەندروستی ڕەوانەی نەخۆشخانەکانی سلێمانی کران بۆ ڕاهێنان لەسەر نەشتەرگەری و بێهۆشی و چۆنیەتی ئامادەکردنی نەخۆش بۆ نەشتەرگەری و ئامادەکردنی ژووری نەشتەرگەری لەوانە: د. شوان محەمەد عەزیز ئاکرێی، د. فایەق گوڵپی، د.خالد، د. ئاکۆ و شەهید د. شێخ کامیل ــ دواتر دکتۆر کامیل لە کاتی گفتوگۆی ی.ن.ك و حکومەت لە شارۆچکەی دوکان شەهید کراوە ــ ئەم خولە بۆ ماوەی ٦ مانگ زیاتر بەردەوام بووە، لە بەشی نەشتەرگەرییەکان و ڕەدهەکان و فریاگوزاری، زۆرینەی دکتۆر و کارمەندەکانی نەخۆشخانەکانی سلێمانی بەگیانێکی

کوردانە و دڵسۆزانەوە هاوکاریی پزیشکانی شۆڕشیان کردووە، زانیاری زیاتریان پێ داون، کە تاکو کۆتایی گفتوگۆ بەردەوام بووە.

### ٣. قۆناغی دوای گفتوگۆ و دامەزراندنی دەزگای تەندروستیی کوردستان (KHF)

پاش ئەوەی حکومەتی عێراقی و ی.ن.ك لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣دا بەبڕیارێك ئاگربەستیان لە کوردستان ڕاگەیاند، کەوتنە گفتوگۆ بۆ چارەسەری کێشەکانی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق و دانانان بە مافە ڕەواکانی گەلی کوردستان، هەلێکی باش بوو بۆ ی.ن.ك کە بتوانێت ناوماڵی خۆی زیاتر ڕێك بخات و کار بۆ بەدەزگاییکردنی ئۆرگانەکانی و دەستنیشانکردنی ئەرك و دەسەڵاتەکان بکات، تاکو بتوانێت بەشێوەیەکی گونجاو کاروبارەکانی خۆی ڕاپەڕێنیت و ئەرك و لێپرسراوێتی دیاری بکات.

لە دوای ئاگربەست، ی.ن.ك کەوتە خۆڕێکخستنەوە و پەرەدان بە دامودەزگاکانی بۆ ئەم مەبەستەش ئیدارەی گشتی دامەزراند، کە چەند دەزگایەکی کارگێڕی لە خۆی دەگرت و هەڤاڵ د. خەسرەو خاڵ سەرپەرشتی دەکرد، یەکێك لەو دەزگایانەی کە قەوارەی تایبەتی بۆ دیاری کرا بەشی (تەندروستی) بوو، بە ناوی (دەزگای تەندروستیی کوردستان) بۆ پێشمەرگە، کە هەڤاڵ مام جەلال لە کۆبوونەوەیەکی فراواندا (تەندروستیی پێشمەرگەی بە یەکێك لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی شۆڕشی نوێ ناو بردووە و ڕای گەیاندووە: **"شۆڕش بەبێ هەندێك ناوەند و دەزگا ڕەنگە ئەنجام بدرێت، بەڵام هەرگیز بەبێ ناوەندی تەندروستی و چارەسەرکردن ئەنجام نادرێت"**، هەربۆیە لەو ڕۆژەدا دکتۆر شوان ئاکرێیی ڕاسپارد کە بە ڕاوێژ لەگەڵ دکتۆر و کارمەندانی تەندروستی تردا ئەم ئەرکە بگرنە ئەستۆ و هەیکەلێکی ڕێکوپێك بۆ دەزگای تەندروستی دابڕێژن، کە بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ هەلومەرجی جوگرافیای ئەوکاتی شۆڕش بگونجێت و کە بە سەر چوار مەڵبەندی پێشمەرگەدا دابەش بووبوو.

پاش ڕاوێژ و گفتوگۆیەکی چڕوپڕ لەگەڵ زۆربەی دکتۆر و کارمەندانی تەندروستی لە ١٩٨٥/٤/٢٤ لە گوندی مەرگە بڕیاری دامەزراندنی (دەزگای تەندروستی کوردستان) درا، کە ئەرکی سەرەکی دەزگاکە ڕێکخستنەوەی هەموو نەخۆشخانە و بنکە تەندروستیەکان و پزیشك و کارمەندەکانی بوو، دابینکردنی دەرمان و کەلوپەلی پزیشکی و دارایی پێویست بۆ ڕاییکردنی کارەکان و ژیانی کارمەندەکانی.

لە دوای سەرکەوتنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە داستانی (دابان–هەلاج)ی ١٩٨٥/٢/١٥ کە سەرەتای دەستپێکردنەوەی شەڕی نێوان پێشمەرگە و ڕژێمی بەعس بوو دوای گفتوگۆ، دەزگای تەندروستی و نەخۆشخانە تاکو پایزی ١٩٨٥ لە ناوچەی مەرگە و کانی توو و سێروان ماوەتەوە، پاشان سەرکردایەتی بڕیاریدا کە نەخۆشخانەیەکی گەورە لە بەرگەڵوو دروست بکرێت و هەموو بەشەکان لە خۆی بگرێت، وەك لە پێشتردا ئاماژەی پێ کراوە.

## ٤. کۆمەڵەی فریاکەوتنی کوردستان (KRA) - Kurdistan Relief Association

ڕێکخراوێکی فریاگوزارە لە ساڵی ١٩٨٦، یوسف محەمەد عەزیز ناسراو بە دکتۆر شوان دایمەزراندووە، هەلومەرجی دامەزراندنی ڕێکخراوەکە زۆرتر پەیوەندی بە هەلومەرجی پەرەسەندنی جەنگی کیمیایی و وێرانکردنی گوندەکان و مەینەتییەکانی جەنگی عێراق – ئێرانەوە هەیە، ڕێکخراوەکە لەسەر داوای دکتۆ کەمال فوئاد دامەزراوە، کە لە ئەڵمانیاوە لە پەیوەندییەکانیدا لەگەڵ دامودەزگاکانی ناو وڵات پێشنیاری کردبوو، ڕێکخراوێکی فریاگوزاری هاوشێوەی ڕێکخراوە ناحکومییەکانی جیهان لە ناو وڵات بۆ فریاکەوتنی لێقەوماوانی جەنگ و ئاوارەکان و بریندارەکان پێك بهێنرێ.

بەم پێیە، یوسف محەمەد عەزیز وەك دامەزرێنەری دامەزراندنی ڕێکخراوە پێشنیارکراوەکە، بەهاوکاری چەند هاوڕێیەکی، دابینکردنی پێداویستییەکانی دامەزراندنی ڕێکخراوەکەی گرتە ئەستۆ، دەستەی دامەزرێنەری ڕێکخراوەکە لە ٢٠ ئەندام پێکهاتبوو، کە بە سەر ١٧ کادیری پزیشکی و ٣ کادیری ڕێکخراوەییدا دابەش بووبوون. پرۆگرامێك بۆ ڕێکخستنی شێوەی بەڕێوەچوون و دیاریکردنی سێکتەرە مرۆیی و فریاگوزارییەکانی

ڕێکخراوەکە بە زمانی کوردی و ئینگلیزی ئامادە کرا و دواتر دامەزراندنی ڕێکخراوەکە ڕاگەیەندرا.

لە دەرەوەی وڵات دکتۆر کەمال فوئاد و کادیرە نیشتەجێبووەکانی ئەوروپا ڕۆڵێکی کارایان لە دروستکردنی ڕایەڵەی پەیوەندی لە نێوان ڕێکخراوە تازە دامەزراوەکە و ڕێکخراوە ناحکومییەکانی ئەوروپادا گێڕا. لە ئاکامی ئەم چالاکییانەدا ڕێکخراوە ناحکومییە کاراکانی ئەوروپا، پاش ئەوەی لە بارودۆخی مرۆڤانەی کوردستان ئاگادار کرانەوە دەستیان بەناردنی تیمەکانیان بۆ کوردستان کرد، لەو سەروبەندەدا ئەو ڕێکخراوانە لە ناوخۆی وڵاتدا پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ K.R.A دامەزراند و سەردانی ئۆردوگاکانی ئاوارەکانی کوردی عێراقیان کرد لە ئێران. ئەم سەردانانە یارمەتیدەر بوون بۆ گەڵاڵەکردنی تێڕوانینێکی ڕوون و ڕۆشن سەبارەت بە مەسەلەی کورد و مەینەتی ئاوارەکانی و پێداویستی دابینکردنی بڕێکی پێویستی کۆمەك و بار بوو بۆ لێقەوماوەکان.

لەو قۆناغەدا لە ڕێگای ڕێکخراوی K.R.A بڕێکی بەرچاوی کۆمەك لە دەرمان و ئامرازی پزیشکی ماسکی کیمیایی گەیشتە کوردستان. ژمارەیەکی زۆری ڕێکخراوە ناحکومییە فریاگوزارە جیهانییەکان بە پیر هەوڵ و کۆششی K.R.A هاتن و کۆمەکیان نارد. ئەوە خۆی لە خۆیدا کەشێکی باشی بۆ ئەوە پێکهێنا کە ڕێکخراوەکە پەیوەندی بەهێز لەگەڵ چەندەها ڕێکخراوی ناحکومیی فریاگوزردا دروست بکات لە سەرانسەری جیهان لەوانە: ڕێکخراوەکانی میدکۆ ئینتەر ناسیۆنالی ئەڵمانی، خاچی سووری سویدی، خاچی سووری نەرویژی، خاچی سووری ئەڵمانی.

لە سەرەتادا ڕێکخراوەکان زۆرتر هاوکاری پزیشکییان پێشکەش دەکرد، بەلام لە قۆناغەکانی دواتردا هاوکارییەکان پەرەیان پێ درا و زۆر کەرەستەی دیکەیان گرتەوە، کە بۆ ژیانی ئاوارەکان بایەخێکی تایبەتیان هەبوو، وەك خۆراك و پۆشاك.

چالاکییە فریاگوزارییەکانی ڕێکخراوی K.R.A کەلێنێکی گەورەی پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکانی کوردییان پڕ کردەوە، چونکە تا ئەوکاتە دەوڵەتان نەیاندەویست پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ کورددا دروست بکەن، بە تایبەتی کە تا ئەو کاتە تیۆری (پیرۆزی سنوور)

هێـز و پتـەوی خـۆی لـە دەسـت نـەدابوو. لـەم ڕووەوە دەرفـەتێکی زۆر لـە ئارادایـە، کـە هەڵسەنگاندنێکی ئەرێنی بۆ چالاکییەکانی ڕێکخراوەکە لەو هەلومەرجەدا بکرێت، ئەویش لەو گۆشەنیگایەوە کە ڕێکخراوەکە وەك تاکە ڕێکخراوی ناحکومی فریاگوزاری لـە دەروازەی مرۆڤایەتییەوە ڕۆڵێکی کارای لـە ناساندنی پـرس و نەهامـەتی کـورد و پەرەپێدانی کاری دیپلۆماتیدا گێڕاوە، بە تایبەتی کە هەندێك لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر، بەیارمـەتی و هانـدانی ڕێکخـراوی میـدکۆ ئینتەرناسـیۆنالی ئـەڵمانی، ئـەو هەلـەیان بـۆ ڕەخسێنرا، کـە کـۆنفرانس لـە دەرەوەی وڵات بـۆ ڕوونکردنـەوەی ڕەوشـی کوردسـتان و ژیـانی ئاوارەکـان ببەستن.

تا ساڵی ١٩٨٩ ڕێکخراوی K.R.A وەك ڕێکخراوێکی فریاگوزاریی سـەر بـە ی.ن.ك کاری کـردووە. لـە سـاڵی ١٩٨٩دا لەسـەر داوای هـەڤاڵ مـام جـەلال، ڕێکخراوەکـە بـە جۆرێـك ڕێکخرایەوە، کە ببێتـە ڕێکخراوێکـی ژێـر چاودێری بـەرەی کوردسـتانی و لـەم سـۆنگەیەوە بڕیار درا هەر حیزبێکی ئەندامی بەرە نوێنـەری لـە دەسـتەی بـەڕێوەبردنی ڕێکخراوەکـەدا هەبێت، بەڵام سەرۆکایەتی ڕێکخراوەکە هـەر بـۆ ی.ن.ك هێڵدرایـەوە. لە چوارچێوەی ئـەو گۆڕانکارییەی کە بە سـەر ڕێکخراوەکـەدا هـات، د. یوسـف محەمـەد عـەزیز وەك لێپرسـراوی ڕێکخراوەکە دەستبەرداری پۆسـتەکەی بـوو، د. ئـەدیب محەمـەد عـەلی ناسـراو بـە د. هـەڵۆ شوێنی گرتەوە. هەر ئـەو ساڵە عەبدولکـەریم حـاجی کرایـە لێپرسـراوی ڕێکخراوەکـە و تـا دوای ڕاپەڕین ڕێکخراوەکەی بەڕێوە بردووە، بەڵام پاش ئـەوەی لـە سـاڵی ١٩٩٢دا بەئەنـدامی پەرلـەمانی کوردسـتان هەڵبـژێردراوە، هـەڤاڵ شـالاو عـەلی عەسـکەری شوێنی گرتووەتـەوە. سـاڵی ١٩٩٤ عەبدولکـەریم حـاجی وازی لـە ئەنـدامێتی پەرلـەمان هێنـا و بـووە پارێزگـاری کەرکووك لە دەربەندیخان. لەم سەروبەندەدا هەڤاڵ شالاو عـەلی عەسـکەری بـووە ئەنـدامی پەرلـەمان و وازی لـە لێپرسـراوێتی ڕێکخراوەکـە هێنـا. بۆیـە هـەڤاڵ ئەحمـەد کاکـە حەمـە مسـتەفا ناسـراو بـە هۆشمەنـد شـوێنی گرتـەوە و بـوو بـە پێنجـەم و دوایـن لێپرسـروای ڕێکخراوەکە.

ڕێکخراوەکە تـا ساڵی ١٩٩٦ لەسـەر ئەرکـەکانی خـۆی بـەردەوام بـوو. لە مـاوەی سـاڵانی ١٩٨٦–١٩٩١دا ڕێکخراوەکە چالاکییە فریاگوزارییەکانی بۆ لێقەوماوانی ناوچەکانی شەڕی سەر

سنوور و ئاواره کورده عێراقییەکانی نیشتەجێی ئێران تەرخان کردووە، بەڵام لە ساڵی ١٩٩١دا سەنتەری چالاکییەکانی بۆ کوردستانی باشوور گواستەوە و خزمەتگوزارییەکی زۆری پێشکەش بە چینە دەست کورت و هەژارەکان کرد، کە بە هۆی سزا نێودەوڵەتییە سەپێنراوەکانی سەر عێراقەوە زیانێکی نالەباریان بە سەر دەبرد. لە هەردوو قۆناغدا ڕێکخراوەکە ئەرکەکانی خۆی بەڕێکوپێکی ئەنجام داوە و خزمەتگوزارییەکی کاریگەری پێشکەش کردووە.

**ئەندامانی دەستەی کۆمەڵەی فریاکەوتنی کوردستان K.R.A ١٩٨٦**

١. یوسف محەمەد عەزیز (د. شوان)
٢. هۆشمەند عەبدولکەریم (د. شالاو)
٣. ئەدیب محەمە عەلی (د. هەڵۆ)
٤. هێمن ئەحمەد حەمەساڵح
٥. فەرەج یاوەر سادق (د. سەردار)
٦. خالید محەمەد ڕەشید
٧. ئاکۆ سەعید محەمەد
٨. حسێن حەمەساڵح حسامەدین
٩. حەسەن عەلی سەعید
١٠. جەلال جەوهەر عەزیز
١١. محەمەد سوڵتان
١٢. نەوزاد نوری محەمەد
١٣. مەنسوور یوسف مستەفا
١٤. بەیان حسێن عەلی
١٥. دانا نوری محەمەد
١٦. شێرکۆ حەسەن عەبدولڕەحمان
١٧. بۆتان عوسمان ئەسعەد
١٨. ئارام ڕۆستەم عەبدوڵڵا

١٩. موحسين لەتیف کەریم

٢٠. جەمال سەرگەڵوویی

**بەرپرسەکانی کۆمەڵەی فریاکەوتنی کوردستان K.R.A ١٩٨٦ - ١٩٩٦**

١. یوسف محەمەد عەزیز ١٩٨٦—١٩٨٩

٢. ئەدیب محەمەد عەلی ١٩٨٩

٣. عەبدولکەریم حاجی ١٩٨٩—١٩٩٢

٤. شاڵاو عەلی عەسکەری ١٩٩٢—١٩٩٤

٥. ئەحمەد کاکەحەمە مستەفا ١٩٩٤—١٩٩٦[٦].

**٥- قۆناغی دوای ئەنفال (سنوور و ئۆردوگاکانی ئێران)**

لە سەرووبەندی تەشەنەسەندنی جەنگی کیمیاییدا لە کوردستان، دەزگای تەندروستیی کوردستان تیمی تایبەت بە چارسەرکردنی بریندارانی کیمیایی پێکهێنا، کادیرەکانی ئەو تیمانە بە سەر مەفرەزە و بارەگا و گوندەکاندا گەڕان و کەوتنە شرۆڤەکردنی شێوەی خۆپاراستن لە چەکی کیمیایی، چەند خولێکیشیان لەم بارەیەوە لە شوێنی جیا جیا کردەوە.

لە قۆناغی پاش شاڵاوی ئەنفالدا، دەزگای تەندروستیی کوردستان چالاکییەکانی گواستەوە بۆ سەر سنوور و ناو ئێران و خزمەتێکی زۆری ئاوارەی کەمپەکانی کردووە. هەرچەندە لەو ماوەیەدا ژمارەی کادیرە پزیشکییەکانی زۆر کەمی کردووە، لە ماوەی ساڵانی ١٩٨٨—١٩٩١ دەزگای تەندروستیی کوردستان، بە پێی گۆڕانی شێوەی جموجووڵی مەفرەزەکانی هێزی پێشمەرگە بە بارودۆخێکی فرە دژواردا تێپەڕیوە. لە گوندەکانی نۆکان و زەڵێ چەند خولێکی پزیشکی بۆ مەفرەزە پارتیزانەکان کردووەتەوە، پێشمەرگەکانی فێری فریاگوزارییە سەرەتاییەکان کردووە و ڕێنمایی پێویستی بۆ شێوەی مامەڵەکردن بۆ

---

(٦)- ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، چ٤، ب٣، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سەروەری، سلێمانی، ٢٠٢١، ل١٧١٦ — ١٧١٨.

پێشمەرگە پارتیزانە بریندارەکان دەرکردووە، هەر وەك سەرنجی بە لای ئەو ڕێوشوێنە پێویستانەشدا ڕاکێشاوە، کە دەبێت لە هەلومەرجی تایبەتدا پیادە بکرێت، لەوانە: هەلومەرجی نەبوونی پزیشك، دەرمان، شێوەی گواستنەوەی نەخۆش و برینداەکان بۆ ماوەی دوور و درێژ و بەرێگەیەکی دژوار و مەترسیداردا.

لە کاتی دانانی نەخشەی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١، ڕۆڵێکی گرنگ بۆ دەزگای تەندروستیی کوردستان دیاریکرا، ئەویش دابینکردنی پێداویستی و کادیری پزیشکی بوو بۆ قۆڵەکانی شەڕ، سەرباری سەرپەرشتیکردنی کاروباری تەندروستیی شارە ڕزگارکراوەکان و ڕێکخستنەوەی کاروباری نەخۆشخانەکان، لەو قۆناغەدا کادیرەکانی دەزگای تەندروستیی کوردستان لە قاسمەڕەشەوە کە یەکەم وێستگەی ڕاپەڕین بوو تا کەرکووك کە دواترینی بوو، ڕۆڵێکی کارا و بەرچاویان لە ڕاپەڕاندنی کاروباری پزیشکیدا گێڕاوە.

پاش ڕاپەڕین، دەزگاکە دەستی بەدامەزراندنی بنکەی تەندروستی لە گوندەکان و دابینکردنی کادیری پزیشکی پێویست بۆ ئەو بنکانە کردووە، سەرباری کاراکردنەوە و ئاوەدانکردنەوەی بنکە تەندروستییە کۆنەکان، بەشێکی زۆری ئەم کارە، بەهاوکاری ڕێکخراوی میدکۆ ئینتەرناسیۆنالی ئەڵمانی بەرێوەچووە.

کارکردن لە وڵاتێکی خاپوورکراو و دواکەوتوو لە ڕووی دامەزراوە تەندروستییەکانەوە، کارێکی زۆر سەخت و دژوار بووە. لەگەڵ ئەوەشدا، دەزگاکە لە ماوەی یەك ساڵدا مووچەی بۆ کارمەندەکانی و دەرمان و کەرەستە پزیشکییەکانی بۆ بنکە و نەخۆشخانەکانی پەیدا کردووە. قەوارەی چالاکی ئەنجامدراوی دەزگاکە لەوەدا دەردەکەوێت، کە ژمارەی کارمەندەکانی لەو ماوەیەدا گەیشتووەتە زیاتر لە چوار سەد پزیشك و کادیری پزیشکی[٧].

دوای هێرشە بەربڵاوەکانی ڕژێم لە ١٩٨٨/٢/٢٢ کە بە (ئۆپەراسیۆنی ئەنفالی یەك) ناسراوە بۆ سەر هێزی پێشمەرگە و دانیشتوانی گوندەکانی دۆڵی جافایەتی، کە بارەگای سەرکردایەتی گشتی ی.ن.ك لەوێ بوون، دوای بەرگرییەکی قارەمانانەی پێشمەرگە و هێزی پشتگیری (کە لە دانیشتوانی گوندەکان پێکهاتبوو)، ڕژێم هەموو جۆرە چەکێکی

---

(٧)- ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان: چ٤، ب١، س.پ، ل٨١٦.

بەکارهێناوە، لەوانەش چەکی کیمیاوی، بۆیە سەرکردایەتی ی.ن.ك بڕیاری کشانەوەی لە ناوچەکان بۆ سنووری ئێران داوە، دوای ئەم کارەساتە پێشمەرگە ڕێکخراوەتەوە و لەسەر سنوورەکان بارەگایان بۆ کراوەتەوە، بۆیە (دەزگای تەندروستی کوردستان)یش لە نزیك ئەوان شوێنی بۆ نەخۆشخانە و دکتۆر و کارمەندەکانی دابین کردووە، دەرمانی پێویست و کەلوپەلی پێویستی بە سەر ئەو بارەگایانەدا دابەش کردووە، لەوانە (میحوەری بلەکێ و چیومڕۆ، قاسمەڕەش نۆکان، دزڵی، بادیناوا، خانێ و دۆڵە کۆگێ...هتد)، هەروەها لە هەموو ئۆردوگایەکیش کە ئاوارەی گوندەکانی لێ نیشتەجێ بوون بنکەیەکی تەندروستی کراوەتەوە، چارەسەری دانیشتوانی ئۆردوگاکانیان کردووە، ئەو ئۆردوگایانەش بریتی بوون لە: (ئۆردوگای بێزیلە، پیرشێخ، بۆکان، کەوپەر، هەنگاوێ و شنۆ... هتد).

سەنتەرێکی سەرەکیش لە شاری سەقزی ئێران کراوەتەوە، کە تایبەت بوو بۆ کاروباری دەزگای تەندروستی کوردستان، نەخۆشخانەکانی ئەم میحوەرانە جگە لەوەی چارەسەری بۆ پێشمەرگەکان کردووە، هەروەها خولی ڕاهێنانی بۆ پێشمەرگە و پارتیزانەکان کردووەتەوە، کە دوای ئەنفال چوونەتەوە بۆ باشووری کوردستان و چالاکییان ئەنجام داوە، بەم شێوەیە تاکو ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ۱۹۹۱ بەردەوام بووە.

جگە لە بنکەی تەندروستی، مەکتەبێکی پەیوەندی تەندروستی لەگەڵ نەخۆشخانەکانی ئێراندا لە تەوریز هەبووە، بۆ ڕاییکردنی کاری ئەو پێشمەرگە بریندار و نەخۆشانەی کە پێویستیان بەچارەسەری تایبەتی هەبووە، لە سەرەتادا (د. خەسرەو و مام قادر) سەرپەرشتیان کردووە، دواتریش د. موحسین عەبدوللەتیف سەرپەرشتی کردووە.

### ٦. قۆناغی ڕاپەڕینی گەلی کوردستان ۱۹۹۱

لە بەهاری ۱۹۸۸ تاکو بەهاری ۱۹۹۱ پێشمەرگە لەسەر سنوورەکان مانەوە، جگە لە پارتیزانەکان کە ناوچەکانی سەروو بەرەو خواروو دەچوون ـ مەبەست لە سنووری ئێرانەوە بۆ قووڵایی خاکی باشووی کوردستان ـ لەگەڵ ئامادەکاری سەرکردایەتی بۆ

ڕاپەڕینی کوردستان، دەزگای تەندروستی کوردستانیش پلانی دارشت بۆ ئەوەی ئەو دکتۆر و کارمەندانەی کە مابوونەوە لەسەر سنوور لەگەڵ هێزەکانی پێشمەرگە ڕێك بخاتەوە، بە بەرنامە بچنە خوارەوە بۆ هاوکاری هێزی پێشمەرگە، بەم شێوەیە لە هەموو قۆڵەکانەوە دکتۆر، یان کارمەندی تەندروستی بە دەرمان و کۆڵە پشتەوە سازدابوو، تا لەگەڵ بروسکەی ڕاپەریندا بگەنە شارەکان و بتوانن لەگەڵ خەڵکی ڕاپەڕیووی شاردا نەخۆشخانەکان بەڕێوەبەرن، ئەمەش ئەنجام درا و لە زۆربەی نەخۆشخانەکان کارگێڕییەکی دەزگای تەندروستی بۆ سەرپەرشتیکردنیان هەبوو، لێرەوە ژمارەیەك دکتۆر و کارمەند پەیوەندیان بە پێشمەرگەوە کرد و بەخۆبەخش دەستیان بەکارکردن کرد، دوای ئەوەی بە شێوەیەکی باش ڕێکخرانەوە توانرا بەهۆی ڕێکخراوەکانی بیانی، خواردن و بڕێك پارمەتی بۆ دکتۆر و کارمەندان دابین بکرێت، چەندین نەخۆشخانە و دەیان بنکەی تەندروستی دروست بکرێت، کە لەلایەن ڕژێمەوە لە شارۆچکە و گوندەکانی کوردستان وێران و ڕاگوێزرابوون.

کاری دەزگاکە بەم شێوەیە بەردەوام بوو تاکو حکومەتی هەرێمی کوردستان دامەزرا و بە ڕێکەوتن لەگەڵ وەزارەتی تەندروستیی حکومەتی هەرێمی کوردستان تەواوی کارگێڕی بنکە و نەخۆشخانەکان ڕادەستی وەزارەتی تەندروستی کراونەتەوە، بەم شێوەیە دەزگای تەندروستی لە شۆڕشی نوێی گەلی کوردستاندا ڕۆڵی خۆی بینی.

پاش پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٢، پێشنیار کرا کارمەندانی دەزگاکە بخرێنە سەر وەزارەتی تەندروستی و دەزگاکەش بە بەرەی کوردستانی بسپێردرێت، بەڵام وەزارەتی تەندروستی پێشنیارەکەی پەسەند نەکرد، لەلایەکی دیکەوە، بەرەی کوردستانی کە پاش پێکهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە سەروبەندی هەڵوەشانەوەدا بوو، لە کۆبوونەوەی خۆیدا بڕیاری هەڵوەشانەوەی دەزگاکەیدا.

هەڵوێستی نەرێنی وەزارەتی تەندروستیی و بەرەی کوردستانی بەرامبەر بە دەزگای تەندروستیی کوردستان، ڕۆڵێکی کارای لە هێشتنەوەی دەزگاکەدا هەبوو، چونکە دەزگاکە بەهەوڵ و کۆشش و لە خۆبووردەیی لێپرسراوەکەی دکتۆر یوسف محەمەد عەزیز و کارمەندەکانی، تا ساڵی ١٩٩٦ لەسەر کارەکانی خۆی بەردەوام بوو، ساڵی ١٩٩٦ لە

سەرووبەندی هێرشی هاوبەشی هێزەکانی گاردی کۆماری ڕژێمی عێراق و هێزەکانی پ.د.ك بۆ سەر هەولێر، دەزگاکە لەبەر یەك هەڵوەشایەوە، دەست بە سەر بارەگا و کەلوپەلەکانیدا گیرا، لێپرسراوەکەی دەستگیر کرا و کارمەندەکانی ڕاونران[٨].

پاش ڕاپەرینی ١٩٩١ی گەلی کوردستان، لە ڕووی بەڕێوەبردن و فەرمانڕەواییکردنی پانتایی جوگرافی و ژیانی هاووڵاتیان پەیوەندی نێودەوڵەتیی...هتد دەزگاکە کەوتە قۆناغێکی نوێ و هەستیارەوە.

پێویست بوو پێڕەو و بەرنامەی کارکردن بۆ دەزگاکە دابڕێژرێت و تۆکمە و فراوانتر بکرێت، کە دەزگای تەندروستی یەکێك بوو لە کارەکتەرە سەرەکییەکانی شۆڕشی ڕابردوو و فەرمانڕەوایی دواتر ئەرکی قورستر و هەستیار کرد، بۆیە بڕیاردرا کە:

- ناوی دەزگاکە بە کوردی هەر وەکو خۆی بمێنێتەوە (دەزگای تەندروستی کوردستان) بە ئینگلیزیش بنوسرێت: - KURDISTAN HEALTH FOUNDATION (KHF).
- لۆگۆیەك کە لە سێ پیتی سەرەتای وشەی ناوە ئینگلیزیەکەی دارێژرابوو، هێمای هیلالی مانگ و خاچی لەسەر نەخش کرابوو، لەسەر چوار لووتکەی شاخ دانرابوو کە شاخەکە هێمابوو بۆ ئەوەی کە لە شاخ دامەزراوە، چوار لووتکەکەش هیمای چوار پارچەی کوردستان بوو[٩].

---

[٨]– ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان: چ٤، ب١، س.پ، ل٨١٦-٨١٧.

[٩]– بۆ بینینی لۆگۆی دەزگاکە بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١).

## ٧. پێکهاتەی دەزگای تەندروستیی کوردستان

وەك ئاشکرایە دەزگای تەندروستی کوردستان، دەزگایەکی خزمەتگوزاریی تەندروستیی کۆمەڵایەتیی ناحیزبی و ناحکومیی بوو، بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری تەندروستی و کۆمەڵایەتی و پاراستنی ژینگە لە هەرێمی کوردستانی عێراق کاری کردووە، ئەم دەزگایە لە قۆناغی شاریش لە پێناو ئامانجەکانیدا بەردەوام بوو، لەوانە:

- بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری تەندروستی و کۆمەڵایەتی بە تایبەتی گوندنشینان.
- ڕێکخستنەوە و بنیادنانی سیستەمی تەندروستیی بەشێوەیەکی مۆدێرن.
- دابینکردنی ئاوی پاکی خواردنەوە بۆ گوندنشینان.
- پاراستنی ژینگە.
- گەیاندنی خزمەتگوزاری بە کەمپی ئاوارە و ڕاگویزراوان.
- پاراستنی مافی مرۆڤ بە تایبەتی ژنان و منداڵان .

پەیکەری کارگێڕی: لە لێپرسراوی دەزگا کە سەرپەرشتیاری گشتی بوو، لەگەڵ کۆمیتەیەکی سەرپەرشتیار کە لە بەڕێوەبەری بەشەکانی دەزگا و بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکان پێکدەهات، بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان.

**بەشەکان:**

- بەشی کارگێڕیی و دارایی .
- بەشی فەرمانبەران .
- بەشی دەرمان .
- بەشی ڕاگەیاندن و چاپەمەنییەکان .
- بەشی خۆپاراستن
- بەشی ژینگە

لە پاش دانانی پێڕەو و پرۆگرام لە کۆبوونەوەیەکی فراواندا دەزگاکە بڕیاریدا کە:

- کارگێڕی سەرەکی دەزگاکە تۆکمەتر و فراوانتر بکریت.
- کارگێڕی هەموو نەخۆشخانە و بنکەکانی تەندروستیی ڕێکبخرێت و سەرپەرشتی بکرێت.
- ئەو نەخۆشخانە و بنکە تەندروستیانەی کە زیانمەند بوون دەستنیشان بکرێن، تاکو لە نزیکترین کاتدا چاك بکرێنەوە.
- هەوڵی دابینکردنی دەرمان و کەلوپەلی پزیشکی بدرێت بۆیان.
- دابینکردنی مووچە و خواردن بۆ ستاف و نەخۆشەکان.
- دروستکردنی پەیوەندی و هەماهەنگی لەگەڵ ڕێکخراوە جیهانییەکان، کە لە کوردستاندا کاریان دەکرد.
- بەهۆی گەڕانەوەی گوندنشینان و شارە سنوورییەکان بۆ زێدی خۆیان هەوڵ بدرێت کە نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستییان بۆ دروست بکرێت، سەرچاوەی ئاوی خواردنەوەیان بۆ دابین بکرێت و بەشێوەیەکی گونجاوتر و تەندروستر تاکو ببێتە هاندانێك بۆ گەڕانەوەی هاووڵاتیان و ئارامیشیان پێ ببەخشرێت.

بۆ ئەو مەبەستانەی سەرەوە لیژنەیەك دروست کراوە، کە سەردانی زۆربەی نەخۆشخانە و بنکەکان بکەن ئاماری تەواوی ستاف و شێوازی بەڕێوەبردن وەربگرن، دواتر دەستنیشانی کەموکورتییەکان بکەن، ئەمەش ماوەیەکی زۆری پێویست بوو، چونکە جوگرافیایەکی فراوان بوو لە شارۆچکەی کفری، کەلار، خانەقین، هەڵەبجە، پێنجوین، چوارتا، دوکان، چوارقوڕنە، ڕانیە، قەڵادزە، ڕەواندز، سۆران، ئاکرێ و زاخۆی دەگرتەوە، بە هەموو شارەدێ و گوندەکانییەوە، بۆیە لە ڕادیۆی گەلی کوردستانەوە بانگەواز کرا کە دەستبکرێت بەڕێکخستنەوەی دامودەزگا تەندروستییەکان و لیژنەکان سەردانی دەزگاکە بکەن بۆ ڕانیە، کە شوێنی سەرەکی کارکردنی دەزگاکە بووە، پشتگیری بەرەی کوردستانیان پێ بێت بۆ پشت ڕاستکردنەوەی داواکانیان، ئیتر وردە وردە لیژنەکان پێ ڕادەگەیشتن کە سەردان بکەن و لە نزیکەوە ئاگاداری ڕەوشەکە بین، بەم شێوەیە توانرا لە ماوەیەکی کەمدا ئاماری باش وەربگیرێت و دەست بەڕێکخستنەوە بکرێت، کە توانرا سەرپەرشتی زیاتر لە چەندین نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی بکرێت.

پاش ئەم ڕێکخستنەوەیە، دەست بە کارکردن کرا، خزمەتێکی زۆر باشیان پێشکەش کردووە، ئیتر ڕێکخراوە جیهانیەکانیش پەیوەندییان پێوە کردوون، بۆ هاوکاری و گەیاندنی دەرمان و کەرەستەی پزیشکی و ئەمبولانس و هەندێك جاریش مووچەی کارمەندەکان و خواردنیان بۆ دابین کردوون.

لەو ڕێکخراوانەی کە لە سەرەتاوە پەیوەندیان بە KHFەوە کرد و هاوکاریان پێشکەش کردووە بریتین لەمانە:

- ڕێکخراوی میدیکۆ ئەنتەرناسیونالی ئەڵمانی MEDICO INTERNATIONAL
- ڕێکخراوی MSF فەرەنسی
- ڕێکخراوی MDM فەرەنسی
- ڕێکخراوی UNICEF
- ڕێکخراوی HAUKARI ئەڵمانی
- ڕێکخراوی OVDA ئەمریکی
- ڕێکخراوی DC (Dutch consortium) هۆڵەندی
- ڕێکخراوی NPA (Norwegian people aid) نەرویجی
- ڕێکخراوی CRA ئەمریکی
- ڕێکخراوی قەندیلی سویدی
- ڕێکخراوی منداڵپارێزی بەریتانی SAVE CHILDRIN FOUND .SCF
- ڕێکخراوی کاریتاسی سویسری CARITAS SWISS
- ڕێکخراوی HARTLAND ALLIANCE

جگە لەمانەش چەندانی تریش پشتگیری تەواوی دەزگاکەیان کردووە، هەروەها چەندین کەسایەتی و خاوەن هەڵوێست، کە پارەداربوون، یان لە دەرەوەی وڵات دەژیان و باری داراییان باش بووە، هاوکاریان کردووە، جا بە دەرمان و کەلوپەلی پزیشکی بێت یان خواردن یاخود بڕێك پارە بۆ مووچەی کارمەندان بێت.

**بۆ نموونە میدیکۆی ئەڵمانی دەستپێشخەری کرد بۆ هاوکاریکردن بۆ دروستکردنی:**

- **دروستکردنی نەخۆشخانە لە شارۆچکە، شارەدێیەکان و گوندەکان، بە تایبەتی بۆ گوندە دوورەدەستەکان و سنوورییەکان.**
- **گەیاندنی سەرچاوەی ئاوی خواردنەوە بە بۆری بۆ ناو حەوزی ئاو، هەروەها دابەشکردنی تۆڕی ئاو بەشێوەیەك لە گوندەکان هەر ٤ - ٥ ماڵێك بەلوعەیەك لە پێش ماڵەکانیان دابنرێت لەگەڵ دروستکردنی توالیتی گونجاو.**
- **پێکهێنانی تیمی گەڕۆك لە پزیشك و کارمەندی تەندروستی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی تەندروستیی و پێ دانی ڕێنمایی تەندروستی بە گوندنشینان و چارەکردنی نەخۆشەکانیان.**
- **ڕاهێنانی (مامان)ی کارا و شارەزا تاکو بتوانن بەشێوەیەکی تەندروست و باش هاوکاری ژنانی دووگیان لە کاتی منداڵبووندا بکات، هەروەها پێ دانی کەرەستەی منداڵبوون بە مامانەکە لە بوکسێکدا.**
- **ڕاهێنانی کەسێکی خوێندەوار، یان وریا کە پیاندەوترا (کارای تەندروستی) بۆ هەندێك کاری خزمەتگوزاری خێرا لە گوندەکان تاکو لە کاتی پێویستیدا بە هانایانەوە بچێت.**
- **وەرگێڕانی پەرتووکێکی پزیشکی گرنگ بە زمانێکی سادە لە ئینگلیزییەوە بۆ کوردی و چاپکردنی، دواتر دابەشکردنی بە سەر کارمەندی تەندروستی و کارای تەندروستی گوندەکان.**

### ٨. كار و چالاكییەكانی دەزگای تەندروستی كوردستان

- سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی ٨٠ نەخۆشخانە و بنكەی تەندروستی لە كوردستان تاكو دروستبوونی حكومەتی هەرێم و دامەزراندنی وەزارەتی تەندروستی، لە ساڵی ١٩٩١-١٩٩٣ ڕێكخراوی میدیكۆی ئەڵمانی پشكی شێری هەبوو لە هاوكاری، یونیسیف و نۆڤداش دوای ئەو دێن.
- دروستكردنی نەخۆشخانە لە قەڵادزێ، سەنگەسەر، ڕانیە و پێنجوێن لە ساڵی ١٩٩٢-١٩٩٦ لەلایەن ڕێكخراوەكانی میدیكۆی ئەڵمانی و یونیسیف و نۆڤدا.
- دروستكردنی ٢٥ بنكەی تەندروستی لە ساڵی ١٩٩١-٢٠٠٠ بە هاوكاری ڕێكخراوەكانی میدیكۆ-هاوكاری- NPA-DC.
- چاككردنەوەی چوار نەخۆشخانە و سی ٣٠ بنكەی تەندروستی لە ساڵی ١٩٩١-٢٠٠٤ لەلایەن ڕێكخراوەكانی میدیكۆ-هاوكاری- NPA-DC.
- دروستكردنی پرۆژەی ئاو و ئاوەڕۆ LATRINE بۆ زیاتر لە ٢٠٠ گوند لە سنووری پارێزگاكانی سلێمانی، هەولێر و كەركووك لە ساڵی ١٩٩١-٢٠٠٥، بە پاڵپشتی و هاوكاری ڕێكخراوی UNICEF-MEDICO-HAUKARI-CRA-SCF
- چاككردنەوەی تۆڕی ئاو و ئاوەڕۆی (٦ نەخۆشخانە و بنكەی تەندروستی و ٢٢ خوێندنگا) لە ساڵی ١٩٩٢-٢٠٠٤ لە سنووری هەولێر-سلێمانی (ئیدارەی ڕاپەڕین)، دووزخورماتوو-دوبز، بە پاڵپشتی ڕێكخراوەكانی-UNICEF-MEDICO HAUKARI-SCF-NPA- CARITAS SWISS.
- پرۆژەی بەرزكردنەوەی ئاستی هۆشیاری تەندروستی و كۆمەڵایەتی بۆ گوندنشینان لە سنووری پاریزگاكانی: (هەولێر، كەركووك، سلێمانی، گەرمیان، هەڵەبجە و ڕاپەڕین)، لە ساڵی ١٩٩١-٢٠١٤ بەهاوكاری ئەو ڕێكخراوانەی سەرەوە.
- چاپكردن و بڵاوكردنەوەی پۆستەر و لیفلیتی ڕێنمایی تەندروستی و كۆمەڵایەتیی زیاد لە یەك ملیۆن دانە لە سەرانسەری كوردستان بەهاوكاری و پشتیوانی ئەو ڕێكخراوانە لە نێوان ساڵانی ١٩٩٢-٢٠١٤.

- وەرگێڕانی پەرتووکێکی تەندروستی لە ئینگلیزیەوە بۆ زمانی کوردی بە ناوی (کاتێك پزیشکی لێ نەبێت) (Where there is no Doctors) لە ساڵی ١٩٩٤ بەیارمەتی میدیکۆی ئەڵمانی.
- پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری چارەسەرکردن و ڕێنمای تەندروستی بۆ خانەی چاودێری کۆمەڵایەتییەکانی پیر و منداڵانی پارێزگای سلێمانی و هەولێر ١٩٩٣–٢٠١٤
- پرۆژەی فریاگوزاری بۆ ئاوارە و کۆچبەران لە کەمپەکانی سنووری سلێمانی، گەرمیان و پشدەر، لە ساڵی ١٩٩٦–٢٠١٤ بەهاوکاری هارتلاند ئەلایەنس–میدیکۆ – هاوکاری–NPA
- پرۆژەی بەرەنگاربوونەوەی وشکە ساڵی لە سنووری گەرمیان و دەشتی کۆیە لە ١٩٩٩–٢٠٠٠ بەهاوکاری UNICEF–NPA
- خولی فریاگوزاریی تەندروستی بۆ مامۆستایان و گەورە کچان و کەس و کاری ئەنفال لە سنووری کۆیە، تەقتەق و گەرمیان .
- گەیاندنی فریاگوزاری تەندروستی و خواردن و ڕاخەر و بەتانی پێداویستی بۆ نەخۆشخانەو بنکەی تەندروستی لە سنووری گەرمیان (خانەقین، دووزخورماتوو، جەلەولا، سەعدیە، دوبز و نەخۆشخانەکانی ناوشاری کەرکووك لە ٢٠٠٣–٢٠٠٤.
- پرۆژەی دروستکردنی توالیتی نوێ (LATRINES) بۆ گوندەکانی سنووری پاریزگای سلێمانی، گەرمیان و پشدەر بەدیزاینی UNICEF لەسەر ئەرکی منالپارێزی بەریتانی، بۆ زیاتر لە ١٠٠ گوند بەهاوکاری ڕێکخراوی – SCF–NPA MEDICO
- چەندین پرۆژەی تر کە جێبەجێکراون بۆ خوێندنگاکان و کەمپەکانی ئاوارە و گوندنشینان.

**٩. ناوی پزیشك و كارمەندانی دەزگای تەندروستیی كوردستان لە شاخ**

| ژ | ناوی | پیشە |
|---|---|---|
| ١ | دكتۆر شوان محەمەد عەزیز | پزیشك |
| ٢ | دكتۆر شاڵاو عەبدولكەریم | پزیشك |
| ٣ | دكتۆر هەڵۆ محەمەد عەلی | پزیشك |
| ٤ | دكتۆر هێمن ئەحمەد حەمە ساڵح | پزیشك |
| ٥ | سەردار یاوەر سادق | كارمەندی تەندروستی |
| ٦ | خالید محەمەد ڕەشید | كارمەندی تەندروستی |
| ٧ | ئاكۆ سەعید عەبدوڵڵا | كارمەندی تەندروستی |
| ٨ | ئارام ڕۆستەم عەبدوڵڵا | كارمەندی تەندروستی |
| ٩ | نەوزاد نوری محەمەد | كارمەندی تەندروستی |
| ١٠ | مەنسوور عەبدوڵڵا یوسف | كارمەندی تەندروستی |
| ١١ | بەیان حسێن عەلی | كارمەندی تەندروستی |
| ١٢ | دانا نوری محەمەد | كارمەندی تەندروستی |
| ١٣ | شێركۆ حەسەن عەبدولڕەحمان | كارمەندی تەندروستی |

---

بەشێكی زانیارییەكانی پەیوەست بە دەزگای تەندروستیی كوردستان لە نووسینێكی د. خالید محەمەد ڕەشید وەرگیراوە.

# ئەحمەد نەجمەدین ئەحمەد (دکتۆر ئاری)

لە ساڵی ١٩٦٥ لە شارۆچکەی چۆمانی سەر بە پارێزگای هەولێر لەدایک بووم، هەڵگری بڕوانامەی دبلۆمم لە تەندروستی، لە ساڵی ١٩٧٩ پەیوەندیم بە ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)ەوە کردووە، لە ساڵی ١٩٨٦ بووم بە پێشمەرگە، بە بێ دابڕان پێشمەرگە بووم، یەکێکم لە پارتیزانەکانی دوای ئەنفال.

سەرەتای بوونم بە پێشمەرگە وەك یاریدەدەری پزیشك لە تیپی ٧٨ی کارووخ کارم کردووە، لە ١٩٨٦ تا ١٩٨٨ لە سنووری هەمان تیپ خزمەتگوزاری پزیشکیم پێشکەش کردووە، سەرەڕای خزمەتگوزاری تەندروستی کاری ڕێکخستەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان (ك.ڕ.ك)م کردووە.

لە ساڵی ١٩٨٦ بەشداری خولی تایبەتم لەسەر چەکی کیمیایی (پاراستن و چارەسەر) لە کرماشان کرد، بەشداربوانی خولەکە ئەوانەی بیرم ماون بریتین لە:

١. هادی ساڵح سەعید/ تیپی ٢١ی کەرکووك
٢. ئەحمەد نەجمەدین ئەحمەد/ تیپی ٧٨ی کارووخ
٣. ئاسۆ/ تیپی ٣١ی سلێمانی
٤. جەلیل ئیبراهیم/ تیپی ٨٣ی هەورێ
٥. عەدنان/ تیپی ٩٣ی کۆیە
٦. ئاراس/ مەڵبەندی ١
٧. کارووخ/ نەخۆشخانەی خەتێ

لە کاتی گەڕانەوەمان ڕاستەوخۆ پەیوەندیم بەتیپی ٧٨ی کارووخ کردەوە، کە لە داستانی قەیوان-ماوەتدا بەشداربوو، پێشمەرگەکان لە گوندی کۆڵەرد لە چیای کۆڕەنگ ئەرکیان پێ سپێردرابوو، هاوکات شەڕی قەیوان-ماوەت بەردەوام بوو، کە داستانێکی بێ وێنەیە، تا گەڕانەوەمان بریندارەکانی پێشمەرگەم تیمار دەکرد و بەڕێمان دەکردن بۆ نەخۆشخانەی بەرگەڵوو، ئەوەی دەمان کرد تەنها فریاگوزاری سەرەتایی بوو، بەڵام ئەگەر

برینەکانیان سادە و کەم بوایە لای خۆمان تیمارمان دەکردن، هەروەها چارەسەری نەخۆشی ئاساییمان دەکرد، چونکە ئەو دەرمانانەی لامان بوو تەنها چارەسەرێکی سەرەتایی بوو .

دوای تەواوبونی ئەرکمان، گەڕاینەوە سنووری تیپەکەمان لە مەڵبەندی سێ لە گوندی وەرتێ، کەوتینە ڕێ و لە بنگرد بە بەلەم پەڕینەوە بۆ بەری کۆسرەت لەوێوە لە بیتوێن پەڕینەوە بۆ خۆشناوەتی تا گەیشتینە وەرتێ، کەشوهەواش باراناوی بوو بەردەوام باران دەباری.

لە وەرتێ ژوورێکی تایبەت هەبوو وەکو بنکەیەکی تەندروستی بۆ چارەسەرکردنی پێشمەرگە و هاووڵاتیانی سنوورەکە بە گشتی سوودمان لێ دەبینی.

سەرچـاوەی دەرمانمـان ڕێکخسـتنەکان و پەیوەندییـە تایبەتـەکان بـوون، لەگـەڵ کەسایەتییەکانی کار بەدەست لە حکومەت و ناو خەڵکدا، ئەو نەخۆشانەی کە چارەسەرمان پێ نەدەکران بەڕێمان دەکردن بۆ نەخۆشخانەی خەتێ، ئەگەر ڕێگا نەبوایە لەبەر بەفر، یاخود کێشەی دیکە، ئەوا حاڵەتی نەخۆشەکەم بە برووسکە دەنارد بۆ نەخۆشخانەکە، کە دکتۆر زریان لەوێ بوو پرسم پێ دەکرد بۆ ئەم نەخۆشە چی بکەین؟ چونکە لە ڕووی زانستی ئاستی چارەسەرەکە لە ئێمە بالاتر بوو لە توانای ئێمە نەبوو، هەروها هەموو بریندارەکانی سنووری تیپمان چارەسەر دەکرد، کە نموونەی زۆرمان هەیە.

لەوانەی لە داستان و شەڕە گەورەکانی سنووری سەرکردایەتی و مەڵبەند بریندار دەبوون و خەڵکی سنووری تیپەکەمان بوون، یان پێشمەرگەی تیپەکەمان بوون، تا چاك بوونـەوەی خزمـەتمان دەکـردن و چاودێریمان دەکـردن، بـەڵام هەمیشـە هـەوڵمان دەدا لـە چوارچێوەی زانستی پزیشکی کاربکەین .

لە ساڵی ١٩٨٧ لەگەڵ زۆربەی پێشمەرگەکانی تیپی ٧٨ی کارووخ بەشداریمان لە داستانی ڕزگاری کرد، ئەرکی تیپەکەی ئێمە لەگەڵ تیپەکانی سنووری مەڵبەندی سلێمانی گرتنی بارەگای فەوجی باڵخ بوو کە سەر بە شارەدێی ماوەت بوو، لە یەکەم هێرش کە دەستی پێ

کـرد تـوانرا بارەگـای فەوجەکـە و ڕەبایـەکان بگـرین، بـەڵام بەداخـەوە ٦ شـەهید و ٣٢ بریندارماندا، ئەوانەی برینیان زۆر بوو پێویستیان بە نەشتەرگەری بـوو یەکسـەر بـەڕێمان کردن بۆ نەخۆشخانەی بەرگەڵوو، کە ڕۆژێکی زۆر ناخۆش بـوو، چونکە ئەرکەکـە لـە ئێمـە گەورەتر بوو ئاسان نـەبوو منـیش بـە تـەنها بـووم، ئەوانـەی بـیرم مـاوە کـە شـەهید بـوون، بریتین لـە: شـەهید وەسـتا عـەتا فەرمانـدەی کـەرت بـوو لەگـەڵ دوو شـەهیدی تـر خـەڵکی سلێمانی بوون. تەرمەکانیان کەوتنـە بەردەسـتی دوژمـن، تیپەکـەی ئێمـە سـێ شـەهیدماندا بەناوەکانی:

١. محەمەد مەحموود/ خەڵکی باڵەییان
٢. عومەر بەردانگەیی
٣. عەبدوڵڵا گچکە/ خەڵکی وەرتێ

جگـە لـەو بەرەیـە برینـدارەکانی تـری تیپـەکانی تـر کـە لێمـان نزیـك بـوون تـوانیم خزمـەتێك بـە ئـەوانیش بکەیـەنم، دوای چـەند ڕۆژێـك ئەرکەکـەمان گوێزرایـەوە بـەرەی حەسـەن بـەگ و وڵاخلـوو، ئێمـە لـەو شـاخەدا بـووین، کـە بـە سـەر وڵاخلـوودا دەیڕوانـی، حکومەتی عێراق هێرشی زۆری دەکرد و فڕۆکەش بەردەوام هێرشی دەکرد، بیرمە لـە کـاتی دوا هێرشـی دوژمـن کـە تـوانی شـوێنەکە بگرێـت شـەڕی دەسـتەویەخە ڕوویـدا، برینـدار و شەهیدمان هەبوو، ئەوانەی لە بیرم ماون بریندارەکان بریتی بوون لە: هەڤاڵ عەزیز داود و پێشمەرگەیەك بەناوی (شەهید) کە ناوی خوازراو بوو خەڵکی دۆڵەڕەقەبوو. ئیدی ئێمە لە سنووری ڕانیە پاڵەپەستۆی زۆرمان لەسەر بوو، لەو کاتەی کە هێرشە گەورەکە کـرا مـن لـە شـاخ کەوتمـە خـوارەوە و بوورامـەوە، دوو پێشـمەرگەم لەگـەڵ بـوون هاوکارییـان کـردم و کۆڵەپشتەکەیان بۆ هەڵگرتم، کە دەرمان و پێداویستی پزیشکی تێدا بـوو، ئەمـە بـووە هـۆی دواکـەوتنم لـە کشـانەوە، ئـەو پێشـمەرگە قارەمانانـە بـوون بـەهۆی ڕزگـار بـوونم، چـونکە

نیگەران بووبوون لە دواکەوتنم کە بریتی بوون لە هەڤالان: (جەلال حاجی گەلالی، ڕەسووڵ قەندە، شێخ محێدین خۆشکانی، سلاح دارسلامی)، کە تفەنگ و کەلوپەلیان لێ وەرگرتم و گەیشتمەوە هێزەکە.

یەکێك لە ڕووداوەکان کە دەمەوێت باسی بکەم ئەو کاتەی هەواڵی برینداربوونی ئەو پێشمەرگەیەمان بۆ هات کە پێیان دەگوت (شەهید) شەڕ گەرم بوو، منیش ڕاستەخۆ بۆ ئەو شوێنە چووم کە بریندارەکەی لێیە، لە ڕێگا بە BKC و چەکی تر تەقەم لێ کرا، هەڤاڵ نیاز دەرگەڵەیی هاواری کرد هەڤاڵ ئاری بگەڕێوە تۆش لێت دەدرێ، خۆت پەنا بدە، من چەند هەنگاوێك ڕۆیشتم گوللەکان لە تەنیشتم بە زەوی دەکەوتن هەڤاڵ نیاز لە دڵسۆزیدا بۆ من هاواری دەکرد بگەڕێوە بریندار ببیت، یان شەهید ببیت بەرەو لات نایەم بە قسەم بکە، منیش یەکسەر هاتمەوە دیوی ئەوان و دواتر توانیم لە شوێنێك کە بریندارەکەیان بۆ گواستبووەوە چووم فریاگوزاری سەرەتاییم بۆ کرد، برینەکەی زۆر سەخت بوو ورگی لە دەرەوە بوو، دوای سارێژکردنی گەیاندرایە نەخۆشخانەی ح.د.ك لە گەڕەدێ و نەشتەرگەری بۆ کرا و سوپاس بۆ خودا چاك بوویەوە.

لەم شەڕەدا شەهیدێکمان بەجێما و نەتواندرا تەرمەکەی ڕزگار بکەن، کە ناوی هەڤاڵ کوێخا بوو فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ٨٣ی هەورێ بوو، لەسەر شاخی گەڕەدێ و گەورەدێ کە بەرامبەر حەسەن بەگ و پشت ولاخلوو بوو، شوێنی شەڕەکەمان دەبینی داخمان بۆ شەهیدەکە هەڵدەکێشا.

لە دەرئەنجامی کەوتنم لە شاخ ئازاری زۆرم هەبوو، بۆیە بردمیان بۆ نەخۆشخانە لە گەڕەدێ، پێیان گوتم پێویستە نەشتەرگەریت بۆ ئەنجام بدەین، بەلام مەرج نییە ئێستا، چونکە سکت ئازاری زۆری پێگەیشتووە، من ئەو کات نەم کرد دواتر لە ساڵی ١٩٨٩ لە سەقز نەشتەرگەرییەکەم کرد، ئینجا دوای شکانمان بەفەرمانی هەڤاڵ مام جەلال تیپەکەمان

کشایەوە بۆ دۆڵی جافایەتی لە گوندی قەرەنگۆ چەند ڕۆژێك ماینـەوە، کـە خـەڵکێکی زۆر بەڕێز بوون، من لەم چەند ڕۆژە لە ماڵی مـام حەسـەن بـووم کـە بـاوکی هـەڤاڵ مەسـتەفا و هەڤاڵ فاخر بوو.

دوای قەرانگۆ فەرمانمان پێکرا کە بەرەو سنووری دوکان بەڕێ بکەوین، لە قەمچوغە دابەزین، دواتر بڕیار درا کە بچینە دەشـتی کۆیـە، لەسـەر ڕێگـای دوکـان-سلێمانی کەوتینـە کەمینەوە، دوای ڕزگاربوونمـان بـەرەو گونـدی تـەلان ڕۆیشـتین و لـەوێش بـۆ دەشـتی کۆیـە، یەکسەر هەوڵمدا کە بچمە ماڵی مام سەید عەلی لـە قازبـەگیان، چونکە کاتێـك چووین بـۆ سەرکردایەتی لە قازبەگیان چەند شەوێك ماینەوە، ئەو چەنـد شەوە من لە ماڵی مام سـەید عەلی بووم کە پیاوێکی بەڕێز و خانەوادەیەکی زۆر نموونەیی بوون.

لە شەڕەکەی بـاڵخ برینـدارێکمان هـەبوو بـەناوی قـادر عومـەر لـە تیپـی ٧٨ی کـارووخ، دوای چارەسەرکردنی لە نەخۆشخانەی بەرگەلۆو کە برینەکەی سەخت بوو، لە گەڕانەوەیدا میوانی ماڵی مـام سـەید عـەلی بووبـوو، پێیـان گوتبـوو دەڵێن د.ئـاری شـەهید بـووە، بـەڵام هـەڤاڵ قـادر گووتبـوی نـا لـە ژیانـدا مـاوە، بۆیـە کـە هـەڤاڵ قـادر گەڕایـەوە سـنووری تیـپ، بروسکەیەکی بۆ کردم نووسیبووی: کە گەڕایتەوە سەردانی ماڵی مام سەید عەلی بکـە بـۆت نیگەرانن، بۆیە من لە گەڕانەوەم سەردانم کردن.

دوای چـەند ڕۆژێـك بڕیـار درا ئـەو هێـزەی کـە لـە ژمارەیـەك تیپـی سـنووری چـەند مەڵبەندێك پێکهاتبووین بەرەو تەقتەق بچین، کـە پلانەکـە گـرتنی تەقتـەق بـوو، پلانەکـە ئەنجام درا، مـن وەك کـادیری پزیشـکی بەشـدار بـووم، لـە شـەڕەکەدا شـەهید و برینـدارمان هەبوو، کە توانیمان بریندارەکان تیمار بکـەین، هاوکـات چـەند کـادیرێکی پزیشـکی لـێ بـوو لەوانە: د. ئارام، د. نەبەز و بەندە، دوای دڵنیـابوون لـە گرووپـی خـوێنی هـەردوولا توانیمـان

لەگەڵ د. ئارام لە سێکانیان خوێن بە بریندارەکان بدەین، بریندارێك بەناوی هەڤاڵ ئازاد داربەسەریی نێردرا بۆ نەخۆشخانەی بەرگەڵوو، د. دکتۆر ئارام لەگەڵی چوو.

دوای گرتنی تەقتەق ئێمە لە نۆمەر گومبەت شەوێك ماینەوە، بەرەو قەمبەر چووین فرۆکە بەردەوام مووشەکبارانی دەکردین، بڕیار درا کەوا هێرش بکرێتە سەر (قاطع جعفر بن منصور) و ڕەبایەی شێراوە لەسەر ڕێگای کەرکووك نزیك قوشتەپە، کە توانرا سەرکەوتن بەدەست بێت، بەڵام شەهید و بریندارمان هەبوو کە توانیمان لەوێش خزمەتی پزیشکی پێشکەش بکەین، دوای ئەم سەرکەوتنە بۆ سنووری مەڵبەندی سێ و دواتر بۆ تیپی ٧٨ی کارووخ گەڕاینەوە، شەهیدەکەمان ناوی هەڤاڵ مام ئەحمەد بوو خەڵکی دۆڵەڕەقە بوو تەرمەکەیمان هێنایەوە.

حکومەتی بەعس دەستی بە کیمیابارانی وەرتێ کرد، هەڤاڵ ڕەسووڵ قەندە و هەڤاڵ محەمەد سەیدە لەگەڵم هاتن بۆ شوێنی کیمیابارانەکە، من سوودم لەو خولە بینی کە لە کرماشان بینی بووم، جلی تایبەت و خەرتومی تایبەت کە فلتەرمیشن بوون بەستم، بەهۆی وەرەقەی هەڵسەنگاندن توانیم دەستنیشانی بکەم کە جۆرەکەی چییە، وەك هەواڵیش بۆ دەنگی گەلی کوردستانمان نارد.

لە بەهاریساڵی ١٩٨٨دا حکومەتی بەعس هەوڵیدا هێرشی بەرفراوان بکاتە سەر ناوچە ئازادکراوەکان لە سەرکردایەتیەوە دەستی پێ کرد سنووری ئێمەشی گرتەوە، لە دۆڵی خانەقا و سنووری زێی وەرتێ-ڕانیەوە لە سنووری دەرگەڵە، لەو چەند ڕۆژەی کە بەرگری کرا بریندارى زۆرمان هەبوو، چەندین فەرماندە و پێشمەرگەمان شەهید بوون، کە بەپێی توانا و هەبوونی دەرمان و پێداویستی پزیشکی خزمەتمان کردن، لە کاتی کشانەوەمان ژمارەیەك هاووڵاتی بەهۆی غازی ژەهراوی توشی هەناسە تەنگی بووبوون، هەوڵماندا خزمەتگوزارییان پێشکەش بکەین، بەرەو سایە و سێوکان کشاینەوە، کە بەرەکەمان کەوتە

هەڵەموند و بێترخێن و زنجیرە چیای پشتی گوڵان، سێ مـانگ بەرەکـە درێـژەی هـەبوو لـەم شەڕەدا برینداری زۆرمان بەخشی.

کـادیرێکی تەندروسـتی بـەناوی د. عـەلی، کـە سـەر بـە تیپێکـی سـنووری مەڵبەنـدی سلێمانی بوو کەسێکی زۆر دڵسۆز بـوو، دوو هەفتـە پـێش کشانەوە هاتـە بەرەکـە، ئیـدی لـە سـنووری ڕێکخسـتنەکانی هـەریر و چـوارقوڕنە و دۆڵـێ دەرمـان و خواردنمـان بـۆ دەهـات، ئەندامی ڕێکخستنەکان زۆر دڵسۆز بـوون، تۆپبـارانی زۆر سـەختمان لەسـەر بـوو، ڕۆژێکیـان هەڤاڵ حەسەن کوێستانی دوو پێشمەرگەی لەگەڵ ناردم بۆ گەرووەمەنجەڵ، کە دەکاتە بەشی دواوەی هەڵەموند، شاخێکی سەختە، شوێنی پشوو بوو، بۆ ئەوەی ژمارەی ئـەو تۆپانـەی کـە دەهاوێژرێن لە کاتژمێرێکدا چەندە بژمێرم، ئێمەش تۆپەکانمان ژمارد، کە لە کاتژمێرێکـدا ژمارەیان ٦٠٠ تۆپ بوو، بەڵام کە گەڕاینەوە گوتمان ٤٠٠ تۆپـە، لـە ئێزگـەی گـەلی کوردسـتان خوێندرایەوە، لە ئەنجامی ئەو تۆپبارانە و ئەو شوێنەی کە باسمان کرد پتەو بوو، بـە سـەر هەڤاڵانمانـدا ڕووخـا، بـووە هـۆی برینـداربوونی ژمارەیـەك پێشـمەرگە و فەرمانـدە، هـەڤاڵ ڕەسووڵ مەولود جێگری لێپرسـراوی تیـپ بـوو لەگـەڵ هـەڤاڵ هیـوا ڕەزانـی شـەهید بـوون، لێرەوە دەنگۆی وەستانی شەڕی عێراق–ئێران پەیدابوو. هێرشەکان کەم بوونەوە، حکومەت خەریکی خۆڕێکخستنەوە بوو، پێشمەرگەش بەشێکی بۆ شوێنی پشوودان هاتنەوە.

ئێوارەیەك جموجۆڵی دوژمن دەستی پێ کردبوو، ئەوانەی سەر شاخ ئاگاداربوون، بۆیـە شەو ژمارەیەك پێشمەرگە نێردرانە سـەر شـاخ، لەوانـە تیپێکـی سـنووری سـلێمانی لـێ بـوو، ئێوارە لەگەل د. عـەلی کـە پێشـتر باسـم کـرد لەگـەڵ فەرماندەیـەکی کـەرت بـەناوی هـەڤاڵ فەرهاد دانیشتین بۆ یەکەم جار یەکترمان ناسی، گوتی هەواڵی بە دایك و خوشك و براکـانی داوە بـەیانی بـێن بـۆ لای، کـە لـە گونـدی گـوڵان یـەکتر ببیـنن، دەزانم کشانەوەمان نزیکە، دەتوانم بەئاسانی بچم بۆ ئەو شوێنە، هەروەها پێم گوتوون پاپراخم بۆ بێنن، کەسێکی زۆر

بەرێز بوو، کاتژمێر ٢ی شەو لای خێمەکەمانەوە یەکێك دەنگی دەهات، داوای منی دەکرد، کە بە دەنگیەوە چووم هەڤاڵ عەلی بوو، گوتی هەواڵێکی ناخۆش هەڤاڵ فەرهاد بریندار بووە، برینەکەی زۆر سەختە بەپەلە با بڕۆین، کە چووین هێنابوویانە بنکەی بەرەکە، بەڵام بەداخەوە تۆپی دەبابە لە نزیکی دابوو، خوێنی زۆری لەبەر ڕۆیشتبوو، هەرچۆنێك بوو هەوڵماندا خوێن بەربوونەکەیمان ڕاگرت و ناردمان بۆ نەخۆشخانەی مەلەکان، کە نەخۆشخانەی بەرەکە بوو، بەداخەوە لە نەخۆشخانەکە شەهید بوو، بەیانی تەرمی شەهید فەرهاد بۆ گوندی گوڵان نێردرا، ئەو شوێنەی بۆ بینینی دایك و خوشك و براکانی دیاریکرا بوو، بەڵام بەداخەوە ئەو ئاواتە کە لە دڵی هەردوولایاندا بوو نەهاتە دی و خواردنی دەستی دایکی نەخوارد، ئیدی بوو بە گریان و فرمێسك ڕشتن، هەرگیز ئەم ڕووداوەم لە یاد ناچێت و کاریگەری زۆری لەسەر جێهێشتم.

لە ١٩٨٨/٨/٨ کە شەڕی عێراق–ئێران وەستا، هێزەکان بەرەو سنووری ئێران ئامادەکران بۆ کشانەوە، چەند یەکەیەکی پارتیزانی لەلایەن سەرکردایەتییەوە دروست کران، کە دوای کشانەوە لە ناوچەکان بمێننەوە، ڕۆژێك نامەیەکی هەڤاڵ حەسەن کوێستانیم بە دەست گەیشت تێیدا هاتبوو: من دونیا تاریك نابینم و بەئومێدم–بۆیە لەو یەکانەی پارتیزانی کە دروستمان کردوون هەڤاڵ سلاح دیلمانی پێشنیاری کردووە، کە تۆ وەك کادیری پزیشکی لەو یەکەیە بمێنیتەوە، کە خۆشی دەمێنێتەوە، ئێوارە لەگەڵ هەڤاڵ سلاح یەکترمان بینی گوتی: (ڕووحی برا)ی با پێکەوە بین، هەروەها هەڤاڵ حەسەن کوێستانیش دەمێنێتەوە، دیاربوو لەگەڵ هەڤاڵ عەبدولڕەزاق بەرپرسی ڕێکخراو قسەی کردبوو، دوای دوو ڕۆژ نامەیەکی هەڤاڵ عەبدولڕەزاقم بۆ هات، هەمان شتی داوا کردبوو کە لەگەڵ یەکەی کارووخ بمێنمەوە، منیش بڕیارمدا و ئیدی وەك پارتیزانی دوای ئەنفالەکان مامەوە، هەندێك دەرمان و جلی زستانە و پێداویستیم لە چیای کارووخ نزیك سایە و سێوکان شاردەوە.

ئەو ڕۆژەی کە کشانەوەی گشتی کرا، بەرەکەی ئێمەش بەرەو کوێستانی وەرتێ لەگەڵ هێزەکەدا کشاینەوە، بەیانی زوو کاتژمێر ٦ هێزەکانی دوژمن لە سێ لاوە هێرشیان هێنا، تەنها پشتمان چیای کارووخ بوو، هەموومان لێك دابڕاین تەنها دوو پێشمەرگەم لەگەڵ بوو بە ناوەکانی هەڤاڵ عومەر ڕەشید و هەڤاڵ محەمەد قادر، دوای سێ ڕۆژ لەگەڵ هەڤاڵ سلاح یەکترمان گرتەوە و بەرەو چیای کارووخ ڕۆیشتین، چونکە ناوچەکە هەمووی دەستی بە سەردا گیرا و بارەگای سوپای عێراقی لێ جێگیرکرا، لە ڕێگەی (بێ سیم) توانرا پەیوەندی بە هەڤاڵ حەسەن کوێستانی بکەین، دوای ١٠ ڕۆژ لە چاڵە بەفرێك لەسەر چیای کارووخ یەکترمان گرتەوە، پاڵەپەستۆی زۆرمان لەسەر بوو، ئاو نەبوو بخۆینەوە بەفرمان دەتواندەوە، خواردنیشمان بەرەو نەمان دەچوو، من وەك کادیری پزیشکی لە کاتی نەخۆشکەوتنی پێشمەرگەکان ئەوەی پێمان بوو بەکارمان دەهێنا، زیاتر سەرما کاری تێ دەکردین، چل ڕۆژ نەمان توانی تەنانەت یەك جار سەرمان بشۆرین.

دوای ئەوەی سەرکردایەتی بڕیاریدا بکشێینەوە و ڕووە و ئێران بڕۆین، لە ڕێگا هەڤاڵ حەسەن کوێستانی تووشی ئازارێکی زۆری گورچیلە بوو، باش بوو دەرزی و حەبی ئازارشکێنمان پێ بوو، ئازارەکەمان ڕاگرت، چونکە دەبوایە بەپێ بڕوات چار نەبوو، ڕێگاکەشمان بە هێزی دوژمن تەنرابوو، ئیتر گەیشتینە ئێران و ژیانی ئاوارەیی دەستی پێ کرد.

دوای چوونمان بۆ ئێران لە ئالۆمتان بووم کە بارەگای مەڵبەندی سێی لێ بوو، بنکەیەکی تەندروستیمان کردەوە، کە نەخۆشخانەکەی قاسمەڕەش دەرمانی بۆ دابین دەکردین، بێ جیاوازی خزمەتی پێشمەرگە و ئاوارە و هاووڵاتیمان دەکرد، لە ساڵی ١٩٨٩ لەسەر بڕیاری هەڤاڵ مام جەلال لە کۆبوونەوەیەکدا لە قاسمەڕەش بە سەر ئۆردوگای

ئاوارەکاندا دابەشی کردین، تا هەڵایسانی ڕاپەڕین لە ئۆردوگای هەنگەوێ و لاوێن بووم، ئەو کات هەموو ئۆردوگایەك بنکەی تەندروستی هەبوو.

لەگەڵ یەکەم هێزی پێشمەرگە و لەگەڵ دەستپێکی ڕاپەڕین لە ڕانیە و قەڵادزێ، ئێمەش لە ٥ و ٧ی ئازار گەیشتینە ڕانیە، کە شارەکان ئازادکران من لە شارۆچکەی هەریر ئەرکم پێ سپێردرا، بەهاوکاری جەماوەر و ڕێکخستنەکانی ی.ن.ك توانیمان نەخۆشخانەی هەریر بپارێزین.

ئیدی لێرەوە و لە دوای ڕاپەڕین ژیانم بە قۆناغێکی دیکەدا تێپەری، لە ساڵی ١٩٩٣دا بەشداریم لە خولی سێهەمی پەیمانگای کادیرانی (ی.ن.ك)دا کرد، دواتر بووم بە ئەندامی کۆنگرەی (١ و ٢ و پلینیۆمی ٣)، دوا پلەی ڕێکخستنم لە کاری حیزبیدا لە ماوەی ساڵانی ١٩٩٥—١٩٩٧ کارگێڕی مەڵبەندی سۆران بووم، دوای ئەم قۆناغە و لەگەڵ دروستکردنی مەڵبەند و کۆمیتەکان، سەرەتا وەك ئەندامی کۆمیتەی چۆمان دەست بەکار بووم، لە ساڵی ١٩٩٨ بەمەبەستی کاری کارگێڕی داوام کرد بچمە ناو حکومەت، هەر لەو ساڵە وەك ڕاوێژکار دەست بەکاربووم.

ماوەی ٢٠٠١—٢٠٠٢ جێگری لێپرسراوی بەشی تەندروستیی شۆڕش بووم لە فەرماندەیی گشتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، ماوەی چوار ساڵ لە وەزارەتی تەندروستیی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ئیدارەی سلێمانی کاری ڕاوێژکاریم کردووە، ئیدی دوای یەکخستنەوەی هەر دوو ئیدارەی هەولێر و سلێمانی بە هەمان پلە خانەنشین کرام.

لە ساڵی ٢٠٠٩ گەڕامەوە سەر ئەرك وەك بەڕێوەبەری گشتی چاکسازی کۆمەڵایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەست بە کار بووم، لەو ماوەیەدا لە دەرەوە و ناوەوەی هەرێم بەشداری چەندین خولی ڕاهێنان و کۆنفرانس و وۆرکشۆپ و سیمینارم لە بوارەکانی کارگێڕیی، یاسایی، مافی مرۆڤ، مافی منداڵان، هونەری کارکردندا کردووە، لەوانە لە ناوەوەی

هەرێم (دوو کۆنفرانس، ٢٨ ۆرکشۆپ، ١٨ خول، ٥ سیمینار)، لە دەرەوەی وڵات (٢ کۆنفرانس، ٦ ۆرکشۆپ، ٥ خول، لە ئەمرکا، ئیتاڵیا، پۆڵەندا، فینلەندا، سوید، تونس، ئوردن، لوبنان، ئێران و تورکیا)، ئێستاش بەردەوامم لە ئەرك و بەڕێوەبەری گشتی چاکسازیی کۆمەڵایەتیم لە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتیی حکومەتی هەرێمی کوردستان. هەروەها خێزاندارم و باوکی پێنج منداڵم، دواتر بڕوانامەی بەکالۆریۆس و ماستەرم لە بواری یاسادا بەدەستهێناوە، شارەزاییم لە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی هەیە[١٠].

(١٠)– ئەحمەد نەجمەدین ئەحمەد (د. ئاری)، هەولێر، ٢٠٢٢/٣/٧.

# ئیبراهیم فەتاح قادر (د. برایم)

لە ساڵی ١٩٦٢ لە شارۆچکەی ماوەت لەدایك بووم، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیم لە ماوەت تەواو کردووە، خوێندنی ئامادەیی پزیشکیم لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٨٢ تەواو کردووە، ئەو ئامادەییە لە ١٩٧٩ کرایەوە هەر ئەو ساڵە لەوێ وەرگیرام، مامۆستاکان هەموو پرۆفیسۆر بوون لەوانە دکتۆر بەکر و دکتۆر عەبدولرەحمان ڕیس هەم پزیشك و هەم مامۆستا بوون زۆرینەی پەرتووکەکانیش بە عەرەبی بوون، لە ساڵی ١٩٧٩ لە پۆلی شەهید ئاشتی لە ماوەت بووم بە ڕێکخستن، ئەم کات هەڤاڵ سەیید ئەحمەدی ماوەتی لێپرسراوی ئەو پۆلە بوو، تا ساڵی ١٩٨٣ لە کاری ڕێکخستن بەردەوام بووم، هەر لەو ساڵە بووم بە پێشمەرگە بۆ ماوەی ساڵێکیش لە کەرتی ڕێکخستنی چوارتا بووم، دواتر وەك پێشمەرگە و پزیشك و برینپێچ لەگەڵ پێشمەرگەدا بەشدار دەبووم، ئەرکی سەرشانی خۆم جێبەجێ کردووە، هەروەها بەهۆی شارەزاییمانەوە لە گوندەکاندا سوودیان لێ دەبینین، جگە لەوەی من بە ئەزموون خۆم فێری ددان کێشان و تیمارکاری و برینپێچی و گوللە دەرهێنانەوە لە لەش کردووە، واتە بووم بە دکتۆری تیپی ٣٧ی شاربازێڕ، کە لە چوارتاوە دەستپێدەکات تا ماوەت و دۆڵی زەروون و سەفرە و گەلاڵە کە دراوسێی تیپی ٣١ بووین، کە هەڤاڵ عەلی چوارتایی سەرتیپمان بوو، (ئێمە وەك تیپی ٣٧ بە گشتی لە مێژووی تیپەکەدا ٤٦ شەهیدمان هەیە).

دواتر لە ساڵی ١٩٨٤ لە کاتی شەهید بوونی مامە ڕیشە لە حکومەت درا، لە قەڵاچوالان سێ چوار جاش کوژران لە چەمچەماڵ و دوکان و سلێمانیش بەهەمان شێوە، ئەوە سەرەتای تێکچوونی دانوستان بوو، کە دانوستان ماوەی ساڵێك بوو بەردەوام بوو، هەندێك لە پێشمەرگە دابەزیبوونە ناو شار، حکومەت هەندێکی لێ بە دیلگرتن و هەندێکی شەهیدکردن، هەندێکیش بەهۆکاری تایبەتی هەر دانەبەزینە ناو شار، دواتر کە دانوستان تێکچوو، چووینەوە شاخ، دواتر هەڤاڵ عەلی چوارتایی سەرتیپ لە شەڕی شاخی کەتوو شەهیدبوو، چەندین برینداریان هێنا، تا تیماریان بکەم، ئەو چالاکییە زۆر گەورە بوو حکومەتی بەلەرزە هێنا و زیاتر لە پەنجا بۆ شەست کوژراویان هەبوو، جگە لەوەش هاووڵاتیمان چارەسەر دەکرد لە گوندی کوڕاوێ و گردەزبێر و وەڕاس، شەوان دەرمانمان لە سوورە قەڵات و ماوەتەوە دەهێنا.

شـەوێك چـووین بـۆ دەرمـان بـۆ سـوورەقەڵات، كارمەنـدانی تەندروسـتی بنكەكـە كـە هـاورێی كـاتی خوێنـدنم بـوون، داوای دەرمانمـان لـێ كـردن، بـۆ ئـەوەی ئـەوان تووشـی لێپرسینەوە نەبن، پێمان گوتن كلیلەكەمان بدەنێ كردمانەوە و بـەپێی پێویست دەرمانمـان برد، لە ڕێگەی گەڕانەوە من و هەڤاڵ ڕەئووف كە خەڵكی سوورەقەڵات بوو، لەگەڵ ئیبراهیم ناوێك هەر خەڵكی سوورەقەڵات بوو، بەڵام هەڵهاتوو (فیرار) بوو پێشمەرگە نەبوو، كەوتینە كـەمینی هاوبەشـی جـاش و سـەربازەوە، دەنگیـان دایـن و تەقـەیان لـێ كـردین و ئێمـەش دەستمان كردەوە و بەرگریمان كرد، ئەو دوو كوڕەی كە دەرمانەكـەیان پـێ بـوو پێم گوتن ئێـوە ڕاكـەن و دەرمانەكـە بـەرن منـیش مامـەوە و بـەرگریم دەكـرد، خۆشـم بـەهۆی پریشكێكەوە كە دابووی لە قاچم بریندار بـووم، كشامەوە و ئـەوانیش كشانەوە، بـۆ سـبەی بیستمان دوو بۆ سێ كوژراو و برینداریان هەبووە، بەڵام ئەو دوو برادەرە دەرمانەكەیان لـێ بـەجێمابوو، شـەو بیرمـان كـردەوە ئەگـەر دەرمانەكـە دەسـتی بەسـەردا بگیرێـت ئـەو برادەرانەمان لە نەخۆشخانەی سووره قەڵات لە سێدارە دەدرێن، بەرەبـەیان كاتـژمێر چـوار، چوار بۆ پێنج هـەڤاڵمان گەڕانـەوە بـۆ دەرمانـەكان، خۆشـبەختانە لـە شـوێنی خـۆی مـابوو، وادیاربوو هەردوو لامان ڕامان كردبوو بۆیە نەگیرابوو، سوودی زۆرمان لەو دەرمانانە بـینی، چونكە سـەرەتایەكی گـرنگ بـوو بـۆ ئێمـە ئـەم ڕووداوە لـە كۆتـایی سـاڵی ١٩٨٣دا بـوو، كـە پێشمەرگە و هاووڵاتی پێكەوە سوودیان لـێ بـینی بـوو، چونكە ئێمـە بـەخۆڕایی دەرمانمـان دەسـت دەكـەوت، بـەخۆڕایش چارەسـەری هاووڵاتیمـان پـێ دەكـرد، وەك ددان كێشـان و قـاچ وەرگەڕان و قاچ شكان.

دوای شەهید بوونی هەڤاڵ عەلی چوارتایی، هەڤاڵ جوامێر هێنـرا بۆ شـوێنی ئـەو، كـە لە تیپی ٣١ فەرماندەی كەرت بوو، لەو ماوەیە جۆرە ئاگربەستێك هەبوو لـە سـنووری تیپـی ٣٧ لەگەڵ حكومەت بەهۆی بوونی مەرزی میراوا، كە سەرچاوەیەكی داهات بـوو بـۆ ی.ن.ك، بۆیە هەم ئەوان هەم ئێمە بێ جووڵە و چالاكی بووین.

دواتـر ی.ن.ك بـیری لـە ئەنجامـدانی چالاكییەكی گـەورە كـردەوە بـۆ تۆكمەكردنـەوەی ڕیزەكانی پێشمەرگە، ئەویش شەڕی دابان هەلاج بوو، بەنزیكەیی هەموو تیپەكان تێیـدا لـە هەموو شوێنێكەوە بەشدار بوون، تا بە حكومەت بڵێین ئەوە دەرگای دانوستان و شەڕیشمان

دانەخستووە هەردووکیمان پێ دەکرێ، لەو شەڕە ١٧ سەنگەری حکومەت دەستی بە سەرداگیرا و ژمارەیەکی زۆر سەرباز کوژراو و بریندار بوون، ژمارەیەك چەك دەستی بە سەرداگیرا و چەکی قورسی نەگوێزراوە سوتێنران، ئەو کات تەنها پزیشك نەبووم، پێشمەرگەش بووم شەوی وا هەبووە هەتا بەیانی پاسەوانیم گرتووە، جارێك چەك و جارێك جانتا دەرمانەکەم هەڵدەگرت، ئێمە وەك سنووری خۆمان یەك شەهیدماندا کە خەڵکی شاناخسێ بوو، ئێمە لە سەنگەرێك بووین چەند کەسێك بووین یاریدەدەری پزیشك بووین بریندارەیان بۆ دەهێنایین، لە خوارەوەش نەخۆشخانەی سەرگەڵوومان هەبوو، بریندارەکانمان تیمار دەکرد و دەنێردرا بۆ بەرگەڵوو کە نەخۆشخانەی ناوەندی بوو، دەرمانی باشتری لێ بوو، بریندارەکانیش بە تەرەکتۆر و وڵاخ دەگوێزرانەوە لەوێ پزیشك هەبوون وەك دکتۆر شوان، هەرچی تیپی (٣٧)ە تا ساڵی ١٩٨٧ هەر منی لێ بووم، دواتر برادەرێك هات و کەم مایەوە و ڕۆیشت، دواتر دکتۆر موحسینیان بۆ ناردین، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو مایەوە، هاوکات شەماڵی براشی لای ئێمە پێشمەرگەبوو.

لەو ماوەیە لە ماوەت ئەفسەرێك هەبوو ناوی موخلیس بوو زۆر توندوتیژ بوو بەرامبەر خەڵکی، کەوتە وێزەی گەنجان لە مەرکەزی ماوەت بوو کەسوکاری پێشمەرگەی دەگرت، لێرەوە تیپی ٣٧ بیری لەوە کردەوە ئەم ئەفسەرە بکوژن، لەسەر ڕێگای گوندی واژە لە نێوان ماوەت - سلێمانی هاتوچۆی دەکرد، ڕۆژێك هەواڵیان بۆ هێنایین کە سبەی ملازم موخلیس لە ماوەتەوە بەو ڕێگەیە دەچێت بۆ سلێمانی، تیپی ٣٧ کەمینێکی بۆ دانا، پێشتر گوتبوویان لە ئۆتۆمبێلێکی جێب ڤیادیدایە، کە ئۆتۆمبێلەکە هات من بەشداربووم بەس لە پێشەوە نەبووم، کە هات هەموو ئەوانەی لە ناو جێبەکەدا بوون کوژران، بەڵام کاتێك دەچنە سەریان هەموو مۆڵەت وەرگر بوون، بە هەر پێنجیان یەك چەکیان پێبوو، ئەو ئەفسەرە ئەو سەربازانەی بەو ئۆتۆمبێلە پێش خۆی خستبوو، بۆ ئەوەی ئەگەر تەقەشی لێکرا خۆی سەلامەت بێت، ئەوانی بەکارهێنا و خۆی دەرباز بوو، ئەمە بووە هۆی تێکچوونی ئاگربەست، ئیدی حکومەت لە هەرچوارلاوە لە دژی تیپی ٣٧ و لە قەڵاچوالان، ماوەت، سوورەقەڵات و کەناروێوە دەستی بە تۆپ باران کرد، بارەگای تیپ لە کوڕاوێ بوو، بۆ

ماوەیەکی زۆر درێژەی کێشا ویستمان لەبەر مەرزەکە ئاگربەستەکە دروست بکەینەوە، چونکە ئەو کات ی.ن.ك ڕۆژانە چەند هەزار دینارێکی لێوە دەست دەکەوت.

ڕۆژێك دوو سەربازی عەرەب بە چەکەوە پەنایان بۆ هێنایین، ئێمەش نەمانتوانی ڕادەستی دوژمنی بکەینەوە، لە شاخی گمۆ سەنگەریان هەبوو، جگە لەوەش ئێمە لە هەر کوێ بووبین چەکی زیادمان دەدا بە خەڵکی تا لە دۆخی لەناکاو ببن بە هێزی پشتیوانی بۆ ئێمە و فریامان بکەون، لەوانە کەمین و پاسەوانی و چاودێری، چەند کەسێك لەوانەی کە چەکدارمان کردبوون ڕووە و ڕوومان بەڕاکردن دەهاتن و دەیانگوت هات! گوتمان چییە؟ گوتیان سەرباز کەوتە ناو کوڕاوێ، هەڤاڵ جوامێر عەرەبی نەدەزانی، منیش کەمێکم دەزانی، گوتی دکتۆر با بچین بزانین چییە، چووین و بانگی عەریفەکەمان کرد، گوتمان چییە، گوتی دوو سەربازمان ڕای کردووە، پێویستە ڕادەستمان بکەنەوە، ئەو سەربازەش دڵنیا نەبوو ئێمە پێشمەرگە بین، وای دەزانی جاشین، ئێمەش نەماندەویست دووبارە ئاگربەست بشکێنین، چونکە ئاگربەستەکە لە بەرژەوەندییمان بوو، لەو کاتەدا مەفرەزەیەك بە فەرماندەیی هەڤاڵ عوسمان بەرەو پشتی گوندەکە سەرکەوتبوون، لە ترسی ئەوەی نەبادا زۆربن و چواردەورمان بگرن و شەڕ بهێننە ناو گوندەکە، ئەفسەرێکی عەرەب کە لەگەڵ چەند سەربازێك هاتبووەوە خوارەوە کە چاوی بە مەفرەزەکە کەوتبوو، ڕاستەوخۆ دەمانچەکەی دەرهێنابوو دەستی کردبوو بە تەقە، ئەوانیش نەیانکردبوو بەنامەردی یەك گوللەیان پێوە نابوو لە تەپڵی سەری دابوو کوشتبوویان، ئیدی شەڕ دامەزرا، ئینجا کەوتینە دوای سەربازەکان یەك دووانێکیان لێ کوژرا و یەك دووانێکیان لێ بە دیل گیرا و هەندێکیش هەڵهاتن، ئەم شەڕە بە شەڕی کوڕاوێ ناسراوە، مەیتەکانمان بۆ حکومەت ناردەوە تا ئاگربەستەکە تێك نەچێت، ئەم شەڕە لە سەرەتای ساڵی هەشتا و شەشدا ڕوویدا.

دوای دوو ڕۆژ حکومەت لە کونجرین و کوڕاوێ و لە هەموو قۆڵەکانەوە هێرشی بۆ کردین، ئەوبەری کوڕاوێ پێیان دەگوت سیرەمێرگ، هەڤاڵ محەمەد حاجی سەعید چوارتایی و کۆمەڵێك پێشمەرگە پێشیان بە حکومەت گرت، ئێمەش بەبەری کوڕاوێوە پێشمان بە حکومەت گرت، لە خوارەوە کەرتی دوومان هەبوو لە کونجیرین بەریان بە حکومەت گرت، شەڕ بە جۆرێك دەستی پێ کرد لە هەرچوارلاوە برینـدارمان بۆ دەهات، بەڵام کەمیان

مەترسیدار بوو، ڕاستەوخۆ تیمارمان دەکرد، لەم شەڕە پێشمەرگەیەك بەناوی ستار کە خەڵکی سلێمانی بوو شەهید بوو، هەر لە کوڕاوێ ناشتمان، بەڵام ڕەنگە حکومەت لە هەموو قۆڵەکانەوە سەرووی دوو سەد کوژراوی هەبووبێت، لە جاش و لە سەرباز، تۆپبارانەکە بۆ ماوەی نزیکەی یەك مانگ بەردەوام بوو، کەم ڕۆژ هەبوو بریندار نەدەین، لە شەڕەکە ئەم برادەرانەمان بریندار‌بوون: (محەمەد حاجی سەعید، بەکرە بچکۆل، عوسمان ماوەتی، وەستا فاروق... هتد)، وەستا فاروق RBG نابوو بە فڕۆکەوە، هەرچی لەشی هەبوو سووتابوو، هەموو ئەمانە ئێمە تیمارمان کرد، هەروەها حاجی سەراوی پارچە دابووی لە قاچی بەخراپی بریندار بووبوو، دکتۆر حەسەن گەرمیانی بەمەبەستی هاوکاری هاتبوو بۆ لامان، بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لەگەڵ مەفرەزەکەی هەڤاڵ مەحموود سەنگاویدا بوو، لە گوندی وەڕاس دوو شەهیدیان دابوو، یەکیان ناوی (مەلا ڕەحیم) بوو، ئەو هێرشەی گوندی وەڕاس لە بەیانی کاتژمێر چوارەوە هەتا دوازدەی نیوەڕۆ درێژەی کێشا بوو، فڕۆکە تێیدا بەشدار بووبوو، جاش و سەرباز پێکەوە هێرشیان کرد بوو، جگە لە دوو شەهیدەکە سێ بریندار هەبوو، هێنایان تیمارمان کردن، پارچە بەر قاچ و شان و سەریان کەوتبوو، چونکە فڕۆکە زۆر بەخراپی بۆردومانی کرد بوو، هۆکاری ئەوەی برینی بریندارەکان شان و مل بوو، ئێمە سەنگەرمان لێدەدا و هەموو لەشمان بەدەرەوە نەبوو، بۆ نموونە شەهید محەمەد حاجی سەعید حەوت جار بریندار بووە، سێ بۆ چوار جار خۆم چارسەرم کردووە، خۆشم سێ جار بریندار بووم، بە گشتی لە تیپی ٣٧ کەم کەس هەیە بریندار نەبووێت، ئیدی دوای ئەو مانگە لە شەڕ گوندی کوڕاوێ داگیرکرا، هەڤاڵ عوسمانی ڕابە برینداربوو شانی پارچە لێی دابوو بێ ئەوەی پاڵی بخەم بە پێوە دووریومەتەوە، جگە لەوەش هەموو دەرمانەکەی ئێمە بە کۆڵمانەوە بوو، بوتڵێك پاکەرەوە و پێداویستی سارێژکاری و لەفاف و دیتۆڵ و دەرزی دژە هەوکردن، زۆرجار ڕێکخستن دەینارد و هەندێکجاریش خۆمان پەیدامان دەکرد، پێویستە بڵێم (ی.ن.ك) لە ڕووی ڕێکخستنەوە زۆر بەهێز بوو، ڕێکخستنەکان لە هیچ نەدەترسان، ئێمە بەو شەڕە دەڵێین داستانی کوڕاوێ، ئەو کات هەڤاڵ فەرهاد سەنگاوی لە ئێزگەوە باسی دەکردین، ئێمە سنوورەکەمان بۆ گەشە بچووك بوو، لە چوار کەرت

پێکهاتبوو، بەشی کۆمەڵایەتیمان هەبوو چوار کەس بوون، کەرتی ڕێکخستنمان هەبوو لەگەڵ ناوچەی شۆڕشگێڕان، کۆی گشتی لە نێوان ٦٠ بۆ ١٠٠ کەس دەبووین.

هەر لە ١٩٨٦ فڕۆکە لە میراوا بۆردومانی کردین، هەڤاڵ عوسمانی ڕابە و سێ پێشمەرگەی دیکە بریندار بوون، یەکێکیان ناوی هەڤاڵ شۆڕش بوو، یەکێکیشیان ناوی هەڤاڵ تەها بوو، دواتر لە کوڕاوێ کشاینەوە لە نێو دۆڵێکدا بە سەر پێوە سارێژکاریم بۆ کردن، هەر هەمان ڕۆژ هەڤاڵان، سەلیم ئاغا و بەکر فەتاح کە لەوێ بەرپرس بوون گوتیان ئێمە پاشەکشە دەکەین، پێویستە بچن لە ماوەت وڵاخ بێنن، لە نێوان میراوا بۆ ماوەت دوو کاتژمێر ڕێگە بوو، دەبوو ئەو شەوە بچین پەیدای بکەین و بیهێنین بۆ میراوا یەکسەر باربکەین و بڕۆین، هێزی بەرگریمان کەم بووەوە، بۆیە پاشەکشەمان کرد، من و هەڤاڵ عوسمان ماوەتی کە پارچەیەکیش بە شانییەوە بوو لەگەڵ دوو برادەری دیکە چووین لە ماوەت وڵاخمان پەیدا کرد، هاتینەوە و بارمان کرد و چووینە گوندی سەفرە بە بەری شینکایەتی ماوەتەوە، بۆ ماوەیەك بارەگامان لەوێ دانا.

هەموو ڕۆژ لە ماوەتەوە تۆپبارانی بارەگاکانی هەڤاڵ مام جەلال لە یاخسەمەر و سەرگەڵوو و بەرگەڵوو دەکرا، تیپی ٣٧یان نارد تا تۆپبارانی ئەو ناوچەیە بکەین، هاوانێك و ٢٧ گوللەمان هەبوو بە وڵاخ گواستمانەوە بۆ پشتی ماوەت تا لە حکومەت بدەین، دوو سێ ڕۆژ ماینەوە حکومەت هیچ تۆپبارانێکی نەکرد، پێمان ڕاگەیەندرابوو تا حکومەت تۆپ هەڵنەدات ئێمەش تۆپباران نەکەین، ئێوارەیەك حکومەت دەستی کرد بەتۆپبارانی یاخسەمەر و سەرگەڵوو و بەرگەڵوو، ئێمەش بە هاوەن دەستمان کرد بەتۆپباران، تۆپێکی ئێمە دابووی لە ماڵێك لە نزیکی سەربازگەکە، بەدەستی ئێمە خاوەنی ماڵەکە شەهید بوو، چەند کەسێکان کەمئەندام بوون، بە تەمەنی ناو تیپەکەی ئێمە من و هەڤاڵ حەمە هەژار و سێ چوار برادەری دیکە بووین کە لەدایك بووی ١٩٦٢ بووین، هەمووی لە ئێمە منداڵتر بوو لە کاتێکدا باسی ١٩٨٥ و ١٩٨٦ دەکەم.

دوای ئەوەی لە سەفرە ماینەوە بریندارانی ناوچەکانی دیکەیان بۆ دەهێنایین، لە وڵاخلوو بەشداریمان لە شەڕێك کرد و پێنج بریندارماندا، یەکێك لەوان ناوی هەڤاڵ کاروان بوو قاچی لایەکی لێ ببووەوە بۆیمان سارێژ کرد و دووریمانەوە و چاك بوویەوە، دواتر

گەڕایەوە بۆ بەرەی شەڕ و شەهید بوو، تا چووینە شاناخسێ هەر خۆم بووم وەك دكتۆر و برینپێچ، هەر ئەو ماوەیەی لە سەفەرە بووین حكومەت هێرشی كرد هەتا من و جەلالی ئامۆزام لە پێشی پێشەوە بووین لەگەڵ كوڕێك كە ناوی عەتا بوو، ئەوكات مەفرەزەكان بچووك بوون لەبەر هێرشی فڕۆكە تا زیان كەم بێت، ئێمە هەر سێكمان شەڕێكی دەستە و یەخەمان تووش بوو (RBG)ـیەك و بیست گوللەمان پێ بوو، هەر یەكە و چەكی خۆمانیش پێ بوو، ئەو ڕۆژە تا نیوەڕۆ هەر جارێك كۆمەڵ دەبوون، بە (RBG)یەكە لێمان دەدان ڕەنگە بیست سەربازمان كوشتبێ، بۆ شەوەكەی پاشەكشەمان كرد، چونكە نە ئالوگۆڕ دەكراین نە چەكمان بۆ دەهات، هەر ئەوەندە چەك و فیشەك بوو كە پێمان بوو، دواتر بەرەو گوندی زەروون بەڕێكەوتین، بینیمان چەند چەكدارێك لە ناو گوندەكەن وامانزانی جاش گرتوویەتی، بوو بە تەقە، كەسێك بریندار بوو كە چووین بینیمان سەربازێكی هەڵهاتوو (فریرا) بوو، ناوی قادر بوو، من سارێژم كرد دەستی شكابوو، بە تەختەی سندوقی سێو قۆڵیمان بۆ هەڵبەستەوە كە بە چەقۆ چاكمان دەكرد، لە هەر چوار لای دەستیمان دەدا، تا دەستی خوار نەبێت، لۆكەمان دەخستە سەر برینەكەی، بە لەفاف دەمان پێچا، تا دەگاتە نەخۆشخانە، ئێمە پەڕینەوە و چووینە شاناخسێ ڕۆژانە تۆپباران هەبوو شەهید و برینداری زۆرماندا، لە كۆتایی ١٩٨٧ حكومەت بەكیمیایی لە شاناخسێیدا، هاوكات لە مالومە، سەرگەڵوو، بەرگەڵوو، بالیسان، سێوسێنان و گۆپتەپەیدا، ئیدی بەردەوام لە شاخی گمۆوە لەسەر تیپی ٣٧ تۆپباران هەبوو، ئێمە بریندارمان زۆر بوو ژوورێكمان ڕێكخست، ئێرانیش دەرمانی پێ دەدان، ڕۆژانە بریندارمان تیمار دەكرد.

هەرچی داستانی ڕزگاری و قەیوان ماوەتە، ئێمە لە شاخی گوڵێ لە پشتی ماوەت شەڕێكی دەستەویەخەمان لەگەڵ حكومەت كرد، دواتر تێكەڵكرا ناویان نا شەڕی قەیوان – ماوەت چونكە لە هەردووكی شەڕ هەبوو، كە ناوچەیەكی فراوان بوو سێ مانگ زیاتری خایاند، لەو شەڕە هەڤاڵ سەلیم ئاغا بریدار بوو، قۆڵی شكابوو، قۆڵیم هەڵبەستەوە و سارێژكاریم بۆ كرد، هەڤاڵ سەلام من تیمارم كردووە، شەهید بەهادین پیشتر بریندار بوو تیمارم كردووە، هەروەها هەڤاڵ ڕزگار بریندار بوو تیمارم كردووە، دواتر شەهید بوو، هەڤاڵ جەمال عەلی گوللە لە دەستی دابوو خۆم بۆم تیمار كردوو و بۆیم دوورییەوە، كە

سارێژکردن و ئاو هەڵواسین و دەرزی دژە ژەنگمان بۆ دەکرد، لە شاخی ماوەت نزیکەی ١٠ بریندارمان هەبووە، بریندارێك لە کەرتی دوو، سێ بریندارێش لە کەرتی تیپ، هەڤاڵ عەبدوڵڵا وسوو و هێزێك هاتن نزیکەی دە ڕۆژ بەرەیەکیان لێ وەرگرتین زۆر باش بوو بۆ ئێمە، ئەوانیش بریندارێکیان هەبوو بەناوی هەڤاڵ ڕەحیم باوزێیی بریندار بوو من تیمارم کرد گولله لە قاچی دابوو بەس نەیشکاندبوو، هەروەها هەڤاڵ عەبدوڵڵا مەحموود هاوەنێك دابووی لە نزیکی کاسی کردبوو، هێنایان گوتیان چی لێ بکەین؟ منیش کە سەیرم کرد، ڕەنگی تێکنەچووبوو، ڕەنگی چاوی تێکنەچووبوو، مەترسی مردنی لەسەر نەبوو، سپرایەکمان پێ بوو لە لووتیماندا، یەك ئاوی موقەتەرمان پێ بوو لێماندا، (کە شتی وا نابێت، بەس من نەمگوت دەرزیمان نەماوە)، کە هۆشی هاتەوە، بینی گۆشت هەڵواسراوە کە بەراز بوو کوشتبوومان جنێوی بە سەرتیپەکەی خۆیاندا گوتی بۆ خۆتان گۆشت دەخۆن و ئێمەش نانەوردە دەخۆین، لەو هێرشە گەورەیەی کە کرایە سەرمان نزیکەی ٤٠ بۆ ٥٠ جاش کوژران، دواتر ئێمە کشاینەوە، توانای بەرگریمان هەر ئەوەندە بوو، چووینەوە بۆ شاناخسێ، بریندارێکی دیکە بەناوی هەڤاڵ بەکر ڕیخۆڵەکانی هەوی کردبوو، لەناوەوە برابوو، دوای تیمار و چارەسەری سەرەتایی، گوتیان کاکە با بەجێی بهێڵێین، گوتم کاکە شوورەییە جێهێشتن نییە، بە دوو دار بەتانییەکمان بۆ کردە دارەمەیت، سێ کاتژمێر بە هەورازدا ڕووەو سەر سەرمان خستووە، خۆشبەختانە دواتر بە وڵاخێك ناردمان بۆ ئێران، تا ئێستاش ماوە خەڵکی گوندی قەشانی لای ماوەت بوو، ئەمەش سیفاتی پێشمەرگە بوو، هەروەها دیلی دوژمنیش کە دەگیرا نەدەکوژرا و دەبوو بەئەندامێکی پێشمەرگە.

لە شەڕێکی دیکەدا لە شاخی زین و سپی، کە هەر لە داستانی ڕزگاریدا بوو ئێرانییەکان ویستیان بچن ئەو شاخە بگرن، هەڤاڵ عەبدوڵڵا وسوو و هەڤاڵەکانی لەو شاخە بوون، پێشمەرگەیەك هەبوو بەناوی هەڤاڵ حەمە مۆریاسی کاتی خۆی مستەشار بووە، ساڵی ١٩٨٦ بە خۆی و فەوجەکەیەوە هاتە ناو پێشمەرگە، ئەم شەڕەش ساڵی ١٩٨٧ بوو، هەڤاڵ حەمە مۆریاسی لەگەڵ ئێمە هات بۆ بێترخێ بۆ ئەوەی بچین هەڤاڵ عەبدوڵڵا وسوو بگۆڕین، هەڤاڵ ئارام لەوێ بوو کە یاریدەری پزیشك بوو لەگەڵ حەمە مۆریاسی بوو، ئیدی هەر لە هەنگاوی یەکەمدا کەوتینە کەمینەوە، لێدراین و دەرمانەکەمان لە وڵاخێك بار

کردبـــوو، ولاخەکـــە بەرکـــەوت و گیـــانی لەدەســـتدا و دەرمانـــەکانیش کـــەوتن، مـــن و پێشـمەرگەیەکی دیکـە چـووین دەرمانـەکان بهێنینـەوە، هـەر لـەوێ حـەوت برینـدارمانـدا، هەڤاڵان حەمە هەژار، بەکر فەتاح، تـەها مـاوەتی و عوسمـان لـە برینـدارەکان بـوون لێـرەدا دەمەوێت ئەو دیمەنە بگێڕمەوە: **"بە تاریکی بەبێ ئەوەی بتوانین لایت هەڵبکەین، چونکە هەر چوارلامان کەمین و سەرباز و جاش بوو، ئاشکرا دەبووین، ناچار بەتاریکی بەدەست بە لەشی بریندارەکەدا دەگەڕاین تا دەستمان بەر برین و خوێن دەکەوت و پەنجەمان دەکرد بە برینەکەدا بەوە دەمانزانی برینە هەر بەو تاریکییە تیمارم دەکرد، بریندارەکە بۆی نەبوو بەهاواریش کەمێك ئازاری خۆی بشکێنێ و ئەو ئازارەی دەخـواردەوە، ئیـدی بهێنـە پـێش چاوی خۆت ئەو دیمەنە چۆن بووە!"** پێشمەرگەیەکمان بەناوی هەڤاڵ زەردەشت برینەکەی سووك بوو، خەڵکی هەولێر بوو، ئێمە لە برینە قورسەکانەوە دەستمان پێ دەکرد، هەنـدێك لە دەرمانەکانمدا بە دکتۆر ئارام تا ئەویش لەو لاوە کاری خـۆی بکـات، ئـەو زەردەشـت نـاوە گوتی لەبەرئـەوەی مـن هـەولێریم بۆیـە تیمـارم ناکـەن، گوتم کاکـە گیـان هیچـتان بـۆ مـن جیاوازیتان نییە، من لەم شیوە کاتژمێر دووی شـەوە ئێـوە تیمـار دەکـەم هێشـتا منـەتم بـە سەردا دەکەن؟ تۆ برینەکەت خوێنی لێ ناڕوا، هی ئەوانی دیکە شکاوی تێدایە، خوێنیان لـێ دەڕوا، یەکێك لەوانە ناوی هەڤاڵ کامەران بوو، قاچی لە خـوار ئـەژنۆی بـە سـێ سـانتیمەتر شکابوو بە تەختەی سندوقی سێو بۆم گرتەوە، بەو پێداویستییە سەرەتاییانە وام کرد چاك ببێتـەوە ئێسـتاش مـاوە و بـە ئاسـتەم دەشـەلێت، ـ ئێسـتا کـە لـە شـەقامی ئـۆرزدی شـاری سلێمانی دەیبینم بەگاڵتەوە دەڵێت ئەو قاچەم هی تۆیە، خۆشـبەختانە زۆربـەی ئەوانـە لـە ژیاندا ماون، کە بۆ خۆی خۆشبەختییە بۆ من ـ.

هەر لە زینی سپی بۆ ڕۆژی دواتر سێ شەهید و حەوت بریندارماندا، هێنایانن بـۆ لای ئێمە، پاسەوانەکەی ئێمە هاواری کرد سەربازی لێیە، بۆیان چووینە خـوارەوە بینیمـان دوو سەربازن، چەکەکانیان بەرز کردەوە و خۆیـان ڕادەسـت کـرد هێنامـان برادەرێکمان دەیگوت دەیـانکوژم نەمانهێشـت، چـونکە شـەڕیش یاسـای هەیـە لـە ڕووی مرۆڤایەتییـەوە نابێـت بکوژرێت، دواتر دیل بەدیلیان لەگەڵ پێشمەرگەیەکدا پێ کر، بۆ مەگەر ئەمە باشـتر نـەبوو لە کوشتنیان!

له ساڵی ١٩٨٨ به مەبەستی سارێژکردنی بەرکەوتووانی کیمیایی لە شاخی شنروێ بۆ هەڵەبجە براین، نزیکەی چل بۆ پەنجا سەربازی پێوەبوو، ڕۆژی یەکەم کە بوو بەشەڕ هەموویانمان بە دیل گرتن، نزیکەی ٤٥ کەس بوون، تفەنگێکی (فاست)مان دەستکەوت، شەهید محەمەد ویستی تاقی بکاتەوە، فیشەکێکی پێ تەقان دای لە دارێك و پارچەیەکی بەر خۆی کەوت و لەوێ شەهید بوو، لە کیمیاییەکە نزیکەی دوو سەد بۆ سێ سەد بەرکەوتەم تیمار کردووە، بریندارێك بەناوی مەجید پارچەی بەرکەوتبوو دابووی لە قۆڵی نیوەی قۆڵی بڕی بوو، ئەو بەشەی قۆڵی کە مابوو خۆی بە چەقۆ لێی کردبووەوە! ئێمە برینەکەیمان بۆی پاك کردەوە، بەس نەمان دووریەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر کیمیایی پێوە بوایە دەچووە خوێنەکەیەوە و دەیکوشت، ئیدی ڕەوانەی ئێرانمان کرد، هەڤاڵ قادر خەبات لەو ڕووداوە لەوێ بوو زیاتر لە سەد بریندارى کیمیاییمان شۆردووەتەوە، ئێرانییەکان لەسەر خۆپاراستن لە کیمیایی چەند خولێکیان بۆ کردینەوە، ئێمە وەك تیپی ٣٧ زۆربەمان ڕووپۆش (ڤیناع)مان هەبوو، پێشمەرگەش متمانەی بەوە نەبوو ئەم جلە لەبەر بکات دەیپارێزێت، ئەوەی لەبەری دەکرد دەیپاراست، ئێمە لە هەڵەبجە لەو شوێنەی لێی بووین حەوزێکی ئاوی لێ بوو، دەبوو بریندارەکان بشۆرینەوە، ساردبێ، یان گەرم چارە نییە، چونکە چارەسەری سەرەتایی کیمیایی تەنها شۆردنەوەیە، ئەوەی چووەتە سییەکانیشەوە ئیدی چارەسەری نەبوو، بەس بۆ بەشی ڕووکاری دەرەوە شۆردنەوەکە چارەسەر بوو، من خۆم هەر زوو ڕووپۆش (ڤیناع)م لەسەر کرد، بەڵام ئێستاش هەموو پایزێك سییەکانم هەو دەکات بە مانگ دەکۆکم، کە کاریگەری کیمیاییە، شەش بۆ حەوت ڕۆژ ماینەوە دەبینین مەیت لەسەر شەقام کەوتووە، کارەساتێکی زۆر خراپ بوو، جارێك بە ناو هەڵەبجەدا ڕۆیشتین بینیمان ئۆتۆمبێلی سەربازی بە سەر مەیتدا ڕۆیشتیبوو، کەس نەدەچەمایەوە مەیتیش لابدا، دواتر گەڕاینەوە بۆ شاناخسێ.

لە گەڕانەوەمان بۆ شاناخسێ کیمیایی لە شاناخسێیدا هێشتا لەو پاسە دانەبەزی بووین کە لە بانەوە پێی هاتبووینەوە، بە برادەرانم گوت، کوڕینە ڕووپۆش (ڤیناع) ببەستن ئەو بۆردومانە کیمیاییە، گوتیان کاکە کیمیایی چی تۆ لە هەموو شوێن پێمان دەڵێی کیمیایی... کیمیایی، گوتم کاکە ئارەزووی خۆتانە، بیبەستن نامرن، نەیبەستن تووشی کێشە

دەبن، من لەبەرچاوی ئەوان ڕووپۆش (قیناع) و بارانگیر و دەستکێشم دەرهێنا و لەبەرم کرد، ئەمە بەهاری ساڵی ١٩٨٨ بوو، دکتۆر کاوە بریندار بوو کە خەڵکی گوندی گوڵێی لای ماوەت بوو لە ١٩٨٧ گواسترابوویەوە بۆ تیپی ٣٧ وردە وردە لای ئێمە ئەزموونی زیاتری وەرگرت بوو، کە دەرچووی پەیمانگای تەندروستی بوو، هەروەها بۆ خۆم بریندار بووم، دکتۆر هادی ساڵح سەعید لەوێ شەهید بوو لەوێ ناشتمان، ئێمە ئاگادار نەبووین برادەران لە چەند لایەکەوە گەڕاونەتەوە بۆ شاناخسێ ڕاستەوخۆ مووشەکەکە دابووی لەناو بارەگاکە، زیاتر لە ٣٠ – ٤٠ شەهید و ٥٠ – ٦٠ پێشمەرگە بریندار بوون، لەوانە هەڤاڵ سەیید ئەحمەد بریندار بووبوو، هەڤاڵ ئاسۆی شێخ عارف کوڕاوێ فەرماندەی کەرت بوو بریندار بووبوو، دواتر بەو برینەوە شەهید بوو، هەڤاڵ عومەر دڕەیی بریندار بووبوو، مامۆستا ڕەئووف و شێخ عەزیز شەدەڵەیی شەهید بوون، ئیدی دوو ئۆتۆبۆسی گەورەمان پڕ کرد لە بریندار و بردمان بۆ ئێران و نەخۆشخانەکانی بانە، تاران و کەرەج، بەشێکیان لەوێ شەهید بوون، هەر نەمانزانی مەیتەکانیان چی بە سەر هات.

لە مانگی ٧ی ١٩٨٨ لە بانەوە هاتینەوە چووینە قەندیل و پێیدا هەڵگەڕاین و چووینە مەڵبەندی سێ لەوێ بۆ گوندی گەڕەوانی خواروو لە شاخێك ئەشکەوتێکی لێیە پێی دەڵێن (ئەشکەوتە سوور) ئێمەیان بردە ئەو شاخە بەرامبەر حکومەتی عێراقی، لە گەرمەی هاویندا ٤٥ ڕۆژ لەوێ بووین، ژیانی ئەو ٤٥ ڕۆژە بەس گێڕانەوە ئاسانە، چەند بریندارێکماندا لەوانە هەڤاڵان: تەها، مستەفا و ئاسۆ، لەوێ من تیمارم کردن، هەڤاڵ مستەفا قاچی شکابوو ورد بووبوو بۆم هەڵبەستەوە، ناردمانەوە بۆ ئێران ٤ ڕۆژ بە پشتی وڵاخەوە بوو، ئیدی من و هەڤاڵ حەمە هەژار و سێ بۆ چوار هاوڕێ بووین، ڕادیۆم کردبووە گوێم لێدەگرت، جگە لەوە پەرتووکێکیشم بەدەستە بوو دەمخوێندەوە، بەناوی سێ کوچکەی بەعسییان، کە بووبوو بە خوو بۆم لە هەموو شوێن پەرتووکی خۆم پەیدا دەکرد، جگە لەوە تۆپبارانیشمان لەسەر بوو، ئیدی ئەم دیمەنە بهێنە پێش چاوی خۆت، ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ بوو کاتژمێر ١١ی نیوەڕۆ بوو، بەڕێکەوت ئەم وتەیەم لە ڕادیۆکەوە بەر گوێ کەوت و گوتی: **"خومەینی دەڵێت کوپە ژەهرەکەم خواردەوە"**، یەکسەر بانگی هەڤاڵ حەمە هەژارم کرد گوتم سوێند بێت بە قورئان مێژوو دووبارە دەبێتەوە و ئاشبەتاڵەکەیە! گوتی

چۆن؟ گوتم خومەینی دەڵێت واز لە شەڕەکە دەهێنم و پاشەکشە دەکەم، ئیدی ئێمە دەدەنەوە بە عێراق و دیموکراتەکانیش دەدەنەوە بە ئێران، بۆیە ئێمە تیاچووین، ئیتر وەرە بگەڕێرەوە بۆ ئێران ئەو هەواڵە زۆر قورس بوو بۆ ئێمە، لە شوێنێکی زۆر دوور بە پێ بە ڕاکردن لە گەڕەوانەوە بگەڕێرەوە بۆ ئێران کە بە ٤ ڕۆژ ناگەیتەوە ئێران، لەو ماندوێتیی و برسێتییە، ماڵەکان دەگەڕاین ئەگەر ئاردمان بدۆزیایەتەوە دەمان کرد بە نان.

ئیدی بڕیاری گەڕانەوەماندا، هاتینە قرناقە و پشتئاشان، بۆ بەیانی من و چەند کەسێکی دیکەیان مۆڵەت پێ دا، ئیدی لەو شەڕە هەڤاڵ ئازاد هەورامیی شەهید بوو لە شاخێك بەناوی کونەکۆتر، ئێمە پاشەکشەمان کرد و بەشێك لە تیپی ۳۷ مانەوە، ئێمە چووینەوە بۆ شاناخسێ، ئێرانیش کشایەوە، سوپای عێراقیش هاتبووە شوێنەکانی ئێمە، ئێمە چووینە شاری بانە و دواتر گوندی زەڵێی بانە، لەوێ خانوومان بەکرێ گرت، دکتۆر موحسین لەوێ بوو پیاوێکی ئازا و بوێر بوو، لەوێش هاووڵاتی دەهاتە لامان، چارەسەرمان دەکرد، بەتایبەت لە ئەنفال کە خەڵك سەررێژی کرد دەرمان بەرنەدەکەوت، ئێرانیش دەرمانی پێ دەداین.

جارێك فێڵێکی زۆر گەورەمان لە ئێرانییەکان کرد، ئێرانییەکان تیپێکیان هەبوو بە ناوی ۳۷ی ئەبوفوزڵ، زۆرێك لە پاسداری ئەوێ بووبوون بە هاوڕێمان، کوردێکی فەیلی بەناوی دەروێش خەڵکی کرماشان بوو پاسدار بوو بەرپرسیش بوو، گوتی ئەوە دکتۆر ئیبراهیم بۆ نایەیت دەرمانەکەتان ببەیت؟ گوتم دەرمانی چی؟ گوتی لەم ڕۆژانەدا یەك هێلیکۆپتەر دەرمانتان بۆ هاتووە بە ناوی تیپی ۳۷، لە ڕاستیدا بۆ تیپی ۳۷ی ئەبولفەزڵی خۆیان بوو، بەڵام لێی تێکچوو، منیش زانیم هەڵەیە بەس گوتم لە کوێیە دێم؟ پێی گوتم، ئیدی چەند کەسێك چووین، یەك پیکابمان لێ بار کرد و هێنامان، شاگەشکە بووین، کەچی بۆ خەڵکمان بوو، سەدان کەسمان لە ددان ئێشە و قاچ شکاوی و دەست شکاوی و برین و بەرکەوتەی کیمیایی پێ چارەسەر کرد، هەر لە تیپی ۳۷ نزیکەی ۳۰ کەسمان بەر کیمیایی کەوتبوون، تا ساڵی ۱۹۹۰.

لە ساڵی ۱۹۹۰ هەڤاڵ غەریب هەڵەدنی بوو بە پارتیزان، منیش پیاوێکی بە جووڵە بووم ساڵ و نیوێك دەبوو لە بانە دانیشتبووم، بڕیارمدا لەگەڵ ئەو برادەرانە بگەڕێمەوە،

مانگی دووی ساڵی ١٩٩٠ بوو لە سەردەشتەوە بە ئەشکاندا و بە سەفرە و زەروون و شاخ و شاخ من و هەڤاڵ عوسمان و برادەرێکی دیکە بووین، چووین بۆ لای هەڤاڵ غەریب هەڵەدنی و لە خوارەوە بووین ئەوانیش چوار کەس بوون بۆ بێتڕخێ هاتبوون بە دووماندا، بەفر لە سەرووی ئەژنۆوە بوو، خواردنێکی کەم لە نان و خورمامان پێ بوو، دوو شەو و دوو ڕۆژ لە یەك ڕۆژە ڕێگایەکدا بووین دەرنەچووین، بەماندوویێتی ڕۆیشتینە خوار هەتا کۆتا ڕۆژ بڕیارماندا ئەو گوێدرێژە سەر ببڕین کە پێمان بوو، یەکی پارچەیەکی بچووك شەکری کلۆمان پێ بوو، شەو لە لای گەرمکانەوە بە ڕەبیەیەکدا ڕۆیشتین، پاسەوانەکە هاتە دەرەوە بە ئاشکرا چاوی پێمان کەوت، کەچی دەنگی نەکرد، کە حەوت کەس بووین هەمووی سی مەتر لێیەوە دوور بووین، دواتر بیستمانەوە خۆی باسی کردبوو، کە چەند پێشمەرگەیەك بە بەرچاویدا ڕۆیشتوون دەنگی نەکردووە، ئەو کورد بوو خەڵکی مەرگە بوو، هاوڕێکانی ژوورەوەی ڕەبیەکەی عەرەب بوون.

ئێمە ڕۆیشتین و چووینە کانیبی، کونە بەردێکی لێ بوو هەر حەوتمان چووینە ناوی، کەمێك لە ڕێگاوە دوور بوو، ئیدی هێزمان لێ بڕا، کە لە ئێوارەوە هەتا چواری بەیانی بەڕێگاوە بووین، ئیدی بڕیارماندا ئەگەر ئاشکراش بین نەڕۆین، هیچیشمان پێ نەبوو جگە لە پارچە شەکرەکە، کە هەر کەس هی خۆی پێ بوو، ڕێکەوتین تا سبەی نەجووڵێین، لەو بەرەوە گوێمان لە دەنگی سەگێك بوو پێمان دەوەڕی، کە ڕۆژ بووەوە تەماشامان کرد بزانین ڕەبیەی لێیە، یان چی لێیە وا ئەم سەگە هەر دەوەڕێت، کە تەماشامان کرد بینیمان سەگێکی بە وەفایە لەسەر خانووە ڕووخاوەکەی خاوەنەکەی کە بووبوو بە کەلاوە هێشتا هەر پاسەوانی خانووەکەی دەگرت، هەر کەسێك لەوێ ڕۆیشتبا پێی دەوەڕی، واتە لە ١٩٨٨ بۆ ١٩٩٠ کە نزیکەی ساڵ و نیوێك ئەو سەگە بە دیار ئەو خانووەوە مابووە و خۆی ژیاندبوو، بۆیە لەو هەموو گەلە جاشە بەوەفاتر بوو کە کورد هەیبوو، کە تەقەیان لە خەڵك و وڵاتی خۆیان دەکرد و وڵاتی خۆیان دەسووتان، ئیدی ئێمە بە شیوێکدا هەڵگەڕاین قوتوویەکی موعەلەبات ئاو هێنابووی هەڵمان پچڕی، دۆشاوی خورمابوو، کە خواردنی بەبرسێتی زۆر خراپ بوو کەچی خواردمان، دواتر هەر دەڕۆیشتن و قووتووی موعەلەباتی دیکە لەوانە پەتاتە و گۆشتمان دەدۆزیەوە دواتر زانیمان لەسەرەوە ڕەبیە هەبووە کە

بەسەرچووە فرێدراوەتە خوارەوە ئاو هێناویەتی، ئێمەش دەمانخوارد، ئیدی ئێمە چوار مانگ پارتیزان بووین، جگە لە خۆمان و سەرباز و شاخ بەولاوە کەسمان نەدەبینی، کاتێک برسێتی برستی لێ برین، گەیشتین بە چەند مانگایەك کە لە ١٩٨٨ەوە بێ خاوەن مابوونەوە کێوی بووبوون، کە مرۆڤیان دەبینی تا دەیان توانی غاریان دەدا، هەڤاڵ غەریب قەناسەی پێ بوو، تەقەی لە گوێرەکەیەك کرد و کوشتی و هێنامانە خوارەوە بە بێ خوێ دەمان برژاند و دەمانخوارد، تێرمان خوارد و پێچامانەوە بردمان، چووینەوە بۆ ئەو ژوورەی کە بۆ مانەوە ئامادەمان کردبوو، لەو چوار مانگە (مین)مان دەنایەوە بۆ سەربازی حکومەت، نزیکەی ٨٠ کەسێکمان ڕەنگە بەو ٤ مانگە لێ کوشتبن، لەوانە لە مینێکدا فەرماندەی لیوایەکمان لێ کوشتن.

لە نەورۆزی ١٩٩٠ ئاردمان لە پیرەمەگروونەوە بە کۆڵ هەڵگرت و بۆ سووورداش بردمان تا نزیکی ئەشکەوتەکە بردمان، بەهۆی سەختی شوێنەکەوە کە زۆر بەرزبوو، بۆمان نەچوو، بۆ بەیانی حکومەت هاتبووە ئەو ناوچەیە، خەڵکیش لە سەیراندا بوو، لە سووورداش چوار کۆپتەر بەسەرماندا دەسووڕایەوە ئێمەش لە کونەبەردێکدا بە دووربین تەماشامان دەکرد، ئاردەکە کە بەجێمابوو، ئەفسەرێك بە نزیکەی پازدە سەرباز و دوو جاشەوە سەرکەوتن و جاشەکە ئاردەکەی دۆزیەوە، گوتی سەیدی وەرە ئاردەکەیانم دەستکەوتووە، ئەویش گوتی وەرە خوارەوە وازبهێنە، ئێمەش سەد مەترێك دووربووین، دەمانتوانی بیکوژین، بەلام ئاشکرادەبووین، سووربوو لەسەر ئەوەی بماندۆزێتەوە، ئەفسەرەکەش گوتی بابە بیڕێژە و وەرە خوارەوە یەخەمان بەربدە، ئەویش ڕشتی کە ئێمە بە کۆڵ بەو ڕێگا دوورەدا بردبوومان.

ئیدی لە ماوەی پارتیزانیدا کەسێکمان بە ناوی هەڤاڵ ئاسۆ بریندار بوو، تیمارم کرد، دواتر کرمێکی ڕەشی تووکاوی هەیە ژەهراوییە پێی دەڵێن (هەڕێ) بە پێشمەرگەکاندا هەڵگەڕابوو، گیانیانی کرد بوو بە تلۆق، دەرمانمان پێ نەبوو، ناچار بەچارەسەرێکی کوردەوارییانە گوتم بڕۆن بە پنگ (پونگە) خۆتان بشۆن، جۆرە گیایەکە لەگەڵ هێلکە و کۆمەڵە شتێك دەشخورێت، حەساسیەتی دەشۆردەوە، بەوە چاك بوونەوە.

لە کۆتاییدا دەڵێمماڵی ئێمە چوار برا و چوار خوشك بووین، دوو برای دیکەم بۆ ماوەیەکی کەم پێشمەرگە بوون، براکەی دیکەم فیرار بوو، باوکیشم لەسەر من مانگ و نیوێك زیندانی کراوە، ئێستا کۆچی دوایی کردووە، لە ١٩٩١ ژیانی هاوسەرگیرم پێکهێنا، تا لە شاخ بووم هاوسەرگیریم نەکرد، نەمدەویست خێزان دروست بکەم، چونکە ئەوەم لێك دەدایەوە، ڕەنگە شەهید ببم.

لە ساڵی ١٩٩١ دوای پاشەکشە لە ماوەت بارەگای هەڤاڵ مام جەلال لەوێ بوو، منیش خەڵکی ماوەتم لەسەر داوای هەڤاڵ مام جەلال بووم بە لێپرسراوی پەیوەندییەکانی ی.ن.ك لە بانە، ساڵ و نیوێك لەوێ بووم، کە هاتمەوە لە لیوا تێکەڵەکان بووم بە پێشمەرگە بە پلەی نەقیب، دواتر بووم بە لێپرسراوی کارگێڕی و دارایی فەوجی سێی لیوای ٢١ی شارباژێر، دواتر لیوای دووی تایبەت دروستکرا، تا ١٩٩٥ لەوێ بووم، لە ساڵی ١٩٩٥ تا ٢٠٠٥ سەرۆکی شارەوانی ماوەت بووم و بڕوانامەکەم لە تەندروستی کشاندەوە و پەیوەندیم بە تەندروستییەوە نەما، هەروەها یەکەم سەرۆك شارەوانی بووم لەسەر ئاستی کوردستان کە دوای ئەوەی نەمتوانیوە خزمەت بکەم دەستم لە کارکێشایەوە، تا ئێستاش هەر نەچوومەتەوە بۆ ئەرك، لە حیزبدا تا پلەی ئەندامی مەڵبەندم بڕیوە، لە ٢٠٠٥ لە مەڵبەندی ٢١ بووم، لە ٢٠٠٦ بوومە کارگێڕی مەڵبەند و دواتر بووم بە جێگری مەڵبەند، لە ٢٠١٠ تا ٢٠١٣ لە مەڵبەندی سلێمانی جێگری مەڵبەند بووم، لە ٢٠١٣وە تا ئێستا لە مەکتەبی خزمەتی پێشمەرگەم، کە بووە بە مەکتەبی شەهیدان و تێکۆشەران[١١].

---

[١١]- چاوپێکەوتن لەگەڵ: ئیبراهیم فەتاح قادر (د. برایم)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٢/١٢.

## ئیبراهیم محێدین عارف قادر

بە دکتۆر برایم ناسراوم، ساڵی ١٩٦٥ لە نەخۆشخانەیەکی شاری کەرکووک لەدایك بووم، سەرەتا لە گوندی هەشەزینی سەر بە شارەدێی سەنگاوی شارۆچکەی چەمچەماڵ ژیاوم، دەرچووی پەیمانگای تەندروستیم، لە ساڵی ١٩٨٢ لە ڕێگەی (هیوا چاوشین)ەوە پەیوەندیم کردووە بە ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)ەوە، لە ساڵی ١٩٨٥ تا ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ پێشمەرگە بووم، لە سنووری قەرەداغ دوو جار بە چەکی کیمیایی بریندار بووم، لە نەخۆشخانەی مەڵبەندی یەك لە تیپی ٥٧ی سەگرمە و بەتالیۆنی دوو کاری تەندروستیم کردووە، کە بە گشتی شەش ساڵ دەکات واتە ١٩٨٥ — ١٩٩١.

سەرەتا چوار مەڵبەند بوونی هەبوو، هەر مەڵبەند و نەخۆشخانەی خۆی هەبوو، لە نێویشیاندا نەخۆشخانەی بەرگەڵوو، نەخۆشخانەی ناوەند (مرکزي) بوو، پێداویستی و کەرەستەی زۆرتربوو، دوو دکتۆری جەراحی لێ بوو، ماوەیەك دکتۆر نەوزاد ڕەفعەت و سەردەمێکیش دکتۆر هەڵۆی بادینی لەوێ بوو، نەشتەرگەریی بچووکی تێدا دەکرا، لەبەرئەوەی ئامێری گەورەی بێهۆشکردنمان نەبوو بە دەرزی سڕکردن نەشتەرگەریی بچووك دەکرا، بۆ نموونە دکتۆر هادی کاری وای کردووە، ڕەنگە ئێستا بە هەندێك پزیشکی گەورە نەکرێت، بۆ نموونە کاتێك خوێن دەچێتە سنگەوە دەبێت بە ئامێری تایبەت دەربکرێت و دواتر نەشتەرگەری بۆ کەسەکە بکرێت، کەچی دکتۆر هادی کردوویەتی، منیش یەك دوو جار کردوومە، هەندێك بریندار هەبوو دڵنیابووین کە ئەگەر نەشتەرگەری بۆ نەکرێت دەمرێت، دەمان کرد لە پێناوی ئەوەی ڕەنگە سەرکەوتوو بێت، کەچی زۆرینەیان سەرکەوتوو دەبوو، ئەمەش پەیوەندی بەبوێرییەوە، هەبوو.

نەخۆشخانەکەی مەڵبەندی ئێمە لە بەلەکجاڕ بوو، کە گوندێکە بەرامبەر سێوسێنان، لە چاڵییەکدا بوو، زۆرجار فڕۆکە بۆردومانی دەکردین، بەڵام نەخۆشخانەکەی نەدەگرتەوە، جارێك لە ساڵی ١٩٨٨ بە چەکی کیمیایی بەرکەوتین، ئێمە وەك تیپی ٥٧ دکتۆرمان هەبوو ئەوانیش دکتۆر فائق گوڵپی و دکتۆر جەبار بوون، هەرچی تیپەکانی دیکەیە زۆرینەیان کادیری پزیشکی لێ بوو، کە ئەوانە بوون خولیان بینی بوو، هەرچەندە من سەرەتا لە

نەخۆشخانەی ناوەندیی بووم، بۆیە لە هیچ تیپ و کەرتێك نەبووم، پەیوەندیشم بە تیپی ٥٧ی سەگرمەوە بەهۆی سنوورەکەمانەوە بووە، لە سەرەتاشەوە پابەندبووم بە ئەوانەوە، بەڵام لە کاتی چالاکیدا وەك تیمی پزیشکی بەشدار دەبووین، بۆ نموونە لە چالاکی گرتنی سەنگاو لە ساڵی ١٩٨٦، بیرمە دەیانگوت کادیرە پزیشکییەکان با زۆر نەیەنە پێشەوە پێشمەرگەیەك گوتی ئەگەر بریندار بین تۆ تیمارمان دەکەیت، بەڵام ئەگەر تۆ بریندار بیت کێ تیمارت بکات؟ بۆیە زۆرتر لە دواوە بووین، بیرمە گوللەیەك بەر پێشمەرگەیەك بە ناوی ڕەحمان عەبدول محەمەد هەشەزینی کەوت، شوێنی مەترسی گرتبوو، چارەسەرمان کرد و نەمانهێشت گیان لەدەست بدات.

ئێمە وەك کادیری پزیشکی لە شاخ ڕێکخراوێکمان دروست کرد بەناوی (KRA)، کۆمەڵەی فریاکەوتنی کوردستان، دکتۆر خالید کە چەمچەماڵی بوو یەکێك بوو لە سەرپەرشتی کارانی ڕێکخراوەکە، ئەو کۆمەڵەیە سەرەتا سەرپەرشتی دەزگای تەندروستیی کوردستانی دەکرد، لەوانە ناردنی نەخۆش بۆ دەرەوە و پەیداکردنی دەرمان، لە دوای ڕاپەڕینیش شێوازی کارکردنی کۆمەڵەی فریاکەوتنی کوردستان گۆڕا، سەرەتا تایبەت بوو بە بواری پزیشکی دواتر لە دوای ڕاپەڕینەوە بواری خێرخوازیشی گرتەوە.

لە ڕووداوێکی دیکەدا لە ساڵی ١٩٨٧ لەشکری بەدرمان لەگەڵدا بوو، گوللەیەك بەر قۆڵی پێشمەرگەیەك کەوت، دەبوو لە نەخۆشخانەی بەلەکجاڕ ببڕدرایەتەوە، دکتۆر فائق بوو بە جەراح و من بووم بەیاریدەدەری پزیشك و دکتۆر ناسیح بوو بە سڕکەر، بە ئامێری سادە توانیمان قۆڵی ببڕینەوە، تەنانەت بۆ بڕینەوەی ئێسك مشاری پزیشکی هەیە، کەچی نەمانبوو بە زنجیری ددانداز بڕیمانەوە، دکتۆر فائق ئەو سەری گرتبوو منیش ئەمسەری ڕامان دەکێشا تا بڕیمانەوە، هەموو موولوولەکانیی خوێنیمان بە مەقەستی تایبەت گرت بۆ ئەوەی تووشی خوێن بەربوون نەبێت، ئیدی کارەکە سەرکەوتوو بوو.

هادی عامری بەرپرسی لەشکری بەدر بوو، چەکدارێکی زۆریان هەبوو، لە سەرەتای ١٩٨٨ کشابوونەوە بۆ دەربەندی دەرەوار لە گەرمیان، ئەوکاتە ئێران لە سەدی دەربەندیخانەوە نزیك بوو، بەس ئاوەکە لە نێوانیان بوو، دەیانگوت ئێمە لە ئەنفالدا پاشەکشە ناکەین حکومەتی ئێران بە هانامان دێت، ئەوەبوو کیمیایی لێی دان و بە دەیان

کەسی لێ کوشتن، لەو نێوەندەدا ی.ن.ك لە هەمووان زیاتر دەوڵەمەندتر بوو لە ڕووی پزیشکییەوە، ئەوەندەی بزانم برادەرانی پ.د.ك یەك دکتۆریان هەبوو کە لە بادینان بوو، پێشمەرگەیەکی بریندار لەشکری بەدر لەو ڕووداوە بەر چەکی کیمیایی کەوتبوو هێنایان، وەك ئاشکرایە کاتێك نەخۆشێك دێتە بەردەستت پێویستە دڵنەوایی بکەیت لێمان پرسی (وين اهلك؟ خەڵکی کوێیت؟) گوتی (أني چان گبل دوزي بس هسة ما ادري افغاني لو افريقي؟ من پێشتر خەڵکی دووز بووم ئێستا نازانم ئەفغانیم، یان خەڵکی ئەفریقام؟) مەبەستی لەوە بوو وا ڕەش بووم و سووتاوم نازانم، ئەو گازی خەردەلە مرۆڤی تووشی سوتاوی دەکرد، پێویست بوو بینێرین بۆ ئێران.

ئەوکات لەبەرئەوەی دوژمنێکی هاوبەشمان هەبوو هەموو هێزە عێراقییە نەیارەکانی ڕژێم هاوکاری یەکدیمان دەکرد، لەبەرئەوە هەموو هێزە عێراقییەکان سوودیان لە نەخۆشخانەکانی ی.ن.ك وەردەگرت، بۆ مێژوو دەیڵێم ح.د.ك نەخۆشخانەیان هەبوو، هەرچەندە ڕەنگە سوودمان لێ بینیبێتن، بەڵام بەزۆری ئەوان سوودیان لە ی.ن.ك دەبینی، ئەمەش بەهۆی پزیشکی باش و ڕێکخستنی پۆلاییینەوە بوو.

لە نزیکی سەنگاو گوندێك هەیە پێی دەڵێن ژاڵەی ڕەبات، فڕۆکە بۆردومانی کرد، برینداری زۆری لێکەوتەوە، یەك لەوان بە ناوی (جیهاد) ئێسکی سەرووی ڕانی شکابوو، دوای سارێژکاری هێنامان بۆ نەخۆشخانەی بەلەکجاڕ، بەهۆی زۆر جووڵانی بریندارەکەوە تووشی هەوکردنی خوێن بووبوو، هەرچەندە هەوڵێکی زۆرمان لەگەڵدا بەڵام شەهید بوو.

لە لایەکی دیکەوە دوای کیمیابارانی گوندی سێوسێنان لەگەڵ هاوڕێیەکەم یەکەم کەس بووین چووینە گوندەکە، خەڵکێکی زۆرمان لە مردن ڕزگارکرد، پێشتر ئەو خولەمان بینی بوو، چەکی کیمیایی گازێکی تێدایە پێی دەڵێن گازی عەساب کە شەبەکەی چاو تەسك دەکاتەوە و قوڕگ وشك دەکات، دەرزییەك هەیە لە دژی ئەوە، هەرچەندە کاریگەری نەرێنیشی هەیە، بەڵام ناچار زۆر بەکارمان دەهێنا، یەکێکی دیکە لە کێشەکان ئەوە بوو پێویستە ئەو تەپوتۆزی کیمیاییە بەلاشەی خەڵکەکەوە لێ بکەینەوە، خەڵکمان دەکردە ناو حەوزی ئاوەوە هەرچەندە ساردیش بوو، بەس بۆ ئەوەی نەمرێت، بیرمە پێشمەرگەیەك بێهۆش بوو خستمانە ناو چەمێکەوە هەموو گیانیمان شۆری، ئێستەش ماوە، لەو کارەساتە

نزیکەی ٨٠ کەس شەهید بوو، خێزانی پیاوێك بە ناوی عوبێد دوازدە کەس بوون بەس خۆی ڕزگاری بوو، بەهۆی کاریگەری نەرێنی گازەکەوە کەسەکە تووشی عەساب دەبوو، کە دەچووین بۆ لای بریندارەکە دەستی دەوەشاند، هەرچی گازی خەردەلە زۆرتر دەتسووتێنێت، هەروەها گازی سیانیدیشی تێدا بوو، کێشەیەکی دیکە بۆن بوو، بۆنی سێوی بۆگەنی لێدەهات، بۆ ئەوەی کەسەکە بۆنی بکات، خۆم دوو جاریش بەو چەکە بریندار بووم، تا ئێستاش گرژی و مۆنی و عەسابم تێدایە، ڕاپۆرتم هەیە کە کاریگەری پاشماوەی ئەو گازانەیە، هەتا سوورێنچکی تەسك کردمەوە و لە دەرەوەی وڵات چارسەرم وەرگرتووە.

زۆرجار بریندار پێویستی بە چارسەر و نەشتەرگەری گەورە هەبوو، پێویست بوو بە هێستر و گوێدرێژ بیگوێزینەوە بۆ نەخۆشخانەی ناوەندی لە بەرگەڵوو، بۆ ئەو مەبەستەش بۆ ڕێگا کادیرێکی پزیشکییان لەگەڵ دەنارد، زۆرجار دەچووم، ئیدی لە ڕێگا تا ئەوێ ئێمە کارمان سارێژکردن بوو.

کە ئەنفالی یەك ڕوویدا پێشبینی ئەنفالی دیکەمان نەدەکرد، وامانەزانی ئەمە هێزێکە تەنها بۆ سەرگەڵوو و بەرگەڵوو هاتووە، بۆیە حکومەت لە هەر ناوچەیەك گوندێکی بۆردومان دەکرد کە لە ڕووی دانیشتوانەوە چڕ بوو، بۆ ئەوەی خەڵکەکە بترسێت و بڕەوێتەوە، لە قەراغ سێوسێنانی هەڵبژارد کە گەورەترین گوند بوو، لەسەر زێ گۆپتەپەی هەڵبژارد، خەڵکیش هەمووی ڕووی لە شارەکان کرد، هێزی پێشمەرگەش لەگەڵ خەڵك وەك ماسی و ئاو وەها بوون، ئیدی بەرەو دیوی ئێران کشاینەوە، بیرمە لە گوندی مەسۆی سەرچەم ڕۆژێك برادەرێك هات گوتی بریندارێکمان هەیە، هاووڵاتییەك قاچی شکابوو، فیشەك لە دەستی دەرچوو بوو، سارێژم کرد هەرچەندە بووە هۆی ئەوەی لە کاروانەکەش بەجێ بمێنم، ڕۆژێکی دیکە هاووڵاتییەك تووشی (تا)یەکی زۆر بوو هەرچەندە پێویستی بە پشکنینی تاقیگە هەبوو، بەڵام من دەرزییەکم بۆ کرد، پێی چاك بوویەوە پێی گوتم تۆ لە بەهەشتەوە هاتی بۆ ڕزگاری من، مەبەستم لەم نموونانە ئەوەیە ئێمە جیاوازی هاووڵاتی و پێشمەرگەمان نەدەکرد.

هەڤاڵ مام جەلال زۆر ڕێزی لە کادیری پزیشکی دەگرت، لە ڕووی داراییشەوە یارمەتیی باشمان وەردەگرت، چونکە لەو ڕۆژگارە وەك پێویستییەکی هەنووکەیی لێی دەڕوانی، لای

خەڵکیش کە دەچوویتە هەر شوێنێك، کە جانتاکەیان دەبینی و دەیانزانی پزیشکی ئیدی ڕێزێکی زۆریان دەگرتین، هەرچەندە لە ڕووی پلەوە هیچ پلەیەکی پێشمەرگایەتیمان نەبوو، بەڵام لە ڕێکخستندا بووین، چونکە ئەندامێتی کارێکی ئەستەم بوو تایبەت لە کۆمەڵە پێویستی بە چەند ساڵێك هەبوو، دەبووی بە (لایەنگر) و دواتر (پاڵێوراو) دواتر دەبووی بە (ئەندام)، دەبوو لە ئاستی ڕۆشنبیری باڵا بوویتایە و بەشداری تاقیکردنەوەت بکردبا، ئەوەی پەیوەندی بە منەوە هەیە من پلەی پزیشکیم هەبوو، بۆ نموونە لە بەتالیۆندا لێپرسراوی بنکەی بەتالیۆن بووم، لە تیپدا لێپرسراوی یەکەی کارگێڕی تیپ بووم، بەڵام لە مەڵبەندا هەموو ئەندامی نەخۆشخانەکە بووین، هەرچی پەیوەندی بە دەرمان و چارەسەرەوە هەیە لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانەوە پێمان دەگەیشت، زۆرجار بریندارى نەخۆشخانەکان هەر ڕێکخستنەکان دەیان گواستەوە.

هەرچی پەیوەندی بە بابەتی بەدەست گەیشتنی دەرمانەوە هەیە، لە دوای ئەنفالەوە پێیان ڕاگەیاندین کە هەر کەس لە ڕێگەی خۆیەوە دەرمان پەیدا بکات، منیش لە ڕێگەی برایەکمەوە بە ناوی (عیسا) کە لە خۆم گەورەتر بوو، بە کۆڵەپشت لەگەڵ خوشکێکمدا بۆیان دەهێنام، هەروەها پەیوەندی تایبەتیش ڕۆڵی هەبوو لە پەیداکردنی دەرماندا.

لە مانگی دووەوە تا مانگی هەشت بە پیادە و بە ڕێگەی ئەم گوند و ئەو گوندەوە، بە شەڕ و لاشەڕ و خۆشاردنەوە گەیشتمە ئێران کە شەڕی ئێران—عێراق وەستا من لە سەقز بووم، نەوشیروان مستەفا ڕۆژێك گوتی هەرچەندە ئێمە شکاوین، بەڵام جێگەی شانازییە بۆ ئێمە، کە هیچ شوێنێکمان ڕادەست نەکردووە بەرگری خۆمان لێ کردووە، ئەمەش بەهۆی نابەرامبەری هێزەکانەوە بووە، هەرچەندە گەرمیان دوای چۆڵکردنیش هەر پێشمەرگەی لێ مایەوە لەوانە (شەهید حەمەڕەش)، ئەوە سەروەری بوو حکومەت بەو هەموو توانای سەربازیی خۆیەوە هێشتا نەیتوانی پاشەکشەی تەواو بە پێشمەرگە بکات، کاتێکیش کە ئێمە لە دیوی ئێران بووین ئەو پێشمەرگانەی کە مابوونەوە زۆرجار بە ئامێر پەیوەندییان پێوە دەکردین، کە فلان نەخۆشی هەیە چ چارەسەرێکی بۆ بەکاربهێنین، بیرمە جارێك شەهید حەمەڕەش پەیوەندی کرد گوتی: کێ لەوێیە؟

گوتیان: دکتۆر برایم

گوتی: با بێته سەر خەت

منیش چووم گوتم: فەرموو؟

گوتی: پێشمەرگەیەکمان هەیە ئازارێك لە ئاستی ناوکێتی چارەسەری چی بۆ بکەم؟

گوتم: دەرزی چیتان لایە؟

گوتی: ئەترۆپینمان لایە، ڕۆکاینمان لایە

گوتم: دەرزییەکی ئەترۆپینی بۆ بکە

گوتی: چییەتی؟

گوتم: ناتوانم لێرەوە پێت بڵێم، بەس لەوە دەچێت پەیوەندی بە گەدەیەوە هەبێت، ئیدی ئەو دەرزییەیان بۆ کردبوو، پێم وابێ باش بووبوو، ساڵێك ئەوها پەیوەندی هەبوو، چەند دکتۆرێکیش دابەزین (واتە گەڕانەوە بۆ لای پێشمەرگە) لەوانە دکتۆر هاوڕێ بۆ ڕەتڵی گەرمیان دابەزی.

ئەو ماوەیەی کە لە ئێرانیش بووین لە گوندی دزڵی تیماری هاووڵاتییەکانی ئەو سنوورەشمان دەکرد، ئەو کاتە دکتۆری عێراقی بەناوبانگ بوو، من لەو گوندە ناوبانگم پەیداکرد، بنکەی تەندروستیم هەبوو، بە دکتۆر برایم ناسرابووم.

لە سەرووبەندی ڕاپەڕین یەك دوو ڕووداوی تەقینی مین بە پێشمەرگەدا لە چیای سوورێن ڕوویدا، هەرچەندە ئێمە ئاگاداریمان کردبوو کە بە سەر بەردەکاندا هەنگاو بنێن، بەڵام لە شپرزەییدا ئەو ڕووداوانە ڕووی دەدا، من گەڕامەوە سەریان یەکێکیان قاچی پەڕی و من فریاگوزاری سەرەتاییم بۆ کرد، بەدار بەستم بۆ ئەوەی تووشی خوێنبەر بوون نەبێت سارێژم کرد و بەپەلە گەیشتمەوە ڕەتڵەکەی خۆم، ئێمە ئاگاداری ڕاپەڕین بووین بروسکەکە شاهیدە کە بەرنامەمان بۆ دانابوو، هەرچەندە خەڵکیش هاوکاربوو، ئێمە پێنج و شەشی مانگ لە ئێرانەوە بۆ سلێمانی دەستمان بە جووڵە کرد، لە ٧ی مانگیشدا لە سلێمانی ڕاپەڕین دەستی پێ کرد.

ساڵی ١٩٩١ وەرچەرخان بوو لە ژیانی مندا، چونکە بەهۆی هاتنەوەمان بۆ شار و زۆری کادیر و کارمەندی پزیشکی، ئیدی بە پێویستم نەزانی کاری پزیشکی بکەم و ڕووم لە کاری سیاسی کرد، بووم بە ڕابەر سیاسی بەتالیۆنی سەگرمە لە هێزی دووی قەراغ، لەسەر

بڕیاری هەڤاڵ مام جەلال ڕێکخستنی جەماوەری دروست کرا و مەڵبەندەکان کرایەوە، مەڵبەندی کەرکووك لە حەوزەی بازیان و لە گۆپاڵە دانرا، لەوێ بووم بە ئەندامی کەرت لە ڕێکخستنی سەنگاو و قادرکەرەم، بەو شێوازە پلەکانی ڕێکخستنم بڕی تا بووم بە کارگێڕی مەڵبەند، ساڵی ٢٠٠٠ بە فەرمانی مەکتەبی سیاسی بووم بە لێپرسراوی ناوەندی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی کەرکووك هەتا ساڵی ٢٠٠٨ بەردەوام بووم، لە ساڵی ٢٠٠١ تا ٢٠٠٥ بڕوانامەی بەکالۆریۆسم لە بەشی یاسا لە زانکۆی سلێمانی بەدەست هێنا، دواتر بڕیارم کردەوە کارێکی کارگێڕی لە وەزارەتی ناوخۆدا بکەم، بەهۆی بوونی بۆشاییەوە کرام بە بەڕێوەبەری شارەدێی تەکیەی کاکەمەندی سەر بە چەمچەماڵ، هەتا ساڵی ٢٠١٨ بەردەوام بووم[١٢].

[١٢]– چاوپێکەوتن لەگەڵ: ئیبراهیم محێدین عارف، چەمچەماڵ، ٢٠٢٢/٢/٢.

## ئەحمەد عەبدولکەریم عارف عەلی (ئەحمەد عارف)

لە ساڵی ١٩٥٣ لە گوندی حەساری گەورەی سنووری پارێزگای کەرکووک لەدایک بووم، خوێندنی سەرەتاییم لە گوندەکەم تەواو کردووە، خوێندنی ناوەندی و ئامادەییم لە شاری کەرکووك تەواو کردووە، دواتر پەیمانگای تەکنیکی سلێمانیم تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٧٥ لە شاری سلێمانی پەیوەندیم بە ڕێکخستنەکانی (ك.ڕ.ك)ەوە کردووە، لە مانگی پێنجی ساڵی ١٩٨٠ لە شاری کەرکووك دەستگیرکرام، شەش مانگ ئەشکەنجە و ئازار درام و بە ٣٠ ساڵ زیندانی سزا درام، دواتر گوێزرامەوە بۆ بەندینخانەی ئەبوو غرێب، بەهۆی ئەو ٣٠ ساڵە و فشاری سەرانی حکومەتەوە کەسوکاری هاوسەرەکەم ناچارکران هاوسەرەکەم لێ جیابکەنەوە.

لە مانگی ٧ی ١٩٨٢ بەلێبووردنی گشتی ئازادکرام، هاتمەوە کەرکووك و بۆ سێ ڕۆژ لای دایك و باوکم مامەوە، دواتر چوومە سلێمانی و نامە چکلێتییەکەی ڕێکخستنم لە سلێمانی وەرگرت کە تایبەت بوو بە ڕێکخستنەکانی ك.ڕ.ك، لە مانگی ٨ی ١٩٨٢ گەیشتمە ناوزەنگ لەلایەن مامۆستا جەمال تاهیر و فەرمیدوون عەبدولقادرەوە پێشوازی کرام، دواتر گوتیان دەتنێرین بۆ تیپی ٥٧ی سەگرمە، بەڵام قایل نەبووم، وەك مەرجێکی شۆڕشگێڕانە هەر ئەندامێك دەستگیر بکرایە، دەبوو شەش مانگ لە ژێر چاودێریدا بێت، بۆیە گوتم منیش شەش مانگ بخەنە ژێر چاودێرییەوە، تا دڵنیا دەبنەوە کە نەبووم بە پیاوی حکومەت.

بەمجۆرە لە ناوزەنگ لەلایەن مامۆستا جەمال تاهیرەوە وەك سەرپەرشتیاری زیندانەکانی شۆڕش دەستنیشان کرام، لەوێ بارەگای یەکێتی نووسەران هەبوو بووم بە ئەندام، ئێزگەش لەوێ بوو، ئەرکی ڕێکخستنیشم لەسەر شان بوو، پێکەوە هەر سێ کارەکەم دەکرد، لە ساڵی ١٩٨٣ بووم بەلێپرسراوی ڕاگەیاندنی مەڵبەندی دوو لە سەرگەڵوو، لەوێ بە تەنها گۆڤاری (سەنگەر)م دەرکرد، کە یەك ژمارەی لێ دەرچوو، لەلایەن هەڤاڵ ئەرسەلان بایزەوە داوام لێ کرا بیوەستێنم، لەسەر ئەوە گفتوگۆیەکی توندمان لە نێواندا دروست بوو، ئیدی تا ١٩٨٥ لە سەرگەڵوو مامەوە.

دواتر له سەرگەڵووەوە بە چەند قۆناغێك لە ناوزەنگەوە هاتمە خوارێ و لە گوندی مۆردخواردەی بناری خاڵخاڵان و سنووری تیپی ٢١ی کەرکووك گیرسامەوە، لەگەڵ هاوسەرم ماڵێکمان پێکەوەنا، هێشتا منداڵمان نەبوو، خەڵکی ئەو بنارە هەموو خەڵکی باش بوون.

ڕۆژێکیان لە سەرکردایەتییەوە بانگەواز کرا کە پێشمەرگەی تیپەکان بچنە سەرکردایەتی، لەو سەروبەندەدا پێشمەرگە بەیەکدا دەهاتن و چاوەڕوانی کەرت و مەفرەزەکانی تیپ بوون تا کۆببنەوە و بڕۆن، لەو کاتەدا بەپەلە پورزایەکم خۆی گەیاندمێ و گوتی: "کاکە، داود بریندارە و لوغمی پێ دا تەقیوەتەوە چی بکەین؟"، منیش لەو کاتەدا دکتۆر هادی کە هاوشار و دۆستم بوو لە دوورەوە بینیم و چوومە لایی و لەگەڵ خۆم هێنام بۆ ماڵەوە، کاتێك داودی بینی گوتی: "خەمت نەبێت نامرێت، شوێنی برینەکەی ئاساییە"، منیش گوتم: ئێ من چی لێ بکەم؟ کەسێك نەبێت سارێژی بکات و دەرزییەکی لێ بدات؟ ئەویش گوتی: "خەمت نەبێت، ئێستا لەبەرچاوت دەرزییەك لە ڕاست و یەکێکیش لە چەپی دەدەم، تۆیش ڕۆژانە هەمان کار بکە تا چاك دەبێتەوە".

منیش هەر وام کرد، هەرچەندە هیچیشم نەدەزانی، دواتر خەڵکی ئاوایی هاتن گلەییان لێ کردم، گوایە من دکتۆرم و خۆم لێیان شاردووەتەوە.

پورزا داود دوای بیست ڕۆژێك خودا شیفای نارد و چاك بوویەوە، بە گوێدرێژێك گەیاندمانە گوندەکەی خۆیان، تا ئێرە هەنگاوی یەکەم و سەرکەوتنی باشمان بۆ هاتە پێش، خەڵکی گوندیش زوو زوو دەهاتن و دەیانگوت دکتۆر فێڵمان لێ مەکە، با نەچینە ئەم گوند و ئەو گوند، منش بەڵێنم پێدان هاوکاریان دەبم، بەڵام ئەوە زۆر باش شکایەوە بۆ من کە شەهید دکتۆر هادی لیستێکی دەرمانی باشی بۆ نووسیم و منیش بە باوکی داوددا ناردمە کەرکووك و خاوەن (دەرمانخانەی فەخری) کەسێکی بەڕێز و باش بوو، هەموو دەرمانەکانی بۆ ناردم.

لە دوای چاکبوونەوەی داودی پورزام، لە گوندی مۆردخواردەی خواروو پیاوێك هاتبوو، خزم و کەسی لە گوندی مۆردخواردەی سەروو هەبوو، زانیبووی کە دکتۆرێك لێرە هەیە، بە یەکێك لە خزمەکانی گووتبوو: "چۆن بتوانین کچەکەمان بهێنین بۆ لای دکتۆرەکە؟" ئەوانیش لە ڕووانگەی لێڕابینینەوە گووتبوویان بچۆ کچەکەت بهێنە و ئێمە دەیبەینە لای،

دکتۆرێکی زۆر باش و شارەزایە، کاتێکم زانی پیاوێك بە منداڵێکەوە خۆی کرد بە ژووردا! هاوسەرەکەم لەوێ نەبوو، ئاگاداری کارەکەی من نەبوو، من سەرم سووڕما چۆن خودا بۆی هێنام و عەقڵم خستە کار، منداڵەکە تەمەنی هەشت ساڵێك دەبوو، لە تەوقی سەرییەوە برین و قەتماغەی برین بوو، سەرم سووڕمابوو لە کوێوە دەست پێ بکەم، گوتم: "ئاوی بۆ گەرم بکەن و لە تەوقی سەرییەوە بۆ پەنجەکانی بۆم بشۆن و بۆم بهێنن"، هێنایانەوە سەراپای لەش و برینەکانیم بە دیتۆڵ شۆرد و دیسانەوە گوتم: "بچن دەستێك سابوونی دیکەی لێ بدەن"، کە هاتەوە ئیدی کەرەستەی دکتۆریم هەبوو تەواوی برینەکانیم هەڵکەند و خوێن بە هەموو گیانیدا دەهاتە خوارەوە، ئاگام لێ بوو باوکەکە زوو زوو فرمێسکەکانی دەسڕی، بەکورتی بە سفراتۆڵ هەموو جەستەییم پێچا و گوتم: "بچن، لایەنی کەم با تا پێنج ڕۆژ پێوەی بێت"، دیار بوو بە گوێیان کردبووم، کە منداڵەکەیان هێنایەوە بەردەستم، منش سفراتۆڵەکەم لێ کردەوە و هەستم کرد منداڵەکە نوێ بوومەتەوە، تەنها شوێنەواری برینی پێوەبوو، سوپاس بۆ خودا منداڵەکە چاك بوویەوە، منیش کۆڵێك کەیفم بەخۆم دەهات، کە بووم بە دکتۆر، دوای چەند ڕۆژێك باوکی کچەکە هاوسەرەکەمی لە ڕێگەی کانی بینی بوو، گوتبووی: خوشکێ ماڵی دکتۆر ئەحمەد کامەیە؟ هاوسەرەکەشم ئاگادار نەبووە و نەیزانیوە من دکتۆرم، دەڵێت: من پیاوەکەم ناوی ئەحمەدە، بەس دکتۆر نییە! ئەویش بە سواری گوێدرێژەکەی کە کۆڵێك قەل و کەڵەشێری لەسەر بوو، شوێنی دەکەوێت و لەگەڵی خۆی کرد بە ژووردا، کە منی بینی بەکەیفێکی زۆر خۆشەوە دابەزی و چاك و خۆشی کرد و گوتی: "ئەم پەلەوەرانە بۆ تۆیە".

بەیانی زووی بەهاری ساڵێك لە ساڵەکانی هەشتاکان ئیدی ناچاربووم بەوەی کە دکتۆربم، هێشتا لە خەوی بەیانیدا بووم هاوار هاوارێ پەیدابوو، کاك دکتۆر... کاك دکتۆر، لە خەوی ڕاپەڕاندم و لە دەرگایدا چووم بە دەنگییەوە، گوتی: فریامان بکەوە منداڵەکەمان سووتا، منیش گوتم: کوانێ بۆ سووتا؟ گوتی: فریا بکەوە لە ماڵەوەیە، ناچار شوێنی کەوتم و ڕۆیشتم بینیم کۆرپەلەیەك دەقیژێنێ، دڵم بۆی ژانی کرد، پێستی لەشی هاتبووەوە خوارەوە، سەیری چوار دەوری خۆم کرد و بینیم زۆپایەکی دار سووربوومەتەوە و نێڵەنێڵێتی، کتریەکی گەورە لار بوومەتەوە و ئاوەکەی بە کوڵاوی ڕژاوە بە سەریدا، گوتم

ئەمە بۆ ڕژاوە؟ دوای بێنە و بەردە گوتی: "دەستبازی من و باوکی"، من تێگەیشتم مەسەلە چییە، جانتاکەم کردەوە و کەرەستەکانم دەرهێنا، هەرچی پێستی دامالراوی منداڵەکە هەبوو پاکم کردەوە، دەرزییەکی ئازارشکێنم بۆ منداڵەکە کردوو کەوتمە تیمارکردنی، دوای چەورکردنی هەستام وەك قنۆرکە پێچامەوە، گوتم سبەی بەیانی بۆمی بهێنن، ئیدی ئەو منداڵە ئەوەندەی دیکە کردمی بە دکتۆر، چونکە بە هەموو ویژدانێکەوە عەقڵم بۆی خستەکار، نزیکەی بە دە ڕۆژ منداڵ کەوتەوە باری جارانی، هەرچەندە کارەکەم زۆر پێ گران بوو، بەڵام هەستم دەکرد خزمەت بە مرۆڤ دەکەم، زیاتر لە کاتی پێویستدا هزر و بیرم دەخستەکار، بۆ ئەوەی زیاتر و زیاتر خزمەت بە مرۆڤایەتی بکەم.

لە گوندی مۆردخواردەی سەروو پیاوێك هەبوو پێیان دەگوت دکتۆر عوبێد، منیش ویستم بزانم بۆ پێی دەڵێن دکتۆر و چی دەکات، لە کاتێکدا بەهۆی کاری ئاودێری و باخدارییەوە ژێر نینۆکەکانی پڕ بوون لە ڕەشی، لەگەڵی بووم بە ئاشنا و سەردانی یەکیمان دەکرد، هاوسەرێکی زۆر بەڕێزی هەبوو بە کەژۆ بانگی دەکرد، دیار بوو یەك منداڵیان هەبوو، ڕۆژێك پێم گوت دکتۆر جەنابتان چ کارێك دەکەن و بۆ دکتۆرن؟ گووتی کاتی خۆی من لە نەخۆشخانەی سەربازی لە بەردەست دکتۆری ددانـدا کارم کردووە، هەر لەوێ توانیم هەندێك زانیاری فێربم، کە هاتمەوە تاقمێکی سارێژکاری و ددان هەڵکێشانم هێنایەوە و ئێستا کاری پێ دەکەم، لە گەرمەی قسەکردندا بووین گوتی کەژۆ ئەو جانتایەم بۆ بهێنە، کە هێنای پێی نیشاندام و گوتی کەژۆ تا ئێستا کەس ڕێگە پێدراو نەبووە، ئەو تاقمە بەکاربهێنێت، لە ئەمڕۆوە دکتۆر ئەحمەد هەر کاتێك ویستی دەتوانێت بە کاری بهێنێت، ڕۆژێك پێشمەرگەیەك بەئازاری ددانەوە هات بۆ لام کە بڕیار بوو بچن بۆ شەڕی دوژمن، بەناچاری تاقمەکەی دکتۆر عوبێدم وەرگرت و سڕکردنم بۆ کرد، بەڵام هەرچیم کرد ددانەکەیم بۆ دەرنەهات، ناچار بەبەنجەوە ڕووی کردە بەرەکانی شەڕ و بەداخەوە هەر لەو شەڕە بە ئەو ئازارەوە شەهید بوو، هەرچەندە نەمزانی ناوی چی بوو.

ساڵ گەیشتە سەرەتای ئەنفال و کوردڤڕان، لە گەرمیان هەموو لایەك شڵەژان و نائارامی پێوە دیاربوو، جموجۆڵ و دەنگ و باسەکان نارەحەتییان پێوە دیار بوو، هێزەکان دەکشێن بۆ سنوورە دەستکردەکان، دوژمن بێ دەست پاراستن دەستی کرد بەکوشتن، دونیای

بەناو ئیسلامی و عیلمانی لە ئاست ئەو کارەساتە کەڕ و لاڵ بوون، لە یەکێتیی نووسەرانەوە نامەیەکم بۆ هات، کەوا ڕووە و هەوراز بگەڕێمەوە، ماڵ و منداڵەکەم ئەگەر بکرێت بێ ترس بگەیەنمە شار و خۆشم هەڵکشێم بەرەو سەرەوە.

هێدی و هێمن هاوسەر و منداڵەکەم خستە تەرەکتۆرێك و ماڵەکەم بەخشی بە خەڵکی بەڕێزی گوندی مۆردخواردەی سەروو، چونکە ئەوەندەی لەوێ بووین زۆر قەدریان گرتین، ئیدی گەیشتینە شێخ بزێنی و لەوێوە بۆ سەر زێ و بەرەو بەری کۆیە ڕۆیشتین، بە نزیکی ڕێگای جاشەکانی ئەو دەم کە لەسەر ڕێگا و گردۆلکەکانی سەر شاڕێی کۆیە و هەولێر بوون تێپەڕین، لەگەڵ ماڵی مام سابیر ناوێك کە خێزانەکەی شەهید بووبوو، بەرەو هەولێر لەگەڵ سێ چوار پێشمەرگە کەوتینە ڕێ بۆ باواجی و دواتر بۆ هیران و نازەنین و کونە فلوسە تا گەیشتینە سنووری دەفەری مەڵبەندی بالیسان، لە ڕێگادا پێشمەرگەیەکی بێ چەکمان گوتی کاك دکتۆر هەتا ناو ئاوایی دەچم و دێمەوە، ئیدی نەمزانی چۆن خەڵکمان بە سەردا داباری، هەر یەکە و بەچەشنێك باسی خۆی و نەخۆشی خۆی دەکرد، ئیدی منیش ئەوەی بۆم کرا لە شروب و لە حەب و لە دەرزی بۆیانم دیاری کرد، ئەوانیش هێلکەی کوڵاو و خواردنیان بۆ هێناین و کەوتینە ڕێ، زۆر شەکەت بووین دەمەو ئێوارە گەیشتینە بناری قەندیل و نزیك بارەگای جووتیاران.

بۆ مێژوو دەیڵێم سەرمایەکی باش بوو، بارەگایەکی حیزبی شیوعی ح.ش نزیکمان بوو، داوای کۆمەك و نانمان کرد، گوتیان ببورن لای ئێمە نان خوراوە و بەتانیشمان نییە، زۆر نیگەران بووم، دواتر گوێم لە دەنگی بەرزانی قالەی خەلۆز بوو، گوتی هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا دەیەوێت بتبینێت، گوتم ناتوانم سەر بکەوم بەیانی دەچم بۆ لای، ئیدی ئاگرمان کردەوە و بە دەوریدا دانیشتین، کە ڕۆژ بووەوە گەیشتمە لای هەڤاڵ نەوشیروان، هەڤالان مام ڕۆستەم و ئازادی سەگرمە و دووان سیانێکی دیکەی بەدەورەوە بوو، سڵاوم کرد و هەڵنەسا، ئەمەش خەتای خۆی نەبوو، خەسڵەتێکی کوردییە کە ڕۆح زلی پێ دەگوترێت، بە هەرحاڵ دەوروبەرەکەی چۆڵ کرد و گوتی چ خەبەرە لە خوارەوە؟ گوتم دەبێت چ بێت پێشمەرگە ڕێگایان لە خەڵك گرتووە بێن بۆ ئەم شوێنانە، کە ئەمەش خراپە و خەڵکەکەمان تیادەچێت، گوتی تیاناچن با بچنەوە ببن بە جاش ئەوە فەرمانی منە، منیش

گوتم تۆ و ئێمە و هێزەکانمان لێرەبن بەعس جاشی بۆ چییە، برا، هەموومان لەناو دەبات، هەرچەندە دەمتوانی زیاتر بڵێم، بەڵام لە یەك توورە بووین و بەرەو ئێران بەرێ کەوتم.

لە سەرووبەندی ئەنفال و شکستی هێزی پێشمەرگە و نەهامەتی خەڵکی کوردستان، لە قەندیلەوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لەوێشەوە بۆ گوندی کاولان کە بارەگایەکی بچووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردستانی لێ بوو، منیش بەگوێرەی ئەوەی هاوسەر و منداڵەکانم لە هەولێر بە جێمابوون لە کاولان مامەوە، ڕۆژێك مامۆستا نازم عومەر پێی گوتم، یەك دوو کەسی باش پەیدا بکە و ببە بە بەرپرسیاری دابەشکردنی هاوکاری بە سەر ماڵە ئاوارەکانی ئەم سنوورە، منیش ڕازی بووم و ئەوەی بیرم بێت هەڤاڵ بەهجەت شەوکەتم بانگ کرد، بە مامۆستا نازمم گوت با دەست پێ بکەین، ئەویش گوتی ئاگاداربن وەك برادەرانی خۆتان نەکەن! گوتم بۆچی؟ گوتی لێگەڕێ، دیاربوو مەبەستی لە گەندەڵی بوو.

پاش چەند مانگێك هاوسەر و منداڵەکەم بە یاوەری کەمال بابەکر گەیشتنە لام، کەمال بابەکر پارەیەکی باشی پێ بوو لە گەڕانەوەیدا لە قەندیل شەهید بوو، تەرمەکەیان هێنا، لە گوندی ئەنجینەی سەر سنووری سەر بە شاربازێر ناشتمان، دواتر ماڵەکەمان کە دوو بەتانی و جلەکانمان بوو هەڵگرت و بەرەو شاری بانە کەوتینە ڕێ، چووینە ماڵی حاجی سادق کە شۆرەتی حاجی سایەقی هەبوو، کچۆڵەیەکی دراوسێیان کە دواتر زانیم کچی سەلیمی چایچییە، هاوکاری کردین و بینی یەك دونیا دەرمانمان پێیە، گوتی ئاغا جەنابتان دکتۆرن؟ منیش بە پێکەنینەوە گوتم بەڵێ، بۆ شەوی دواتر کچۆڵەکە هاتەوە گوتی: ئاغا دکتۆر، باوکم دەڵێت تەشریف بهێنن بۆ ماڵی ئێمە، منیش ڕەحمەتی موکری میوانم بوو، گوتم: چی دەڵێیت بچین؟ ئیدی چووین و ئەو شەوە خزمەتی باشیان کردین و دواتر گەڕاینەوە، لە ڕۆژی دواترەوە بووین بە ماڵی (ئاغا دکتۆر) و بەرنەدەکەوتین، خزمەتێکی باشی خەڵکی گەڕەك و بانمان کرد، دواتر چەند ماڵێکمان کرد و ئەو گەڕەکەی لێی بووین گەڕەکی سلێمان بەگی بانە بوو، دواتر کوردستانی باشوور ئارام بووبووەوە و گەیشتینەوە سلێمانی و وازم لە کاری پزیشکی هێنا.

له دوای ١٩٩١ ماوەیەك لێپرسراوی کۆمیتەی ڕێکخستنی ئاوارەکانی کەرکووك بووم لە سلێمانی، دواتر کۆنگرەی یەکێتیی نووسەرانمان بەست، یەکێتیی نووسەرانی شاخ و یەکێتیی نووسەرانی کوردستانمان تێکەڵ کرد، لێرەوە گۆڤاری گزنگمان وەك زمانحاڵی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەران دەرکرد و ڕۆڵی گرنگم تێیدا گێڕا، دواتر لە ١٩٩٩ پەیمانگای ڕۆژنامەنووسیم تەواو کرد و لە ساڵی ٢٠٠٠ لە بەشی ڕاگەیاندنی زانکۆی سلێمانی وەرگیرام و بڕوانامەی بەکالۆریۆسم بەدەستهێنا، پاشان پێشکەشی خوێندنی ماستەرم کرد لە زانکۆی جینان لە تەرابلوسی لوبنان، بەڵام بەهۆی خراپی دۆخی داراییەوە تەواوم نەکرد و دەستبەرداری خوێندن بووم، ئێستا خانەنشینم، ساڵی ١٩٨٦ ژیانی هاوسەرگیریم پێکهێناوە و باوکی پێنج منداڵم[١٣].

[١٣] ئەحمەد عەبدولکەریم عارف، سلێمانی، ٢٠٢٢/٢/١.

## ئەنوەر محەممەد نوری (د. ئەنوەر)

بە دکتۆر ئەنوەر ناسراوم، لە ساڵی ١٩٥٤ لە گەڕەکی ئەڵماس لە شاری کەرکووک لەدایک بووم، لە ساڵی ١٩٧٧-١٩٧٩ پەیمانگای پزیشکییم تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٨٠ پەیوەندیم بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کردووە، ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندم بەهێزی پێشمەرگەوە لە سنووری تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان کردووە، وەك پزیشك و پێشمەرگە خزمەتم کردووە، هەتا ئەنفالی ساڵی ١٩٨٨ لە کار و خەباتی سیاسی و تێکۆشان و پزیشکی و پێشمەرگایەتی بەردەوام بووم، لە دوای ئەوەوە گەڕاومەتەوە سەر ئەرکەکەی خۆم.

ڕۆژێك گوندی تلیان لە ناوچەی شوانی سنووری چەمچەماڵ کەوتە بەر بۆمبارانی چەکی کیمیایی، هەرچەندە خۆم پێشتر بریندار بووبووم، دەستم کرد بەتیمارکردن و چارەسەرکردنی برینداراني بەرکەوتەی چەکی کیمیایی لە گوندەکەدا.

شەوێکی زستانی زۆر سەخت و پاش باران کاتژمێر ١٢ی شەو بەدواوە هاتن بە شوێنمدا و گوتیان هەڤاڵ پۆلا لە گوندی چیاسەوزی ناوچەی شوان بریندارە، ئەگەر بتوانیت و بێیت بۆ لای تا تیماری بکەیت، ڕاستەوخۆ بەڕێ کەوتم پاش سێ کاتژمێر ڕێکردن کە دونیا باران و قوڕ و لیتە و لافاو بوو، ئەوەی کە لە بیرم ناچێتەوە لە چەمێکدا ئاوی لافاوەکە هەتا سەر سنگم هات، بەڵام بەردەوام بووین و گەیشتمە لایی و چارەسەرم کرد.

لە لایەکی دیکەوە لە بۆمبارانێکدا کەسێك کونی خۆشاردنەوە لە فڕۆکە ڕووخا بوو بە سەریدا کە پێیان دەگوت (کونەتەیارە)، لە ژێر نزیکەی مەترێك خۆڵدا دەرمانهێنا کە بەئاستەم هەناسەی دەدا، بەهەناسەی دەستکرد ژیانم بۆی گەڕاندەوە.

لە ساڵی ١٩٨٧ ئەرکی گرتنی سەربازگەی قەڵاتەمان پێ سپێردرا، کە لەسەر زێی تەقتەق بوو، هێزێك لە هەردوو تیپی: (٢١ی کەرکووك و ٢٥ی خاڵخاڵان) پێکهێنرا، بەسەرپەرشتی هەڤاڵ عەبدولرەحیم کە لە مەڵبەندی دووی ئەوکاتەوە نێردرا بوو، چالاکییەکە سەرکەوتوو بوو، هەڤاڵ ڕەحیم شەهید بوو، لەو چالاکییە وەکو پزیشك تەنها خۆم بووم، کە کشاینەوە گوندی قەسرۆك هەشت بریندارمان هەبوو، هەر یەکە و بەجۆرێك دەیان ناڵاند، نەم دەزانی فریای کامەیان بکەوم، هەبوو خوێنی دەویست، هەبوو

موغەزی پێویست بوو، هەبوو دوورینەوەی برینی دەویست، هەبوو ڕاگرتنی خوێنبەربوونی پێویست بوو یان دەرزی هێورکەرەوە یاخود دەرمانی پێویست بوو، ئیدی بەڕاستی بۆ من شڵەژان بوو، لەوێ پێشمەرگەیەکی حەساری بە ناوی هەڤاڵ فەرهاد حاجی سابیر، کە هەرچەندە پێشمەرگەی تیپی ئێمەش نەبوو، بەڵام بەگوێرەی ئەوەی حەساری بوو، زۆر چالاکانە هاوکاری کردم، تا هەموو کارەکانم تەواو کرد، ئینجا گوتی دکتۆر تەواو بووی؟ گوتم بەڵێ فەرهاد گیان، زۆر سوپاست دەکەم و ماندووم کردی، گوتی: شایەنی نییە، بەڵام منیش هەندێك بریندارم، گوتم تۆ! گوتی: بەڵێ، پاشان سکی هەڵدایەوە، کە بینیم بەڕاستی سەرسامی کردم، چونکە برینەکەی فەرهاد هیچیی کەمتر نەبوو لە برینی هەندێکیان، زۆر خۆڕاگرانە خۆی ئاشکرا نەکرد تا کۆتایی، ئینجا دەستم کرد بە دوورینەوەی برینەکەی فەرهاد کە هەشت تەقەڵی پێویست بوو، گوتم ئافەرین ڕۆڵەی قارەمان، شایەنی باسە زۆرینەی پێشمەرگەی ئەوکات ئەوها بوون.

ساڵی ١٩٨٧ دوژمن هاتە سەر شاخی کەلکەسماق و سەنگەری خۆیان لەسەر دامەزراند، لە مەڵبەندی دووەوە بڕیار هات کە دەبێت ئەو شاخە هەمان شەو بگیرێتەوە، بۆ ئەو مەبەستە لە تیپی ٢١ و ٢٥ و ٩٣ و تیپێکی دیکە هێزێکی گەورە پێکهێنرا، هەر ئەو شەوە هەڵمان کوتایە سەریان و قارەمانانە توانیمان لە ماوەی ٢٥ خولەك بیست ڕەبیەیان بگرین و خاپووریان بکەین و کوشتارێکی زۆر باشیان لێ بکەین و دەستکەوتی باشمان لە چەك و تەقەمەنی هێنایەوە، بەڵام بەخوێنی دکتۆر حەمید نووسرایەوە، ئەم نەبەردییەش بەسەرپەرشتیی هەڤاڵان: مام ڕۆستەم و مەلا ئاراس ئەنجام درا و خرایە پاڵ دەیان نەبەردی دیکەمان.

یەکێکی دیکە لەو کارە ئەستەمانەی کە بیرمە بریتی بوو لە چوونمان بۆ شەڕەکانی وڵاخلوو، لەگەڵ ئەوەی گوایە من پزیشك بووم، کەچی کلاشینکۆفێك و هەشت مەخزەن و دوو نارنجۆك و دەمانچەیەك و گوللەیەك RBG و بەتانییەك و جانتا دەرمانەکەم هەڵگرتبوو، خۆ ئەگەر بۆ باوکم بوایە ئەستەم بوو هەر بیانتوانم، ئەو هەموو ماندوێتی و

ئازار و شەونخونییە بەڕاستی لە ژمارە نایەن، بەڵام ویژدانم ئاسوودەیە، چونکە بۆ ڕزگاری گەلەکەمان بوو[١٤].

---

[١٤]– ئەنوەر محەمەد نوری (د. ئەنوەر)، کەرکووک، ٢٠٢٢/٢/٢٥.

## بەرزان عوبێد عەبدولقادر نادر (د. هەژار)

من لە بنەماڵەی بابانم بنەچەمان بۆ فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە لە گوندی هەڵشۆ دەگەڕێتەوە، لە مانگی ٧ی ساڵی ١٩٥٧ لە بنەماڵەیەکی ڕۆشنبیر و کوردپەروەر لە گوندی غەزەمپەڕ (قەزنەفەر)ی کەرکووك لەدایك بووم، باوکم نووسەر و ڕۆشنبیر و کوردپەروەر بووە، لە (ح.ش)دا لە ١٩٤٥ ئەندامی سەرکردایەتی بووە.

ئێمە کە سەرەتا چووینە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی سەر بە شیوعی بووین، دواتر پەیوەندیمان کرد بەڕیزەکانی (ی.ن.ك)ەوە، برایەکم بەناوی ملازم سیروان لە ١٩٨٧/٩/١١ شەهید بووە، پلەکەی فەرماندەی کەرت بووە لەناو (ی.ن.ك)دا، برایەکی دیکەم بەناوی دلێر نازناوەکەی (گۆران) بوو هەر لە پێشمەرگایەتیدا لە ساڵی ١٩٨٧ شەهید بووە، برایەکی دیکەم بەناوی ئاراس بە نازناوی (سوارە) هەر پێشمەرگە بووە، شەهیدبوونی براکانم دۆخێکی دەروونی خراپی بۆ من دروست کرد.

من قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییم هەر لە کەرکووك تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٧٦ ڕێکخراوێکمان دروست کرد بەناوی برایانی فەهد لە چەند شوێن لقی هەبوو، سەر بە ح.ش بوو، لە ساڵی ١٩٧٣ چوومە زانکۆ لە بەشی شەریعەی ئیسلامی (بەشی فیقهە) و کۆتا ساڵی زانکۆم لە نەجەف لە حەوزەی عیلمی تەواو کرد، باوکم بەزۆر ناردمیە ئەو بەشە، دواتر بۆ ئەوەی بەشداری سوپا نەکەم، ماستەرم لە شەریعە (سیرة نبوية شريفة) لە ١٩٧٩ خوێند.

ساڵی ١٩٧٩ لە ڕیزەکانی ح.ش بریندار بووم، لە مانگی ٦ی ساڵی ١٩٨١ کەوتمە کەمینی جاشەکانی عەباسی بەهلوول ئاغا لە سەنگەسەر ئیدی ناردیانم بۆ سووریا بۆ چارەسەر، من لە ژیانی پێشمەرگایەتیمدا (٩) جار بەسەختی و بەگوللە بریندار بووم، چەند جارێکیان هەر بەڕێکەوت لە مردن گەڕاومەتەوە، ئیدی لە سووریا بەدەرفەتم زانی لەوێ بەشی

پزیشکیم خوێند کە هاوشێوەی کۆلێژی پەرستاری ئێستا بوو، خوێندن بە عەرەبی و فەرەنسی بوو، ماوەکەی نزیکەی دوو ساڵ بوو، ئیدی تا ساڵی ١٩٨٦ لە سووریا مامەوە و گەڕامەوە.

ئەو کاتەی پێشمەرگەی ح.ش بووم لە بناری قەندیل بە دیل گیرام، ئێمە لەگەڵ ماڵی شەهید ئازاد هەورامیی خزمایەتیمان هەبوو، پێشتر پێکەوە پەروەردە بووبووین، ئەو رزگاری کردم، ئیدی داوای لێ کردم پەیوەندی بە ی.ن.ك بکەم، ئیدی لە ساڵی ١٩٨٧ پەیوەندیم بەڕیزەکانی (ی.ن.ك)ەوە کرد.

لە ڕووداوێکدا لە گوندی مۆردخواردەی بناری خاڵخالان چەند پێشمەرگەیەك لەوانە هەڤاڵ سیروانی برام و هەڤاڵ حەمەسوور دووشیوانی و چوار بۆ پێنج پێشمەرگەی دی بریندار بوون، لەوێ نەشتەرگەریمان بۆ کردن، هەڤالان مام باپیر و سەلامیان لەگەڵ بوو دواتر هەڤاڵ سەلام شەهید بوو، ئێمە وەك کادیری پزیشکی من و د. هادی و د. حەمەفەرەنسی بووین، د. هادی زۆر بوێر بوو نەشتەرگەری گەورەی دەکرد، من پێشنیارم کرد حەمەسوور سەرەو خوار هەڵواسن تا خوێنی ناو سییەکانی بێتە خوارەوە بۆ ئەوەی نەخنکێت، وامان لێ کرد و دواتر نەشتەرگەریمان بۆ کرد و سەرکەوتوو بوو.

ئێمە تیمێك بووین گەڕۆك بووین هەرکات لە سەرکردایەتییەوە برووسکە بهاتبا هەر کوێیان بگوتبا دەبوو بچین، لە ڕووداوێکدا لە ناو بەفردا بەهۆی لاوازبوونی بینینەوە دوو پێشمەرگە ڕێگا ون دەکەن و ماوەیەکی زۆر لە بەفردا دەمێننەوە، لە شوێنێك پێی دەڵێن کونەمشکە لە نزیکی هەڵشۆ یەکێکیان ناوی هەڤاڵ تۆفیق فەتحوڵڵای قەراغ بوو، ئەوی دی خەڵکی گەرمیان بوو، دۆخێك هەیە پێی دەڵێن گانگرین، کە بەهۆی سەرماوە کەسەکە قاچی ڕەش دەبێتەوە و هەستی ئازار لە دەست دەدات، واتە ئەگەر بە پێی پەتی بە ناو بەفردا بڕوات هەست بە سەرما ناکات، یەکێکیان قاچێك و ئەوی دیکە هەردوو قاچی ڕەش بووبوویەوە، بەڵام دووەم کەمتر ڕەش بووبوویەوە، ئەوەی کە هەردوو قاچی بوو پێڵاوی لە

پێ نەمابوو، کەچی هەستی پێ نەکردبوو کە لە پێیدا نەماوە، واتە لە ناو بەفرەکە بەجێمابوو، ئێمە لە سنووری گوپتەپە بووین لە ڕێگەی بروسکەیەکەوە لەگەڵ هەڤاڵ ساکار ڕۆیشتین بۆ ناوچەی مامەندە و دۆڵەکۆگە، لە خوارووی زەڵێ بەمشار یەکی قاچێکی هەردوو پێشمەرگەکەمان لە چەند سانتیمەترێك سەرووی باریکایی قاچیانەوە بڕییەوە، هەرچەندە قاچەکەی دیکەیان ڕەش بووبوویەوە بەس کەمتر بوو، بڕیارماندا کارێك بکەین هەر یەکەیان یەك قاچ لە دەست بدەن، ئەویش بریتی بوو لە داماڵینی پێستی قاچەکەی دیکەیان کە ڕەش بووبوو، چونکە پێست زوو دروست دەبێتەوە، بەڵام قاچەکەی دیکەیان زۆر ڕەش بووبوویەوە، ئەگەر نەبڕایەتەوە ڕەشبوونەکە سەر دەکەوت، دواتر دەبوو بەشێرپەنجەی ئێسك، دەبوو لە سەرووی ڕەشییەکەوە ببڕدرێتەوە، لەو کاتەدا دایکم هاتبوو بۆ ئەوەێ، دایکم نزیکی ئێمە بوو، لەو کاتەی کە ئێمە قاچی پێشمەرگەکەمان دەبڕیەوە پێشمەرگەکە جنێوی بە دایکم دا، دایکیشم گوێی لێ بوو، دوای قاچ بڕینەوەکە هاتم بۆ لای دایکم، گوتم دایکە گوێت لێ بوو جنێویان پێ دەدای؟ گوتی: **"کورە ڕۆڵە قاچیت بڕیوەتەوە دەتەوێت جنێوت پێ نەداتا"** دواتر کە هۆشیان هاتەوە هاتن بۆ لای دایکم، دەستیان ماچ کرد، تا ئێستاش چەند مقەستێکی پزیشکی ئەو کاتەم ماوە[١٥]، ئەوە نەبێت کەمێك کول بوون، ئەگینا وەکو خۆی ماون، وەك یادگاری پاراستوومە، من ئەو کات کۆڵەپشتێکی گەورەم هەبوو، هەموو کەلوپەلێکی پزیشکی تێدا بوو.

ڕۆژێك برا گەورەکەم هەڤاڵ ئاری بابان (شێوەکار) هات بۆ لام تووشی سەرئێشەیەك بووبوو، گوتم دەرزییەکی بێهۆشکردنمان هەیە بۆ ئەو دۆخەی تۆ زۆر باشە، ئامادەی بۆتی بەکار بهێنم، بەس بێهۆش دەبیت، قایل بوو منیش لێمدا، ئیدی ئێمە چووین بۆ جەولەیەك ماوەی شەو و ڕۆژێکمان پێچوو هاتینەوە هێشتا لە خەو هەڵنەسابوو، دواتر کە هۆشی هاتەوە گوتی ئەوە چ دەرزییەك بوو وتم فلان دەرزییە و دەتخەوێنێت و هەست

---

(١٥)- بۆ بینینی وێنەی مقەستەکان بڕوانە پاشکۆی وێنەکان.

بەئازار ناکەیت -بەردەوام ئەو جۆرە سەر ئێشەیەی لەگەڵدا بوو تا لە کۆتاییدا لێی کرد بەشێرپەنجەی مێشك و لە ٢٠٢١ هەر بەو ئازارە کۆچی دوایی کرد-.

لە ڕووداوێکی دیکەدا لە بۆردومانێکدا لە گوندی چەوری گەرمیان پێشمەرگەیەك بە بۆردومان بریندار بوو، دوو سەتڵ هەنگوینی پێ بوو، لەو کاتەی پارچەکە بەری دەکەوێت دوو سەتڵە هەنگوینەکەی لێدەکەوێت، لەو برینداریيە هەر دەیگوت کوا هەنگوینەکەم، گوتمان وازیبێنە هەنگوینی چی! با چارەسەرت بکەین، ئیدی بەزووترین کات ڕەوانەی سەر سنوورمان کرد.

ماوەیەك ئۆتۆمبێلێکی سەربازیمان هەبوو، دەستمان بە سەردا گرتبوو، زوو زوو کلاجی هەڵدەسا، منیش دەمزانی چۆن چاك دەبێت پێویست بە ناردنەوەی بۆ شار ناکات، لەو کاتە لە ژێر ئۆتۆمبێلەکە بووم پێشمەرگەیەك هات گوتی دکتۆر هەژار زۆر نەخۆشم منیش گوتم قورگت تاڵە؟ گوتی بەڵێ، گوتم تاولەرزت هەیە؟ گوتی بەڵێ، ئیدی زانیم چییەتی، منیش دەرزییەکم بۆ گرتەوە و دەرزییەکەم بۆ کرد، بۆ دەرزی دووەم تاقەتم نەبوو لە ژێر ئۆتۆمبێلەکە بێمە دەرەوە گوتم تۆ پاڵکەوە و بەرەو ژێر ئۆتۆمبێلەکە لێم نزیك بەرەوە ئەو وای کرد و منیش هەر لە ژێر ئۆتۆمبێلەکەوە دەرزییەکەم لێیدا، تا ئێستاش بە گاڵتەوە ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە، ئەم ڕووداوە کۆنە ئەوکات لە ڕیزەکانی (ح.ش)دا بووم، من کە چوومە ڕیزەکانی ی.ن.ك هەر وەفادار بووم بۆ ح.ش، چونکە بڕوانامەکەم بەهۆی ئەوانەوە بەدەست هێنابوو، ئەوان بوون ناردیانم بۆ سووریا تا چارەسەر بکرێم و خوێندن تەواو بکەم، وەفای ئەوانم لە بیر نەکردبوو، جارێك بە هەڤاڵ مام جەلالم گوت ئەگەر ڕۆژێك شەڕ لە نێوان ی.ن.ك و (ح.ش)دا هەڵبگیرسێت من بەشداری ئەو شەڕە ناکەم، گوتی: "**تۆ کوڕی باوکی خۆتی**"، واتە پێشتر باوکمی ناسیوە کە بەرپرسێکی ح.ش بووە، لە کوردستان و کەرکووکدا بنەماڵەکەی ئێمە ناسرابوو، باوکم بە

عوبێد سەعاتچی، یان (عوبێد گاور) ناسرابوو، هێندە شیوعییەکی سەر سەخت بوو خەڵکی هەموو دەیانناسی.

لە دۆڵی بالیسان گوندێك هەیە ناوی خەتێیە مەڵبەندی لێ بوو، حکومەت کیمیابارانی کرد، پێشمەرگەیەکی زۆر بەرکەوتن، دەرزی ئەترۆپین هەیە لە پێشمەرگەکانمان دەدا، پێمان دەگوتن دەموچاوتان ببەستن و گەیشتنە ئاو دەموچاوتان بشۆن و دەست لە گیرفانتان دابنێن، بۆئەوەی پاشماوەی کیمیاییەکە نەلکێ بەدەستانەوە و بە بێ ئاگا دەست بدەن بە دەموچاوتانەوە، گازەکە خەردەل بوو تووشی ڕشانەوە و سکچوون و میز بەخۆداکردنی کردبوون.

ئیدی لە ساڵی ١٩٨٨ چووینە ئەودیو بۆ ئێران، تا ساڵی ١٩٩١ ژیانم بەو شێوەیە بردەسەر، ئیدی لە دوای ڕاپەڕین هاتینەوە، لە ١٩٩٢ بووم بە ئەفسەر بە پلەی نەقیب، دواتر لە ڕانیە سەربازگەیەکمان دانا بەناوی بنکەی مامەڕیشە، لەوێ پلەی حیزبیشم کارگێڕی کۆمیتە بوو، لە بنکەکە ڕاهێنانی سەربازیمان دەکرد و کردمان بە فەوجێك، دواتر وەك ڕابەری سیاسی ١٨ی بەرانەتی دیاریکرام و کەوتمە دەشتی هەولێرەوە و شەڕی ناوخۆی بەسەردا هات، تا ١٩٩٦ لە ناو هەولێر بووم، ئامر هێز بووم، دواتر بە تێپەڕبوونی کات پلەم بەرز کرایەوە تا ٢٠٠٣ پلەکەم گەیشت بە عەقید، لە ٢٠٠٣ کە شەڕ گەیشتە کەرکووك من خۆم بۆ نەگیرا سەرەڕای ئاگادارکردنەوەم کە نەچم، بەڵام لەگەڵ هێزەکەم بەرەو کەرکووك بەڕێ کەوتم و گەیشتینە ناو شاری کەرکووك و بەشداری شەڕی ناو کەرکووکمان کرد، ئیدی لە بواری سەربازی بەردەوام بووم تا لە ٢٠٢١ بەپلەی سەربازی خانەنشین کرام.

لە ساڵی ١٩٨٨ هاوسەرگیریم کرد، کچە گەورەکەم لە ئێران لەدایك بوو ناومان لێنا ئیڤان، پێنج منداڵی دیکەم هەیە بەناوەکانی (ڤانیا، تانیا، سیروان، سەردار، هەستی) [١٦].

---

[١٦]– چاوپێکەوتن لەگەڵ: بەرزان عوبێد عەبدولقادر نادر (د. هەژار)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٣/٩.

## بورهان ڕەئووف نجم (د. بورهان چوارداخی)

به بورهان شێخ ڕەئووف، یان بورهان چوارداخی ناسراوم، له ساڵی ١٩٥٦ له گوندی پیرەسپانی گەورەی ناوچەی ساڵەیی کەرکووك چاوم بە ژیان هەڵهێناوە، مەبەست لە نازناوەکەم بریتییە لە دوو وشەی لێکدراوە (چوار+داخ)، چوار مەبەستم چوار پارچەی کوردستانە کە بە (داخ) گوزارشتم لێ کردووە، خوێندنی سەرەتاییم لە گوندی زەردك تەواو کردووە، ناوەندی و ئامادەییم لە کەرکووك تەواوکردووە، ساڵی ١٩٧٩ – ١٩٨٠ پەیمانگای پزیشکی سلێمانیم تەواوکردووە، ساڵی ٢٠٠٤ کۆلێژی یاسام لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.

پزیشك و پێشمەرگە و شاعیر و نووسەر و مامۆستای شۆڕش بووم، ساڵی ١٩٧٦ لە ئاهەنگێکدا لە ڕەحیم ئاوای کەرکووك هەندێك خوێندکاری کورد ئیتیحادی تەلەبەی عێراقی بوون، سەر بە حیزبی بەعس بوون، منیش بەبێ ئەوەی بانگهێشت کرابێتم بۆ ئاهەنگەکە بانگیان کردمە سەر شانۆ، منیش چووم هۆنراوەی (گەل فریـزە)ی خۆمم خوێندەوە، بۆ ڕۆژی دواتر ئەمنی عێراقی گرتمیان، ئەشکەنجەی زۆریاندام، بەڵام ئەو کات من ڕێکخستن نەبووم.

ساڵی ١٩٧٨ لەسەر دەستی هەڤاڵ ڕەحمان حەمید جوڵا، پەیوەندیم بە ڕێکخستنەوە کردووە، لەگەڵ هەڤاڵانی هەردوو شاری کەرکووك و هەولێر پەیوەندیم هەبووە، لە ساڵی ١٩٧٧ لە گوندەکەی خۆم خوێندنگەم داناوە بۆ منداڵانی گوندەکە، لە ژیانمدا خەباتم بە چوار شێوە ئەنجام داوە، ئەوانیش: (کاری پزیشکی، کاری ڕێکخراوەیی، کاری کۆمەڵایەتی، کاری پەروەردەیی و مامۆستای شۆڕش).

هەرچی کاری پزیشکییە لە مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٨١ چوومەتە ناوچەی شێخ بزێنی خواروو، گوندەکانی کاولە سووار و تولکی و بەستی شەرغە لە ئەوبەری زێی بچووك، تا ١٩٨٨/٩/٢٦ لە بناری چیای دێدەوان، لەگەڵ کۆمەڵێك برادەری دیکە لەوێ ماینەوە، لە ماوەی هەشت ساڵی خەباتم لە ڕووی پزیشکییەوە چەندین پێشمەرگە و هاووڵاتیم تیمار کردووە، ئەوانەی لە یادم مابێت ئەمانەن:

**هەڤاڵ محەممەد عەمەدۆنی:** لە حکومەت یاساغ بوو لە کۆتایی ساڵی ١٩٨١ جاشەکان دەچنە سەری، بەڵام خۆی نادات بەدەستەوە، بەسەختیش برینداری دەکەن، بەڵام ئازایانە دەربازی دەبێت، گوللە بە کۆڵنجی کەوتبوو، هێنایان بۆ لای من، بۆ ماوەی پازدە ڕۆژ تەداوایم کرد، کە بریتی بوو لە دوو کۆرس دەرزی (ئەنتی بایۆتیک)م لێ ئەدا و برینەکەیم پاك دەکردەوە، تا بەتەواوی چاك بوویەوە و ئێستاش لە ژیاندا ماوە.

**کونجی قەناعەت:** لە ساڵی ١٩٨٢ لە شوێنێکی تەنگەبەری ئەستەمی ـچڕ بۆ خۆشاردنەوە دروستمان کرد و بووە خەڵوەتگەی کاری سیاسی و پێشمەرگایەتی و خۆحەشاردان و شاردنەوە بۆ کاتی پێویست، کە لەم شەش کەسە پێکهاتبووین:

١. بەندە
٢. مام ڕەئووف کاولەسواری
٣. مەلا شاخی
٤. شەهید سەمەد مام ئەحمەد شەوگێڕی، کە برا گەورەی شەهیدی فەرماندە مەلا ئاراس و سێ برای دیکەی شەهید بوون.
٥. شەهید مەلا ئاراس
٦. شەهید سەرباز مام حسێن

کونجی قەناعەتمان دروست کرد بۆ ئەم مەبەستانە: (بۆ خۆشاردنەوە، چونکە ئەو کات جاش و سوپا بە دووی پێشمەرگەدا کێوماڵیان دەکرد، بە تایبەت لەو ناوچەیە مەبەستیان بوو مەلا ئاراس شەهید بکەن، هەروەها بۆ حەسانەوەی بریندارەکان و سارێژکاری، کە هەواڵیشیان لەسەر بدرایە ئەستەم بوو بدۆزرێنەوە، دواتر بۆ بڵاوکراوەکانی ی.ن.ك و دابەشکردنی بە سەر شانەکانی ڕێکخستندا، لەگەڵ بوونی چەندین پەرتووکی فکری و ئەدەبی و فەلسەفی، هەروەها پێویستی چا و خواردن، لەگەڵ دەرزی و دەرمان و پێویستی گرنگی پزیشکی، وەك ئەمپۆلی دژەخوێنبەربوون، سایکرۆکاپرۆن و ڤیتامین K، ئامێری پێوانی فشاری خوێن، سێتی نەشتەرگەری بچووك، لەفاف و گۆزی پاکەرە و دیتۆڵ، پەرمەنگەنات و موغەزی، جۆرەکانی دەرزی ئازارشکێن، ئەسپیجیك و نۆڤالجین و کەمێك ترامال و دەرزی دژە ژەهر بۆ مار و دووپشك، لەگەڵ مەڵهەمەکانی بیورن کرێم،

تتراسایکلین، دڵۆپەی پاکەرەوە بۆ چاو، گولاجەکانی ئەسپیرین، پاراسیتامۆڵ، گلیڤانان، تیگریتۆڵ بۆ ئازاری عەسەبە، هەرووەها ڤیالی، کلۆرۆفنیکۆڵی گرانەتا و دەرزی دژە ژەهر ئەنتی ستین و ڤیالی، گرامایسین، ئەمپیکلۆکس ئامپیسیلین و سفرتتۆڵ بۆ سەر برین و کە بۆ سوتاوی بەکاردەهات، هەروەها ئامپولی بی کۆمپلێکس بۆ خوێن کەمی و ڕانینتیدین بۆ برینی گەدە و ناوسك، ئەمپولی دژە هەستیاری و لەگەڵ تاقمی (نەشتەرگەری بچوك) و دەرزی و دەزووی دوورینەوەی برین، هەروەها هی دیکەشمان لابوو بەڵام دوای چل ساڵ هەر ئەوەندەم لە بیرە، بەکورتی ئەو کونجی قەناعەتە نەخۆشخانەیەکی بچووکی نهێنی بوو لە ژێر زەوی، سەرەتا ئەم کەسانە پێیان دەزانی: (مەلا شاخی، مەلا ئاراس مام ڕەئووف گاولەسوار، سەمەد مام ئەحمەد و سەربازی مام حسێن).

**داستانی مۆردخوارده:** لە نەورۆزی ساڵی ١٩٨٢ کە فەرماندە عەلی ساڵح و کۆمەڵێك پێشمەرگە شەهید بوون، هەڤاڵ مەلا ئاراس و پێشمەرگەیەك بەناوی هەڤاڵ مەجید محەمەد ناسراو بە نەقیب سیروان کە خەڵکی گوندی بیرەسپان بوو بریندار بووبوون، هەڤاڵ مەلا ئاراس لەبەر سەختی برینەکەی ڕەوانەی سەرکردایەتی کرا، من نەقیب سیروانم بردەوە بۆ بیرەسپان، لە شوێنی تایبەت لە ماڵی خۆمان کە بۆ شاردنەوەی کادیر و هەڤاڵان دروستمان کردبوو شاردمەوە، بۆ ماوەی دوازدە ڕۆژ بەنهێنی کە هەموو گیانی پارچەی هاوەن بوو دەرم دەهێنا و پاکم دەکردەوە و ڕۆژی دوو دەرزیم لێ دەدا، کە بریتی بوو لە کەپسوولی ئەمپکلۆکس شەش کاتژمێر جارێك پاشان پێکەوە چووین بۆ بنکەیەکی گوندی تولکی واتە (کونجی قەناعەت)، کە وەك باسم کرد پڕمان کردبوو لە داودەرمان.

تیمارکردنی شەهیدی فەرماندە مەلا ئاراس؛ لە دوای ئەوەی مەلا ئاراس لە سەرکردایەتی هاتەوە، چارەسەری تەواوی بۆ کرابوو، قۆڵێکی بە لەفافەوە لە ملی بوو، لەگەڵ پێشمەرگەیەك دەگەڕێتەوە لە گوندی گۆگجە لە مانگی ١٩٨٢/٩ تووشی کەمینێکی جاش دەبن، گوللەیەك لەو قۆڵە شکاوەی دەدا، بۆ ماوەی شازدە ڕۆژ من لە کونجی قەناعەت تیمارم کرد، بە لێدانی ڤیالی (ئەمپیسیلین، گارامایسین) ڕۆژانە ئەمپولی (بی کۆمپلێکس)م سێ ڕۆژ جارێك بۆ بەکاردەهێنا، هەروەها ڕۆژانە برینەکەیم تەداوای دەکرد، لە کاتی پێویست

دەرزی ئازار شکێن (ئەسپیجیک)م لێ دەدا، لێرەدا پێویستە باس لە ڕۆڵی پورە فاتم بکەین، کە ئێمە لە گیرفانی خۆمان دەمان نارد بۆ کەرکووك پێویستی برینداری بۆ دەهێنایین.

**تیمارکردنی شەهیدی فەرماندە عەریف ئەکرەم:** ناوبراو لە تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر قۆڵ و ڕانی بریندار بووبوو، لە پاش ئەوەی لە سەرکردایەتی مەڵبەندی هەولێر چارەسەری باشی بۆ کرابوو، گەڕایەوە بەستی شەرغە لەو بەر زێی بچووك بۆ گوندی ئاومال، بەڵام برینەکەی هەوی کردبوو، من بە ڕێکەوت لە ماڵی هاوڕێم سابیر ئاومالی بووم، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ تیماری باشم بۆ کرد و کەپسوولی دژەهەوکردنم پێ دا، پاشان حەبی ئازار و کەپسوولی ئەمۆکسلینم بۆ کۆرسێك پێ دا، بۆیە گەڕامەوە سنووری کەرکووك، ئەم کارەم لە مانگی ٤ی ساڵی ١٩٨٢دا بوو.

**بریندار بوونی عەلی مەنزەر:** پێشمەرگەیەکی قارەمان بوو لە مانگی ٤ی ساڵی ١٩٨٣ لە شەڕی ناوخۆ گوللەیەك لە سەری دابوو، لە پشتی سەرییەوە دەرچوو بوو، تووشی شەلەلی کردبوو، هێنایانە گوندی بیرەسپان، بەشەو لە ماڵ مام حسێن بیرەسپانی کە بووبوو بە پەناگەی لێقەوماوان، بەندە کاری تەواویم بۆ کرد و برینەکەیم پاك کردەوە، چونکە ئێسکی کاسەسەری شەق کردبوو، بەڵام مۆخی نەگرتبوو، دوای ٧٢ کاتژمێر بەرەو باش بوون چوو، بەڵام زمانی تەواو نەبوو، جووڵەی دەستێکیشی کەم کرد بوو، هەروەها نانی نەخواردبوو موغەزیم بۆ هەڵواسی، بەردەوام فشاری خوێنیم بۆ دەپێوا، لە دوای سێ ڕۆژەوە کەمێك نانی دەخوارد، بەڵام لایەکی لە ٨٠٪ لە جووڵە کەوتبوو، ناچاربووم دەرزی تراماڵی لێ بدەم چونکە لەبەر ئازار خەوی نەبوو، بە ناچار دوای سێ ڕۆژ، بۆ شەوەکەی لەگەڵ هەڤاڵ مەلا فەرمان گواستمانەوە بۆ ناوچەی شێخ بزێنی، پاشان بە کەڵەك گواستمانەوە بۆ گوندی سێگردکان، لەوێوە ناردیان بۆ سەرووتر، پاشان بۆ ئێرانیان نارد.

**بریندار بوونی مام ڕەزا:** لە کەرتی ١ی ساڵەیی بوو ئامۆزای شەهیدی فەرماندە مام برایمە سوور بوو، لە مانگی ١ی ساڵی ١٩٨٣ بە گوللەیەك کە لە قۆڵی دابوو بریندار بوو، بەڵام خۆشبەختانە ئێسکی نەگرتبوو، بە ڕێکاری پزیشکی تیمارم کرد و هەموو ڕۆژ دوو ڤیالی (Ampeclox)م بەیانی و ئێوارە بۆ بەکارهێنا و پاشان پاکم کردەوە و بە کۆرسێك چاك بوویەوە، بەداخەوە لە ئەنفالدا دوای ئەوەی بریندار دەکرێت ئەنفال دەکرێت.

له ١٩٨٣/٧/١٧ فڕۆکەیەکی ڕژێم بۆدومانی (مام عوسمان قەساب و کوڕەکەی) کردبوو، کوڕەکەی شەهید بوو، خۆشی بەسەختی بریندار بوو، من فریای مام عوسمان کەوتم و تیماری باشم بۆ کرد و خوێن بەربوونەکەیم ڕاگرت، بۆ ماوەی یازدە ڕۆژ لە بیرەسپان تیمارم کرد، کە شەوان لە ماڵی کۆچکردوو تالیبی شەهید شێخ غالیبی بیرەسپان دامان دەنا، هەر هەمان ڕۆژ فڕۆکە هاووڵاتییەکی بەناوی حاجی مەجیدی دارەمان بریندارکرد، بەڵام لەبەر سەختی برینەکەی کە لە سکی دا بوو شەهیدبوو.

ساڵی ١٩٨٤ کاتێك دانوستان لە نێوان (ی.ن.ك) و حکومەتی عێراقدا ئەنجامدرا، من لە گوندەکەی خۆم بیرەسپان لەبەر کەمی مامۆستا لەگەڵ مامۆستا عادل مەلا ئەحمەد بووم بە مامۆستا، لە هەمان کات لەسەر داوای خەڵکی ئاوایی هەڵبژێردرام بۆ ئەنجوومەنی باڵا بۆ ڕێکخستنی کاروباری گوند، لەگەڵ چوار هەڤاڵی دیکەدا، دوای کۆتایی هاتنی دانوستان چووەمەوە شاخ.

**ڕووداوی ڕۆژی ١٩٨٢/٤/١:** چەند جاشێکی خۆفرۆش بە شەو هاتن بۆ سەر ماڵی هەڤاڵ سەرباز مام حسێن، برایەکیان بەناوی مستەفا مام حسێن بەسەختی بریندار دەکەن، کە تەمەنی حەڤدە ساڵ بوو، من ئەوکات لە ناوچەی شێخ بزێنی خواروو بووم، هەر شەوەکەی گەیاندیانە نەخۆشخانە لە کەرکووك نەشتەرگەرییان بۆ کردبوو، ماوەیەك لە نەخۆشخانە مابووەوە، پاشان چەند حەب و دەرزییەکیان بۆ نووسی بوو، من بۆ ماوەی دە ڕۆژ لە بنکە نهێنییەکەی ماڵی خۆمان دەرزیم لێدەدا، هەتا بە تەواوی چاك بوویەوە، پاشان لە کەرتی یەکی ساڵەیی لەگەڵ فەرماندە سەرباز بوو بە پێشمەرگە.

**برینداربوونی پێشمەرگە سلاح محەممەد ڕەزا:** پێشمەرگەیەکی قارەمان بوو لە هاوینی ساڵی ١٩٨٥ برینداربوو، گوللەیەك لە دەستی هاوڕێیەکی دەرچوو بوو لە مەچەکی دابوو، هەر زوو گەیشتمە سەری و چارەسەری کتوپڕم بۆ کرد، دەرزی دژە خوێن بەربوونم بۆ کرد، (Saycrocapron)م بۆ کرد تا خوێن بەربوونەکەی بوەستێت، پاشان دەرزی ئەمپیکلکسم بۆ کرد، بە لەفاف بۆم بەست تا لە ماوەی یەك هەفتە بە تەواوی چاك بوویەوە.

**قاچ شکانی حاجی حسێن مەرزیەی:** لە هاوینی ساڵی ١٩٨٥ ناوبراو قاچی شکابوو، لە پاش گرتنەوەی دەرزیان بۆ نووسی بوو، بەندە لەگەڵ هەڤاڵ کاکەمەند خانی کاکەڕەش بە شەو چووینە سەری و دەرزی دژە هەوکردنم بۆ کرد و حەبی ڤۆڵتارینم پێ دا، بۆ ئازاری ئێسك و ئەوانەشی کە لە حەب و دەرزی پێویستی بوو، بۆم دانا.

**هێرشی بەهاری ساڵی ١٩٨٥:** لە کۆتایی بەهاردا هێزێکی حکومەت هێرشیان کردە سەر گوندەکانی شەوگێڕ و کاولەسوور، لە گوندی کاولەسوور شەڕێکی سەخت دەستی پێ کردبوو، لە ئەنجامدا هەڤاڵ مام برایم دەستێکی بەسووکی بریندارببوو، هەڤاڵ سیامەندی مام نوری قەرەسالم گوللەیەك لە لای قورگی دابوو، خۆشبەختانە بۆری هەناسەی نەگرتبوو، سارێژم کرد و هەر زوو خوێن بەربوونەکەیم وەستاند، چونکە گوللەکە دەماری گەورەی خوێنی نەگرتبوو، دەرزی ڤیتامین Kم لێدا، لەگەڵ ئامپیکلۆکسی ئەمریکی و دوازدە ڤیالی ئەمپیکلۆسمی ١×٢ بۆ ماوەی شەش ڕۆژ بۆ بەکارهێنا، بۆ ئەوەی هەو نەکات، هەروەها دەرزی (Novalgin)م بۆ کاتی پێویست بۆ ئازار بۆ دانا.

**بریندارببوونی پورە هەمینە محەمەد:** لە پایزی ساڵی ١٩٨٦ پورە هەمینە دایکی دوو شەهید بە بۆردومانی فڕۆکە بەسەختی بریندار بوو، زۆربەی پەراسووەکانی تێکشکابوو، کە چوومە سەری هیچ بڕوام نەبوو بتوانێ بژی، بەڵام پێم نەگوت، سەرەتا ئەمپۆلی دژە خوێن بەربوونم بۆ کرد (Seycrocapron)، هەروەها ئەمپۆلی (Novalgin)م لێدا بۆ ئازار، پاشان ڤیالی ئەمپیکلۆکس و گارامایسینم بۆ کرد، لەبەر قورسی برینەکانی بەپەلە بردیان بۆ کەرکووك، لەوێ چارەسەر کرا، مانگێك لە نەخۆشخانە بوو، کە چاك بوویەوە بۆ ماوەیەك دەست بە سەریان کرد لەبەرئەوەی دایکی پێشمەرگەیە، دواتر ماڵەکەی سووتا کە بڕێك پارەشی تێدا بوو، لە کۆتاییدا لە ٢٠١٣/٧/١٧ کۆچی دوایی کرد، سەرئەنجام تا مردیش قەرەبوو نەکرایەوە.

**پایزی ساڵی ١٩٨٦ فڕۆکە لە سێ هاووڵاتیدا:** لە ڕێگەی باسکە باریکی گوندی عەلی بەیان، شەهید زرار بیرەسپانی و هەڤاڵان حەکیم حاجی یاسین بیرالآکی و تەها مەجید یارمجەیی، بە بۆردومانی فڕۆکە بریندار بوون، من بە ماتۆڕ لە شێخ بزێنییەوە گەڕامەوە بیرەسپان، زانیم فڕۆکە لە خەڵکی ناوچەی ساڵەیی داوە، بۆ ئەوەی فریایان بکەم گەڕامەوە،

دوای نیو کاتـژمێر برینـدارێکیان بـه نـاوی هـەڤاڵ حـەکیم یاسـین هێنـا قـۆڵێکی دۆشـکە بڕیبوویــەوە، خــوێنی زۆری لەبــەر دەڕۆیشــت ڕاســتەوخۆ دەرزی (Seycrocapron) و دەرزی ڤیتامین K چوار ملیگرامم بۆ کرد، دەرزیەکم بۆ وەستانی خوێنەکەی بەکارهێنا کە لــە ڕووی پزیشـکییەوە کـارێکی نەشـیاوە، کـارێکی سەرسـوڕهینەر بـوو بـە کاتـژمێرێك خوێنەکەیم وەستاند، دواتـر دەرزی (Tramal)ی ئـازار شـکێنم بـۆ کـرد، پاشـان بـە لـەفاف بەستم، بۆ بەیانی زوو بردیان بۆ کەرکووك، چونکە تەمەنی سەربازی نـەهاتبوو، ئـەو کـات دەبـوو بتگووتبـا کۆپتـەری ئێرانـی لێـی داوە، پاشـان لـە نەخۆشـخانەی جمهوری کـەرکووك سەریان سووڕمابوو، کە چۆن ئەم خوێنبەربوونە کۆنترۆڵ کراوە! تا ئێستاش لە ژیاندا ماوە، دوای ئەو دەستم کرد بە ساڕێژکردنی هەڤاڵ حەکیم بیرالکی تـا چارەسـەر بـوو، ڕاسـتەوخۆ چـووم بـۆ بیرەسپانی بچووك کـە برینـدارێکی لـێ بـوو بـەناوی هـەڤاڵ زرار، هـەوڵی زۆرم لەگەڵدا برینەکەی زۆر سەخت بوو، بەداخەوە شەهید بـوو، برینـداری سـێهەم هـەڤاڵ تـەها مەجیـد یارمجـەیی بـوو لەگـەڵ شـەهید زرار برینـدار بووبـوو، بـەڵام خۆشـبەختانە فریـای کەوتم و چارەسەرم کرد.

**بریندابوونی ئومێد عەبدوڵڵا کاکەوەیس:** ئەو پێشمەرگەیەی لەبـەر بـوێری ناویـان لێنـابوو (ئومـە شـێت)، ئـەم پێشمەرگە قارەمانـە لـە هێرشـکردنە سـەر ڕەبیـە لـە سـنووری شارەدێی ئاغجەلەر لە بەهاری ساڵی ١٩٨٦ بە مـین بەسـەختی برینـدار بـوو، گەیشتمە لای و بینیـم زۆر بەئازارە، چونکە میزی گیرابوو، پارچەیەك لە لوغمەکە بـە ناوگـەڵیا تـەقی بـوو، ئەندامی نێرینە و میزەڕۆی وەها ئاوسا بوو ڕێڕەوی میزی گرتبوو، بە وتەی خۆی دوو ڕۆژ بوو میزی نەکردبوو، منیش سەرەتا ئەمپۆلی (Novalgin)م بۆ ئازارەکەی بۆ کـرد، پاشـان دوڤیالی (Ampicillen) و (Garamycin) دژە هەوکردنم بۆ کرد، فشاری خوێنیم گـرت بەرز بوو، چونکە میز خوێواوە، لە کونی زەکەرییەوە سۆندەیەکی باریکی موغەزیم لێدا بۆ ناو میزەڵدانی، ڕەنگە نزیکەی دوو لیتر میزی کردبێـت، یەکسـەر حەسـایەوە، ئیـدی دەسـتم کرد بە دوورینەوەی برینەکانی لە دەوروبـەری ئەنـدامی نێرینـەی و ناوگـەڵی، دواتـر داوای خواردنی کرد، منیش گوتم شـلەی گۆشـتی سـووری بـدەنێ، کۆرسـی دەرزیـم بـۆ دانـا لەگـەڵ حـەبی ئـازار (Paracitamiol)، بـۆ مـاوەی دوو ڕۆژ کەوتـەوە سـەر پێـی خـۆی، دووبـارە

پەیوەندی کردەوە بە کەرتی یەکی ساڵەیی تیپی ٢١ی کەرکووک، بەڵام بەداخەوە لە شەڕی ناوخۆ شەهید بوو.

**وەرگەڕانی ئۆتۆمبێلی پێشمەرگە قادر ئازیانە بە هۆی کەمینەوە:** لە هاوینی ساڵی ١٩٨٦ لە تیپی ٨٧ی قەرەچووغ لە سنووری تیپەکەی لەگەڵ سەرتیپەکەی سەفینی مەلا قەرە لە نێو ئۆتۆمبێلدا دەکەونە کەمینەوە و وەردەگەڕێن، سەر و دەوم و چاو و شەویلاگی زۆر بەسەختی بریندار دەبێت، من ئەوکات لە (حاوی تولکی) بووم دوو پێشمەرگە لەلایەن هەڤاڵ مەلا خدرەوە کە لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی هەولێر بوو، هاتن بۆ لام باسێکیان پێ گوتم، منیش کۆڵەپشتەکەم لە کۆڵ کرد کە پڕ بوو لە دەرمان، هەروەها کەرەستەی برینداری و ئامێری پشکنینی خوێن و تاقمی نەشتەرگەری بچووکم پێ بوو، لە زێی بچووک بە کەڵەك پەڕینەوە چووین بۆ گوندی سێکانی بۆ کەپرەکەی هەڤاڵ مەلا خدر، لەوێ کاری تەواوی پزیشکیم بۆ کرد، ناو دەم و زمان و مەڵاشووی ئاوسابوو، نەیدەتوانی نان بخوات، یەکسەر موغەزیم بۆ دانا، پاشان هەرچۆنێك بێت شلەمەنیمان پێ دا، ڤیالی دژە هەوکردنم بۆ کرد، گارامایسین ڤیال و ئەمپیسلین ڤیالم و ئەمپوڵی فلاجیل بۆ کرد، بەدەرزی تێکەڵ لەگەڵ موغەزیدا، واتە (Normal salin)، چونکە فلاجیل دژی میکرۆبی ناهەواییە لە شوێنێك ئۆکسجینیشی لێ نەبێت، هەندێك میکرۆب هەیە دەتوانن کاری خۆیان بکەن، مرۆڤ تووشی هەوکردن دەکەن، بەڵام (Flagil) یەکسەر ئەو میکرۆبە لەناو دەبات، دەرزی هەوکردن و دەرزی ئازار و حەبم بۆ دانا، ٤٨ کاتژمێر چاودێریم کرد هەوکردنەکەی دامرکایەوە، منیش گەڕامەوە نزیك بنکەکەی خۆم، کە کونجی قەناعەت بوو، پاشان چوومەوە بۆ گوندی کاولەسوور.

**برینداربوونی قاسم محەمەد ئەمینی پێشمەرگە:** پێشمەرگەی تیپی ٢١ی کەرکووک بوو لە هاوینی ساڵی ١٩٨٦ بە گوللەیەك کە لە دەستی هاوڕێیەکی دەردەچێت دەدات لە ناو لەپی دەستی و بریندار دەبێت، یەکسەر گەیشتمە لایی و لەپی دەستیم بۆ دوورییەوە، پاکم کردەوە، بە پەڕمەنگەنات، سفراتۆڵم لەسەر دانا، چونکە چەورە، پاشان گۆزی پاکەرەوەم لەسەر دانا و بەلەفاف بۆیم پێچا، گولاجی (Ampiclox)م بۆ دانا تا شەش کاتژمێرێك جارێك بیخوات، لەگەڵ حەبی پاراسیتۆڵ لە کاتی پێویست، دوای هەفتەیەك دەستی چاك

بوویەوە، پاشن تەقەڵەکانیم بۆ دەرکرد، گەڕایەوە ناو کەرتەکەی خۆی، بەڵام بەداخەوە لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ لە کەرکووك شەهید بوو.

**داستانی گرتنی سەری ڕەش:** لە مانگی ١ی ساڵی ١٩٨٧ لە شەوێکی بەفر و زریاندا نۆ پێشمەرگەمان لە تیپەکانی ٨٦ی دەشتی هەولێر و ٨٧ی قەرەچووغ و تیپی بەرانەتی لە سەرما ڕەق بوونەوە، هەندێکیش لە پێشمەرگەکان تووشی ئازاری ئێسك بووبوون، هەڤاڵ کەریم عەوێنە ناوکی زۆر شین بووبووەوە، لێی کردبوو بە فتق بە دەرزی دژە هەوکردن و مەڵهەمی ڤیکس و چارەسەری سروشتی چارەسەرم بۆ کرد و بە چەند ڕۆژێك چاك بوویەوە.

**بریندار بوونی هەڤاڵ عەلی سابیر یارمجە:** لە هاوینی ساڵی ١٩٨٧ فەرماندەی مەفرەزە لە تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر پێشمەرگەی بوێر هەڤاڵ عەلی سابیر یارمجە گوللەیەك بەر سنگی دەکەوێت، شوێنی کاریگەری نەگرتبوو، هەموو ڕۆژ دووجار تیمارم دەکرد، ئەمپۆلی دژە هەوکردنم لێدەدا وەك (Licocin) بەیانیان و ئێواران (Erthromycin) لەگەڵ حەبی فلاجیل (Flagintablet) ٢×١ هەموو ڕۆژ برینەکەیم پاك دەکردەوە، پاشان شاشی سفراتولم لەسەر دادەنا، بە گۆزی پزیشکی بە پلاستەر بۆ ئەوەی هەوا وەرنەگرێت و بە پاکی بمێنێتەوە، پاش هەفتەیەك برینەکانی یەکیان گرتەوە، ئیدی دەرزییەکانیم بۆ کرد بە گولاج، بۆ کۆرسێکی تەواو لە پاش دوو هەفتە چاك بوویەوە، دووبارە پەیوەندی کرد بە مەفرەزە و تیپەکەیەوە.

**بریندار بوونی پێشمەرگە سەرکەوت نەجم مەلا محەمەد:** لە کەرتی ١ی تیپی ٢١ی کەرکووك بوو، لە ١٩٨٧/٦/١٣ بریندار بوو، لە سنووری گوندی عەمدۆنی شێخ بزێنی خواروو بە مین بریندار بوو، پارچەیەك لە مینەکە لەسەر بڕبڕە (کلێنچك)ی چەقی بوو، هەردوو قاچی جووڵەی زۆر کەم بوو، ئەو پارچەیەم بەشێوازێکی سەرسوڕهێنەرانە دەرکرد، ڕاستەوخۆ قاچەکانی کەوتەوە جووڵە، هەموو برینەکانیم پاك کردەوە، ئەمپولی (Novalgin)ی ئازارشکێنم بۆ کرد، پاشان یەك کۆرسی ڤیالی (Licocn)م بۆ دانا، بە سفراتۆڵ برینەکەیم داپۆشی، ئەو شوێنەی دەپێچرا بە گۆز و لەفاف بەستم، پاش پازدە ڕۆژ چاکبووەوە و پەیوەندی کردەوە بە کەرتەکەیەوە.

**برینداربوونی فەرماندی سەرباز مام حسێن:** لە هێرشەکەی بارق حاجی حنتە، بۆ سەر گوندی تولکی لە ڕۆژی ١٩٨٧/٦/١٦ بەڕاستی داستانێکی مەزن بوو، چونکە پێشمان جاش و جەیشێکی زۆر بوو، فرۆکەش بەردەوام لە ئاسمانی شەڕەکە دەسووڕایەوە، پشتمانیش ئاوی زێی بچووک بوو، بەڵام نەخشەی هەڤاڵ سەرباز و دوو مەفرەزەی پێشمەرگە لەگەڵ هێزی پشتگیریدا لووتی ئەو هێزەیان شکاند و زیانێکی زۆریان لەو هێزەدا، بە خوێنی دوو شەهید و برینداربوونی هەڤاڵ سەرباز کۆتایی بەشەڕەکە هات، بەندە لەگەڵ برینپێچ دکتۆر سلێمان گەیشتینە سەری و گوللەیەك لە ڕانیدا بوو، تیمارمان کرد، بەڵام گوللەکە زۆر ڕۆچوو بوو، نەمانتوانی دەری بکەین بە وتەی هەڤاڵ سەرباز تا ئێستا ئەو گوللەیە لە ڕانیدا ماوە، هەر ئەو ڕۆژە هەڤاڵ ڕێباز دوو مەفرەزەی ڕەوانەی لای هەڤاڵ سەرباز کرد بۆ پاراستنی، شەوەکەی بردیان بۆ گوندی سێگردکان، چونکە هێزێکی زۆری پێشمەرگە لە ناوچەکە هەبوو، ئەو دوو شەهیدەش بریتی بوون لە شەهید مەلا یوسف و شەهید مام کەریم.

**شەهید شەوقی سەربڕی:** ناسراو بە جووتیار پێشمەرگەی کەرتی یەکی ساڵەیی تیپی ٢١ی کەرکووك بوو، لە شەوێکی زستان، لە ساڵی ١٩٨٧ لە ڕووداوێکدا گوللەیەك لە دەستی برادەرێکی لە ماڵی هەڤاڵ ڕەنجە دەرچوو، لە حاوی تولکی ئاگادارکرامەوە، من ماڵم نزیك بوو گەرما و گەرم گەیشتمە لای بریاندارەکە، چونکە لە نزیکەوە لێی دابوو، لە ڕانی ڕاستی دابوو لە ڕانی چەپیەوە دەرچوو بوو، بەبێ ئەوەی لە ئێسك بدات، یەکەمجار بە شیشی کلاشینکۆف فتیلم بۆ کرد، دوای پاککردنەوەی شیشی تفەنگەکە بە دیتۆڵ فتیلەکەش بە لەفاف پاکەرەوە بۆ ئەوەی پیسی ئەو گوللەیە لەناو قوولایی گۆشت نەمێنێت، کە زۆر ئازاری هەیە، ئەو فتیلەیەی بۆ نەکرێت ئەو پیسییە دەبێتە چڵك و کێم، ئەو چڵك و کێمە دەبێتە هۆی درەنگ چاکبوونەوەی برینەکە، دەرزی ئەیپیجیکم لێدا بۆ ئازار، ئەوجا دەرزی ئەنتیبایۆتیك و ئەمپیکلۆکسم لێدا، ٢×١ ڕۆژانە تا کۆرسێکم بۆ تەواو کرد، واتە ١٢ دەرزی ڕۆژانەش بۆیم پاك دەکردەوە، بە ماوەی دە ڕۆژ برینەکەی وشك بوو، ئیتر بۆیم کرد بە گولاج، ئەمپیکلۆکس چوار دانە لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا، واتە شەش کاتژمێر

گولاجێك بۆ ئەوەی هەو نەکاتەوە، دواتر چاك بوویەوە، بەڵام بەداخەوە لە ساڵی ١٩٩١ شەهید بوو.

**هەڤاڵ شۆڕش عەبدولڕەحمان ڕەشید:** ناسراو بە شۆڕش قەرەهەنجیری لە ساڵی ١٩٧٨ بووەتە پێشمەرگە، هەموو پلەکانی بڕیوە تا دواجار لە دوای شەهیدبوونی فەرماندە مەلا ئاراس بووەتە سەرتیپی ٢١ی کەرکووك، لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا چەندین جار بەسەختی بریندار بووە، دوا بریندارى لە شەڕی قەرە سرد بووە، کە گوللەیەك لە دەستی دابوو، بەفەرمانی سەرکردایەتی ناردیانە خوارەوە، لە بەهاری ساڵی ١٩٨٨ هاتە سنووری کەرتی یەکی ساڵەیی لە حاوی گوندی تولکی لەگەڵ هەڤاڵ عەریف نامیق بریندار بوو، هاتە لای من تەماشای برینەکەیم کرد و فیشەکێك لە ناو دەستیدا تەقی بووەوە، پەنجەکانی زۆر شێواندبوو، پەنجەیەکی لە لێواری گانگرین بوو، پێست و گۆشتەکەی بەرەو ڕەش بوونەوە دەچوو، ئەو پێستە ڕەشانەم لێ کردەوە و باش پاکم کردەوە و دووریمەوە، گولاجی ئەمپیکلۆکسم پێ دا، ڕۆژی چوار جار بیخوات بە لەفاف بەستم و باش ماوەیەك چاك بوویەوە، ئێستاش پەنجەیەکی بێ هێزە و سەرمای پێ بگات ئازاری هەیە.

**شەهیدی فەرماندە فاقە مەخموری:** لە ساڵی ١٩٨٢ لە سنووری هەولێر بووە بە پێشمەرگە، لەبەر ئازایەتیی و بوێری هەر زوو پلە سەربازییەکانی بڕی بوو، لە فەرماندەی مەفرەزەی کەرتەوە تا فەرماندەی تیپی ٨٧ی قەرەچووغ لە ساڵی ١٩٨٨دا، لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا چوار جار بریندار بووە، لە پایزی ساڵی ١٩٨٧ لە گرتنی تەقتەق گوللە بەر شانی دەکەوێت، لە دوای شەڕەکە چارەسەری سەرەتایی خێرای بۆ دەکرێت، پاشان گەڕایەوە ناوچەی بەستی شەرغە بۆ گوندی ئاوماڵ، منیش بەرەو گوندەکە بە ڕێکەوتم، بۆ ماڵی هاوڕێم سابیر ئاوماڵی، کە ماڵەکەیان جێی حەسانەوەی پێشمەرگە بوو، ماڵێکی زۆر دەست و دڵ تێر و شۆڕشگێڕ بوون، هەموو برا و خوشك و دایك و باوکی لە خزمەت هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوون، لەوێ هاوڕێم فاقە مەخموریم بینی، دەستی لە ملی بوو، وتی برینەکەم ئازاری هەیە، منیش دوای نان خواردن تەماشای برینەکەیم کرد زانیم چڵك و کێمی کردووە، ئیدی منیش ئەوەی بۆم کرا بە سرنج بەشێکی ئەو چڵك و کێمەم دەرکرد، برینەکەم پاك کردەوە و ڤیالی ئەمپیکلۆکسم لێدا، سێ ڕۆژ هەموو ڕۆژ برینکەیم پاك

دەکردەوە، دەرزییەکانم لێ دەدا، پاشان گولاجی دژە هەوکردنم پێ دا بۆ یەک کۆرس، ٤×١ شەش کاتژمێر جارێك بە گۆزی پاککەرەوە لەفاف بۆیم پێچا و چووم بۆ گوندی خورخور، بەداخەوە لە ساڵی ١٩٩٦ لە شەڕی ناوخۆ شەهید بوو.

**برینداربوونی منداڵێکی نۆ ساڵ:** ئەو منداڵە ناوی پێرس بوو کوڕی هاوڕێی دێرینم ڕەمەزان حەساری بوو لە شەوێکی زستانی ساڵی ساڵی ١٩٨٧ بەهۆی دەستکاری چەکەوە بە چەکی کلاشینکۆف کە گوللەی لەسەر بووە لە پەنجەی خۆی دابوو بریندار دەبێت، هەر ئەو گوللەیە دەدات لە ڕانی پێشمەرگەیەك بە ناوی (جوتیار)، ئیدی من سەرقاڵی چارەسەری جووتیار بووم، لەولاوە خوێنی دەستی منداڵەکە وەستایەوە، هەر ئەو شەوە برینەکەی پێرسم پاك کردەوە و ستراقۆلی چەورم لەسەر دانا و دەرزییەکی دژە هەوکردنم بۆ کرد، هەروەها پێش کاتی خەوتن دەرزییەکی نۆڤالجینم بۆ کرد، تا شەش ڕۆژ سارێژم بۆ کرد هەر دوازدە کاتژمێر جارێك دەرزی ئەمپیسلینم بۆ دەکرد.

لە سەرەتای مانگی ٥ی ساڵی ١٩٨٨ لە پرۆسەی ئەنفالدا هێزێکی زۆری بێشومار لە سەرباز و جاش هێرشیان کردە سەر ناوچەی قەلاسێوکە و شێخ بزێنی سەروو و خواروو لە دەڤەری کەرکووك، لەو بەری زێی بچووکیش بەرەو گوندەکانی شەرغە تا دەگاتە نزیك تەقتەق، ناچاربووین لە زێی بچووك بپەڕینەوە، من کۆمەڵێك خزم و ناسیارم لەگەڵ بوو، چووینە هەڵەتەکەی گوندی بەردەسپی لەوێ شوێنێك هەیە پێی دەڵێن (loولی بەردەسپی) ئاوێکی باشی هەیە لە ئەشکەوتێکی گەورەوە دەردەچێت، کە تونێلێکە ئەوسەری دیار نییە، چەند بڕۆی ناگەیتە ئەسەری تونێلەکە تاریك و پێچاوپێچە، لە هەندێك ئاوەکەی دەگەشتە خوار ئەژنۆ، ئەوێ شوێنێکی باش بوو بۆ خۆ حەشاردان، ئەوەی شایەنی باسە من دۆست و هاوڕێی باشم هەبوو، چ بەهۆی پەیوەندی لە پێشینەم چ بەهۆی پیشەکەم، جگە لەوەی تێکەڵاوی و خزمایەتیم هەبوو نان و خواردنم پێ پەیدا دەکرا، لەو کاتەدا پێشمەرگەیەك لە تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر بوو، نەخۆش کەوت کە بەداخەوە ناویم بیر نییە، لەبەر نەخۆشی لە تیپەکەی کە چوو بوون بۆ بالیسان جێمابوو، هەفتەیەك شاردمەوە، ئێواران نانم بۆ پەیدا دەکرد و چارەسەریم پێ دەدا، کە تاولەرزی مەلاریای هەبوو، حەبی

کلۆرۆکوینم بۆ دانا بوو، هەر دوو ڕۆژ جارێك ئەمپولیم لێ دەدا، چونکە خوێنی کەم بوو، هەتا جارێك کەوتە سەر پێ، ئێوارانێك چوومەوە نەمابوو، بێ ماڵئاوایی ڕۆیشتبوو.

**مارپێوەدانی شەمێ:** شەمێ کچی ماڵێکی ڕەوەند بوو، لە دۆڵی پشتی چیای دێدەوان، کە ماڵەکەیان لە پشتی چیای ناوبراو گیر بووبوون، کە ئێمە نانمان لێ بڕابوو ئێوارانێك بۆنی نانی گەرم هات، چووم بۆ سۆراغی شوێنی نانەکە بینیم پیاوێك لە پێشی ئەشکەوتێك دانیشتووە، کچێکیش کە شەرواڵی پیاوی لەبەرە وا نان بە ساج دەدا، چووم و سڵاوم کرد و باوکی وەڵامی دایەوە گوتی: فەرموو

گوتم: نانمان دەدەیتێ؟

گوتی: فەرموو نان بخۆ،

گوتم: ئاخر هاوڕێم لەگەڵە، پێویستمان بە چواردە نانە،

گوتی: لۆ بابم فرێم دانایە؟ بەم ڕۆژە کێ نان دەدات بە کێ! پاشان گوتی ئەوە چییە لە پشتت کردووە؟

گوتم: کۆڵە پشتی دکتۆرییە،

گوتی: چ دکتۆر!

گوتم: بەڵێ،

گوتی: قسەیەك بکەم هەنگێ لێم تووڕە نابی؟

گوتم: نەخێر

گوتی: چما دکتۆری چ دەکەی لێرە بێ ئەقر

گوتم: قسمەت ئەمنی هێنایتە ئێرە

گوتی: دانیشە تێر نانی بخۆ هەنگی بڕۆ

من کە بۆ خۆم تێر بخۆم و هاوڕێکانم برسی بن ئیدی نەمخوارد، بۆ شەو، مار بە کچەکەیەوە دابوو، ئێمەش لێیانەوە نزیك بووین، هات گوتی: دکتۆر قوربانت بم کچەکەم مار پێوەی داوە، منیش یەکسەر چووم بینیم مار بە پووزی کچەکەیەوە داوە، یەکسەر سەرووی جێ پێوەدانەکەم بەتوندی بەست و شوێن جێ پێوەدانەکەم برینداار کرد، بە گوشینی سەرووی ژەهرەکە زۆری ژەهرەکەم دەرکرد، پاشان ئەمپولی ئەنتیستینم بۆ کرد،

ئینجا بە زمانی خۆیان گوتم: خارە شیری بۆ بهێنە، ئەو دەمەش کۆتایی مانگی پێنج بوو، پەزەکانی شیریان هەبوو، شیری پێ دا، ئیدی پاش چارەکێك کەمێك ڕشایەوە، حەبی ئەسپرینیشم پێ دا، شوێنی برینەکەیم پاك کردەوە، سوێندی خوارد دەبێت نان و شیرێك بخۆی منیش دڵیم نەشکاند، سێ ڕۆژ دەرزیم لێ دەدا، مام ڕەمۆ تۆڵەی کردەوە نانی چەوری پێ داین، دوای چەند ڕۆژێك کاتی خۆرئاوا بوون بە کۆڵێك نانەوە هات بۆ لام گوتی دکتۆر وەرە کارم پێتە، منیش چووم، گوتی ئەمن لێرە دەڕۆم، بەس ئەتوش لێرە مەمێنە و بڕۆ، گوتم بۆ؟ شتێکی پێ گوتم عەقڵم گرتی منیش چوومەوە لای هاوڕێکانم پێم گوتن با بڕۆین، گوتیان بۆ؟ گوتم ئەوەی دێت بابڕۆین، کەوتینە ڕێ و نەمانزانی ئەو شوێنە کوێیە، کە ڕۆژهەڵات دووبارە خۆمان شاردەوە تا پێش خۆرئاوا بوون، ئیدی بەو جۆرە بەردەوام بووم تا ساڵی ١٩٨٨ و بە لێبووردن هاتینەوە بۆ هەولێر، چونکە ماڵی باوکم بۆ کۆمەڵگای دارەتوو ڕاگوێزرا بوون.

سەرجەم پلە حیزبییەکانم بە هەڵبژاردن بڕیوە، لە ١٩٩١ بووم بە ئەندامی کەرت، پاشان کارگێڕی کەرت، دواتر کارگێڕی کۆمیتە، بە هەڵبژاردن بووم بە لێپرسراوی کۆمیتەی دارەتوو، بە بڕیاری مەکتەبی سیاسی بووم بە ئەندامی مەکتەب، لە هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٦ بووم بە جێگری لێپرسراوی مەڵبەند، لە ئێستادا خانەنشینم بە پلەی سەربازی و ڕاوێژکاری مەکتەبی سیاسیی (ی.ن.ك)م لە کەرکووك(١٧).

---

(١٧)– بورهان ڕەنووف (د. بورهان چوارداخی)، کەرکووك، ٢٠٢٢/٢/١٥.

# تاریق ساڵح قادر (د.دڵشاد)

لە ساڵی ١٩٥٩ لە خێزانێکی هەژار لـە شاری کـەرکووك لـەدایك بـووم، چـوار بـرا و سـێ خوشك بووین، لە بنەماڵەیەکی کوردپەروەر بووم، لە ١٩٧٤/٨/٤ باوکم لە زیندانی حکومەتی عێراقدا لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانی لەدەستداوە، خۆڕاگری باوکم بووە ئیلهامی خەباتی مـن، ئیـدی لـە سـاڵی ١٩٧٤–١٩٧٥ لـە شـاری کەرکووکـەوە بـەرە و سـلێمانی ڕاگـوێزراین، تەنانـەت تۆماری شارستانی (نفوس)یشمان بۆ سلێمانی گوێزرایەوە، لە سلێمانی لە خوێندنگەی شـەو درێژەم بە خوێندندا، هەتا لە ساڵی ١٩٧٨ گەیشتمە کۆلێژی پزیشکی، لە قۆناغی دووی کۆلێژ تێکەڵی ڕێکخستنەکانی ك.ڕ.ك بووم، پۆلێکمان بە ناوی (شەهید حەسەن خاوێ) هەبوو من لێپرسـراوی بـووم، لەگـەڵ هـەڤاڵ حەمـەی مـام نـەبی و هـەڤاڵ خالیـد، بڵاوکراوەمـان بـڵاو دەکردەوە.

لە کاتی دروستبوونی شەڕی بەرەی جود پێویسـتیان بـە دەرمـان هـەبوو، مـن دەچووم دەرمانم پەیدا دەکرد و بەشێکیانم بۆ شارەزوور بۆ مەسـتەکان دەنـارد، بەشـەکەی دیکـەمان بۆ بەکرەجۆ دەنارد، دوای بەهێزبوونی ڕێکخستەکانی کۆمەڵە زانکۆی سـلێمانیان لـە ١٩٨١–١٩٨٢ گواستەوە بۆ هەولێر، منیش ڕۆیشتم، ئیدی خۆپیشاندان دەستی پێ کرد و من بوومـە کەسـی دیـاری ناویـان، هـەتا ویسـتمان کۆلێژەکـە بسـوتێنین، شـەوێك خۆمـان ئامـادە کـرد و ڕۆیشتین بینیمان پاسەوانی تێدا بوو، هەڵهاتین و تەقەیان لێ کـردین، ئیـدی ئاشـکرابووم و لەو هەڵهاتنەوە واتە لە (١٩٨٢)ەوە چوومە دەرەوە بـۆ پێشـمەرگایەتی، وەك کـادیری کۆمەڵـە چوومە ناو کەرتی چواری شەهید ئەحمەد شاتوانی لە تیپـی پـازدەی شـارەزوور، کـە هـەڤاڵ خامیدی حاجی غالی سەرتیپ و هەڤاڵ مەحموود گەرمیانی جێگری سەرتیپ بوو.

لە شەڕەکاندا منیان نەدەبرد دەیانگوت تۆ منداڵی، دواتر گوتیان بچۆ بۆ نەخۆشخانەی سەرکردایەتی و بۆ نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر بەختیار، کە د. کەمال و د. فائق گوڵپی لـێ بـوو، دوای ماوەیـەك لێبـوردنی گشـتی دەرچـوو، هـەڤاڵ نەوشـیروان مسـتەفا و هـەڤاڵ مـەلا بەختیار زۆر فشاریان لێ کـردم کـە بگەڕێمـەوە خوێنـدن تـەواو بکـەم، هاتمـەوە گوتیـان بـۆ

بەغداد گواستراویتەتەوە بچۆ لەوێ تەواوی بکە، منیش چووم و لە ساڵی ١٩٨٤ تەواوم کرد و بووم بە پزیشکی موقیم، بەڵام هەر ڕژێم وازی لێنەدەهێنام تا بۆ بەغداد گواستمیانەوە، منیش لە کاردانەوەی ئەمەدا دووبارە چوومە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی، لە سنووری مەڵبەندی کەرکووك لەگەڵ د. حسێن و د. حەسەن.

لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا دەیان جار کاری برینپێچی و نەشتەرگەریمان کردووە، لەوانە چەندین جار قاچی بریندارم بڕیوەتەوە، بیرمە لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٥ پێشمەرگەیەك لە تیپی ٢١ لە قاچی درابوو تووشی گانگرین بووبوو، بەنجم لە سەرووی ئەژنۆیدا و لە خوار ئەژنۆییەوە قاچیم بڕییەوە، هەروەها چەندین جاری دیکە بڕینەوەی دەست و بڕینەوەی پەنجەی برینداری ئەنجام دراوە.

کە چوومە دەرەوە هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا گوتی: تۆ کەسێکی چالاکی بچۆ بۆ گەرمیان. منیش چووم و لە سوورقاوشان نەخۆشخانەمان بە سەرپەرشتی هەڤاڵ عەلی بچکۆل دروست کرد، شوێنێکی سەخت بوو لە ناو چەمی دووئاوان و لە نێوان تەلان و دەشتی کۆیە و گوندی عەسکەر زۆر گونجاو بوو، کۆمەڵێك دەرمانمان لێ دادەنا و برینندارەکان دەهاتنەوە ئەوێ و بۆ شەڕەکانیش جەولەمان دەکرد و دەچووین، ئەوێ سنووری تیپی ٢٥ بوو هەرچەند برینداری تیپی ٩٣شمان بۆ دەهات، چەندین کادیری پزیشکی لێ بوو لەوانە شەهید دکتۆر هادی، شەهید د. حەمید، شەهید د. کامەران، د. سەردار، د. ئەنوەر. لە شەڕیشدا د. هادی بەشدار دەبوو چەندین جار ئاگادارم دەکردەوە، کە کاری وا نەکات، خۆشم لە دوو شەڕی تەقتەقدا بەشدار بووم، پێشمەرگەیەك بە ناوی ڕەحیم بە تەنیشتی خۆمەوە شەهید بوو، لە لایەکی دیکەوە دوو جار هێرشمان بردە سەر سەربازگەی تەکیەی کاکەمەند.

دواتر من لە گۆپتەپە لە شوێنێکی گونجاودا لە چەمێکی پشتی گوندەکەوە نەخۆشخانەیەکی دیکەم دروست کرد، کە بریتی بوو لە دوو بۆ سێ ژوور، چەند شتێکی

سەرەتاییم تێدا دانا، بیرمە لە شەڕێکدا ٣٠ سی بریندارپان بۆ ئەو نەخۆشخانەیەی گۆپتەپە هێنایەوە، دکتۆرەکانی نەخۆشخانەی سوورقاوشان بۆ ئەوەی گۆپتەپەش دەهاتن، بیرمە بۆ بریندارەکانی ئەو شەڕە (٦٠) مەرم کۆ کردەوە، دوو ڕۆژ جارێك مەڕێکم سەر دەبڕی و جگەرم بۆ بریندارەکان ئامادە دەکرد، ئیدی لە کاتی بینینی مەفرەزەی پێشمەرگە و کۆبوونەوەی پێشمەرگە ڕاستەوخۆ دەمانزانی کە نیشانەی ئامادەکارییە بۆ شەڕێك، ئەو کات من هەم لە ڕێکخستنەوە هاتبووم هەم پزیشك و هەم پێشمەرگە بووم.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٦ چووینە گوندێکی دیکەی سنووری ئاغجەلەر بە ناوی گردخەبەر، کاوریان بۆ سەر بڕین و ئیدی ئەوە جەژن بوو هێندە برسی بووین، لە شوێنێك دانیشتین لەگەڵ هەڤاڵان د. کامەران و وریا سوور و پێشمەرگەیەك بە ناوی سەباح، یاری کۆنکانمان دەکرد، خواردنیان هێنا و پێش دەستپێکردن بە نانخواردن هاووڵاتییەك هات گوتی فلان کەس وا لە ئازاردا دەمرێت و زۆر نەخۆشە فریای بکەون، من بە د. کامەرانم گوت بچێت، گوتی بەخوا تازە من واز لە کۆنکانەکە ناهێنم، ئیدی من بە ناچاری چووم دیار بوو نەخۆشەکە بەرد لە گورچیلەی هاتبووە خوارەوە بۆیە دەرزیم بۆ کرد، کەمێك هێور بووەوە، ئیدی ویستم بۆ لای برادەران بگەڕێمەوە، بە زۆر دەستیان گرتم و گوتیان کە دەبێت نان بخۆی، منیش کەمێك نانم خوارد، هاوکات هەر پەلەی ئەوەم بوو بگەمەوە ئەولا، هەڵسام و بەڕێکەتم و کە گەیشتمە لایان دەبینم هەموو وا دەرشێنەوە، ئیدی تێگەیشتم لە ڕێگەی خواردنەکەوە دەرمانخوارد کراون، د. کامەران و هەڤاڵان وریا و سەباح شەهید بوون، هەر زۆر بەڕێکەوت بوو کە من لەو خواردنەم نەخوارد، د.کامەران یەکەم کەس بوو شەهید بوو، هەر لە نەخۆشخانەکەی خۆمان بیرمە ڕیشی هاتبوو گورچیلەی بەهۆی زەهرەکەوە وەستا بەهۆی ناپاکی ئەو ماڵەوە شەهید بوو، بەڵام ڕاستەوخۆ دووانەکەی دیکە شەهید نەبوون، هەڤاڵ خەلیل سێدەریی کە پێشمەرگەیەکی قارەمان بوو گوتی بە ناو جاشەکاندا دەیانبەم بۆ ئێران، منیش بەرەو سەرگەڵوو لەگەڵیان بە ڕێکەوتم، لەسەر سنوور هەڤاڵ

سەباح شەهید بوو، هەڤاڵ وریاش لە ئێران شەهید بوو، دواتر بۆمان دەرکەوت زەهری زەرنیخ لە خواردنەکە کرابوو، لەو کاتە دکتۆر مەحموود عوسمان و هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا پێیان دەگوتم بۆمان باس بکە ئەو زەهرە چییە و چۆنە و نیشانەکانی چیین؟ ئیدی هەڤاڵ نەوشیراون مستەفا لە ڕێگەی ئامێرەوە قسەی لەگەڵ دەرەوە دەکرد و باسی زەهرەکەی دەکرد.

هەرچی پەیوەندیدارە بە پەیداکردنی دەرمانەوە هەڤاڵ شوانی تەنسیق کە ڕێکخستنی لێپرسراوی کۆمەڵە بوو لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانەوە بۆی دەناردم، - ئەگەر بمابا بەڕاستی ئەو شێرێك بوو خۆی- هەروەها بەهەمان شێوە مامۆستا جمهور بۆی دەناردم، هەروەها هەڤاڵ ئەحمەد کرێکار دەرمانی بۆ دەهێناین، یان لە ڕێگەی هاووڵاتیی گوندەکانەوە داوامان دەکرد، هەندێك جار کەلوپەل و دەرمان نەدەما، لەوانە لەفاف، من هەڵدەستام لە گوندەکان خامم دەهێنا ئەمکوڵان و پاکم دەکردەوە و هاوشێوەی لەفاف بۆ برینپێچی پارچە پارچەم دەکرد.

یەکێك لەو ڕووداوانە بریتی بوو لە پێشمەرگەیەکی ی.ن.ك ئێسکی ڕانی شکابوو، کەسێك هەبوو بە ناوی د.ئارا کە سەر بە چریکەی فیدایی خەلق بوو، هات بۆ لامان ئەو لە ئێسك زۆر شارەزا بوو، دوای چارەسەری سەرەتایی ناردمان بۆ ئێران، ئیدی خەڵکی گوندەکانیش دەهاتن بۆ لامان وەك پێوەدانی مار و دووپشك و دەست و قاچ شکان و دەستبڕین بە داسی درەو، ڕۆژنە ٣٠ بۆ ٤٠ نەخۆشمان دەبینی، لەو کات پێویستی سڕکردنمان نەبوو، بەس لە نەخۆشخانەی بەرگەڵوو هەبوو، هەڤاڵ مام جەلال ناردی لە دەرەوە ئامێر و کەلوپەلی پزیشکیمان بۆ بێت، لەو کاتەدا من لە ڕێگەی (ح.د.ك)ەوە ئامێری پشکنینی خوێنم بۆ هات، ئیدی بانگەوازم بۆ هەموو پێشمەرگەکانی تیپی ٢١ و ٢٥ کرد تا بێن پشکنینی خوێنیان بۆ بکەم تا هەر کەس و جۆری خوێنی خۆی بزانێت، بۆ ئەوەی لە هەر دۆخێکی نەخوازراو و برینداری و خوێنبەربووندا کاتێك پێویستیان بە خوێن وەرگرتن

دەبێت، خوێن بە یەکدی ببەخشن، بیرمە پێشمەرگەیەك هەبوو بەناوی نەجات، شەش جار خوێنی بە هاورێکانی بەخشی، من خۆم چەندینجار خوێنم بەخشیوە، د. سەرداریش خوێنی بەخشیوە.

لە ڕووداویکی دیکەدا ڕۆژێك ماڵێکی عەرەب هاتبوون بۆ بەرگەڵوو بۆ دیدەنی کوڕەکەیان، پێم وابوو کە سەربازی حکومەت بوو لای پێشمەرگە دیل بوو، یان هەڵهاتووی سەربازی بوو لای پێشمەرگە بوو، لە سنووری سەرگەڵوو فڕۆکە لێی دابوون، یەکێکیان پێویستی بە خوێن بوو، من بۆ یەکەمجار لەوێ خوێنم بەخشی بە ژنێکی عەرەب، ئەو خوێنبەخشینە زۆر بێهێزی کردم، دواتر ماڵی مامۆستا فاروقی برام دەبەیەك شەربەتی مێوژیان بۆ هێنام.

لە ڕووداوێکی دیکەدا لە ساڵی ١٩٨٦دا هاووڵاتییەك ساچمەی پێ دا تەقی بوو نزیکەی ٥٠ بۆ ٦٠ ساچمەی لە گیان بوو، من چەندین کاتژمێر خەریکی دەرهێنانی و تیمارکردن بووم بۆی، یەکێکی دیکە لە بریندارەکان پێشمەرگەیەك بوو بەناوی پێشڕەو مەلا محەمەد کانی عارەبان، ڕانی شکابوو هێندە مابوویەوە بە برینەکەیەوە ڕانی بۆگەن بووبوو، نامەیەکی لە گیرفان بوو خوێندمەوە نووسیبووی: "دایە گیان من شەهید دەبم، گەردنم ئازاد بکە....".

لە شەڕێکدا بۆ گرتنی تەقتەق پێشمەرگەیەکمان شەهید بوو ناوی تاریق بوو، هەموو کات شەهید د. هادی پێی دەگوتم د. تاریق ئەمجارە نۆرەی تۆیە، ئەو مەبەستی ناوەکەم بوو، چونکە بەس ئەو دەیزانی ناوی ڕاستیم تاریقە، چونکە من لە دەرەوە ناوم دڵشاد بوو، لێرەدا شەڕێکم بیر دێتەوە کە هەڤاڵ عەبدولڕەحیم بە تەنیشت منەوە بوو، لەگەڵ هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ بە ئامێر قسەی دەکرد، هەرچەندە ئەو بە منی دەگوت لە سەنگەرەکەوە سەرت بەرز مەکەوە، کەچی خۆی سەری بەرز کردەوە و هاواری کرد گوتی ئەو بەر ئازاد کرا، لەو ساتەدا ڕاستەوخۆ گوللەیەك لە ملیدا، برینەکەی هێندە مەترسیدار بوو لە کاتی

سارێژکردندا لە ژێر دەستمدا شەهید بوو، ڕووداوی شەهیدبوونی ئەو پێشمەرگانە لە بەردەستمدا هێندە کاریگەری لەسەر جێهێشتووم لە دوای ئەو ڕووداوانەوە تا ئێستا هەرگیز نەمتوانیوە و ئامادەنەبووم هیچ پلە و لێپرسراوێتی و پاداشتێك وەربگرم، چونکە وام لێکداوەتەوە لەسەر حسابی خوێنی شەهیدانە، ئێمە لەو ڕۆژگارە بەو شێوەیە هێنامان، نەدبوو لە ئێستادا بەم جۆرە سیاسەت بکەن!

ئەو کاتانەی کە شەڕ دەوەستا، کارمان کەم دەبوویەوە دەچووین لە سنووری ناوچەی قەڵاسێوکە و بەری کۆیە و تەقتەق لە گوندەکان منداڵمان خەتەنە دەکرد، پێشمەرگەیەکمان هەبوو بەناوی هەڤاڵ ئاسۆ (ئاسۆ کوێر) لەبەر دەستی من فێری سارێژکاری بووبوو، ڕۆژێك خزمێکیان برین لە سەری هاتبوو، بانگی ئاسۆیان کردبوو چارەسەری بکات، ئەویش نەیزانیبوو چوو بوو دەرزی سڕکردنی لێدابوو، هەڤاڵ ڕەهبەری سەیید برایم بە گاڵتەوە پێی دەگوتم: "تۆ ئاسۆت بۆ وا لێ کردووە لە خۆیەوە دەچێت خەڵك بەنج دەکات" بەداخەوە دواتر هەڤاڵ ئاسۆ ئەنفال کرا.

ڕۆژێك هەڤاڵان شوانی تەنسیق و مامۆستا جمهور بانگیان کردم کە دەچین بۆ چالاکی لە نێوان گوندی گەڵناغاج و سەرچناری ئاغجەلەردا، پێشمەرگەیەکی خۆمان هەرچەندە برایەکیشی لە پێشمەرگایەتیدا شەهید بووبوو، پەیوەندی کردبوو بە هەوالگری ڕژێمەوە لە دەرفەتێکدا هەڤاڵ شوان و هەڤاڵ جمهور شەهید دەکات، لەو ڕووداوەدا هەڤاڵ نەوزاد بریندار بووبوو، من تیمارم کرد، هەتا بیرمە پێشمەرگەیەکمان بە ناوی جەلال چوو ئامێری دەنگ تۆمارکردن (مسجل)ی هێنا دەنگی تۆمار کرد، گوتی شەهید دەبێت با بیگێڕێتەوە کێ وای لێ کردوون، برینداەکەش گوتی فلان کەس کە پێشمەرگەی خۆمان بووە وای لێ کردووین، دواتر بکوژەکە خۆی ڕادەستی ڕژێم کرد، خۆشبەختانە هەڤاڵ نەوزادیش شەهید نەبوو، هەرچەندە هێندەی گوللەی بەر کەوتبوو کەس پێشبینی نەدەکرد بمێنێت، بە دەستی خۆم چوار بوتڵ خوێنم تێ کرد، ئێمە هەندێك کارمان دەکرد لە زانستی

پزیشکیشدا نەبوو، بۆ نموونە فوتوویەکی دۆشاومان دادەنا خوێنەکەی کە لە بەری دەڕۆیشت دەمانکردە ئەو فوتووەوە بەوە دەمانزانی چەندە خوێنی لێدەڕوات ئیدی ئەوەندەمان تێدەکرد.

ساڵی ١٩٨٦ بوو، یان ١٩٨٧ بوو، بیرمە بەشداری شەڕێکی دیکەم کرد هەڤاڵ سیروان کوێخا نەجم سەرپەرشتی دەرکرد، بریتی بوو لە ئازادکردنی ئاغجەلەر، هێرشمان بردە سەر ڕەبیەیەك نەمانەدەزانی هێندە بەهێزە بە BKC و RBG لێمان دەدا، کاری لێنەدەکرد، شەڕێکی دیکەم بیرە لە قولقولە و یاخیان تێیدا پێشمەرگە شکا، من لەو شەڕە جگە لەوەی پزیشك بووم برنەوێك و کلاشینکۆفێکم پێ بوو کشامەوە شاخەکە و بە تەنها بەرگریم دەکرد تا پێشمەرگە فریام کەوتن، لە شەڕێکی دیکەدا لە ساڵی ١٩٨٧دا کە هەڤاڵ عەلی بچکۆل و هەڤاڵ حەمەدەمینمان لەگەڵ بوو لە بەرامبەر دوکان لە پشتی کانی توو، هێرشمان کرد و دەیان سەربازی ڕژێمی لەسەر دەستی ئێمە کوژران، تەنانەت جلی یەکێك لە ئەندامانی (قوات خاصة)م لەبەرکرد، لە شەڕێکی دیکەدا لە گوندی خەجەلەرزۆکی لای شاخی ماوەت کە تیپی ٢١ ئەنجامیدا، هەرچەندە پاسدارمان لەگەڵ بوو ئێمە دڵنیابووین لەوەی ئەو قۆڵە دەپارێزن، کەچی بۆ سبەی بینیمان حکومەت گەیشتووەتە سەر شاخەکە و هەرچی پاسدارە هەڵهاتوون و چەکەکانیشیان بە جێهێشتووە، ئێمە لەوێ گیرمان خوارد، پێشمەرگەیەکمان بە ناوی پاڵە کە فەرماندەی کەرت بوو شەڕێکی بێ وێنە و خەیاڵی کرد، هێندەی مامە ڕیشە ئازا بوو، هەرگیز قارەمانێتی ناگێڕدرێتەوە خەڵکی کەرکووك بوو سەر بە تیپی ٢١ بوو، بەداخەوە دواتر لە بادینان شەهید بوو.

لە ڕووداوێکی دیکەدا هەڤاڵ حەمەسوور دووشیوانی بریندار بوو، دکتۆر هادی چارەسەری کرد، بەردەوام من و د. هادی لەو گوندانە پێشمەرگە و هاووڵاتیمان تیمار دەکرد، لە شەڕێکدا لە گوندی تیژە و تلیان دوو پێشمەرگە بریندار بوون، یەکێکیان گوللە

تیغی سەری کردبوو، شەهید بوو، ئەوی دیکە هەرچەندە گوللەکە بەتەواوی سەری گرتبوو لە لای نێوچەوانییەوە خۆشبەختانە شەهید نەبوو.

لێرەدا دەمەوێت لێکدانەوە بۆ ڕێکەوتنێك بکەم، بە بۆچوونی من ئێمە لە ڕێکەوتن لەگەڵ ئێران لە شەڕی لەگەڵ عێراقدا کەوتینە هاوکێشەیەکی هەڵەوە، دەبوو بێلایەن (محاید)بین، چونکە هاوکێشەکە لەسەر ئاستێکی باڵاترەوە کاری لەسەر دەکرا، کە ئەویش ئەمریکا و ئەوروپا و سۆڤیەت بوون، ئەوەش بەهەڵە دەزانم بەسەرکردایەتی هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا لە خاڵخاڵانەوە لە بیرە نەوتییەکانی کەرکووکمان دا.

لە ساڵی ١٩٨٨دا و لە مەرگەساتی ئەنفالدا برایەکم لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئەنفال کران، کارەساتێکی گەورە بوو، ئێمە کشاینەوە بۆ دیوی ئێران، ئێمە وەکو پزیشکی شۆڕش لە لای خەڵك زۆر ڕێزلێگیراو بووین، لە لای بەشێکی سەرکردایەتیش بەهەمان شێوە، بەڵام هەندێك هەبوون دژایەتیان دەکردین، چونکە ئێمە بڕوانامەمان بەرز بوو، هەرچەندە ئەو کات و ئێستاش چەندین کەموکورتی بوونی هەیە، بەڵام بە گشتی ئێمە کارەکتەرێکی کارای شۆڕشێکی گەورە بووین.

ئیدی لە دوای ڕاپەڕینەوە گەڕامەوە تا ساڵی ١٩٩٦ لە شەڕەکانی بەرگری لە ی.ن.ك بەشداربووم، لە ساڵی ١٩٩٤ لە ڕێگای چوونم بۆ چارەسەرکردنی چەند پێشمەرگەیەکی بریندار، کە نەمزانی پیلانە و لەلایەن چەند کەسێك ناپاکیم لێکراوە و کەوتمە کەمینی پ.د.ك نزیکەی (٥٠) ڕۆژ لە خورماڵ لە زیندانی تاکەکەسی بووم و ئەشکەنجەدرام، دواتر لە ڕێگای خاچی سوورەوە ئازاد کرام.

بە گشتی لە دوای ڕاپەڕینەوە بواری مەدەنیم هەڵبژاردەوە، تا ئێستاش لە کاری پزیشکی هەر بەردەوامم، هەروەها لەگەڵ پورزایەکی خۆمدا هاوسەرگیریم کردووە، باوکی

**سێ منداڵم، دوو کوڕ و کچێك، بەناوەکانی: (فەرمان، مستەفا و دالیا)، ئێستا کە ساڵی (٢٠٢٢)ە لە نەخۆشخانەی شەهید حەمەڕەش لە سلێمانی لە کاری پزیشکی بەردەوامم[١٨].**

**[١٨]- چاوپێکەوتن لەگەڵ: تاریق ساڵح قادر (د. دڵشاد)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٣/٣.**

## تاهیر عوسمان حەمەساڵح (شەهید د.تاهیر کەلهوڕی)

لە ساڵی ١٩٦٦ لە ناوچەی ساڵەیی لەدایك بووە، لە بنەماڵەیەکی کوردپەروەر بووە، هەر لە کەرکووك پلەکانی خوێندنی بڕیوە، پەیمانگای تەندروستی تەواو کردووە، شەهید پاڵە و بەرزانی حاجی کامیل لە هاوڕێ نزیکەکانی د. تاهیر بوون، لە ڕێکخستندا دەرمانیان بۆ پێشمەرگە پەیداکردووە و ناردوویانە بۆ شەهید د. هادی، شایەنی باسە د. تاهیر ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە ڕێکخستنەکانی کەرکووکدا.

لە ساڵی ١٩٨٣ پەیوەندی بە تیپی ٢١ی کەرکووکەوە کردووە، پێشمەرگەیەك بە ناوی ئازاد جەمیل لە باسی د. تاهیردا دەڵێت: "من لە ساڵی ١٩٨٤ لە شەڕی حەسار بریندار بووم، بە برینداری گواسترامەوە بۆ گوندێك بۆ لای د. تاهیر، دۆخم باش نەبوو، ناوبراو تا بەیانی بەدیارمەوە بوو چارەسەری پێویستی بۆ کردم و لە مردن ڕزگاری کردم، بۆیە شەهید د. تاهیر بۆ من وەکو ڕەمزێك وایە و لە بیری ناکەم".

پێشمەرگەیەکی دیکە بە ناوی مام عەلی گەدە دەگەڕێتەوە و دەڵێت: "من لە ساڵی ١٩٨٨ تووشی نەخۆشییەکی مەترسیدار بووم، کەس نەیدەوێرا نزیکم بکەوێتەوە، کەچی د. تاهیر دەهات دەرزی بۆ دەکردم و حەب و دەرمانی پێ دەدام و تەنانەت جلوبەرگیشی بۆ دەگۆڕیم، ڕۆژنە سەردانی دەکردم تا چاك بوومەوە و لە مردن ڕزگاری کردم".

بەمشێوەیە د. تاهیر لە خزمەتی خەڵك و پێشمەرگە بەردەوام دەبێت، تا لە ڕێکەوتی ١٩٩١/٣/١٩ بە دەستی هێزەکانی ڕژێم لە فولکەی ئیخوانی لە ناو شاری کەرکووك شەهید دەکرێت[١٩].

---

[١٩]- ژیاننامەی تاهیر عوسمان حەمەساڵح (د. تاهیر کەلهوڕی) لە ڕاکان عوسمان حەمەساڵح وەرگیراوە، کەرکووك، ٢٠٢٢/٢/١٥.

## تەها ئەورەحمان حەمەعەزیز ڕەسووڵ (د. تەها)

پێشمەرگایەتی واتە گیانبازی لەگەڵ مەرگدا، تێیدا ئەگەر شەهیدیش نەبیت برینـدار دەبیت، برینـداری بـە گوللـە، بـە پارچـەی تـۆپ و نـارنجۆك، یـان بۆردومـانی فڕۆکـە و بـەر کیمیـایی کـەوتن، نەخۆشـی، سـەرما، گـەرما، ژەهـراوی بـوون، سکچوون و ڕشانەوە، یـاخود پێوەدانی مار و مێروو و دووپشك، خەڵکی بە گشتی ڕووبەڕووی ئەم دۆخانە دەبنەوە، بەڵام پێشمەرگە بە زیادەوە ڕووبەڕووی دەبووەوە.

من لە ساڵی ١٩٦٢ لە گونـدی حاجیتـانی بنـاری پیرەمـەگرن لـەدایك بـووم، ناسـراوم بـە دکتـۆر تـەها، یـان (تـەهای حـاجی ئـەورەحمان)، دەرچـووی پـەیمانگای تەندروسـتیی بـاڵای سـلێمانییم، سـاڵی ١٩٨٤ لـە فەرمانگـەی تەندروسـتیی تکریـت دامـەزراوم، لـە بنکـەی تەندروسـتیی ئەبوالعـەجیل و مـاوەی سـاڵ و نیوێـك لـەوێ بـووم، لـەو ماوەیـەدا توانیومـە دەرمـان و پێداویسـتی پزیشـکی بـۆ پێشـمەرگە بنێـرم، سـاڵی ١٩٨٧ پەیوەنـدیم کـردووە بـە ڕێکخسـتنەکانی کۆمەڵـەوە، لـە سـاڵی ١٩٨٥ بڕێـك دەرمـان و چـەندین پێداویسـتی پزیشـکیم گەیاندووە بە دەستی پێشمەرگە و خۆشم بووم بە پێشمەرگە، سەرەتا لە ناوەندی کۆمەڵە و پاشان لە تیپی پارێزگاری لە دەستەی پاسەوانەکانی هەڤاڵ مام جەلال کـارم کـردووە، پاشـان چـوومە ئـەو هێـزە تایبەتـەی کـە ئـەرکی هێنـان و گواسـتنەوەی چـەك و تەقەمـەنی و پێداویستی پێشمەرگەیان لە سنوورەکانی ئێران لە بێتوشەوە بۆ ناوچەکانی دۆڵـی جافـەتی دەگواستەوە هێنانی چەك و تەقەمەنی لـە سـنوورەکانەوە بـۆ ناوچـەکانی مەڵبەنـدی دوو و سەرکردایەتی لە دۆڵی جافایەتی کارێکی زۆر قورس بوو، هەموو ئەو چەك و تەقەمەنییانە بە باری هێستر و بە کۆڵ دەگوازرانەوە، لە سـنووری نێـوان دوو دەوڵـەتی گـەورەی بـەهێز و شەڕکەر بە ناوچەیەکی شیو، دۆڵ، شاخ، ڕووبار، هەوراز و نشێو بـە نـاو چـەندین کـەمین و کێڵگەی میندا، ئەم کارە هەر بە پێشمەرگەکانی ئەو کات دەکـرا، دوای ئـەنفالیش کـاری مـن کە گواستنەوە و هێنانی چەك و تەقەمەنی بوو کۆتایی هات.

دوای ئەنفالی یەك بەشدار بووم لە بەرگری و شـەڕەکانی ناوچـەکانی مەڵبەنـدی سـێی ئـەوکات لـە چـیای کـارووخ و هەڵەمۆنـد و گـەرووی مەنجـەڵ و شـاخی کێـل کێـل و سـەری جوانەگا، دوای گیرانی ئەو ناوچانەش لە ئەنفالی حەوت و هەشتدا بەشداری بەرگرییـەکانی

چیای قەندیل لە شاخی کونەکۆتر و سوورەدێ و قەرناقا و پشت ئاشانم کردووە، لە پایزی ساڵی (۱۹۸۸)ەوە تاکو بەهاری ساڵی ۱۹۹۱ و کاتی ڕاپەڕین لە هەموو مەفرەزە پارتیزانەکانی ڕەتڵی سووورداش بەشداربووم، لە ژیانی پێشمەرگایەتی وەك کادیری سەربازی و ڕابەر سیاسی و کادیری کارگێڕی و ڕاگەیاندن و پزیشکی بەشداری تەواوی ئەو جەولە و چالاکییانەم لەگەڵ هاوڕێکانمدا کردووە.

بە گشتی بەشداری دەیان چالاکی پێشمەرگانە و چارەسەری سەدان پێشمەرگە و هاووڵاتیم کردووە، بەشداریم لە داستانی شەڕی سێ مانگەی قەیوان ماوەت کردووە، بەشداریم لە داستانی ڕزگاری و بەرگرییەکانی ئەنفالی یەك و بەشداری لە زۆربەی چالاکی و شەڕ و جەولەی پارتیزانەکانی ڕەتڵی سووورداش کردووە، بەشداریم لە چەندین خول کرووە، وەك خولی کیمیایی و چۆنێتی خۆپاراستن (ئێران)، خولی خۆپاراستن لە چەکی کیمیایی (ئەنقەرە)، خولی هەڵوەشانەوە و هەڵگرتن و دانانی مین و تەڵەی تەقاندنەوە (زەڵێ)، خولی چۆنییەتی دروستکردن و بەکارهێنانی کەرەستەکانی نەشتەرگەری و نەخۆشخانە (لیڤەر پوول، بەریتانیا).

دەتوانم بڵێم هەبوونی پزیشك لە هەر شوێنێك، یان لە هەر ماڵ و گوند و شارێك لە ناو هەر تیپ و مەفرەزەیەکی پێشمەرگە جۆرە ئارامی و دڵنیاییەکی دەدا بە کەسەکان، هەبوونی پزیشك لە مەفرەزەکانی پێشمەرگە، پێشمەرگەی وا لێ دەکرد، کە ئازایانەتر و جەربەزانەتر و سوورتربێت لەسەر کار و چالاکی و هێرش بۆ سەر دوژمن چونکە پێشمەرگە هەستی دڵنیایی لا دروست دەبوو، کە پزیشکێك هەیە لە کاتی پێویستی و برینداربوونی دەبێتە فریادڕەس و هاوکار و چارەسەرکار بۆی، بۆیە لەگەڵ تەواوی پێویستییەکانی وەك چەك و تەقەمەنی و جلوبەرگ و خۆراك و هۆشیاری، هەبوونی دکتۆر لەمانە زیاتر بوو بۆی، چونکە لە دۆخی نزیك بوونەوەی لە گیانبەخشین پزیشك لە هەر شتێك لەوانەی دیکە پێویستتر بوو بۆی، بۆیە پزیشکانی شۆڕش لە هەموو سات و شوێنە جیاوازەکاندا پێویستی سەرکەوتنەکانی دیکەی مسۆگەر کردووە.

هەبوونی پزیشك لە مەفرەزە و لە تیپەکان ورەی پێشمەرگەی بەرزکردووەتەوە، سەرکەوتنی چالاکییەکانی مسۆگەر کردووە، بۆیە پێویستە شانبەشانی پێشمەرگە و

شەهیدان و بریندارانِ، ڕێز لە هەموو ئەو پزیشکانە بگیرێت کە کاری پزیشکیان کردووە لە سەرکەوتنی شۆڕشدا.

پزیشکی شۆڕش بە گوێرەی ئەوەی هەم پێشمەرگە هەم دکتۆر بووە، بۆیە هەمیشە باری شانی قورس بووە، جگە لە چەك و تاقم هەمیشە کۆڵە دەرمانی هەڵگرتووە و بە گوێرەی خوێندەواری و ڕادەی هۆشیاری زۆربەی دکتۆرەکان جگە لە کاری خۆیان، کادیری ڕێکخستن و سەربازی و کارگێڕی و ڕاگەیاندن و بێ سیمیش بوون (جیهاز)، بۆیە هەمیشە ئەرك و فەرمانی سەرشانی دکتۆرەکان لە کاری باقی فەرمانده و پێشمەرگەکان قورستربووە.

لە پایزی ساڵی ١٩٨٦ گوندی هەڵەدن چۆڵ کرا، خەڵکەکەی لە دەوروبەری گوندەکە بوون، هەر یەکە و بە وشکەکەڵەك هۆدەیەکی دروست کردبوو، چۆڵ بوونەکە مەبەست لە خۆپاراستن بوو لەو تۆپباران و بۆردومانانەی کە دەکرایە سەر گوندەکان، ئێوارەیەك من لەو نزیکانە لە ماڵێك بووم، لە پڕ چەند فڕۆکەیەك هاتن و بۆردومانی گوندی هەڵەدنیان کرد، بارەگای گومرگ لەو گوندە بوو، هەر یەکسەر دوای بۆردومانەکە خۆم گەیاندنە گوندەکە و بەرە و لای بارەگای گومرگ چووم، لەوێ دوو پێشمەرگە بریندار بوون، هەڤاڵ خالید شەشۆیی بریندار بوو، کۆمەڵێك پارچە بەدەست و دەموچاو و سەر و پشتییەوە بوو، بەڵام دۆخی باش بوو، من کۆڵە پشتەکەم پێ بوو خێرا بۆم تیمار کرد هەندێك دوورینەوەی دەویست بۆم کرد، بریندارەکەی دیکەش دۆخی باشتر بوو.

سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٨٧ بوو، لە بارەگای سکرتاریەت بووم، لە کانی مورادی یاخسەمەر، ئێوارەیەك پێشمەرگەیەك هات گوتی هەڤاڵ مام جەلال بانگت دەکات، گوتم من؟ گوتی ئا...ئا تۆ، ترسام، بە خۆم گوت خودایە دەبێت منی بۆچی بێت! کە چوومە لای هەڤاڵ مام جەلال سلاوم لێ کرد، گوتی دانیشە کوڕم، گوتم فەرموو هەڤاڵ مام جەلال ناردبووتان بە شوێنمدا، گوتی کوڕم دەبێت ئیشێك بۆ مامی خۆت بکەیت، گوتم فەرموو بەسەرچاو، گوتی بەیانی زوو لەگەڵ نەخۆشێك دەتنێرم بۆ ئێران، هەتا سواری ئۆتۆمبێلی ئێران دەبێت، پێویستە لەگەڵیدا بیت، گوتم بەسەرچاو، دەستی کرد بە گیرفانیدا و بڕی سەد دیناری پێ دام، گوتی ئەوە بۆ خەرجی خۆت بەکاربهێنە، هەندێك کەسی لێ بوو گوتی

لەگەڵ ئەماندا ڕێك بكەوە، بزانە كەی دەڕۆن، گوتم باش، ئیدی خوداحافیزیم لێ كرد، بۆ سبەی هەر زوو هەڵساین، بە ئۆتۆمبێلەكانی هەڤاڵ مام جەلال چووین بۆ گوندی مالومە، لەوێ هەڤالان جەمال ئاغا و ئازادمان هەلگرت، هەڤاڵ ئازاد دۆخی باش نەبوو چەندین نەخۆشی گەورەی مەترسیداری هەبوو، لە ڕێگا دەبوایە جاروبار فشاری خوێن و پلەی گەرمی و هەڵواسینی ئاو و دەرزی لێدانی هەبوو بۆی ئەنجام بدەم.

بە ئۆتۆمبێلەكانی هەڤاڵ مام جەلال ڕۆیشتین، تاكو گەیشتینە سێروان لەوێ لە بارەگای هەڤاڵ ملازم عومەر لاماندا نانی نیوەڕۆیان ئامادە كردبوو، دوای نیوەڕۆ ولاخیان بۆ ئامادەكردین، یەك بۆ هەڤاڵ ئازاد و یەك بۆ من، بەڕێكەوتین و گەیشتینە گوندی گەرمكان لە بارەگای شێخ سەدرەدین نانی ئێوارەمان خوارد، مریشك و برنج و شلە و كاڵەك و شوتی...هتد، بۆ پێشمەرگە ئەم خواردنانە گرنگ بوون، لە كاتی نان خواردندا بووین هەڤاڵ جەبار فەرمان بە مەفرەزەیەكەوە گەیشتە ئەوێ، دوای چاكی و چۆنی، بڕیار درا هەر ئەو شەوە پێكەوە لە دەشتی قەلادزێ بپەڕینەوە، لە گەرمكانەوە بۆ گوندی كنجارە و لەوێوە بۆ پشتی بەستەستێن و لەوێوە بۆ بناری قەندیل، تاكو گەیشتینە گوندی قەلاتوكان، لەوێ لە بارەگای شەهید عەبدولڕەحمان سێوەیستیماینەوە، بۆ ڕۆژی دواتر ولاخێكی دیكەیان بۆ دابین كردین.

بە شاخی قەندیلدا سەركەوتین بەرەو (تاتی دۆ) لەوێشەوە بۆ شەوەكەی گەیشتینە گوێزێ كە چەند بارەگایەكی ی.ن.ك لەوێ بوو، بۆ بەیانی هەڤاڵ ئازادمان بردە سەر بەرزاییەكەی سنووری ئێران لە دەشتی وەزنێ لە نزیك ئالۆەتان و لەوێ سەری ئۆتۆمبێلمان خست، بەرەو تاران دواتر بەرەو ئەوروپا، بەلام بەداخەوە هەڤاڵ ئازاد بەهۆی سەختی نەخۆشییەكەیەوە كۆچی دوایی كرد، هەر لە ڕێگەی تارانەوە تەرمەكەی هاتەوە، لە گوندی زەڵخان لای شێنێ بە خاك سپێردرا.

دوای ئەو ڕووداوە هەڤاڵ جەبار فەرمان پێی گوتم مادام هەر تا ئێرە هاتووی بۆ پیاسەیەكی سەفەز ناكەی، گوتم باشە هەندێك پارەی پێ دام و نامەیەكیشی پێ دام بۆ مەكتەبی دارایی كە لە گوێزێ بوو، دكتۆر فوئاد مەعسومی لێ بوو، ئەویش هەندێك پارەی

بۆ خەرج کردم، گەشتی سەقزم کرد و پاشان چوومە تاران، پاش هەفتەیەك لە تاران بە هەمان ڕێگای پێشوو بەرەو بارەگای سکرتاریەت بۆ گوندی یاخسەمەر گەڕامەوە.

لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٧ بارەگامان لە گوندی ئەشکان بوو، لە ناوچەکانی سەرکردایەتی لە دۆڵی جافایەتی سەرقاڵی هێنانی چەك و تەقەمەنی بووین، شەوێك لە شەوەکانی ناوەڕاستی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٧ چەند بارێکی گرنگ هەبوو، دەبوو بیگوێزینەوە، بارەکان دەزگایەکی بەدالە و تەلەفۆن بوو، لەگەڵ سەحنێکی گەورە و بارێکی دیکە و هەشتا دەمانچەی چواردەخۆر، بارەکانی دیکەش زۆر گرنگ بوون بریتی بوون لە چەك و چاپ و ئامێری ڕادیۆی گەلی کوردستان، ئێوارە بارمان کردن و هەر کە دونیا تاریك بوو لە ئەشکانەوە بۆ سەر چەمی هەرزنە بەڕێکەوتین، لەوێشەوە بۆ شاخی سەخت و تەنگەبەر و دۆڵی قووڵ بەرەو جافایەتی، دەوروبەری کاتژمێر نۆی شەو لە ناو ڕووباری زێی بچووك و لە ئاستی هەرزنە، ڕەتڵێك تۆپ و هاوەن بە ئاراستەی ئێمە تەقێنرا، هەموویان لە ناوماندا تەقینەوە، هەر لەوێدا پێشمەرگەیەك بە ناوی هەڤاڵ مستەفا کە خەڵکی سەرگەڵوو بوو شەهید بوو، چەندین پێشمەرگەش برینداربوون، چەندین هێستریش کوژران و بریندار بوون، هەندێك لە بارەکان کەوتنە ئاوەکەوە، ڕۆژی حەشر کە باس دەکرێت چۆنە! بۆ ئێمە ئاوها بوو، هەموو پێشمەرگەکان بێ شڵەژان و لە دوای نەمانی تەقینەوەی تۆپەکان خێرا هەریەکە و پەلاماری شتێکماندا، خێرا شەهید و بریندارەکانمان لەوێ دوورخستەوە، هەرچۆنێك بێت بە پشتوێن و جامانە برین و خوێن بەربوونمان بۆ بەستن، هێزەکەمان دابەشکرد بە دوو بەشەوە، بەشێکیان شەهید و بریندارەکان بگێڕنەوە بۆ گوندی ئەشکان، کە گوندێکی ئێران بوو، بەشەکەی دیکەش بۆ ڕزگارکردن و کۆکردنەوەی بارەکان، ئێمە هەر چۆنێك بێت لە کاتژمێر و نیوێکدا بریندارەکانمان گەیاندە گوندی ئەشکان، لە ژووری بنکە تەندروستییەکەدا دەستمان بە چارەسەری خێرا کرد، سەرەتا خوێنبەربوونەکانمان وەستاند و موغەزیمان بۆ هەڵواسین و دەرزی و دەرمانمان پێ دان، ئەوانەی کە بریندار بوو بریتی بوون لە:

١. عەلی حەمەڕەش باخەمری: هەرچەندە دواتر کۆچی دوایی کرد، سەرەتا هەرچۆنێك بێت توانیمان چیست تویی بۆ دابنێین و لە مردن ڕزگاری بکەین.

٢. ئەحمەد حاجی کەریم هەڵەدنی: دۆخی زۆر خراپ بوو هەرچی لە توانامانـدا بـوو بۆمان کرد، شـەویلاکی و شـانی شـکابوو، پەنجـەی شـکابوو، هـەموو لەشـی پارچـەی تۆپ بوو.

٣. بەختیار عەبدوڵڵا سەرگەڵوویی: برینداربوو

٤. حەیدەر سەعید حاجیتانی: برینداربووو

ئـەم چـوار برینـداره هـەتا بڵێـی دۆخیـان خـراپ بـوو، دەبـوو ئـەو شـەوە لـە ئەشـکان بمێننەوە، بۆ بەیانی لە سەردەشتەوە ئۆتۆمبێلی فریاگوزاری خێرا هات و بریندارەکانی برد بۆ سەردەشت، پاشان بۆ تەورێز و دوای دوو بۆ سێ مانگ لە چارەسـەریی، بـە تەنـدروسـتیی باشەوە هەموویان گەڕانەوە، هەرچەندە لەو ڕووداوە چوار برینـداری دیکەمان هەبوو، بەڵام برینـەکانیان سووک بوو، برادەرانی دیکـەش بارەکانیـان گواسـتەوە شـاردیانەوە، لەبەرئـەوەی دەمانزانی کاتێك کە ڕۆژ دەبێتەوە هێزی حکومەتی عێراق دێنە شوێنی ڕووداوەکە.

لە ١٩٨٧/١٢/٦ کۆتا شەڕی داستانی قەیوان ماوەت بـوو، ئـیتر لـەو ڕۆژەدا دوژمـن شـاخی برزوت و باڵۆسە و گوندەکانی سەفرە و گەلاڵە و شاخی گردە ڕەشی داگیر کرد و پێشـمەرگە شکا، بەشێکی بۆ دۆڵی جافایەتی و بەشێکی بۆ دۆڵی ماوەت و شاناخسێ و بەشێکیشی بەرەو و ئەشکان لەسەر سنووری ئێران کشانەوە کـە ئـەو کـات ئێمـە بارەگامـان لـەوێ بـوو، نیمچـە بنکەیـەکی تەنـدروسـتیمان هـەبوو، چـەند ڕۆژێـك دوای ئـەو ڕێکەوتـە لـە شـاخی بـرزوت، هەڤاڵان ئەحمەد ڕۆمی فەرمانـدەی دیـار و حەمـە تیمـاری شـەهید دەبـن، کـە لـە تیپـەکانی گەرمیان بوون، چەنـدین پێشمەرگەش برینداربوون یەك لـەوان نـاوی هـەڤاڵ عوسمـان بـوو، زۆر هیلاك بوو، چەنـدین گوللە و پارچەی بەرکەوتبوو، چەندین شوێنی شکابوو، لە بـزروت بۆ ئەشکان دوو ڕۆژ بوو بە ڕێگای زۆر ناخۆش و شیو و دۆڵ و چەم و ڕووبار بە کۆڵ و بـە سواری وڵاخ تاکو گەیاندبوویانە لای ئێمە ئەوەندەی دیکە هیلاك بووبوو، تاکو گەیشتە لای من بە هاوکـاری هەنـدێك لـە بـرادەران خێـرا ئـەوەی چارەسـەری سـەرەتایی بـوو لـە خـوێن بـەربوون و دوورینـەوە و سـاڕێژکاری و هەڵواسـینی موغـەزی و پلازمـا، هەرچۆنێك بێـت هەڤاڵ عوسمان نوزمیەکی بەبەردا هاتەوە، هەمووان دڵخۆش بووین، هـەموو لەشـیم پشـکنی

بوو بەرەو باشی دەچوو، بەڵام هەر هاواری دەکرد، منیش وتم عوسمان چییە؟ دەستی بۆلای ناوگەڵی برد، منیش تەنها تەماشای ئەو شوێنەم نەکردبوو، شۆرتێکی لە پێ دابوو خێرا دام نا و کە سەیرم کرد چەرمی گونەکانی پێوە نەمابوو، بەڵام هیچ برینێکی پێوە نەبوو، تەنها بە فشارێکی زۆر چەرمەکە تەقی بوو، هەرچۆنێك بێت چەرمی گونیم بۆ هێنایەوە یەك، یەك دوو تەقەڵم لێدا، سەیرم کرد، عوسمان بەو هەموو دۆخی برینداری و شکانی دەستی و پەنجە و هەبوونی چەندین گوللە و پارچە پێوەی، سەرما و برسێتی و لەبەر ڕۆیشتنی خوێنێکی زۆر و هاتنی لەو ڕێگا دوورەوە، کەچی بەو هەموو حاڵەوە کاتێك چەرمی گونەکانیم بۆ دەدوورییەوە جووڵەیەکی کرد، ئەندامی نێرینەی جووڵەی تێکەوت، منیش بانگم کرد، عوسمان هەتیو ئەوە چییە؟ خەریکی چیت؟ گوتی دکتۆر گیان چییە؟ شەهید غەریب کە فەرماندەی ئەو بارەگایە بوو هاتە لامەوە وتی دکتۆر ئەوە چییە؟ وتم هەڤاڵ غەریب تەماشا ئەها ئەندامی نێرینەی جووڵەی پێکەوتووە، هەڤاڵ غەریب پێکەنی و گوتی کاکە وازبهێنە ئەوە شەیتان وازی لێهێناوە، کەچی تۆ وازی لێناهێنی.

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٨ ئاوارەی ئێران بووین، ئۆردوگایەکی سەد ماڵی دەبووین، لەسەر چۆمی کەڵوێ (زێی بچووك)، لە نزیك شاری سەردەشت، منداڵان و هەرزەکاران سەرقاڵی مەلە بوون، لەسەر چۆمی ئۆردوگای پیر شێخ، هەڤاڵ ئەنوەری حاجی عەبدوڵڵا تەلانی مەلەی نەدەزانی، خۆی ڕووت کردەوە و خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکەوە لەو خەیاڵەدا بوو هەموو کەس بەو جۆرە مەلە دەکات، ئیدی خولەکێك بۆ دوو خولەك ئەنوەر دیار نەما، ئیدی خەڵکەکە شڵەژان و بووە گریان و هاوارکردن، تا بزانن کێ مەلەزانە تا فریای بکەوێت، لە ماڵەکانەوە هەرچی ژن و پیاو و منداڵ هەبوو، بەرەو زێیەکە ڕایان کرد، لەو کاتەدا هەڤاڵ فاروقی ئەحمەدی مەلا مەحموودی کلێنە، لە سەردەشت دەهاتەوە و تەماشا دەکات خەڵکی هەموو بەرەو ئاوەکە ڕادەکەن، کە یەکێك بوو لە مەلەوانە زۆرباشەکان، ئەویش خێرا بەرەو ئاوەکە ڕادەکات، دەگاتە ئەوێ و بەدەست ئاماژەی بۆ دەکەن کە لە کوێدایە، ئەویش خۆی فڕێ دەداتە ئاوەکەوە، جارێك چووە ژێر ئاوەکەوە هیچی نەبینی بوو، جارێکی دیکە چووەوە ژێر ئاوەکە دیار بوو بۆ شوێنێکی قووڵتر ڕۆیشتەوە و ئەمجارە هەڤاڵ ئەنوەری دەرکردەوە، ئەنوەر لە ماوەی ئەو سێ بۆ چوار خولەکە هەموو گیانی ڕەش

هەلگەڕابوو، خێرا مـن چوومە سەری و هـەڵمان گێڕایـەوە، دەستماندا بـە پشتیدا و خێـرا هەناسـەدانی دەسـتکردم بـۆ کـرد و زینـدوو بـووەوە، پـاش چـارەکێك یـەك بـۆ دوو جـار کۆکەیەکی بۆ کرد.

سـەر ئـەو ئـاوە وەك ڕۆژی حەشـر وابـوو، سـەدان منـداڵ و ژن و پیـاوی لـێ بـوو، هـەر چۆنێك بـوو مـن گـوتم مـاوە، ئـەو خەڵکـەمان لـێ دوور بخەنـەوە، پـاش چـەند جارێـك لـە هەناسەدانی دەستکرد، هـەڤاڵ ئـەنوەر زینـدوو بـووەوە، پـاش چـارەکێك پشوودان، بـە پێـی خۆی ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە، مام حاجی عەبدوڵڵای باوکی ئەنوەر هەتا کۆچی دوای کرد هەر دەیگوت ئەنوەر کوڕی تۆیە، ئەنوەر کوڕی دکتۆر تەهایـە، (خۆشـبەختانە هـەڤاڵ ئـەنوەر تـا ئێستا لە ژیاندا ماوە).

لە بەهاری ساڵی ١٩٨٨ دوای ئەوەی لە ئەنفالی یەك ناوچەکانی سەرکردایەتی لە دۆڵـی جافایەتی گیران، ئێمە بارەگامان بردە شاناخسێ، لە کۆتایی بەهاری هەمان ساڵ وەك هێـزی پشتیوانی بۆ هاوکاری ئەو هێزەی لەوێ بوو، بەڕێ کەوتین، بەرەو مەڵبەندی سێی ئـەوکات و لە شاخی کارووخ، گـەرووی مەنجەڵ، شـاخی هەڵەمونـد، شـاخی پێبـۆ، کێـل کێـل، سـەری جوانەگا لە ناوچەی وەرتێ و ڕەواندز.

ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٧ ئێمە لەسەر شاخی (پێبۆ) بووین، لە ڕووی دوژمنەوە ئاسان بوو، بەڵام لـە ڕووی ئێمـەوە زۆر دژوار و سـەخت بـوو، بـەهۆی حـەبڵ و سـنگ و کێبڵـەوە دەمـانتوانی هاتوچۆی پێ دا بکەین، ئەرکەکەمان زۆر سەخت بوو، دە ڕۆژ جارێك ئاڵوگۆڕمان پێ دەکـرا، لـەو دە ڕۆژە تـەنها نـان و چـا هـەبوو، دەم و چـاو شـۆردن نـەبوو، چـونکە ئـاو نـەبوو، خەلفیەکەمان لە گوندی گەرەوانی سەروو بـوو لـە ئێمـەوە دوور بـوو، مـام بـەکر مالومـەیی پێشـمەرگەیەکی هـێمن و لەسـەرخۆ و بەڕەوشـت بـوو، کورتەباڵایـەکی کـەمێك گۆشـتن و کەسێکی سوعبەت چی و قسەخۆش بوو، دەیویست یارمەتی هەموو برادەرەکانی بـدات، مـام بەکر ڕۆژانـە ئـاو و خـواردنی لەگـەڵ چـەند کەسـێکی دیکـە بـۆ سـەر دەخسـتین، ئـەو ڕۆژە ١٩٨٨/٨/٧ دەمەو عەسر هەندێك ئاو و خواردنی سەرخستبوو، برادەران زۆریان لێ کرد ئـەو شەوە نەچێتە خـوارەوە، لای ئـەمان بمێنێتـەوە و قسـەی خۆشـیان بـۆ بکـات، مـام بـەکریش قایل بوو، مایەوە، کاتـژمێر نـۆی تـەواو مـن و شـەهید غـەریب و حەمـەی حـاجی کـەریم و

فەریق هەڵەدنی دانیشتبووین، دەمانویست گوێ لە ڕادیۆی لەندەن بگرین، کەمێك لە هەواڵەکان بزانین، چونکە لەو ڕۆژانەدا دەنگی ڕێکەوتنی ئێران و عێراق هەبوو، شەڕ دەوەستێت و هەمان چارەنووسی ئازاری ١٩٧٥ و ڕێکەوتننامەی جەزائیر دووبارە دەبێتەوە، بە گشتی پێشمەرگە زۆر بێتاقەت و وره زۆر نزم بوو.

کاتژمێر نۆی تەواو لەگەڵ لێدانی (بیگ بەن) تۆپێك لە ڕەواندزەوە تەقێنرا و لەو لای ئێمەوە دای بە زەویدا، هەڤاڵ فەریق هەڵەدنی قاچی نا بە ڕادیۆکەمدا و شکاندی، پاش چەند چرکەیەك بێدەنگی لە سەنگەرەکانی خوارەوە بوو بە هاوار، من خێرا ڕام کرد و کۆڵە پشتەکەم کردە کۆڵ و بەرەو لای تەقینەوەکە ڕۆیشتم، چی ببینم! کە بینیم هەڤاڵ ناسر ئەحمەد فاتە مۆرە هەڵەدنی بریندار بووە، مام بەکرم بینی ڕیخۆڵەکانی لە ورگی هاتبوونە دەرەوە، شانی شکا بوو، چەندین پارچەی دیکەی پێوەبوو، هەر چۆنێك بێت، هەوڵم لەگەڵدا و ڕیخۆڵەکانیم کردەوە ورگی، چەند تەقەڵێکم لێدا، بەو شەوە کە تەنها لایتێکی دەستیم پێ بوو، لە کاتی تیماری مام بەکر، فەرمانم بە پێشمەرگەکان دەکرد کە بچن داربڕن و بەبەتانییەك گوێزەرەوە (نقالە)یەك دروست بکەن، هەر چۆنێك بێت مام بەکرمان گەیاندە گوندی گەرەوان لەو شاخە سەخت و هەزار بە هەزارە، بە کۆڵ و بە شۆڕکردنەوە، پاشان بە ولاخ کاتژمێر یەك و نیو گەیاندمانە گوندی گەرەوان، لەوێ چارەسەری دیکەم بۆ کرد و هەندێك موغەزیم بۆ هەڵواسی و خوێن بەربوونەکانیم ڕاگرت، برادەران چایان لێنابوو، نان و چایەکمان خوارد و دوو فەردە (گا)مان لە ولاخێك بار کردوو مام بەکرمان خستە نێوانی بەرەو گوندی مەلەکان، کە ئەو کات نەخۆشخانەیەکی گەورەی لێ بوو، گوندی گەرەوان بۆ مەلەکان زۆر دوور بوو، دەبوو شاخی ئاراسن ببڕی و پاشان چەندین شیو و دۆڵ تا دەگەیشتینە مەلەکان، بەرەبەیانی زوو بەڕێکەوتین کاتژمێر هەشتی تەواو لە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ گەیشتینە سەر شاخی ئاراسن پێش ئەوەی کە بگەینە بەرزایی و شۆڕبینەوە پلەیەکی ناخۆش هەبوو بۆ ڕۆیشتنی ولاخ، ناچار مام بەکرمان لە پلەکە داگرت و هێسترەکەمان بردە سەرەوە، تا ئەو کاتەی کە لە هێسترەکە دامان گرت مام بەکر هۆشی هەبوو، قسەی دەکرد، ولاخەکەمان بردە ئەو دیو پلەکە و چووینەوە بۆ لای مام بەکر تا سواری ولاخەکەی بکەینەوە، کە سەیرمان کرد مام بەکر گیانی سپاردبوو، واتە لە کاتژمێر

٨ی ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ شەهیدبوو، ئێمە پێنج کەس بووین، پێکەوە لەسەر تەرمەکەی دە دەقە بەکوڵ گریاین، پاشان هەڤاڵ وەلی مالومەیی کە خزمی مام بەکر بوو، پرسیمان چی بکەین؟ پاشان بە هەموو پێکەوە بڕیارماندا بیبەین، بەرەو مەلەکان و لەوێ شۆردمان، بەتانییەکمان پێوە پێچا، بردمان لە گوندی گوڵان لە نزیك ڕانیە بە خاکمان سپارد.

مام بەکر منداڵی نەبوو، تەنها خێزانی هەبوو لەگەڵ هەندێك لە خزمەکانی کە هەمووی ئاوارەی گوندەکانی سەردەشت بووبوون، لەوێ دەژیا، بەڕاستی مردنی مام بەکر ئازارێکە و ئێستاش کە (٢٠٢٢)ە بیرم نەچووە، جاروبارێش لە ڕۆژنامە و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان یادی دەکەمەوە، درووود بۆ گیانی بەرزی مام بەکر و سەرجەم شەهیدانی ڕێگەی ڕزگاری کوردستان[٢٠].

بەهاری ساڵی ١٩٩٠ پارتیزان بووین لە شاخی پیرەمەگروون، بارەگای سەرەکیمان لە دۆڵەبی بوو، لە پشتی گوندی پیران بارەگای ئۆردوگای پیرەمەگروون، پێشمەرگەیەك بە ناوی هەڤاڵ تۆفیق محەمەد قادر (توانا سوور)، لە مەفرەزەکەماندا لە هەمووان ڕووخۆشتر و گورجوگۆڵتر بوو، چەند ڕۆژێك بوو ددانی ئازاری هەبوو، پاش وەرگرتنی چارەسەری ئازار و هەوکردن، سوودی نەبوو، ددانەکە کلۆر بوو ئازاری ئەوەندە زۆر بوو لەسەر سەر دەخولایەوە، دوای گفتوگۆیەك بڕیارماندا لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی پیرەمەگروون و سلێمانییەوە، بینێرین بۆ شار بۆ چارەسەری کێشەی ددانی، بڕیارماندا لە دوای ئێوارەوە بیبەین بۆ ئۆردوگای پیرەمەگروون، من بیرۆکەیەکم بۆ هات، وتم برادەران بۆ داوا لە ناوشار نەکەین تاقمی ددان کێشانمان بۆ بنێرن؟ گوتیات تۆ هیچی لێدەزانی؟ گوتم بەڵێ، ئیدی لە ماوەی دوو ڕۆژدا لە ڕێگەی هەڤاڵ ئاکۆی محەمەد وەهبی، تاقمی ددان هەڵکێشانەکەمان بۆ هات، من پێشتر لە نەخۆشخانەکانی مەڵبەندی دوو لە گوندی بلەکێ لە کاتی چەند ددان هەڵکێشاندا تەماشای دکتۆر جەبارم کردبوو، خۆشم بڕێك شارەزایی تیۆریم هەبوو، توانام هێنا و بەباشی بۆم سڕکرد، پاش کەمێك زۆر بەدروستی توانیم ددانەکەی بۆ هەڵبکێشم، کاتێك مەلا بەهادین ددانەکەی بینی کە بە دەمی پلایسی ددان

---

(٢٠)- ئەم چیرۆکە لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ و گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە بڵاوکراوەتەوە.

کێشانەکەوە بوو، گوتی: "اللهم صلی علی محمد وعلی اله محمد"، منیش ڕووم کردە توانا و گوتم چۆنم بۆت ئەوە ددانەکەم بۆ کێشای و لەو ئازارە ڕزگارم کردی، شەهید توانا سووریش گوتی ئەی من چۆنم بۆت، جوان وەستام ددانم بۆ بکێشی.

ساڵی ۱۹۹۰ بارەگای پارتیزانەکانی ڕەتڵی سووورداش لەسەر کانی دۆڵەبی لەسەر شاخی پیرەمەگروون بوو، ئەوکات ڕێکخراوی ناو شار شیری (نیدۆ)یان بۆ دەناردین، بەیانیان زۆر جار نان و شیرمان دەخوارد، پێشمەرگەیەك سکی دەچوو، دوو سێ چارەسەرم بۆ کرد و بۆم گۆڕی، هەر چاك نەبوو، ئاسۆ سووورداشی بە گاڵتەوە گوتی شیرەکەی بۆ بگۆڕە بزانە چاك نابێت؟

ئیدی من لە دوای ڕاپەڕین و دامەزراندنی حکومەتی هەرێم وەك یەکەم ئەفسەری ئاسایش بەشداری حکومەت بووم و پاشان بەشداری کۆلێژی سەربازی قەلاچوالانم کرد و بە پلەی ملازمی دوو تەواوم کرد، پاشان وەك بەرپرسی دووەم لە نەخۆشخانەکانی شۆڕش بەردەوام بووم، تا ساڵی ۲۰۰۹، پاشان گوازرامەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی کاروباری پزیشکی لە وەزارەتی پێشمەرگە، وەك جێگری بەڕێوەبەری گشتی دەست بە کار بووم، هاوکات بڕوانامەی بەکالۆریۆسم لە یاسا هەیە، ئێستاش لیوای مافپەروەرم لە وەزارەتی پێشمەرگە، خێزاندارم و خاوەنی پێنج منداڵم، باوکم و برایەکم و برازایەکم و چەندین مام و ئامۆزا و پورزام شەهیدن، بە گشتی بنەماڵەکەمان خاوەنی پازدە شەهیدن[٢١].

(٢١)- تەها ئەوڕەحمان حەمەعەزیز ڕەسووڵ (د. تەها)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٢/١٠.

## جەبار عەبدول نەریمان قادر (د. جەبار)

لە ساڵی ١٩٥٥ لە دایکبووم، باپیرم لە ناوچەی هەمەوەند لە گوندی گورگەیی ژیاوە، باوکیشم چووەتە سنووری دوبز و لەوێ نیشتەجێ بووە، باوکم چوار هاوسەری هەبووە، من لە هاوسەری سێیەمی لە گوندی قوتانی دوبز لە دایکبووم، لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا چوومە بەر خوێندن، لە ١٩٧٠ چوومە ناوەندی و لە ١٩٧٣ چوومە ئامادەیی کوردستان لە کەرکووك، لە ساڵی ١٩٧٦ کۆلێژی پزیشکی گشتی بەسرە وەری گرتم و لە ١٩٨٣ تەواوم کرد.

لە قۆناغی ئامادەیی هەڤاڵ ئازاد هەورامیم ناسی و لە یەك پۆل و پێکەوە دادەنیشتین، پەیوەندیمان بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستانەوە کرد، دوای زانکۆ و لە ١٩٨٤ ساڵێك لە سەماوە بووم بە پزیشك، دواتر لە سەرەتای ١٩٨٥ بووم بە پێشمەرگە و سەرەتا چوومە ڕێکخراوی سلێمانی کۆمەڵە، هاوکات هەڤاڵ پۆلای خاڵۆم لەوێ بوو، ئەو بوو بە لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی تیپی ٥٧ی سەگرمە، گوتم منیش لەگەڵ ئەو دەچمە تیپ، هەڤاڵ ئازادی سەگرمە سەرتیپ بوو، بەلای ئەو هەڤاڵانەوە سەیر بوو، کە پزیشکی گشتی بووم و هاتووم بۆ تیپ، هاوکات لەگەڵ مەفرەزەکاندا بەشداریی شەڕم دەکرد، هەموو کارێکی تەندروستیم ئەنجام دەدا.

هەڤاڵ ئازادی سەگرمە پیاوێکی خەمخۆر بوو لە ڕێگەی هاوڕێکانی ئەوەوە دەرمان بە من دەگەیشت، بارەگای من لە گوندی مێوڵی قەرەداغ بوو، ڕۆژێك پێشمەرگەیەك فیشەکێك لەناو باریکایی قاچیدا تەقی بوو، ئێسکەکەی ورد کردبوو، هەڵسام بە چینێکی گەچ پێچام، ئەو ئێسکانەی هاتبوونە دەرەوە شۆردم و خستمەوە شوێنی خۆی و هەموو ڕۆژ تەداویم دەکرد، بە دوو مانگ و نیو ئێسکەکەی دروست بووە و چاك بووەوە، لە ساڵی ١٩٨٧ فیشەکێك دابووی لە سکی پێشمەرگەیەك، هێنایان بۆ لام، سەرەتا نەم هێشت نان بخوات، هەروەها نەم هێشت تووشی هەوکردن ببێت، لەو کاتەدا هەڤاڵ ئازاد هات بۆ لام گوتی هەڤاڵ غازی برات

له ناوچەی شوان شەهید بووە، گوتم دڵم نایەت ئەم بریندارە جێبهێڵم، ئیدی بۆ نزیکەی دە ڕۆژ چاکبووەوە، واتە لەبەر خاتری ژیانی ئەو پێشمەرگە بریندارە، نەچووم بۆ سەر تەرمی براکەم.

لە ڕووداوێکی دیکەدا لە ١٩٨٦ هەڤاڵ کەریم زەنانەیی پارچەی تۆپ بەر قۆڵی کەوتبوو، گۆشتەکەی تا سەر ئێسك لەت کردبوو، هەڤاڵ ئازاد گوتی دکتۆر باڵی دەبڕیتەوە، گوتم بە دوو مانگ وەك خۆی لێدەکەمەوە، دوای دوو مانگ چاکم کردەوە و گوتم بانگی هەڤاڵ ئازاد بکەن، هات کە بینی، گوتی بڕوا ناکەم و کاتی برینداربوونەکەشی بڕوام پێ نەکردی.

ڕۆژێك هەڤاڵ پۆڵای مام کەریم کە ئاوەڵزاوام بوو، هات بۆ لام و گوتی ڕۆژێکیان لە گوندەکەمان گوێم لە فیشکەیەك بوو، بینیم مارێکە لەگەڵ بزنمژۆکێکدا شەڕ دەکەن، کە مارەکە بە بزنمژۆکەکەوە دەدات، بزنمژۆکەکە دوور دەکەوێتەوە و دەچێتە سەر بنجە گیایەك و کەمێکی لێ دەخوات و دێتەوە لەگەڵ مارەکە شەڕ دەکات ئەم کارە چەند جارێك دووبارە بووەوە، دوای ئەوە چوومە سەر بنجە گیایەکە تەماشا دەکەم لە جۆری گۆزەروانە.

لە هەر دۆخێکی پێوەدانی مار و دووپشکدا، لەو ڕووداوە بە دواوە لەوانە هەڤاڵ عەتا کە ئامر کەرتی هەمەوەند بوو مار پێوەی دابوو، هێنایان گوتم گیای گۆزەروانم بۆ پەیدا بکەن، کەمێك لەو گیایەم بۆ هاڕی و پێمدا و هەندێکیشم لەسەر برینەکەی دادەنا تا چاك بووەوە. بە هەمان شێوە کوڕێکی دیکەی خەڵکی خاوێم چارەسەر کرد شوێنی پێوەدانەکەم بە دەرزییەك بریندار کرد، هەندێك لەو گیایەم بە هاڕاوی خستە سەری و بە لەفاف پێچام، دوای نیو کاتژمێر کردمەوە ژەهری مارەکە دەرهاتبووە ناو لەفافەکە.

لە ڕووداوێکی دیکەدا کوڕێکی گەنجی ناوچەی جەباری فیشەك لە ملیدا بوو بۆڕی خوێنی سوتاندبوو، بەڵام تووشی خوێنبەربوونی نەکردبوو، گەیاندبوویانە تاران، لەوێ پێش چارەسەری تەواو گەڕابووەوە ناوچەکەی خۆی، هێشتا هەوکردنی شوێنی تەقەڵەکانی مابوو، کلۆ خوێن سەر برینەکەی گرتبوو، گوتیان دەیبەینەوە بۆ ئێران گوتم فریای ئەوێ

ناکەوێتـەوە بـەس ئـەو کڵۆ خوێنانـە لا بچن، تووشـی خوێنەبـەربوونی دەکات و دەمرێـت، لەناکاو بۆڕی خوێنی تەقی و تووشی خوێنبەربوون بوو، منیش بە حـەوت مقەسـتی گـرتنی دەمار نەمتوانی خوێنەکەی بوەستێنم و لەسەر دەستمان شەهید بوو.

لە ڕووداوێکی دیکەدا لە ئەستێڵ بووین، هەڤاڵ کـەریم زەنانـەیی دوای برینـداربوونی لە شوێنێك پێستەکەی دووڕابـووەوە، هێنایـان بـۆ لای مـن، شـوێنی دووڕاویەکـەی ئاوسابوو، گـوتم ئـەوە خوێنـە کۆبوومتـەوە، چـەقۆیەکم لـە پێسـتەکەدا و خـوێنی فڕێـدا، هاوڕێکـانی گوتیان دەمرێت، تەداویم بۆ کـرد، خوێنەکـەی نەدەوەسـتایەوە، بـردم بـۆ لای دکتـۆر فـائیق هەر سوودی نەبوو، یـەکێك لـە کـادیرانی تەندروسـتی گوتیـان دەبێـت ئـەو قۆڵـە ببڕبنـەوە، ئەویش ڕای کرد لە دەستیان و هاتەوە بۆ ئەستێڵ، دووبارە پێچامەوە و بردم بۆ بانی مـۆرد نامەیەکم بۆ بەرپرسانی پێشمەرگە نووسی بۆ ئەوەی بینێرن بۆ لای پسپۆڕی دڵ و خـوێن، دواتر بە ڕێگایەك گەیاندبوویانە چەمچەماڵ و چارەسەریان کردبوو.

لە ڕووداوێکی دیکەدا پێشمەرگەیەك بە ناوی هەڤاڵ شەماڵ لە تیپی ٥٧ی سـەگرمە لـە هێرشی سەر بیرە نەوتەکانی کەرکووك کەوتبووە بەر هێرشی جاشەکان، فیشـەك بـەر ڕانـی کەوتبوو، شکابوو، هێنایان بۆ لای من، شەوێك پشتوێنەی گەچم بۆ کرد و پەنجەرەیەکم لـە ڕانی کردەوە بۆ تەداوی، گومانی هاتنی فڕۆکەم کرد و بردمە خاوێ بۆ ماڵی خاڵم دوو بوتڵ خوێنیشم پێدا، دوای دوو مانگ و نیو چاك بووەوە.

جگە لەمانە هەندێك جار لەدایکبوون (ولادة)م دەکرد، واتە ژن هەبوو منداڵەکەی گیر دەبـوو، مـن ئـەو کەوچکەم هـەبوو کـە سـەری منداڵەکـەی دەگـرت و ڕامدەکێشایە دەرەوە، هەروەها هەبوو فیشەك بـەر دەمـاری سـەرەکی قولەقاچی دەکـەوت، قاچی کەسـەکە کـورت دەبـوو، مـن پێسـتەکەم لا دەدا و ئـەو دەمـارە گۆشـتیەم لـە سـەروو و لـە خـوارەوە دەبـڕی، بەشـێکی بڕاوییەکـە لای ڕاسـت و بەشـێکی لای چـەپم دەبـڕی، بـۆ ئـەوەی دەمارەکـە درێژببێتـەوە و کـورت نەبێتـەوە، لـەوەدا سـەرکەوتوو بـووم، دوای مانگێـك لـە گـەچ گـرتن

کورتی قاچەکە چاك دەبووەوە، هەروەها لە کیمیابارانداا لە قازانقایە باڵی پێشمەرگەیەکمان شکا، هات بۆ لای من، چارەسەرم بۆ کرد.

لە پێش ئەنفالدا چووین بۆ قۆپی قەرەداغ، پێشمەرگەیەکی قەڵەومان هەبوو، نانەوا بوو، لەوانە بوو کە قاچی باریك بوو ورگی ئەستور بوو، بە مامە پاشا بانگمان دەکرد، گوتی توخوا جێم مەهێڵە، گوتم بەڵێن بێت، گوێدرێژێکم بۆ پەیدا کرد و لە پاڵ گوێدرێژەکە پشتم بۆ کرد بە پایە و تا سەرکەوت، هەتا گەیاندمە سەر شاخەکەی پشت بانی مۆرد، دواتر لەگەڵ پێشمەرگەیەکی بریندار بە ناوی ئەحمەد چەندین فیشەك بەر قاچی کەوتبوو تەداویم بۆ ئەویش کرد و ڕزگاریانم کرد، ئەو برینداره خێزانیشی لەگەڵ بوو، خێزانەکەی بە کۆڵ دەیبرد بۆ ئەوەی سەرئاو بکات.

لە کاتی ئەنفالدا توانای ڕۆیشتنم نەما، چوار ڕۆژ بوو نانم نەخواردبوو، لە گوندەکانی ناوچەی هەمەوەندی چەمچەماڵەوە بەرەو سنووری شوان بە شەو نزیکەی ١٥٠٠ کەس بووین پەڕینەوە، هەڤاڵان شێخ جەعفەر و حەمەڕەش پەڕاندیانینەوە، چووینە گوندی کانی سپیلکە و کوچك نەخشینە و باوەفەتی، لەوێ د. جەلالم بینی گوتم چوار ڕۆژە نانم نەخواردووە، گوتی ئێستا دەگەینە ئەو گوندانە نانت بۆ پەیدا دەکەم، ئیدی لەوێ نان و هەندێك دۆم خوارد، بەرەو سنووری بەری کۆیە بەڕێکەوتین، لەوێ قاچم تۆکی بەردەدا، لەو سنوورە هەندێك پشوومانداا و هەندێك ماسییان بۆ پەیدا کردین و هۆشمان هاتەوە،

دواتر پەڕینەوە بۆ بەری کۆیە و د. حسێنی برازای هەڤاڵ مام جەلالم بینی، دوای گفتوگۆ، گوتی من سبەی دەچم بۆ بالیسان و ئیتر پێشمەرگایەتی ناکەم، گوتم منیش لەگەڵ خۆت ببە، گەیشتینە بالیسان و خەتێ، د. زریانم بینی و پێم گوت لەگەڵ تۆ دێم، سەرەتای هەڵایسانی شەڕی مەڵبەندی سێ بوو، هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ گوتی ئەوەی خێزاندارە با بڕوات، ئەوەی بڕیاری مانەوەش دەدات دواتر نابێت هەڵبێت، ئیدی من چوومە تونمێ بۆ لای ملازم عومەر و هەڤاڵ کۆسرەت، لەوێ بە د. زریانم گوت تۆ خێزانت هەیە، من نیمە،

بۆیە تۆ بڕۆ بۆ ئێران، من لە شوێنی تۆ دەبم، هەڤاڵ کۆسرەت پێی باش بوو، دواتر هەڤاڵان قادری حاجی عەلی و د. فائیق و د. جەلال و د. ناسیح هاتن، گوتیان تۆ بڕۆ بۆ بەری قەندیل ئێمە لێرە دەبین، هەر کەس بریندار بوو بۆت دەنێرین، منیش چوومە سوورەدێی بنای قەندیل، ئیدی لەوێ دەستم کرد بە چارەسەری ئەو بریندارانەی کە بۆیان دەناردم، هەڤاڵ ئازاد هەورامی لەوێ شەهید بوو.

حکومەت دەستی بەسەر زۆرینەی شوێنەکاندا گرت، لەگەڵ هەڤاڵان قادری حاجی عەلی و حامیدی حاجی غالی چووینە گوندێك، بۆ یەکەمجار لەوێ چێشتی (قوڕاو)م خوارد، دواتر چووینە ئێران و من چوومە بلەکێ، دوو خانوومان کرد بە نەخۆشخانە و بارەگا، هەڤاڵ مام جەلال کۆبوونەوەی پێ کردین، هەموو کادیرە تەندروستییەکانی لە بارەگای ملازم عومەر کۆکردەوە، کە چووین لە دەرگا وەستا بوو یەك یەك پێی دەگوتین: "یاخودا بەخێر بێن"، دوای دانیشتین گوتی مەمنونتانین ئەوەندە ساڵە لەگەڵمان بوون، کێ دەیەوێت بچێت بۆ دەرەوە (ئەوروپا و ئەمریکا) دەینێرم، کێ دەیەوێت لە ئێران بمێنێتەوە کار ئاسانی بۆ دەکەم، کێ لەگەڵمان دەمێنێت ئازادە، ئیدی ئێمە پارتیزانی دەکەین، ئیدی من و د. شوان و د. ئازاد گوتمان لەگەڵ ئێوە دەمێنینەوە، دواتر لە بانەوە دەچووین بۆ بلەکێ، بیستمان د. ئازاد و هاوڕێیەکی لە ڕێگەی چوون بۆ لای ئاوارەکان ئۆتۆمبێلەکەیان وەرگەڕابوو شەهید بوون.

لە کاتی ڕاپەڕین چوومە کەرکووك لەوێ بۆ هەولێر و لەوێ بۆ شەقلاوە، ئیدی بە ئۆتۆمبێل بە شارەکان دەگەڕاین بۆ چارەسەری نەخۆش و بریندار، دواتر لەسەر داوای د. محەمەد خۆشناو بووم بە پزیشکی (مقیم أقدم) لە هەولێر، تا ساڵی ١٩٩٥ بەردەوام بووم، دواتر دوو ساڵ و هەشت مانگ (مقیم أقدم جراحة)م خوێند، دواتر هەڤاڵ عومەر فەتاح گوتی نەخۆشخانەی شۆڕشمان بۆ دروست بکە، قایل نەبووم، دواتر لەبەرئەوەی گەرمیانی بووم ناردیانم بۆ کەلار و بووم بە بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی کەلار و تا ٢٠٠٤ لەوێ بووم،

ماوەیەکیش لە دەربەندیخان بەڕێوەبەری گشتی بووم، لە کەلار خۆم هۆڵی نەشتەرگەریم دروست کرد و لە سنووری کەلار و دەربەندیخان دەستم کرد بە نەشتەرگەری خەڵك، لەوێ هەزاران کاری نەشتەرگەریی خۆڕاییم بۆ خەڵکی گەرمیان ئەنجامدا، بیرمە لە یەك شەو و ڕۆژێکدا ١٨ نەشتەرگەریی بێ بەرامبەرم ئەنجامداوە، تا لە ساڵی ٢٠١٨ خانەنشین بووم، لە ئێستادا خۆم نەخۆشم و گرێیەك لە سەرمدایە و تووشی شێرپەنجەی میزەڵدان بووم و هەروەها تووشی شەلەل بووم و لایەکی لاشەم کار ناکات و چاوەڕێی مردنم[٢٢].

---

[٢٢]- چاوپێکەوتن لەگەڵ جەبار عەبدول نەریمان قادر (د. جەبار)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٦/٢١.

## حەمید عومەر ئیبراهیم ئەسوەد (د. ئامانج)

لە ساڵی ١٩٦٤ لە بناری چیای قەرەچووغ دەشتی قەراج لەدایك بووم، کە ئێستا گوندەکەمان سەر بە شارەدێی سەرگەڕانی شارۆچکەی دوبزی پارێزگای کەرکووکە، بەڵام لە ساڵی (١٩٧٦)ەوە لە هەولێر دادەنیشم، لە ساڵی ١٩٨٦ پەیمانگای تەندروستیم لە هەولێر تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٨١ لەگەڵ هەڤاڵ کاکە حەمە پەیوەندیم بە (ك.ڕ.ك)ەوە کردووە.

دوای تەواوکردنی خوێندن لە مانگی ٧ی ساڵی ١٩٨٦ بووم بە پێشمەرگە، لە نەخۆشخانەی مەڵبەند دەستبەکاربووم، دواتر چوومە تیپی ٨٥ی بەڕانەتی و تا دوای ئەنفال و ساڵی ١٩٨٩ مامەوە.

لە ژیانی پێشمەرگایەتیمدا لەگەڵ هاوڕێم دکتۆر هیوا دەستم کرد بە چارەسەرکردن و تیمارکردنی بریندارانی پێشمەرگە، کە بەداخەوە لە ٣١ی ئاب شەهید بوو، زۆرم سوود لە زانیارییەکانی شەهید دکتۆر هیوا وەردەگرت، بریندارانی شەڕ و هاووڵاتیان لەلایەن ئێمەوە چارەسەر دەکران، کە تاکە سەرچاوەی تەندوستی بووین لە سنوورەکە.

بەدرێژایی ئەو ساڵانە چەندین یادگاری خۆش و ناخۆشم هەیە، ساڵی ١٩٨٧ پێشمەرگەیەکی بریندار بە ناوی نەجات تورکمان کە ئێستاش لە ژیاندا ماوە و خەڵکی هەولێر بوو مار پێوەی دابوو، پێش ڕۆژهەڵهاتن هێنایان بۆ لای من، توانیم چارەسەری سەرەتایی بۆ بکەم، پاشان بردم بۆ نەخۆشخانەی مەڵبەند لە گوندی سماقوولی، لەوێ شەهید د. چیا گوتی کاری باشت کردووە، دەستخۆشیی لێ کردم ئەوە بۆ من مایەی دڵخۆشی بوو، چونکە من ئەزموونی چارەسەرکردنی نەخۆشم بە ژەهری مار نەبوو.

ڕۆژێکی دیکە هاووڵاتییەکی گوندی سوسێ لە ساڵی ١٩٨٨ کە بارەگای تیپەکەمان لەو گوندە بوو تەندروستی زۆر خراپ بوو بورایەوە، منیش چارەسەرم بۆ کرد و لە ماوەی دە خولەك تەندروستی بەرەو باش بوون چوو، ئەوە بۆ من سەرکەوتن بوو بۆیە لە یادی ناکەم.

لە دوای گرتنی سەری ڕەش لە ساڵی ١٩٨٨ بەرەو شەڕی سەرکردایەتی ڕۆیشتین، شەو درەنگ لە گوندی کانیبی سەر بە دەشتی کۆیە دابەش بووین، من و دوو پێشمەرگە بەو شەوە درەنگە چووینە ماڵێك نانمان نەخواردبوو، ئەو ماڵە کوڕێکیان لە شەڕەکەی سەری ڕەش بریندار بووبوو، لە ماڵەوە بوو، لە کاتی نان خواردن باسی ئەوە کرا کە دەبوو ئەو ڕۆژە تەداوی بکرایە، بەڵام بۆی نەکرابوو، دوای نان خواردن برینەکەیم بۆ تەداوی کرد، دەرزی و دەرمانی پێویستم پێدا، ئەو ماڵە زۆر دڵخۆش بوون بە من، بۆ منیش دڵخۆشی بوو.

لە شەڕی سەری ڕەش یەکەم بریندار تیپەکەمان مام عەلی بوو کە چووین د. هیوا تەماشای چاوی کرد و گوتی بەداخەوە شەهید بووە، ئەوە ڕووداوێکی زۆر ناخۆش بوو بۆ من لە بیرم ناچێتەوە.

سەرچاوەی دەرمانمان لە نەخۆشخانەی مەڵبەندەوە بوو، کە لەلایەن هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵەوە پەیدا دەکرا، کە ئەو کات زۆر ئەستەم بوو، هەڤاڵ کۆسرەت جگە لە دەرمان، پارە و ئازوخەشی پەیدادەکرد، من هاوڕێیەکی ڕێکخستن و خوێندنم هەبوو بە ناوی عەبدولواحید ئیدریس شەریف، زۆربەی کات دەرمانی باشی بۆ دەهێناین، بە تایبەت ئەو دەرمانانەی کە کەم دەستمان دەکەوت، هەڤاڵ عەبدولواحید کارێکی ئەستەمی دەکرد، هەروەها لە کاتی شەڕەکان و چارەسەرکردنی بریندارەکاندا، پێشمەرگەکان هاوکاری و بەردەستی من و د. هیوایان دەکرد.

هاوکات من ئەندامی کۆمەڵە بووم، هەڤاڵ بێستوون بەرپرسی ڕێکخستن بوو لە تیپەکەمان، زۆر جار بۆ کاری ڕێکخستن من جەولەم دەکرد، چونکە جێگەی متمانەی هەڤاڵ بێستوون بووم.

لە ساڵی ١٩٨٨ ئێمە لە نزیك هیران چوار پێشمەرگە بووین بەر چەکی کیمیایی کەوتین، بەڵام بە سووکی هاوکات ڕووپۆش (قیناع) و دەمامك و دڵۆپەی چاومان لابوو، بە کارمان هێنا و بەسەلامەتی لێی دەرچووین[٢٣].

---

[٢٣]- حەمید عومەر ئیبراهیم ئەسوەد (د. ئامانج): هەولێر، ٢٠٢٢/٢/٢٠.

## خالید محەمەد ڕەشید مەحموود (د. خالید)

لە ١٩٦٠/٣/٢٠ لە شارۆچکەی چەمچەماڵ لەدایك بووم، لە ساڵی ١٩٨٧ لە شاخ لەگەڵ کچێکی دانیشتوی سلێمانی بە ناوی دڵسۆز هاوسەرگیریم کردووە، باوکی سێ منداڵم دوو کوڕ و کچێك، بە ناوەکانی ژیار، ئەلەند و ژیلا.

لە ساڵی ١٩٦٥-١٩٦٦ چوومە قوتابخانە لە لیوای هەولێر پاشان گەڕامەوە بۆ چەمچەماڵ، خوێندنی سەرەتاییم لە ساڵی ١٩٧٠—١٩٧١ تەواو کردووە و ساڵی ١٩٧٨—١٩٧٩ ناوەندی و دواناوەندییم لە چەمچەماڵ تەواو کردووە، لە ساڵی ١٩٨٠—١٩٨١ پەیمانگای باڵای پیشە تەندروستییەکانی کەرکووکم تەواو کردووە و بڕوانامەی دیبلۆمم بە دەستهیناوە، لە ساڵی ٢٠٠٧ بڕوانامەی بەکالۆریۆسم لە زانستە سیاسییەکان لە زانکۆی سلێمانی بە دەستهێناوە.

لە ساڵەکانی ١٩٦١—١٩٦٥ بە هۆی دۆخی سیاسی کوردستان و دوورخستنەوەی باوکم بە تومەتی ئەندامبوونی لە (ح.ش)دا، وەك فەرمانبەر بۆ پارێزگای بەسرە و پاشان بۆ سنووری پاریزگای هەولێر گوێزرایەوە، لە ساڵی ١٩٧٣ پەیوەندییم بە یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە کردووە، لەگەڵ هاوڕێی خۆشەویستم هەڤاڵ شێرزاد حافز لە یەك شانەی قوتابیاندا ڕێکخرابووین، لە ساڵی ١٩٧٤ بەهۆی شکستهێنانی گفتوگۆ و دانوسانی حکومەتی عێراق و شۆڕشی ئەیلوول و دەستپێکردنەوەی شۆڕش، بەشێکی هەرە زۆری دانیشتوانی چەمچەماڵ بۆ گوندەکان، یان شارەکانی سلێمانی و کەرکوك وەك نارەزایەتییەك بەرامبەر سیاسەتە نەتەوەپەرستییەکانی حکومەتی عێراقی ئەوکات شاریان چۆڵ کرد، هەربۆیە خێزانی ئێمەش ڕوویان لە گوندی هەکز کرد، پاشان لەلایەن یەکێتی قوتابیانەوە ئاگادارکراین، کە بۆ بەردەوام بوون لە خوێندن، پێویستە ڕوو لە شارەدێی ئاغجەلەر بکەین کە قوتابخانە و بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە بۆ قوتابیانی کەرکووك و چەمچەماڵ کراوەتەوە، بۆیە ڕوومان لە ئاغجەلەر کرد لەو کاتەدا ١٤ ساڵ بووم لە قۆناغی ناوەندی بووم، پاش نسکۆی شۆڕش

گەڕاینــەوە و دەســتم بــە خوێنــدن کــردەوە و تاقیکردنــەوەی ســەری ســاڵمان کــرد و خۆشبەختانە دەرچووم.

بۆ یەکەمینجار لە ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ ٢٠ خوێندکاری هاوڕێمدا هەوڵماندا لە پەروەردەی کەرکووك خوێنـدنگای ئامـادەیی تێکـەڵاو لـە چەمچەماڵ بکەینـەوە، بۆ مێژوو دەیڵێم لـە چواری ئامادەیی ١٩ کوڕ بووین تەنها یەك کچی ئازا و بوێر لەگەڵمان بـوو بـە نـاوی ڕوونـاك ئـەنوەر، کـە پـێش ئێمـە خوێنـدنی ئامـادەیی لـێ نـەبوو دەبـوو بـۆ تـەواوکردنی خوێنـدنی ئامادەیی بچنە کەرکووك، یان سلێمانی، ئیـدی مـن لـە سـاڵی ١٩٨١ لـە ڕێگـەی هـەڤاڵ خـدری خەلیفە عزیزەوە پەیوەندیم بە کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە.

بـە مۆڵـەتێکی سـەربازی تـەزویر کـە هـەڤاڵ ئـەیوب ڕەسـووڵ لـە چەمچەماڵەوە بـۆی هێنـابووم، بـۆ یەکـەمین جار ڕوومـان لـە گونـدی قەمچوغە کـرد و بـووم بـە پێشـمەرگە و پەیوەندیم بە شۆڕشەوە کرد، شەهید حەمە چاوشین و هـاوڕێم عـارف کاکەمەنـد یاوەریـان کــردم، لــە ناوەڕاســتی ســاڵی ١٩٨٢ لەســەر داوای شــەهید هــەڵۆ چەمچــەماڵی و تیپــی ٢١ی کەرکووك بوومە پێشمەرگە، بە هۆی پیشەکەم و کـارکردنم لـە بـواری تەندروسـتی نازنـاوی (دکتۆر خالید)م لەلایەن پێشمەرگەکانی تیپەوە پێ بەخشرا و بووم بـە دکتـۆری تیپـی ٢١ی کەرکووك.

سـاڵی ١٩٨٢ لـە بـەر هەسـتیاری ناوچـەکە و زۆری چـالاکی و هێرشـەکانی حکومـەت و جاشەکانی بۆ سەر سەنگەرەکانی پێشمەرگە و گوندەکان بریـنداری زۆرمـان دەدا، بۆیـە داوام لـە هـەڤاڵ مـام ڕۆسـتەم کـرد کـە بنکەیـەکی تەندروسـتیمان لـە چـەمی سوورقاوشـان بـۆ دابمەزرێنیت لەگەڵ هاوڕێم شەهید دکتۆر حەمید حەمەد ئەمین بارام، کە شـوێنێکی شیاو بــوو بــۆ چارەســەری پێشــمەرگە، چــەندین بریـنــدارو نــەخۆشمان تێــدا چارەســەر کــردووە، ماوەیەکی زۆریش لەگەڵ پێشمەرگەکانی کـەرتی یـەکی سـاڵەیی تیپـی ٢١ کەرکووکدا بـووم، بەشداری چالاکییەکانی ئەو کەرتەم دەکـرد، لـە کـاتی گفتوگـۆی شـۆڕش و ڕژێمـدا لـە سـاڵی

١٩٨٤—١٩٨٥ بۆ ماوەی شەش مانگ بەشداری خولێکی ڕاهێنـان لەسەر ئـامێری بێهۆشکردنی نـەخۆش و ئامـادەکردنی ژووری نەشتـەرگەریم کـرد لـە نەخۆشخانەی فێرکاری سلێمانی لەگەڵ هەڤالان: (د. شوان محەمەد عەزیز، د. فایەق گوڵپی، د. ئاکۆ سعید و شەهید د. شێخ کامیل).

یـەکێك لـەو شـتانەی کـە لێـی دەترسـاین نـەبوونی دەرمـان و پێداویسـتی پزیشـکی و نەبوونی متمانە بوو بە هەموو دەرمانێك، چونکە بەردەوام دەترساین کە حکومەتی بەعس لە ڕێگەی خەڵکی خۆیەوە دەرمـانی خراپمان بـۆ بنێـرێ، لەگەڵ نـەبوونی ساردکەرەوە بـۆ پاراستنی دەرمانـەکان، هـەروەها دووری شـوێنەکانمان گرفتێکـی دیکـە بـوو بـۆ نموونـە لـە نەخۆشخانەی قوڵەهـەرمێ کۆمـەڵێك پزیشـك و کارمەنـدی بـاش هـەبوو لەوانـە (د. شـوان ئاگرێیی، د. فـائق، د. خـدر مەعسـوم و د. زریـان)، بـەڵام بـەهۆی سـەختی و دووری ڕێگاکـە هـەموو نەخۆشـێك نەدەگەیشـتە ئـەوێ، دەبـوو، یـان بمانهێنایـە بـۆ ئـەوێ، یـان لـە ڕێگـەی ڕێکخستن و خزم و کەسەوە بینێرین بۆ ناوچەکانی کەرکووك و چەمچەماڵ و بیشارینەوە، بە جۆرێـك لـە جۆرەکـان چارەسـەر بکرابایـە، بـەبێ ئـەوەی ڕژێـم بزانـێ کـە پێشمەرگەیە، سـنووری ئێمـەش جگـە لـە سوورقاوشـان ناوچـەیەکی لـەبار نـەبوو بـۆ خۆپـارێزی و خـۆ حەشاردان، هەروەها لە ناوچەی چەمچەماڵ دوو سەرۆك جاشی لێ بوو ئەوانیش (تەحسین شاوەیس و قالە فەرەج) بوون، کە زۆر دەستوەشێن بوون، شارەزای هەموو ناوچـەکان بـوون، خەڵکیشـیان لـە ناوچـەکاندا هـەبوو، لەبەرئـەوە نەمانـدەتوانی بـە ڕۆژ لـە گوندەکانـدا بمێنینەوە و تەنها شەوان دەماینەوە، سوپای ڕژێم لە شەڕەکاندا هەتا کاتژمێر سێ دەیتوانی بمێنێتەوە، بەڵام جاشەکان چونکە شارەزای ناوچەکە بوون و جلی کوردییـان لەبـەر دەکـرد، زۆرتر دەمانەوە و کەمینیان بۆ پێشمەرگە دادەنا.

بەگشتی سنووری چالاکی ئێمە بریتی بوو لە کەرکووک، هەولێر، دووکان، سلێمانی، کۆیە و تەقتەق، واتە لە نێوان تیپی ٩٣ و ٥٧دا بووین، سەرەتا کە من پەیوەندیم بەو تیپەوە کرد هەڤاڵ غەریب عەسکەری گوتی دکتۆر ئەوە بە تۆوە بووین بە پەنجا پێشمەرگە، بەڵام دواتر خەڵکێکی زۆر پەیوەندییان پێوە کردین، فەرماندەی کەرتەکانی تیپەکەمان پێکهاتبوون لە هەڤاڵان: (شێرزاد حافز، ئیبراهیم، کەریم، شەهید دارا و حەسۆ).

لە ساڵی ١٩٨٥ لەگەڵ هاورێکانمدا نەخۆشخانەی گشتی شۆڕشمان لە بەرگەڵوو دروستکرد، لەگەڵ ئەوەشدا بەشدار دەبووم لە داستانەکانی هێزی پێشمەرگە بۆ چارەسەری بریندارەکان، لەوانە: (داستانی دابان–هەلاج، داستانی ڕزگاری، شەڕەکانی سەرکردایەتی، کیمیابارانی دۆڵی جافایەتی و مەرگە ...... هتد).

دواتر لە ساڵی ١٩٨٤ – ١٩٨٥ لە مەرگە بوومە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری دەزگای تەندروستی کوردستان Kurdstan Health کە لە هەمان ساڵ دامەزرابوو، دواتر بووم بە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی فریاکەوتنی کوردستان (KRA) کە لە ١٩٨٧ دامەزرا .

لە ١٩٨٥–١٩٨٨ سەرپەرشتیاری ژووری نەشتەرگەری بووم لە نەخۆشخانەی گشتی شۆڕش لە بەرگەڵوو، چەندین نەشتەرگەری سەرکەوتوو بۆ پێشمەرگەی بریندار و هاووڵاتیانی ناوچەکە تێدا ئەنجام درا، لە ساڵی ١٩٨٦ لە تۆپبارانی نەخۆشخانەکەمان لە بەرگەڵوو برینداربووم، لە ساڵی ١٩٨٧ بەهۆی بۆردومانی فرۆکەی حکومەتی عێراق بە چەکی کیمیایی بۆ سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی دووبارە بریندار بووم، لە مانگی ١٩٨٨/٣ بەهۆی شاڵاوی ئەنفال، چووینە سنووری ئێران لە شاری سەقز و سەردەشت نیشتەجێ بووین، لەوێ لە ئۆردوگای ئاوارەکان لە بادیناوای کە نزیک خانی و ئۆردوگای پیرشێخی سەردەشت بوو کاری پزیشکیم دەکرد، هەر لە ساڵی ١٩٨٩دا لەسەر سنوور نەخۆشخانەی

گشتی شۆڕشمان له گوندی نۆکان دامەزراند و کارمان تێدا دەکرد، لەگەڵ هاوڕێیان دکتۆر شوان، دکتۆر ئارام، دکتۆر شێرکۆ تاکو سەرەتای ڕاپەرینی ساڵی ١٩٩١ بەردەوام بووین.

پێش ڕاپەرینی ساڵی ١٩٩١ ئامادەکاریمان کرد بۆ دروستکردنی تیمی تەندروستی و دابینکردنی دەرمان بۆ هێزەکانی پێشمەرگە، وەك پاڵپشتی بۆ گەلی کوردستان بەشداری ڕاپەرینمان کرد، لەگەڵ هاوڕێکانم د. ئارام ڕۆستەم و د. شێرکۆ حەسەن گەیشتینە ڕانیە و سەرپەرشتی نەخۆشخانەی گشتی ڕانیەمان له ئەستۆ گرت، هەر لەو ماوەیەدا بۆ هاندانی گوندنشینان گەڕانەوەیان بۆ گوندەکانیان چەندین نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستیمان لە شار و گوندەکانی کوردستان کردەوە.

هەرچی پەیوەندیارە بە هاوکاری نەخۆشخانەکان و پەیداکردنی دەرمانەوە، زیاتر لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی ناو شار و خەڵکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەرەوە بوو، هەروەها لە ڕێگەی حیزبە کوردییەکانی کوردستانی ئێران بە تایبەت دیموکرات بەشێکی دەرمانی پێویستمان پێ دەگەیشت، هەروەها سەرکردایەتی شۆڕش دەرمان و پێداویستیەکانی لە ڕێگەی کڕینەوە بۆ دابین دەکردین، جگە لەمانەش بەهۆی چالاکی پێشمەرگەوە دەست بە سەر دەرماندا دەگیرا و سوودمان لێ دەبینی .

پاشان لە ساڵی ١٩٩٢ دەزگای تەندروستی کوردستان KHF وەکو ڕێکخراوێکی تەندروستی مرۆیی خۆی ناساند، منیش وەك لێپرسراوی گشتی فەرمانبەرانی دەزگاکە دەست بەکار بووم، له ساڵی ١٩٩٧ بووم بە بەڕێوەبەری گشتی دەزگای تەندروستی کوردستان KHF، دەزگاکە کاری کرد بۆ ئاوەدانکردنەوەی گوندەکانی کوردستان و بەڕێوەبردنی ٨٠ نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی بە هاوکاری ڕێکخراوە جیهانییەکان، ئەمە پێش

دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو، کە حکومەتی هەرێمی کوردستان دامەزرا ڕادەست بە وەزارەتی تەندروستی هەرێم کرا[٢٤].

---

(٢٤)- خالید محەمەد ڕەشید مەحموود (د. خالید)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٢/٢٤، ئیسماعیل خالید: ڕۆڵی تەندروستی لە شۆرشی نوێدا، گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە، ژ٩، سلێمانی، ٢٠٢١، ل٦٦-٧١.

## خەلیل ئیبراهیم محەممەد ساڵح (د. خەلیل)

له ١٩٦٤/٤/١٣ له گوندی زەند مەلا یوسف هەفتەغار لەدایك بووم، خوێندنی سەرەتاییم لە خوێندنگەی گوندی هەفتەغار تەواو کردووە، خوێندنی ناوەندی و دواناوەندیم لە خوێندنگەی دواناوەندی داقوق تەواو کردووە، خێزاندارم، باوکی (شڤان، نالان، سۆما و میران)م، هەلگری بڕوانامەی دیبلۆمی تەندروستیم، هەلگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسم لە بەشی یاسای زانکۆی کەرکووك.

سەرەتای تێکەڵبوونم وەك کوردێك دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی لە قۆناغی دواناوەندی خوێندکار بووم، بەڵام وەك ڕێکخستن لە کاری سیاسییدا لە ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندیم بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کردووە، لە شانەی شەهید سەیفەدین، ئەو کاتە تازە زانکۆی سلێمانی گوازرابووەوە بۆ هەولێر، خوێندکاری پەیمانگای تەندروستی بووم، لە پەیمانگای تەندروستیی سلێمانی، لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێی خوێنگەرم، ئەوکاتە سلێمانی لە جۆش و خرۆشدا بوو، من ئەو کاتە نازناوم (تۆڵە) بوو، لە دوای تەواوکردنی پەیمانگا نازناوی دکتۆرم لێنرا.

سەرەتای هاوکاری و ڕۆڵ بینینی ئێمە وەك لایەنی تەندروستی ئەو ساڵانەی کە خوێندکار بووم لە پەیمانگا و بەتایبەتی ساڵانی ١٩٨٣ – ١٩٨٤ کە ی.ن.ك لەگەڵ حکومەتی ئەو سەردەم دانوستانی هەبوو، ئێمەش لەگەڵ هەڤاڵەکانماندا کارمان خزمەتکردنی پێشمەرگەی بریندار و دابینکردنی کەرەستەی پزیشکی بوو بۆیان، هاوکات لەگەڵ دکتۆر نەوزاد ساڵح پسپۆری نەشتەرگەری بوو، هەروەها ناجیە خانیشمان لەگەڵ بوو، چەندین جار نەشتەرگەرییان بۆ پێشمەرگە ئەنجام دەدا، ئێمەش کارمان ئەوە بوو کە وەك خوێندکار لە نەخۆشخانەکان دەماینەوە، بە شەوان تەنها بۆ ئەوەی خزمەتیان بکەین و پێداویستییەکانیان بۆ دابین بکەین، چەندین جار کەرەستەی پزیشکیمان لە نەخۆشخانەکان بە دزییەوە دەردەکرد، لە ڕێگای برادەرێکەوە کە ناوی هەڤاڵ (غەریب)

بوو، له بیرمهماڵیان لای سەدەکەی ئازادی بوو له سلێمانی، ئۆتۆمبێلێکی بیجۆی مۆدێل ۱۹۷۵ی هەبوو، کەرەستەکان لە ڕێگای ئەوەوە بۆ ناوچە ئازادکراوەکان دەردەکرا، بە تایبەتی سرنج، لەفاف، موغەزی، ئامێری ئەعتا، هەروەها دەرزی دژە خوێن بەربوون و دەرزی هایدرۆکورتیزۆن، ئەو کات دکتۆر هونەر ناوێك هەبوو هەڵە نەبم کوڕی کاکەی فەلاح بوو، زۆر بە دڵسۆزی هاوکار بوو لەگەڵمان، هەروەها ناجیە خان ئەو کات پەرستار بوو، لە نەخۆشخانەی فێرکاری لێپرسراوەی پەرستارەکانی ژووری نەشتەرگەری بوو، هەروەها کیژێکمان لەگەڵ بوو بە ناوی (گەزاڵ) کچی ڕازی شاعیر بوو، لەگەڵ هەڤاڵێکی دیکەمان لەگەڵ بوو ناوی ئارام، ئەو سەردەمە کەس کەسی نەدەناسی، لەبەرئەوەی بارودۆخەکە ترسناك بوو، بەڵام لە خۆشەویسی پێشمەرگە هەموو کەس ئامادە بوو هاوکارمان بێت.

لە کۆتایی ساڵی ۱۹۸٤ و سەرەتای ساڵی ۱۹۸۵ لە ترسی ئاشکرابوونمان لە دوای تێکچوونی دانوستانەکان من گوێزرامەوە بۆ دوورترین بنکەی تەندروستی، ئەویش بنکەی تەندروستیی دووگۆمان بوو لە ناوچەی سەنگەسەر، لەوێش لەگەڵ شێخ حسێنی بنەوشانی ناوچەی قەڵادزێ ئەوەی لە توانامدا بوو کردمان، هەموو کات ئەوەی پێشمەرگە پێویستی بووایە دەمانکرد، لەگەڵ برادەرێکدا کە ناوی هەڤاڵ (عەزیز) بوو، هەروەها پیاوێکی دیکە بەناوی مام بایز کە پێیان دەگوت بایزە کۆڵ لە ماڵەکەی ئەوان چارەسەری نەخۆشمان دەکرد، هەتا مەرگەساتی ئەنفال لەو کاتەشدا بە ناسنامەی تەندروستی کارمان ئەوە بوو کەسوکاری پاشماوەی ئەنفال بپارێزین و بیانگەیەنینە ناوچە ڕزگارکراوەکان.

لە ساڵی ۱۹۸۹ لە ڕێگای هەڤاڵ کۆسرەت ئاغجەلەرییەوە پەیوەندیم کردەوە بە سوپای ڕزگاری کوردستانەوە کە بە (سرك) ناسرابوو، لە ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ۱۹۹۱ شانازی ئەوەم پێ بڕا لە ڕزگارکردنی شارۆچکەی چەمچەماڵدا بەشدار ببم، هەتا ڕزگارکردنی هەموو چەمچەماڵ و ڕزگارکردنی کەرکووکی قودسی کوردستان و بریندابوونم لە شەڕی مەعەسکەر خالید لە دوای ساڵی ۱۹۹۱ و کۆڕەوی کورد بۆ وڵاتی ئێران بەردەوام بووم، لە

دوای دەرچوونمان لە کەرکووك و دوای گەڕانێکی زۆر خێزانەکەم لە شاری (بیجار)ی ئێران دۆزییەوە، لە دوا گەڕانەوەمان بەشداریم لە ڕاپەڕینی دووەم بۆ دەرکردنی ڕژێم لە کوردستان کرد.

وەك ئاوارەیەك لە بازیان بە خێزانەوە نیشتەجێ بووم، بووم بە لێپرسراوی کەرتی سێی ڕێکخستنی ئاوارەکانی دۆڵی بازیان، لە پاڵ کارکردنمدا ماڵەکەم وەك نەخۆشخانەیەکی بچووك بۆ چارەسەرکردنی نەخۆش بە کاردەهێنا، بەمشێوەیە لە ماڵەکەمدا زۆر کەس تا ساڵی ١٩٩٥ چارەسەر کراوە، لە شەڕی ناوخۆدا لە گوندی خۆران بە سەختی برینداربووم، هەر ئەو دکتۆر ئەوزادەی کە لەسەر دەستی ئەو فێری کوردایەتی و نیشتیمانپەروەریی بووم نەیهێشت قاچم ببڕنەوە، لەبەرئەوەی ماوەی دوو شەو لە بەفری چیای سەفیندا مابوومەوە، ئەو نەشتەرگەری تایبەتی بۆ کردم، ئەو هۆکار بوو کە قاچمی لە گانگرین پاراست و نەبڕایەوە.

دوای ٣١ی ئابیش بە خێزانەوە چووینە ئێران و ماڵەکەم لە بازیان سوتێنرا، دواتر هاتینەوە سلێمانی و کۆمیتەی ئاوارەکانمان دامەزراندەوە و هاوکاربووم بۆ دامەزراندنی سەندیکای تەندروستی، لەگەڵ د. عوسمان شێخانی و دکتۆر جەبار کە بە د. جەباری سەندیکا ناسراوە، دەمەوێت ئەوە بڵێم لە کارکردن بۆ (ی.ن.ك) زۆر ماندوو بووم، هەموو کات بەرژەوندی (ی.ن.ك)م خستووەتە سەرووی بەرژەوەندی خۆمەوە، بەشداری هەر چوار کۆنگرەی (ی.ن.ك) بووم و بە هەڵبژاردن بووم بە ئەندامی کۆنگرەکان.

لە ساڵی ٢٠٠٣ دوای پرۆسەی ئازادی لەسەر بڕیاری هەڤاڵ مام جەلال گەڕاومەوە کەرکووك و بووم بە لێپرسراوی کۆمیتە، ئێستاش کارگێڕی مەڵبەند و لێپرسراوی کۆمیتەم، لە هەموو کاتە سەختەکاندا بۆ بەرگری لە (ی.ن.ك) لە سەنگەری پێشەوەدا بووم و سەربەرزم کە هیچ خاڵێکی خراپم لەسەر نییە[٢٥].

---

[٢٥]- خەلیل ئیبراهیم محەممەد ساڵح (د. خەلیل)، کەرکووك، ٢٠٢٢/٣/١٣.

## دارا فەتاح ڕەشید حەمەئەمین (د.دارا)

لە ١٩٦١/٢/١٤ لەدایك بووم، لە خوێندنگەی عەربەتی سەرەتایی خوێندنی سەرەتایم تەواو کردووە، قۆناغی ناوەندیم لە خوێندنگەی سیروان لە شاری سلێمانی تەواو کردووە، دواتر لە زانکۆی موسڵ پەیمانگای پزیشکیم تەواو کردووە، پاشان کۆلێژی پزیشکیم لە زانکۆی موسڵ خوێندووە، لە ساڵی ١٩٧٩ لە ڕێگەی شەهید دکتۆر چیا لە هەرێمی پێنجی قەراغ، پەیوەندیم بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کردووە.

لە مانگی ١١ی ساڵی ١٩٨٢ پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کردووە، لە تیپی ٥٥ی قەرەداغ کە هەڤاڵ حامیدی حاجی غالی سەرتیپی بوو، وەك پێشمەرگە و کادیری پزیشکی درێژەم بە خەبات داوە، لە ساڵی ١٩٨٤ گفتوگۆی نێوان حکومەتی عێراق و (ی.ن.ك) سەرکەوتوو نەبوو، زۆربەری تیپەکان بە تایبەت ئەو تیپانەی کە ناوچەی ئازادکراویان هەبوو بڕیاریاندا هەر تیپێك نەخۆشخانەیەك لە سنوورەکەی خۆی بکاتەوە.

یەکێك لەو تیپانە تیپی ٥٥ی قەرەداغ بوو، کە لە بەلەکجاڕ بەسەرپەرشتی خۆم ئەو نەخۆشخانەیە کرایەوە، ئیدی لەبەر زۆری چالاکی پێشمەرگە بەردەوام بریندارمان هەبوو، جگە لە بریندارانی پێشمەرگە، خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری بەلەکجاڕ و هاووڵاتیان بەمەبەستی چارەسەر سەردانیان دەکردین، لەبەرئەوەی زۆربەیان سەربازی هەڵهاتوو بوون نەیاندەتوانی بچنەوە ناو شار.

بەڕاستی بریندار و نەخۆشمان زۆر بوو ناوی زۆربەیان نازانم، هەندێکیانم دێتەوە یاد وەك هەڤاڵان: (حەمە قاشتی و شەهاب هەورامیی، ستار دەربەندیخانی، هیوا هەورامیی، شەهید برایم عەربەتی و شەهید ڕزگار)، کە بەداخەوە ناوی ئەوانی دیکە نایەتەوە یادم، لە کارە پزیشکییەکاندا هەردوو هەڤاڵ (د. حەسەن و شەهید د.ساجد) لە سنووری تیپی ٥٥ی قەرەداغ هاوکارم بوون، لە سلێمانی و کەرکووك و دەربەندیخان دەرمانمان بۆ دەهات، بەڵام نازانم کێ دەینارد، چونکە هەرگیز پرسیارم نەدەکرد، بەڵام چەند جارێك هەڤاڵ حەمە

قاشتی لە چالاکییەکانیدا لە ناو شارۆچکەی دەربەندیخانەوە دەیهێنا، جارێکیش شەهید تەنیا یادی بەخێر لە گەڕانەوەی لە چالاکییەك لە شاری دەربەندیخانەوە دەرمانی نەخۆشخانەیەکی هێنابوو، جارێکیش لەگەڵ حەمە قاشتی لە چالاکییەکانی ناو دەربەندیخان لە کەمپی خواروو دەرمانی نەخۆشخانەیەکمان هێنا، ئەو شەوە خۆشم بەشداری چالاکییەکە بووم.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٥دا لەبەر هۆکاری کێشەیەکی نێوان خۆم و هاوڕێیەکم چوومە تیپی ٥٧ی سەگرمە، ئەو کاتە هەڤاڵ ئازاد سەرتیپی ٥٧ی سەرگرمە بوو، بە گەیشتنم بە بارەگای تیپ هەڤاڵ ئازاد داوای لێ کردم کە لە گوندی مێولی نزیك بارەگای تیپ نەخۆشخانەیەك بکەمەوە، سەرەتا نەخۆشخانەکەمان لە خێمەدا دانا، بەڵام بەداخەوە، لەبەر زۆری تۆپبارانی گوندەکە کارەکە سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە بریندار و نەخۆشمان بە سەر ماڵەکانی گوندەکەدا دابەش دەکرد، هەمیشە سوپاسگوزاری خەڵکی گوندی مێولێم کە زۆر هاوکارمان بوون، لەبەر تۆپبارانی دوژمن بریندار و نەخۆشمان لە ژێر خانەکاندا دادەنا، چونکە بریندارەکان توانای ڕاکردن و خۆشاردنەوەیان نەبوو، لە تیپی ٥٧ی سەگرمە لە سەرچاوەیەکەوە دەرمانمان بۆ دەهات، بەڵام لە دوو چالاکیدا یەکێکیان کە گرتنی شارۆچکەی قەرەداغ بوو جاری یەکەم دەرمانی نەخۆشخانەکەمان هێنا و جارێکی دیکە لە چالاکییەکدا بۆ سەر شارۆچکەی بەکرەجۆ کە خۆشم بەشداری چالاکییەکەم کرد دەرمانی نەخۆشخانەکەمان هێنا.

لە ساڵی ١٩٨٧ بریندار بووم بۆ تاران نێردرام، لە نەخۆشخانەی ئیمام خومەینی نەشتەرگەریم بۆ کرا، گوللەکە لە سەری دابوو، هەتا چاك بوومەوە زۆری خایاند و کردەی ئەنفال دەستی پێ کرد، پەیوەندییەکانی خۆمان لە ئێران نەیانهێشت بگەڕێمەوە، ئیدی لە ئێران مامەوە هەتا ڕاپەڕین[٢٦].

---

[٢٦]- دارا فەتاح ڕەشید حەمەئەمین (د. دارا)، گەرمیان، ٢٠٢٢/٣/١٢.

# ڕەزا ساڵح ئەحمەد ئەمین

لە ساڵی ١٩٥٦ لە گوندی ڕەباتی سەنگاو/ چەمچەماڵ لەدایك بووم، تا پۆلی سێی ناوەندیم لە چەمچەماڵ خوێندووە، برایەکم پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بوو، لەبەرئەوە لە ساڵی ١٩٧٤ خانووەکەمان لەلایەن حکومەتەوە دەستی بەسەرداگیرا، ئیدی هەڵهاتین و چووینە ناوچەی سەنگاو، ماوەیەك لەوێ ماینەوە، خۆم لە یەکێتیی قوتابیانی کوردستانی لقی کەرکووك بووم، کە بارەگاکەی لە پێنجوێن بوو، لەوێ خولێك کرایەوە، بەشداریم کرد و سەرکەوتنم بەدەستهێنا، کە گەڕامەوە چوومە بەتالیۆنی چواری قەرەداغی هێزی تایبەتی هەڤاڵ حەمە مۆریاسیی، پاش مانگێك شۆڕش توایەوە، لەو کاتەدا خەڵك بەرەو ئێران ئاوارە دەبوون، ئێمەش بە تەواوی خێزانەوە ئاوارە بووین، خۆم و دایکم و سێ خوشکم و ماڵی براکەم کە چوار کەس بوون، بەر شاری (ئەرەك)ی ئێران کەوتین، من پێشتر باوکم کۆچی دوایی کردبوو، لە شاری (ئەرەك)یش خوشکێکم بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل گیانی لە دەستدا.

ئەرەك لە هەموو ڕوویەکەوە شارێکی گەورەی پیشەسازی ئێران بوو، درێژەم بە خوێندندا و پۆلی شەشم تەواو کرد و چوومە خولی پزیشکی و سەرکەوتنم بەدەست هێنا و بوومە (یاریدەدەری پزیشك لە بەشی نەشتەرگەری) و لە نەخۆشخانەی شارەکە دامەزرام، هاوکات بە ماوەی سێ مانگ فێری زمانی فارسی بووم، نەخۆشخانەکە پێشکەوتوو بوو بە جۆرێك هەموو بوارێك بەشێکی تایبەت بە خۆی هەبوو.

لەوێ دەستمان بە کاری ڕێکخستن کرد و پەیوەندیمان لەگەڵ ناوزەنگ گرێدا، ئەوەی لەوێ بووین بریتی بووین لە هەڤاڵان: (خەلیل سەعید، جەلیل سەعید، ئەحمەد تۆفیق، عەلی میرزا، نەجمەدین و بەندە)، ئێمە لەوێ یەکەم خانەی ڕێکخستنمان دامەزراند، هەروەها لە تاران، ئیسفەهان، شیراز، کرمان و ناوچەی لوڕستانیش ڕێکخستنمان هەبوو،

ئەوکات هێشتا ئۆرگانەکانی ی.ن.ك ناوی نوێی بۆ دانەنرابوو، دواتر ڕێکخستەکانی ئەرەك ناونران: کۆمیتەی بەمۆ، ئێمە پەیوەندیمان بە د. خدر مەعسومەوە هەبوو، کە لە ناوزەنگ بوو.

دواتر چەند کەسێك بەدوای یەکدا وەك سەرپەرشتیاری پەیوەندییەکانی (ی.ن.ك) و ئێران لە سەردەشت دەست بە کاربوون، هەر یەکەیان دوای چەند مانگێك دەچوونە تاران و فیزای دەرەوەیان وەردەگرت و دەچوونە ئەوروپا و نەدەگەڕانەوە، کاتێك هەڤاڵ مام جەلال ناردی بە دووماندا لەگەڵ هەڤاڵ خەلیل سەعید چووینە ناوزەنگ، ئەو پرسیارەم لە هەڤاڵ مام جەلال کرد و گوتم هەر کەس دێت، تا دەیناسین دەچێتە دەرەوە، بۆیە پێویستە کەسێك لە ئێران جێگیر بکرێت و نەڕوات، بۆیە هەڤاڵ مام جەلال گوتی ئەوە د. فوئاد مەعسوم هاتووە، ئەو ناڕوات، چونکە خۆی لە دەرەوە گەڕاوەتەوە، ئیدی پەیوەندیمان لەگەڵ د. فوئاد مەعسوم گرێدا، کاتێکیش ئەو خوشکەم بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل گیانی لە دەستدا، برووسکەی ماتەمینی بۆ ناردین، ئەوەی بیرم مابێت تێیدا هاتبوو: "ئێوە لەو کۆستە گەورەترن و ئەم شۆڕشە پێویستی بە ئێوەیە..."

دواتر هەواڵمان بۆ هات داوای دەرمانمان لێ کرا، ئیدی ئێمەش کۆمان دەکردەوە و هەموو مانگی جارێك دەمناردەوە، لەوانە پێداویستی سارێژکاری برینداری و دوورینەوە، لەوێ ڕێکخراوی کۆمۆنیستی ئێرانی هەبوو، کە بەرهەڵستکار (ئۆپۆزسیۆن)ی حکومەتی ئێران بوو، ئەوان لەوێ بڵاوکراوەی (شەرارە)یان بۆ چاپ دەکردینەوە، لەوێ بەهێز بوون هەموو پێداویستییەکیان لابوو، ڕۆژێك لەگەڵ هەڤاڵ خەلیل سەعید چووینە لایان، وەك ئاغای ڕەباتی ناسێنرام، هەرچەندە ئەوان پارتێکی کۆمۆنیستی بوون کەچی پرسیاری ئەوەیان لێ کردم کە ئایا سوننەم، یان شیعەم، گوتم سوننەم، گوتی خۆزگە تۆیش وەك خۆمان شیعە دەبووی! گوتم هاوڕێ ئەو ئایدۆلۆژیایەی کە تۆ بڕوات پێیەتی، نە شیعە و نە سوننەی قبوڵ نییە، گوتی چونکە ئێمە لە خانەوادەیەکی شیعە پەروەردە بووین، حەز

دەکەین ئەوەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین شیعە بێت، هاوکات ئەوان زۆریان دەستیان کراوە بوو، گوتمان پێویستیمان بە دەرمانە، گوتیان هەر کات هەر چیتان پێویست بوو بۆمان بکەن بە لیست، ئیدی بێ پارە بۆیان دابین دەکردین.

لە ئێران هەموو تاکێك دەفتەری بیمەی تایبەت بە نەخۆشیی هەیە، من ئەو دەفتەرەم لە کوردانی ئەوێ وەردەگرت و ئەو دەرمانانەی بە کەڵکی بریندار بهاتبا تێیاندا دیاریم دەکرد، پاشان دەمدا بە پزیشکێك کە هیندی بوو، ئەو دەرمانەکانی لە دەفتەکان دەنووسی و منیش دەفتەرەکانم بە خاوەنەکانیان دەدایەوە، ئەوانیش دەچوون وەریان دەگرت و بۆیان دەهێنامەوە، منیش دەرمانەکانم کۆ دەکردەوە، لە لایەکی دیکەوە دەرمانم لە ڕێکخراوەکانیش وەردەگرت، لە نەخۆشخانەکەش بەشێك هەبوو تایبەت بوو بە بریندارانی شەڕ بێ بەرامبەر، من بەشێکی دەرمانەکانم لەوێش دەهێنا، ئیدی دەرمانەکانم کەڵەکە بوون و بە جۆرێك زۆربوون جارێك نزیکەی یەك پیکاب دەرمانم بۆ ناوزەنگ ناردەوە. ئەو کەسەی لەوێ بوو گوتبووی نەك بەشی بریندار، بەڵکو بەشی هاووڵاتیانی سنوورەکەشی کردووە، بەمشێوەیە پێکەوە کاری ڕێکخستن و کۆکردنەوەی دەرمانیشم دەکرد.

هەڤاڵ نەجمەدین لە ئێران هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکی فارسدا کرد، کە لە بەشی تاقیگە دامەزرابوو، ئێمەش لە ڕووی خێزانییەوە تێکەڵ بووین، ڕۆژێك هەڤاڵ نەجمەدینم لە گرنگی و پێویستی هەندێك دەرمانی دەگمەن ئاگادار کردەوە، ئەویش هاوسەری تێگەیاندبوو تا هاریکارمان بێت و کارئاسانیمان بۆ بکات، لەوانە ئامێری پشکنینی خوێن و ئامێری تیشك لەلایەن ئەوەوە بۆمان دابین کرا، ئیدی تەواوی ئەوانەی دیکە خۆم پەیدام دەکرد، دواتر دەمدا بە هەڤاڵان ئەحمەد و خەلیل، ئەوانیش تا سەردەشت دەیان هێنا و دواتر بۆ ناوزەنگ دەنێردرا.

دواتـر هـەر برینـدارێك لـە لای پزیشـكی پێشـمەرگە چارەسـەر نەكرابایـە، بـۆ ئێـران دەنێردرا، هەندێكیان بۆ نەخۆشخانەكەی ئێمە لە شاری ئەرەك دەهاتن، لەوانـە هـەڤاڵ مـام والی و هەڤاڵ حەمە دیسكەرەیی، ڕۆژێك نەشتەرگەریمان بۆ هەڤاڵ مـام والـی كـرد و ١١ سم لە ئێسكی قاچیمان كورت كردەوە، كە لـە سـەرووی باریكـایی قاچییەو بـوو، دواتـر پـێڵاوی ژێربەرزمان بۆ بەكارهێنا تا لەگەڵ قاچەكەی دیكـەی هاوئاسـت بێتـەوە، لـە نەخۆشـخانەكە تۆمارێكی بریندارانی سەربازی شەڕی عێراق-ئێـران هـەبوو، هـەر پێشـمەرگەیەكی برینـدار بهاتبا وەكـو سـەرباز ئـەژمارمان دەكـرد، ئیـدی هـەموو شـتێك بـۆ ئـەو برینـدارە دەبـوو بـە خۆڕایی.

ڕۆژێكـی دیكـە هـەڤاڵ سـامان گـەرمیانی بـۆ لامـان هێنـرا كـە دەرمـانخوارد كرابـوو، چارەسەرمان كرد، هەروەها هەڤاڵ عەلی شامار هات پشتی ئازاری هەبوو چارەسەری بۆ كرا، هەروەها هەڤاڵ ڕووناك خێزانـی مـەلا بـەختیار، دووگیـان بـوو هێنـرا بـۆ نەخۆشـخانەكە و لـەوێ منـداڵی بـوو، پێشـمەرگەیەك هـەبوو بـە نـاوی ئەحمـەد یـاوەر كـە خانـەڤینی بـوو چارەسەرمان بۆ ئەویش كـرد، پێشـمەرگەیەكی دیكـە بـە نـاوی مـەریوان دوومـەڵێك لەسـەر ڕووخساری هاتبوو، بردم بۆ ماڵی خۆمان و هەر لـە ماڵـەوە چارەسـەرم بـۆ كـرد و تـەداوایم كـرد، بـەوجۆرە چـەندین پێشـمەرگەیان دەهێنـا تووشـی قورحـەی گـەدە هـاتبوون، ئێمـە نازورمان بۆ دەكردن و چارەسەرمان دەكردن.

شایەنی باسـە ئێمـە لـەوێ هـەموو برینـدار و نەخۆشـەكانی پێشـمەرگەمان بـە نـاوی برینداری شەڕی عێراق-ئێران تۆمار دەكرد، ئیدی هەموو مافێك دەیگرتەوە كە هـەموو بـە خـۆڕایی بـوو لەوانـە: مانـەوە، خەوانـدن، پـێ دانـی ژوور، پێداویسـتی و هـەموو جـۆرە جلوبەرگێك، لەگەڵ نووسـراوێك بـۆ ڕێگا، جگـە لـە بلـیتی خۆڕایی بۆ ڕێگا و بڕێـك پـارە، نەخۆش هەبوو بە تەنها چەندین نەشتەرگەری بـۆ كـراوە، كـە لـەو كاتـەدا بـە پـارە بكرایـە بڕێكی زۆری دەكرد.

لە نەخۆشخانەی شاری ئەرەك شەوێك لەگەڵ هاوڕێیەکمدا لە بەشی فریاکەوتنی نەخۆشخانەکە ئێشکگر بووین، هەواڵ هات گوتیان پاسێك بە پڕ لە سەرنشینەوە تووشی ڕووداوێك بووە، چەند کەسێکی تێدا مردبوو، ئەوانەی دی هەمووی بە شێوازی جۆراوجۆر بریندار بووبوون، ئەو هەموو بریندارەمان تیمار و چارسەر کرد کە سەرووی ٣٠ کەس دەبوون، وەکو کارمەندی تەندروستیی دوو کەس بووین، ئیدی زۆر ماندوو بووم و لە ژوورێکدا چەندین کەس پاڵ کەوتبوون، نەمزانی مردووەکانن دانراون، چونکە هەمووی چەرچەفی لەسەر بوو، من وامزانی هاوڕێکانم و نەخۆش و کەسانی دیکەن خەوتوون، ئیدی لە ڕیزی مردووەکاندا لەسەر نەقالەیەك چەرچەفێکمدا بە خۆمدا و خەوم لێکەوت، لە شیرینی خەودا بووم هەستم کرد نەقالەکە لە ژێرمدا دەڕوات! هەستم ڕاگرت دوو کەس یەکێك لای سەرمەوەیە و یەکێك لای قاچمەوە ڕام دەکێشن وایانزانیبوو یەکێکم لە مردووەکان! منیش بێ ئەوەی بجووڵێمەوە وامزانی گاڵتەم لەگەڵدا دەکەن و بە دەنگێکی بەرز گوتم (پدر سوخته چ کار میکونی)، یەکێکیان هاواری کرد (مورده زینده شود-مردووەکە زیندوو بووەوە) یەکسەر بوورایەوە، ئافرەتێك بوو، ئەوی دیکەش ڕای کرد، گوتم: (بابە من فلان کەسم، مردووی چی)، ئیدی ئەوەی کە بوورایەوە ماوەی یەك مانگ لای پزیشکی دەروونی مایەوە تا چارسەری وەرگرت و تا چاك بوویەوە.

لەو ماوەیەدا من دوو جار سەردانی ناوزەنگم کردووە، جارێکیان ئەوە بوو کە دکتۆر فوئاد داوای کرد بچین بۆ تاران، هەڤاڵان خەلیل و نەجمەدین و بەندە چووینە تاران، هەر یەك لەو دوو هەڤاڵە ئۆتۆمبێلیان پێ بوو، لەوێ د. فوئاد گوتی، متمانەم بە کەس نییە، پێویستە ئێوە ئەم کەسانەم بۆ بگەیەننە ناوزەنگ کە بریتی بوون لە هەڤالان: (هێرۆ خان، زیرۆ، ئەبو سەفا)، دوا کەسیان سەر بە ئۆپۆزسیۆنی سوری بوو، لەگەڵ چەندین ئامێر و کەرەستەی ڕاگەیاندن و تەندروستی، هەروەها گوتی بۆ ڕێگاکەش داوای نووسراوی فەرمیمان لە ئێران کردووە، بەڵام بەهۆی گومرگ و مەرجی گلدانەوەی بەشێك لە

ئامێرەکان لەگەڵ بڕێکی زۆری پارە قایل نەبووین، بۆیە پێویستە ئێوە بە هەر ڕێگایەکە بیگەیەننە ناوزەنگ، واتە دەزگای ئیتلاعات ڕێگەی نەدەدا، ئێمەش دەستمان بەکارەکە کرد، هەرچی پارەکەیە لە ناو بۆری هەواسازی یەکێك لە ئۆتۆمبێلەکان شاردمانەوە، ئیدی کەرەستەکانمان کردە سندووق و بەشی ناوەڕاستی ئۆتۆمبێلەکەوە، بۆ سبەی ئێمە سێ کەس بووین نێردەکەش سێ کەس بوون لەگەڵ کەرەستەکاندا بە دوو ئۆتۆمبێل بە ڕێکەوتین.

لە ڕێگە گەیشتینە تەبرێز و ڕووداوێکی شەڕ دروست بوو، ئۆتۆمبێل ڕادەگیرا و دەپشکنرا، هاتە نۆرەی ئێمە من و هەڤاڵ خەلیل بووین کە کەرەستەکانمان پێ بوو، پرسیاری لێ کردین و گوتی: ئەوە چییە پێتانە؟ هەڤاڵ خەلیل لە خۆیەوە گوتی فەخفورییە (فەخوری)، کابرای پۆلیس هەر نەیزانی چی دەڵێت گوتی بڕۆن، چونکە لە ئێران بەو جۆرە قاپە دەڵێن (چینی)، ئێمە دەرباز بووین و دوور کەوتینەوە و وەستاین تا ئۆتۆمبێلی دووەم بگات، هەر نەگەیشت، ناچار دابەزیم و بەپێ بۆ پرسیاری ئەوان گەڕامەوە، گەیشتمەوە بازگەکە، گوتیان قەدەغەیە چیت دەوێت، گوتم ئێمە لەو پێشەوە وەستاوین منداڵێکمان پێیە و شیرمان لێ بڕاوە، ئێوەش بەهۆی شەڕەوە ناهێڵن بچینە شارەوە، ناچار دەمەوێت بە سەر ئەو ئۆتۆمبێلانەدا بگەڕێم کە ڕیزیان بەستووە، بەڵکو کەسێك منداڵی پێ بێت و شیریان پێ بێت، گوتی برۆ بگەڕێ، منیش بەو بەهانەیەوە بە سەر ئۆتۆمبێلەکاندا گەڕام تا گەیشتمەوە لای ئەوان، گوتم ئەوە چییە بۆ نایەن، گوتیان ئێمە ڕاگیراوین، گوتم بۆچی؟ گوتیان لە کاتی داواکردنی ناسنامەدا ئەو هاوڕێ سورییە، پاسەپۆرتی سوری نیشان داون، نەجمەدینیش کە شۆفێر بوو پەناهەندە بوو ناسنامەی ئێرانی نەبووە، هەڤاڵ هێرۆ پاسەپۆرتی بەریتانیای پێ بووە، هەڤاڵ زیرۆ پاسەپۆرتێکی دیکەی پێ بووە، واتە ئەو چوار کەسە هەر کەس و ناسنامەی وڵاتێکی پێ بووە، ئەمەش گومانی لەسەر دروست کردوون و دەست بە سەر کرابوون و لادرابوونە لاوە.

چیرۆکی ئازادبوونی ئەوان بەڕێکەوت بوو، لە ڕووداوی شەڕەکەی ناوشار کە لە نێوان حکومەت و نارەزایانی تەبریز ڕوویدابوو، چوار کەس دەستگیر کرابوون، هێنرابوون بۆ بنکەی پۆلیس، لە شارەوە خۆپیشاندانێکی گەورە ساز کرا، بەمەبەستی پشتگیری بۆ ئازادکردنی ئەو چوار کەسە، بە نزیکبوونەوەی خۆپیشاندەران پۆلیس بە ڕێکەوت ئەو چوار کەسەی ئێمەی ئازاد کردبوو، ئەمە تا ئێوارەی خایاند، دوای ئازاد بوون دەبوو بچن بۆ بۆکان و دواتر بۆ مەهاباد، هەرواشیان کردبوو، بێ ئەوەی بمانبینن لە لای ئێمەوە ڕۆیشتبوون، هیچ هۆکارێکی پەیوەندیشمان لە نێوان نەبوو، ئێمەش لەبەر ئەو کەلوپەلانە و پارەکە نەمانتوانی شەو بەو ڕێگایەدا بڕۆین، چونکە ئەو کات لە شەودا لە نێوان بۆکان و مەهاباددا ڕێگر هەبوو، بۆیە نەمانوێرا خۆمان لەو ڕێگایە بدەین، شەو داهات و ڕۆشنایپەکمان بەدیکرد، بەرەو ڕووی چووین، دەرکەوت ئەمە دەواجینە، گوتمان نەشارەزاین و ناوێرین بەو ڕێگایەدا بڕۆین، بۆیە داوا دەکەین شەو لای ئێوە بمێنینەوە، ئیدی فەرموویان لێ کردین، ئەوانەی لەوێ کاریان دەکرد تورك بوون.

ئیدی هەڤاڵانی ئۆتۆمبێلەکەی دیکەمان بۆ دۆزینەوەی ئێمە کەوتبوونە پرسیارکردن، هەڤاڵ هێرۆ پەیوەندی بە شێخ عیزەدینی حسێنی و هەڤاڵانی کۆمەڵەوە کردبوو تا ئێمە بدۆزنەوە، ئەوانیش چەندین ئۆتۆمبێلیان ڕاسپاردبوو، ئەو شەوە تا بەیانی لە نێوان بۆکان و مەهاباددا بە دوای ئێمەدا گەڕابوون، ئێمەش بێ ئاگا بووین، تا ڕۆژ بووەوە، ئیدی کەوتینە ڕێ، گەیشتینە لایان، هەر لایەکمان لە ئەوی دیکەی دەپرسی ئێوە لە کوێن و خەمی ئێوەمان بوو، ئەو ڕووداوەی ئەو ڕۆژە هاوکات بوو لەگەڵ دانوستانی حکومەتی تاران و پارتە کوردییەکان لە شاری مەهاباد.

ئێمە تا سەردەشت چووین، ئیدی هەڤاڵانی پەیوەندییەکانی ی.ن.ك پێدویستییەکانیان لێ وەرگرتین و ئێمەش هەر پارەکەمان پێ مایەوە، ئیدی ئەو شەش کەسە بووین بە دوو بەشەوە، چاوساغێك هەڤاڵ هێرۆ و دوو کەسەکەی دیکەی لە ڕێگای سەرەوە بەرەو ناوزەنگ

برد، ئێمەش لە ڕێگای خوارەوە بەرەو ناوزەنگ بەڕێکەوتین، کەسێك بە ناوی هەڤاڵ بەکر چاوساغی ئەو ڕێگایە بوو گوتی بەشی سەرەوە ڕێگای هێستری نییە، بۆیە لەبەر بارەکان و هێسترەکان پێویستە خۆشمان لە خوارەوە بچین، شەوێکی بارانـاویی بوو دونیا قوڕ بوو، هیچمان نەدەبینی، قاچمان دەچووە چاڵی جێ سمی ئەسپ و وڵاخی باربەرەوە، هەموو گیانمان لە قوڕ هەڵکێشرابوو، لە ڕێگە دەگەیشتین بە هەر قاچاخچییەك لێمان دەپرسی ناوزەنگ زۆری ماوە؟ یەکێك دەیگوت هێندەی نەماوە، یەکێك دەیگوت پشتی ئەو کەلەیە، یان پشتی ئەو شاخەیە، یان پێنج دەقە ڕێگەی ماوە، کەچی هەر نەدەگەیشتین، بۆیە هەڤاڵ خەلیل ئارامی لێ بڕا و گوتی من نایەم، لە پڕ باوەشی کرد بە ملی هێستری قاچاخچییەکدا و سوێندی خوارد و گوتی دەبێت ئەم هێسترەم بە کرێ بۆ بگرن تا دەمگەیەنێتە ناوزەنگ، کابرای خاوەن هێستر گوتی: "کاکە وەڵڵا یەك خولەکی دیکە بڕۆ لەو کەلە بەو دیودا گوێت لە خوڕەی ئاوی چەمی ناوزەنگ دەبێت و ڕووناکی ماڵ و بارەگاکان دەبینی"، هەڤاڵ خەلیل گوتی وانییە، کابرا بەناچاری هەڤاڵ خەلیلی سەرخست و چەند خولەکێکی نەبرد گەیشتین، هەڤاڵ خەلیلیش بە گاڵتەوە گوتی: "بەخوا لە هەموو کورددا تۆ یەکەم قاچاخچیت ڕاستی بڵێیت، خۆ من لە ئێوارەوە بە هەر کەس دەڵێم، دەڵێت ئەوە ناوزەنگە گەیشتن، کەچی هەر ناگەین، تەنها تۆ بووی ڕاستیت گوت".

ئیدی گەیشتین، لەوێ بارەگای ح.ش لەسەر چەمەکە بوو، بارەگای هەڤاڵ مام جەلال لە ناوەڕاستی شاخەکە بوو، بارەگای هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا لە بەشی سەرەوە و لە بناری شاخەکە بوو کە چەکە قورسەکانی لێ بوو، ئیدی لە چەمەکە لە نزیك بارەگای ح.ش جلوبەرگەکەمان پاك کردەوە، بە هاوڕێیانی (ح.ش)مان گوت برسیمانە، گوتیان خواردنمان لانییە، گوتمان هەرچی بێت دەیخۆین، نان و ئاویش بێت، گوتیان جگە لە نان بەس (چا)مان لایە، ئیدی دەستمان کرد بە نان و چا خواردن، هەڤاڵ نەجمەدین ڕاستەوخۆ خەوی لێکەوت، هێندەی نەبرد هەڤاڵ زیرۆ هاتە خوارەوە و گوتی هەڤاڵ مام جەلال

داواتان دەكات، هەڤاڵ خەلیل گوتی بشمكوژن ناتوانم بە سەر ئەو شاخەدا سەر بكەوم، هەڤاڵ زیرۆ ڕۆیشت و هێندەی نەبرد گەڕایەوە و گوتی هەڤاڵ مام جەلالی دەڵێت: با پشوو بدەن و سبەی بێن، ئیدی بۆ سپێدە سەركەوتین، بە هەڤاڵ زیرۆمان گوت بارەگای هەڤاڵ مام جەلال كامەیە؟ بە ئاماژەی دەست پێی گوتین ئەوەیە، كە نزیك بووینەوە تاماشام كرد هەڤاڵ مام جەلال لەسەر خانووەكە هاتوچۆ دەكات، كە لێی نزیك بووینەوە بە دەنگێكی بەرز گوتی: "خەلیل سەعید و جەماعەت ئەگەر ڕەخنەتان لێمان گرت، ئەم سەر بەرەو ژووروەشی تێدا بنووسن"، هەرچی لە بارەگا و خێمەكاندا بوون بە دەنگی هەڤاڵ مام جەلال هاتنە دەرەوە.

لەوێ هەڤاڵ مام جەلال باسی ڕێكخستن و گرنگی دەرمان بەدەستخستنی كرد، بە كارێكی پیرۆزی لە قەڵەمدا و گوتی ئێوە كۆڵەكەیەكی گرنگی شۆڕشن، بۆیە زۆر پێویستمان بە دەرمانە، هەروەها گوتی ئێوە هەر لەوێ بمێننەوە تا لە دۆخی ناردنی نەخۆش و بریندار و قایل نەبوونی حكومەتی ئێراندا بۆ شوێن و جێی ئێوەی بنێرین، گوتمان ئێمە شوێنی مانەوەی باشمان هەیە.

هاوكات بەشی تەندروستی و ڕاگەیاندن هەر لە ناوزەنگ بوو، بەڵام نزیكی بارەگاكان نەبوو، ئیدی چووین بۆ بەشی ڕاگەیاندن، ئەبو سەفا میوانیان بوو، هەڤاڵ خەلیل گوتی هەڤاڵانی ڕاگەیاندن پارەیان لێ بڕاوە ئەگەر پارەت پێیە بمدەرێ دەچین مریشكێك بۆ میوانەكەیان دەكڕین، گوتم بەڵێ، پێمە، ئیدی كاری میواندارییەكەیان پێ جێبەجێ كرد، دواتر گەڕاینەوە بۆ شاری ئەرەك.

لە ئێران لەلایەن (پ.د.ك) و ئیتلاعاتەوە دژایەتی دەكراین، سێ جار ماڵی ئێمە لەلایەن ئیتلاعاتەوە لە پشكنیندا هەڵوەشێنراوە، ڕۆژێك لە نەخۆشخانە بووم، تەلەفۆنم بۆ كرا تا بۆ ماڵ بچمەوە، كە چوومەوە دەبینم هەموو هەڵوەشێنراوە، گوتم بۆ واتان كردووە، گوتیان ئێوە هەواڵتان لێدراوە، میوانی دەرەكیتان هەبووە، گوتم میوانی دەرەكی لە ناو

سەرین و پشتی و دۆشەکدا چی دەکات! خۆ ئێوە ئەوانەشتان هەڵوەشاندووە، ئێمە لەلایەن حکومەت و ئیتلاعاتەوە زۆر دژایەتی دەکراین، بەڵام پ.د.ك پەیوەندی پتەوی هەبوو لەگەڵ حکومەت، هەر لە دروست بوونی (ی.ن.ك)ەوە پ.د.ك لە ئێراندا قیادە مۆقەتەی دروست کرد، نادر هەورامیی و چەند کەسێکی نارده ناوچەی هەورامانی تەخت تا پەیوەندی لەگەڵ هەورامانی سەخت گرێ بدەن، ئیدی بوون بە ئاگر بۆ گیانی کوردانی باشوور کە نیشتەجێی شارەکانی ڕۆژهەڵات بوون، ئەو کوردەی لەگەڵیان نەبووایە دەیان گوت سەر بە (ی.ن.ك)ە، ئیدی ئەوان کاریان ئاژاوە و چاودێریکردن و هەواڵ و زانیاری پێ دان بوو بە ئیتلاعات، پێشتر لەگەڵ (ساواك)یش هەمان کاریان دەکرد.

لە سەردەمی شا و کۆماری ئیسلامیش هەمان کاریان ئەنجام دەدا، حکومەتیش لە سەردەمی شا و سەردەمی ئیسلامییەکانیشدا بەرامبەر کورد بە گشتی و کوردی ڕۆژهەڵات بە تایبەتی زۆر چەوسێنەر بوو، لێرەدا نموونەیەك دەگێڕمەوە: دوای هاتنە سەر دەسەڵاتی خومەینی، دادوەرێك بە ناوی خاڵخاڵیی هەبوو زۆر خوێنڕێژ بوو، ڕۆژێك لەسەر ڕێگای سەقز دوو کوردی بێ تاوان کە باوك و کوڕ بوون لەسەر کێڵگەوە دەچنەوە بۆ ناوشار، دەیانگرن و دەیانبەن بۆ لای خاڵخاڵیی، ئەویش بێ لێپرسینەوە دەڵێت پێویستە یەکێکتان بکوژم، باوك دەڵێت من بکوژن بەشی خۆم دونیام بینیوە کوڕەکەم گەنجە، کوڕیش دەڵێت ناتوانم بڵێم باوکم بکوژن، بۆیە خۆم بکوژن، خاڵخاڵیش دەڵێت هەردووکیان بکوژن، ئەگەر تاوانبارین، ئەوە سزای خۆتان وەرگرتووە و بۆ جەهەنەم، ئەگەر بێ تاوانیش بن ئەوە دەچن بۆ بەهەشت! ئەو کابرایە وەکو هۆلاکۆ وابووە بچووبایە هەر شارێك گەورە و بچووکی تووشی تۆقین دەکرد.

لە ڕووی دەروونییەوە لە ئێران زۆر ماندوو بووم، لە ساڵی ١٩٨٥ بەمەبەستی پێشمەرگایەتی هاتمەوە باشوور، دواتر پێیان ڕاگەیاندم ئێمە لە ڕۆژهەڵات کارمان پێتە و

ناردیانمەوە بۆ ئێران، لە نەخۆشخانەکەش هێندەی نەمابوو دەربکرێم، چونکە ماوەیەکی زۆر بوو مۆڵەتم کردبوو، بۆیە گەڕامەوە ئێران و تا ساڵی ١٩٩٠ لە ئێران مامەوە.

لە دوای ڕاپەڕین لە فەوجی ٣ی لیوای ٢٤، بووم بە ئەفسەری پزیشك، کە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا وازم هێنا و گوتم نامەوێت بەشداری ئەو شەڕەبم، ئیدی وازم لە کاری سیاسی و سەربازی هێنا، دەستم بە کاری ئازاد کرد و دوکانی قوماشم دانا و لە ئێرانەوە قوماشم دەهێنا و تا ٢٠٠٣ بەردەوام بووم، دواتر دەستم بە کاری بەڵێندەرایەتی کرد و چەند ساڵێکە لەو کارە بەردەوامم، هەرچی لایەنی ژیانی تایبەتیمە لە ساڵی ١٩٧٦ لە ئێران هاوسەرگیریم کردووە، خێزانم خوشکی شەهید موئمینە، باوکی چوار کوڕ و سێ کچم[٢٧].

---

[٢٧]- چاوپێکەوتن لەگەڵ: ڕەزا ساڵح ئەحمەد ئەمین (د. ڕەزا)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٤/٣٠.

## زرار شەریف کەریم ئەحمەد (شەهید زرار تیژەیی)

ساڵی ١٩٦٣ لە گوندی تیژەی ناوچەی شوانی چەمچەماڵ لەدایك بووە، ساڵی ١٩٧١ – ١٩٧٢ چووەتە بەر خوێندن، لە قوتابخانەی تلیانی سەرەتایی تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بەسەرکەوتوویی تەواو کردووە، پاشان بە گوزەرانی ژیان و کاری جووتیارییەوە سەرقاڵ بووە، لە ساڵی ١٩٧٩ لە سنووری هەرێمی دووی کەرکووك پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)ەوە کردووە، ساڵی ١٩٨٤ لە تیپی ٢١ کەرکووك دەبێتە پێشمەرگە، دوای ئەوەی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان پێکدەهێنرێت وەك و کادیری ڕێکخستن دەست بەکار دەبێت، دەبێتە کادیرێکی ژیر و لێهاتوو و خۆشەویستیی جەماوەر و پێشمەرگە، دواتر خولی برینپێچی دەبینێت و لەگەڵ مەفرەزەی پزیشکیدا لە کاتی پێویستدا کاری کردووە.

لە ساڵی ١٩٨٠ هاوسەرگیری کردووە، لە ساڵی ١٩٨٨ لە ئەنفالدا هاوسەرەکەی شەهید بووە، لە ڕاپەڕیندا ڕۆڵی گرنگی بینیوە، ئەو ماوە کەمەی کە هێزی پێشمەرگە لە کەرکووك بووە بەرپرسی نەخۆشخانەی ئازادیی بووە، لە دوای کۆڕەو لە ساڵی ١٩٩١ بەرپرسی بەرەی کوردستانی لە تەکیەی کاکەمەند بووە تا ساڵی ١٩٩٢ بەردەوام بووە، پاشان بووە بە ئەندامی کەرت و دواتر لێپرسراوی کەرت لە تەکیەی کاکەمەند لە سنووری مەڵبەندی کەرکووك، لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٢ بەشداری خولی ئەفسەرانی کردووە لە سکرتاریەتی هەڤاڵ مام جەلال و بەسەرکەوتوویی بە پلەی ملازمی دوو تەواوی کردووە، دواتر بووە ڕابەری سیاسیی فەوج و جێگری لێپرسراوی فەوج لە سکرتاریەت، لە سپێدەی ١٩٩٣/١٢/٢٧ لە شەڕی پاراستنی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە گەڕەکی هەواری تازەی شاری سلێمانی شەهید بووە، لە پاش خۆی کوڕێك و پێنج کچی بەجێهێشتووە[٢٨].

---

[٢٨]- ڕۆژی ٢٠٢٢/١٢/٢٩ لە فاتیح عومەر وەرگیراوە.

# سەردار عەبدولقادر ئەحمەد عەلی گلاڵی (دکتۆر سەردار)

له ١٩٥٧/٧/١ لەدایك بووم، خێزاندارم و باوکی سێ منداڵم، بە ناوەکانی (پاڵە، تەلار و پاقێ)، قۆناغی سەرەتاییم لە قوتابخانەی پیرەمێرد لە کەرکووك تەواوکردووە، قۆناغی ناوەندیم لە خوێندنگەی کاوە لە کەرکووك تەواوکردووە، قۆناغی ئامادەییم لە خوێندنگەی ئامادەیی کوردستانی کوڕان تەواوکردووە، دواتر لە پەیمانگای تەندروستیی سلێمانی بەشی یاریدەدەری پزیشکیم تەواوکردووە، هەرچەندە لە یەکەمەکان بووم و مافی وەرگرتنم لە کۆلێژ هەبووە، بەڵام بەهۆی شەڕی عێراق – ئێران وەرنەگیراوم، تەنها بڕوانامەی دیبلۆمم وەرگرتووە.

سەرەتای کاری سیاسیم لە ساڵی (١٩٨١)ەوە دەست پێ کردووە، تا لە ساڵی ١٩٨٢ لەگەڵ شەهید محەمەدی برام بەشداری ڕێکخستن بووم، لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣ لە تیپی ٢١ی کەرکووك و مەڵبەندی ٢ی ئەوکات و لە کەرتی تیپ بووم بە پێشمەرگە، کە بارەگاکەی لە گوندی گۆپتەپە بوو، سنووری چالاکیمان سنووری تیپی ٢١ی کەرکووك بوو، پاش ئەوەی دکتۆر خالید دەچێتە سەرگەڵوو ئیدی من بوومە پزیشکی تیپی ٢١ی لە کەرتی تیپ.

سەرەتای کاری پزیشکم لە دوای تەواوکردنی پەیمانگای تەندروستی لە ساڵی ١٩٨٣وە دەست پێ کردووە، کە بۆ ماوەی ساڵێك لە سنووری کەرکووك دامەزرام، ماوەی ٣ مانگ لە نەخۆشخانەی کەرکووك بووم، دواتر چوومە نەخۆشخانەی حەویجە کە (حوض ١٦)یان پێ دەگوت، لەوێ کاری یاریدەدەری پزیشکیم دەست پێ کرد، دوای تەواوکردنی ماوەکەم ڕاستەوخۆ چوومە دەرەوە و بووم بە پێشمەرگە، لەم شوێنانە کارم کردووە: لە سنووری تیپی ٢١ی کەرکووك، تیپی ٢٥ی خاڵخالان، نەخۆشخانەی یاخسەمەر لەگەڵ دکتۆر شالاو، نەخۆشخانەی سوورقاوشان لەگەڵ دکتۆر دڵشاد، نەخۆشخانەی قوڵەهەرمێ لە زەڵێ،

زستانەکەی بە نۆرە لەگەڵ هەڤاڵێك چووم بۆ دۆڵەکۆگە، هاوینەکەشی لە گوێزیلە خێمەم هەڵداوە و کاری پزیشکیم تێدا کردووە، پێشمەرگە و هاووڵاتیم تێدا چارەسەر کردووە.

لە ساڵی ١٩٨٤ لە مانگی شەشدا لە یادی کۆمەڵەدا لە گۆپتەپە ئاهەنگێك ساز کرا، کاتژمێر ١٠ بۆ ١١ پێشمەرگەیەك بە ناوی حەمەفەرەنسی RBGیەکی لەدەست دەرچوو، خۆی پێ بریندار کرد، قاچ و پێی بریندار بوو، دوای ئەوەی چارەسەری سەرەتاییم بۆ کرد، هەڤاڵ مام ڕۆستەم و چەند هەڤاڵێك داوایان لێ کردم بیبەم بۆ نەخۆشخانەی سووورداش، ئیدی بە ئۆتۆمبێل لەگەڵ دوو پێشمەرگە مۆغەزیم لە ناو ئۆتۆمبێلەکە بۆ هەڵواسی تا دوو موغەزی تەواو کرد، ئیدی بردمان بۆ نەخۆشخانەی سووورداش کە دکتۆر شوانی لێ بوو، هەر ئێوارەی ئەو ڕۆژە گەڕامەوە گۆپتەپە.

هەر لە ساڵی ١٩٨٤دا ئێمە چارەسەری و سارێژکاریمان بۆ هاووڵاتیش دەکرد، زۆرجار نەخۆشەکانمان ئەوانە بوون کە مار و دووپشك پێوەی دەدان، ڕۆژێك خێزانی شەهید شەوکەتی برای هەڤاڵ ڕەفعەت عەبدوڵلا لە شەوێکدا دوو جار دووپشك پێومیدا، هەر دوو جارەکە فریای کەوتم.

لە ساڵی ١٩٨٤ لە تۆڵەی شەهیدکردنی مامە ڕیشە، شەڕی ماڵە عەرەبەکان کرا، تەنانەت هەموو تیپەکان، تایبەت ئێمە وەك تیپی ٢١ و ٢٥ کۆبووینەوە بۆ چالاکییەکی گەورە و بەرنامەمان دانا لە ماڵە عەرەبەکانی لای گەڵۆزی نزیك ساڵەیی سەر ڕێگای سەرەکی کەرکووك - هەولێر بدەین کە حکومەت هێنابوونی بۆ ئەوێ، منیش وەك دکتۆر لەگەڵیان بووم، کە ئەوکات هەڤاڵ سیروان کوێخا نەجم سەرپەرشتی شەڕەکانی دەکرد، لە شەڕەکەدا هەڤاڵ خەتاب عارف (خەتابە ڕەش) بریندار بوو، هاتە بەردەستم لە دەست و قۆڵی درابوو شکابوو، چارەسەری سەرەتاییم بۆ کرد، هێنامانە دواوەی شەڕ و لە مزگەوتێك دامان نا، هەروەها ئەوەندی بیرم بێت پێشمەرگەیەکی دیکەش بە ناوی هەردی برینداا بوو، دواتر گەڕاینەوە و هەر کەرتێك چووینە گوندێك من چوومە گوندی جولحان، هەردی کە بریندار

بوو، له گوندی تۆمار دانرا بوو تووشی خوێنبەربوون بووبوو، نەمتوانی بگەمە سەری و شەهید بوو، دواتر خەتاب عارف نێردرا بۆ گوندی سەرمۆرد نزیك قەمچوغە منیش هەر له لای بووم، نزیکەی دوو بۆ سێ مانگ چارەسەرم دەکرد.

هەر له ساڵی ١٩٨٤ بۆ ١٩٨٥ شەڕی گۆپتەپە کرا و حکومەت هێرشی کرد و حاکم کەمال و چەند پێشمەرگەیەك شەهید بوون، سێ پێشمەرگە بە دیلی گیرا و دواتر حکومەت شەهیدی کردن، چەند پێشمەرگەیەك بریندار بوون، هەڤاڵ مام ڕۆستەم بریندار بوو، من له سەرمۆرد بووم، مام ڕۆستەمیان هێنا و تیمارم کرد و دەرزیم لێدا و بۆ سبەی ڕەوانەی بەرگەڵوو کرا، منیش له هەر شوێنێك بوومایە هەموو کات کۆڵەپشتەکەم له کۆڵ بوو دەرمانی تیمار و دەرزی و حەب و کەپسوولی تێدا بوو، من پێش شەڕەکان ماڵی گوندەکان دەگەڕام بۆ دۆزینەوە و داواکردنی دەرمانی زیاد، تایبەت حەبی ئازار و دەرزی و مقەستی دوورینەوە و کەپسوولی ئەنتیبایۆتیك، ئیدی بۆ پێشمەرگەم هەڵدەگرت، زۆر جاریش له بەرگەڵووەوە بۆمان دەهات، یان له ڕێگەی ڕێکخستن و هاووڵاتیی دڵسۆزەوە، ڕۆژێك له شارەوە دوو پاکەت دەرزییمان بۆ هات هەر دانەی چوار بۆ پێنج دەرزی تێدا بوو، هەر دەرزی نزیکەی سێ سیسی بوو، نرخی هەر دەرزییەکی نزیکەی ٢٥ دیناری ئەو کات بوو، کاتێك برینداریم تیمار دەکرد، که لەو کاتەی ئەو کەسە ئازاری دەبێت ئیدی نیو سیسی و جاری وا هەبوو کەمتریشم لێدەدا، ئیدی بە ویستی خۆم تیمارم دەکرد بێ ئەوەی هەست بەئازار بکات، چونکە ئەو کەسە ئاگای لێنەبوو من چی دەکەم، هەرچەندە کە قسەم لەگەڵ نەخۆشەکە دەکرد بەڕاستی وەڵامی دەدایەوە، دواتر کە سڕکردن بەری دەدا پێیم دەگوت فلان شتت گوتووە بیری نەمابوو، ئیدی چەندین جۆر دەرمانمان بۆ دەهات، خۆشبەختانە له هیچ قۆناغێکدا خۆم بریندار نەبووم.

له ساڵی ١٩٨٥ له سوورقاوشان نەخۆشخانەیەکی جێگیرمان دانا، ئەو کات ئێمە وەك تیپی ٢١ چوار کەرتمان هەبوو، بریتی بوون له کەرتی ١ و ٢ و ٣ و کەرتی تیپ، هەر کەرت و

دکتۆری خۆی هەبوو، دکتۆر ئاری دکتۆری کەرتی ١ی ساڵەیی بوو، کە هەڤاڵ پۆڵای موهەندیس لێپرسراوی کەرت بوو کە، شەهید دکتۆر حەمید دکتۆری کەرتی ٣ بوو، کە شەهید سەیید ئیبراهیم لێپرسراوی بوو، هەرچی کەرتی دووی شوانە، هەڤاڵ شۆڕش قەرەهەنجیری لێپرسراوی بوو، هەرچی کەرتی تیپە ماوەیەك هەڤاڵ عوبێد نەجم لێپرسراوی بوو ماوەیەکیش هەڤاڵ ئیبراهیمە سوور لێپرسراوی بوو، کەرتی تیپ سنووری نەبوو بەردەوام لە جووڵەدا بوو، کەرتەکانی دیکە تا ڕادەیەك جێگیر بوون، هەروەها هەڤاڵ مام ڕۆستەم سەرتیپ بوو و شێرزاد حافز جێگری بوو، دکتۆر کامەرانیشمان هەبوو لە تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان بوو لەگەڵ شەهید وریا سووردا بوو، سنووری هەردوو تیپ پێکەوە بوو، گوندی مام ڕەش دەکەوتە نێوان هەر دوو تیپی ٢١ی کەرکووك و ٢٥ی خاڵخاڵان.

ئێمە لە نەخۆشخانەی سوورقوشان بووین، دکتۆر دڵشاد بەڕێوەبەری بوو، هەرچەندە زۆر نەدەمایەوە و لە جووڵەدا بوو، من بەزۆری دەمامەوە لەگەڵ هەڤاڵێك بە ناوی ئاسۆ تیماری پێشمەرگەمان دەکرد، بەتایبەت بەهۆی شەڕی سەرکردایەتی و دابان هەلاجەوە لەو ماوەیەدا بریندار زۆر بوو، هەموو ڕۆژ بەیانی زوو هەڵدەستاین پاش نان خواردن هەتا کاتژمێر شەش و حەوتی ئێوارە خەریکی سارێژکردن بووین، هەرچەندە نەخۆشخانەی بەرگەڵووشمان هەبوو، یەکێك لەو برینداراانە کوڕێکی هاوڕێم بوو بە ناوی نەوزاد، هاوڕێی منداڵیم بوو لە پێشمەرگایەتیدا بوو بە ڕابەری سیاسی کەرت، لەو شەڕە گوللە لە سەری دابوو، نەمان توانی بیبەین بۆ نەخۆشخانەی بەرگەڵوو، چەند ڕۆژ تیمارم بۆ کرد تووشی خوێنبەربوون بووبوو، بەڵام دواجار لە ژێر دەستمدا شەهید بوو، خەڵکی کەرکووك بوو لە تیپی ٢١ بوو، پێشمەرگەیەکی نموونەیی بوو، ئەوکات هەموو نموونەیی بوون، من باسی سنووری خۆم دەکەم هیچ کاتێك کەسی خراپمان تێدا نەبووە، سەرەتا کەسەکە کە دەبوو بە پێشمەرگە ڕەنگە هەڵەی هەبوو بێت، بەڵام دوای پێنج بۆ شەش مانگ پێشمەرگایەتی دەگۆڕا و پەروەردە دەبوو، ئیدی دەتتوانی سەری پێ بسپێری، ئەو باشی و ڕەوشتەی لە

پێشمەرگەم بینیوە وێنەی نییە، من ئەوە دەڵێم کە بە چاوی خۆم بینیوە، خراپیش هەبووبێت من نەمبینیوە، هەروەها بریندارێکی دیکە بە ناوی هەڤاڵ کەریم لە شەڕی سەرکردایەتی بریندار بوو، لای من مایەوە تا چارەسەرم کرد.

لە شاخەکەی پشتی نەخۆشخانەکە ڕچەڕێیەکی لێ بوو لەوێوە دەگەیشتینە نەخۆشخانەکە، ڕۆژێك سێ پێشمەرگە هاتن چوار برینداریان پێ بوو، برادەرانی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسك) بوون، بەرپرسەکەیان هاتە پێشەوە گوتی کێ لێپرسراوی ئەم نەخۆشخانەیەیە؟ گوتم من، گوتی ئێمە سەر بە (حسك)ین، ئەم شەو لە چالاکییەکدا چەند پێشمەرگەیەکمان بریندار بوون، تیماریان دەکەن؟ گوتم ئەمە نەخۆشخانەی شۆڕشە، من وەك خۆم هەمووی وەك یەك تەماشا دەکەم، ئیدی زۆر مەمنون بوو کە بۆم سارێژکردن، لەوە بەدواوە لەو ناوچەیە هەر کات داوای هەرچیم لێ بکردایە دەهات بە دەمی داواکەوە، چەندین جار بریندارمان لابوایە برسییان دەبوو، کەسێکم دەنارد بۆ لای، بۆ ئەوەی ئاژەڵێکمان بۆ بنێرێ تا بۆ بریندارەکان سەری بڕین، لەبری یەك دانە دوو ئاژەڵی دەنارد، چونکە لای سەیر بوو کە ئێمە تیماری پێشمەرگەی (حسك)مان دەکرد.

ڕۆژێك لە گوندی گەڵناغاجی سەر بە ئاغجەلەرەوە، هاووڵاتییەکیان هێنا لە ناو کێڵگەدا گوللە لە دەستی دەرچوو بوو، هەردوو سەر پێی گرتبوو، هێنایان بۆ سوورقاوشان، دۆخی خراپ بوو، تیمارم بۆ کرد، گوتم دۆخی باش نییە بیبەن بۆ سەرکردایەتی، بردیان و هێنایانەوە لەبەر هەر هۆکارێك بێت پارمەتی نەدرابوو، هێنایانەوە گوتیان دکتۆر لای تۆ بشمرێت ئێمە لای تۆ چارەسەری دەکەین و نایبەین بۆ هیچ شوێنێك، ئیدی تا هاتنەوە قاچی هەوی کردبوو، ئاوسابوو، لەفافم بە شیشی تفەنگەوە دەپێچا و دەم کرد بە قاچیدا تاکو چڵك و پیسی قاچی دەربچێت، تا مانگێك لای من بوو تا چاك بوویەوە، ئیدی ئەم کارە لای خەڵکی گوندەکە بە گشتی زۆر جێگەی پێزانین بوو، چەندین جار لەوە بەدوا داوای چەندین شتم لێ کردوون هەرگیز نەیاندەگوت نەخێر.

من ئەومندە مانـدوو دەبـووم، تـا شـەوێك لـە نەخۆشـخانەكە هاتمـە دەرەوە لـە بـەردەم سەكۆی پێش نەخۆشخانەكە كەوتم، ئاگام لە خۆم نـەما، بـە هەسـتی خـۆم بـە دەنگـی بـەرز بانگی پێشمەرگە دەكەم، بەڵام كەس گوێی لێ نـەبوو، بـە ڕێكـەوت پێشمەرگەیەك هـاتبووە دەرەوە، گوێم لە دەنگێك بوو كەسێك گوتی ئەوە چیتە دكتۆر بیرمە بە دەنگێكی نزم گـوتم بمبەنە ژوورەوە، ئەومندە مانـدوو بووبووم و خواردنم كەم خواردبوو، زەختـم دابـەزی بـوو، هاتبووە سەر چوار، تووشی لەرز بووم، زۆپایان بۆ داگیرساندم و سێ بـۆ چـوار لێفـەیان پـێ دادام هـەر لـەرزم هـەبوو، ئـەو هەڤاڵـەی لەگـەڵم بـوو بـە نـاوی ئاسـۆ زۆر زیـرەك بـوو، یارمەتیـدام، هەرچـەندە هـیچ بڕوانامەیـەكی پزیشـكی نـەبوو، كەچـی سارێژكاری دەكـرد، خەڵكی دووكان بوو لە تیپی ٢١ بوو، دواتر لە ١٩٨٨ بەر شاڵاوی ئەنفال كەوت، ئەو پێشتر لـە ڕەبیەیەكی حكومەت سەرباز بووە، تۆپێك هەبوو كە لەسەر ئۆتۆمبێل دادەنرا لەگەڵ خـۆی هێنابووی، لە سنووری تیپی ٢١ ڕادەسـتی شۆڕشـی كردبـوو، كـە ئەمـە دەسـتكەوتێكی گـەورە بوو، ئەو دەیزانی خوێنی مـن چ گروپێكـە لـەوێ كەسـێك هـەبوو هـەڵهاتووی سـەربازی بـوو یارمەتی ئێمەشی دەدا، ئاسۆ پەلی گرت و گوتی وەرە خوێن بدە بە دكتۆر بـە بـێ پشـكنین، كانوولەی موغەزیمان لابوو، سەرێكی كانوولەكـەی لـە دەمـارێكی دەسـتی ئـەودا و سـەرەكەی دیكـەی كانوولەكەیـدا لـە دەمـارێكی دەسـتی مـن، هـەر ڕاسـتەوخۆ بـە بـێ بوتـڵ خـوێنی لـە ئەوەوە بە مندا، ئەمە بۆ كەسێك بێ بڕوانامە بێ و بێ بوتڵ و پشكنین كـارێكی ئەسـتەمە، من لە مردندا بووم ئیدی ئەو خوێنە زیندووی كردمەوە.

دوای چاكبوونەوەم لەم نەخۆشییە گوتم دەچم خێزانم دەهێنمـەوە كـە سـێ سـاڵ بـوو هاوسەرگیریم كردبوو، واتە لە ساڵی ١٩٨٣ەوە، كە بووم بە پێشمەرگە ماوەیەك ماڵم لە گوندی گۆكجە بووە، ماوەیەك لە گوندی كلاوقووت بـوو دواتـر لـە گونـدی مۆردخـواردەی خـواروو، منداڵیشم هەبوو، دواتر ماڵم بردە گوندی كلێسە، ئەو كاتەی لە نەخۆشخانەی سوورقاوشـان

بووم ماڵم لە گوندی کلێسە بوو، ئەو کاتە خێزان و منداڵم ناردبووەوە کەرکووک، ئیدی دوای نەخۆش کەوتن و چاك بوونەوەم چووم بیانهێنمەوە، نزیکەی هەفتەیەکم پێ چوو.

دوای هاتنەوەم بۆ ئێوارەکەی چوومە گوندی گەڵناغاج ئەو گوندەی برینداەکەم بۆیان چارەسەر کرد، چوومە ماڵی مەلاکە، کە چوومە ژوورەوە هەموو تووشی شۆك بوون، خێزانەکەم گوتی سەردار ئەوە چییە؟ گوتم نازانم، ئەوانیش هیچیان نەگوت، ئیدی خەڵکی گوندەکە بە گشتی هاتن بۆ ماڵی مەلا و شوێن بۆ دانیشتن نەما، پاش پشوودان، گوتم مامۆستا ئەو خێرە، ئەو پەشۆکاوییە چییە؟ گوتی ئەوە ڕووداوێکی گەورەیە بەس تۆ نایزانی، کاتێك کە تۆ لێرە ڕۆیشتووی بە شوێن منداڵەکانتدا لە دوای تۆوە هەواڵ بۆ ئێمە هات گوایە لەلایەن (ح.ش)یەوە شەهید کراوی، ئێمەش بڕوامان کردبووە، منیش گوتم ئاگام لێ نییە، گوتی لە نەخۆشخانەکە و لە گوندەکان هەموو بێتاقەتی ئەوە بووین گوایە شەهید کراوی، ئیدی مەلاکە بە گاڵتەوە گوتی ئەگەر بێت و جزداشەکی سپی لەبەر بکەیت و بچیتە گوندی عەسکەر دەڵێن ئەمە فریشتەیە هاتووە، (گوندی عەسکەر گوندێکی ئەو سنوورەیە)، مەبەستی ئەوە بوو هەموو گوندەکانی ئەو دەوروبەرە بیستبوویان کە شەهید کراوی، نەشمانزانی کێ ئەو هەواڵەی بڵاوکردووەتەوە، هەندێك خەڵکی ئەو گوندانە لە نەخۆشخانەکە پرسەیان بۆ دانابووم، ئیدی من گوتم دەچم بۆ گوندی بۆڵقامیش کە زۆرینەی شیوعی بوون، شیوعیش لەگەڵ ی.ن.ك نێوانی باش نەبوو، کەسێك لەو گوندە دوای ئەوەی بیستبووی من شەهید کراوم، پەیمانی دابوو گوتبووی: "ئەگەر ئەو هەواڵە درۆ بێت و دکتۆر سەردار ببینمەوە، ئەم مەخزەنە پلاسکۆیەی خۆمی بە دیاری پێ دەدەم" کە ئەوکات دیارییەکی بە نرخ بوو، ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارەکەی بە تراکتۆر چووم بۆ گوندی بۆڵقامیش چووم بۆ ماڵی هاوڕێیەکم لەو کاتەدا بەهۆی ڕێگاوە تووشی سەرئێشەیەکی خراپ بووبووم، هەر ئەوەندەی سڵاوم کرد، ئیدی هەموو تووشی شۆك بوون کەچی ئەوانیش بیستبوویان گوایە شەهیدبووم، گوتم دوو حەبی سەرئێشەم بدەنێ با کەمێك

بخەوم، هەڤاڵ سیروانی کوێخا نەجم گوتبووی هی ئەو خوێنپێدانەیە مردووە، هەڵەی هەڤاڵ ئاسۆیە، ئیدی لەو ماڵە پێیان گوتم تۆ چۆن هاتووی بۆ ناو ئەم هەموو ماڵە شیوعییە، منیش گوتم کەس دوژمنم نییە، ئەو ماڵەش سەر بە ڕێکخستنەکانی ی.ن.ك بوون کە چووم، ئیدی لەوێوە گەڕامەوە بۆ کڵێسە بە ڕێکەوت تووشی ئەو کوڕە بووم کە پەیمانی دابوو مەخزەنەکەم پێ بدات، لەوێ پێشکەشی کردم، ئیدی چوومە گوندی کڵێسا و لەوێ مامەوە، ئیدی هەرگیز دڵسۆزی خەڵکی خۆمان بیر ناچێتەوە، "کە ئەوە وەفایە".

دوای ساڵی ١٩٨٥ چوومە نەخۆشخانەی یاخسەمەر کە لە قەراغی گوندەکە بوو لەگەڵ د.شالاو کۆیی لەوێ دەستم بەکار کرد، ماڵی باوکی خێزانم لەوێ بوون، باوکی خێزانم لە گومرگی ئەوێ بوو، ئەو کات بارەگای هەڤاڵ مام جەلال لەوێ بوو، واتە لە کانی موراد، شەش بۆ حەوت مانگ لەوێ مامەوە، ڕووداوی سارێژکاری و پزیشکی کەم بوو چەند نەخۆشێکی هاووڵاتی سەردانی دەکردین و چارەسەرمان دەکرد، دواتر ئەوێم بەجێهێشت و هاتمەوە بۆ سنووری خۆم.

ئیدی لە ساڵی ١٩٨٦ شەڕەکانی سنووری خاڵخاڵان و هێرشی حکومەت دەستی پێ کرد هەڤاڵێك بە ناوی هەڵکەوت خەڵکی گوندی کەلهوڕی ناوچەیساڵەیی بوو، لەو کاتەدا ماڵیان هاتبووە گوندی کارێزەی بناری خاڵخاڵان، جێگری لێپرسراوی کەرتی سێ بوو، ڕۆژێك فڕۆکە هاتە سەر گوندی کارێزە، دواتر زانیمان کە هەڤاڵ هەڵکەوت هەواڵی لێ درابوو، فڕۆکەکە هەندێك سووڕایەوە، بۆردومانی نەکرد، هەرچەندە زۆر نزم بوو، هەڤاڵ هەڵکەوت چوو RBGیەکەی دەرکرد، گوتی تەقەی لێدەکەم، هەرچەندە ئاگادارمان کردەوە، بەڵام بە گوێی نەکردین، لەگەڵ ئەوەی کە برینداریش بوو، چوو هێنایی و گوللەیەکی RBGی نا بە فڕۆکەوەوە، ئێمەش لە ترسا هەر یەکە و بەلایەکدا بۆ کونێك ڕامان کرد، ئیدی فڕۆکەکە گەڕایەوە هێشتا هەڤاڵ هەڵکەوت نەگەیشتبووەوە لامان فڕۆکەکە گەیشتە سەری و تەقەی لێ کرد و بوو بە تۆز و خۆڵ ئیدی فڕۆکەکە ڕۆیشت و ئێمەش هاتینە دەرەوە، چاوەڕێ

بووین تۆزەکە بنیشێتەوە، بۆ هەڤاڵ هەڵکەوت دەگەڕاین بینیمان بە سەختی بریندار بووە و پارچە بەر ناوسك و میزەڵدانی کەوتووە، بەپەلە هێنامانە ژوورەوە و دەستم کرد بە سارێژکردنی لەناوەوە تووشی خوێنبەربوون بووبوو، نزیکەی سی بۆ چل و پێنج خولەك خەریك بووم هیچم بۆ نەکرا و لەژێر دەستمدا شەهید بوو، کە دایك و خوشك و براکانی بەدیارییەوە بوون، ئیدی خوشکەکەی دەیکێشا بە سەری مندا کە بۆ هێشتوومە بمرێت و پێیان دەگوت بۆ وادەکەی خۆ هەڵەی دکتۆر نییە، گوتم وازی لێ بهێنن لە ئازاری براکەیدایە، شەهید بوونی هەڤاڵ هەڵکەوت زۆر کاریگەری لەسەرم دانا و زۆرم پێ ناخۆش بوو، چونکە لەبەر دەستم شەهید بوو.

هەر لەو ماوەیە شەڕی خاڵخاڵان دەستی پێ کرد، بریندارمان زۆر بوو حکومەت گوندەکانی ڕووخاندبوو من لە گوندی جەلەمۆرد بووم، هەواڵم بۆ هات گوتیان محەمەدی برات برینداربووە، گوتم دەڕۆم بۆ لای بەرپرسەکان نەیاندەهێشت، چونکە لە دوای چالاکی فڕۆکە بە سەر ئەو شوێنەدا دەگەڕا، ڕاستەوخۆ لە دوای ئەو چالاکییەوە بوو کە ئەو هەواڵەم پێگەیشت، بەڵام گوێم نەدا بە مەترسییەکان و ملی ڕێگەم گرتە بەر بەناو شیو و چەم و دۆڵ و قەت پاڵدا هەتا پێم کرا بەخێرایی ڕێگاکانم قەد بڕ دەکرد، هەرچەندە فڕۆکە لەسەرمان بوو من بە ناو شیو و دۆڵە بچووکە ئاودڕەکاندا ڕام دەکرد، گوتیان لە گوندی دارەقوتەیە هەرچەندە ماوەیەکەی زۆر بوو دکتۆر هادیش لەوێ تیماری کردبوو، بەڵام هەر دڵم ئاسوودە نەبوو، چونکە من لەگەڵ ئەو برایەم زۆر نێوانمان باش بوو، هەرچەندە ئەو لە من بچووکتر بوو کەچی من لە ڕێگەی ئەوەوە بووبووم بە ڕێکخستن، ئیدی من دوای کاتژمێر و نیوێك گەیشتمە لای محەمەدی برام، بینیم دکتۆر هادی تیماری کردبوو، RBGیەك لە نزیکی تەقێنرابوو پارچەکانی بەر قۆڵێکی کەوتبوو، بۆ ڕۆژی دواتر دووبارە تیمارم کردەوە، هەر لەو کاتە و لەو شەڕەدا هەڤاڵ پێشڕەو مەلا محەمەد کانی عارەبان بریندار بووبوو، گوللە بەر قاچی کەوتبوو، بۆگەنی کردبوو، هاوین بوو گەرم بوو،

من تیمارم کرد، دواتر گواستمانەوە بۆ شوێنێکی دیکە، ئیدی لە چەمی گوندی تۆمار جگە لە محەمەدی برام و پێشڕەو مەلا محەمەد دوو بۆ سێ بریندراری دیکەم لەگەڵدا بوو، ئیدی وەڵامم بۆ دایکم نارد بێت محەمەدی برام ببینێت، کە هات بۆ لامان بۆ گوندی تۆمار، بە هەواڵی بریندار بوونی محەمەد هاتبوو بەڕێکەوت لە ماڵێک بووین محەمەدی برام کەوتبووە ئەو سەری پێشمەرگە و بریندارەکانەوە، دایکم هەر لە یەکەم پێشمەرگە و بریندارە و بە حسابی محەمەد دەستی کرد بە ماچکردنیان، یەکەمی ماچ کرد گوتی محەمەد، گوتمان ئەوە نییە، چوو دووەمی ماچ کرد، گوتمان ئەویش ئەو نییە هەتا کۆتا کەس بەو شێوەیە بەردەوام بوو، هێندە ترسا بوو لەوەی بڕوای نەکردبوو کە لە ژیاندا ماوە، بۆیە نەیدەناسییەوە، ماڵی ئێمە سێ برا پێشمەرگە بووین، دواتر یەکێکمان شەهید بوو ئەویش شەهید محەمەد بوو.

هەر لەو ساڵانەدا دەزگای تەندروستی دامەزرا لە شوێنێك کە دەکەوێتە نێوان زەڵێ و تۆژەڵە، لە شوێنێکی تەخت بینایەکیان دروست کرد و دواتر بووە نەخۆشخانە و دکتۆر شوان سەرپەرشتی دەکرد، دواتر بوو بە دەزگای تەندروستی، شایەنی باسە سێ کارمەندی تەندروستی لە ڕەگەزی مێ لەوێ کاریان دەکرد.

هەرچی نەخۆشخانەی قوڵەهەرمێیە، لە نێوان شێنێ و زەڵێدا بوو، سەرەتا ئەو شوێنە شوێنێکی بچووك بوو، هەروەها سەخت و گونجاو بوو، ناوی شوێنێك بوو لەو ناوچەیە، ڕەنگە بەهۆی بوونی داری هەرمێ وە ئەو ناوەی بەبەرداکرابێ، لە ڕاستیدا نەخۆشخانەکە کۆن بوو، کاتی خۆی سەرکردایەتی و هەڤاڵ مام جەلال لە تۆژەڵە بوون هاتبوونە ئەوێ و کردبوویان بە نەخۆشخانە، من کە چوومە ئەوێ دکتۆرێکی لێ بوو بە ناوی دکتۆر هەندرێن، نەخۆشخانەکە لە سێ بۆ چوار ژوور پێکهاتبوو، کوڕێك یارمەتی دکتۆر هەندرێنی دەدا ناوی هەژار بوو، پایز بوو من چوومە ئەوێ، ئەوکات پێشمەرگە لە دۆڵەکۆکە بوو هەڤاڵ نەوشیراون مستەفا لەوێ بوو، ماڵی چەند پێشمەرگە و ئامێرەکانی

شۆڕشیش لەوێ بوو، سروشتی دۆڵەکۆگە وابوو، دەبوو پێش وەخت زەخیرە و خواردنی زستان ئامادە بکەیت و هەڵی بگری، چونکە زستان بەهۆی زۆری بارینی بەفرەوە ڕێگاکەی دەگیرا، تەنها شوێنی پیادەی هەبوو، ڕچەڕێیەکی سەختی هەبوو، لە قەت پاڵێکی بەرزدا بوو، دەبوو شارەزا بیت ئینجا خۆت لەو ڕێگایە بدەی، چونکە شارەزا نەبوویتایە دەکەوتیتە بەفرەوە، ڕۆژێك لەو ڕێگایەمدا، بەڵام من هەرگیز بە تەنها بۆ ئەو شوێنانە نەدەچووم، هەمیشە کەسێکم لەگەڵ خۆم دەبرد، لە ڕێگادا لەناکاو پێم خزی کەوتمە چاڵێك بەفرەوە و تا سنگم بەفر هات، ئەگەر ئەو هاوڕێیەم لەگەڵ نەبووایە دەخنکام.

پازدە ڕۆژ جارێك لەگەڵ دکتۆر هەندرێن دەچووینە شوێنی یەکدی و مۆڵەتمان بە یەکدی دەدا، جارێك من لە زەڵێوە چووم بۆ ئەوێ ئەو دەهاتەوە بۆ قوڵەهەرمێ، ڕۆژێك بەفرێکی زۆر باری بوو شەهید ئازاد هەورامیی خۆی و خێزانی لە زەڵێ بوو،ماڵی خەزوورم و هاوسەرم و محەمەد و سالاری برام هەر لەوێ بوون، ئەو ڕۆژە پێیان گوتم خۆت لەو بەفرە نەدەی دەرناچی، منیش قایل بووم و نەچووم، ئیدی بۆ ڕۆژی دواتر لەگەڵ پێشمەرگەیەك چووم، کەچی بێ ئاگاداری ئێمە دکتۆر هەندرێن بە ڕێکەوتبوو بۆ قوڵەهەرمێ، کوڕێکی بەڕەوشت بوو هەروەها پابەندبوونی ئایینی زۆر بوو، کاتی بەڕێکەوتنیشی هەڵەبوو، دوای نیوەڕۆ بەڕێکەوتبوو، چونکە لەو شوێنە سەختانە دەبوو سپێدە زوو بەڕێ بکەوی، بۆ ئەوەی شەوت بە سەردا نەیەت، ئیدی هێندە خلیسکابوو، هەڵدێرابوو، تەڕ بووبوو دواجار لە شوێنێکی دەشتایی بەرفراوان ڕەق بووبووەوە، کە چەند مەترێکی مابوو بگاتە شوێنێك بریتی بوو لە ژێر شاخێك وەکو ئەشکەوت وابوو پشوومان لێدەدا، لەو باوەڕەدام گەیشتبایە ئەوێ ڕەق نەدەبووەوە، ڕۆژێك دوای ئەوە من لەگەڵ ئەو پێشمەرگەیە چووین گەیشتینە تەرمەکەی، تەرمەکەیمان بۆ نەگەڕێندرایەوە، ناچار بردمان بۆ ژێر شاخەکە، دواتر چوومە دۆڵەکۆگە ئاگاداری برادەرانمان کرد، دواتر ناشتیان.

لێرەوە ئەنفالی بە سەردا هات و بەرە و ئێران بەڕێکەوتین، لەگەڵ ماڵی خەزوورم چووین بۆ سەقز، لەوێ منداڵەکانم کردە بەر خوێندن، ئەو کات دوو منداڵم هەبوو، ئیدی خەڵك زۆر بوون کە ئاوارە بووبوون، ئیدی حکومەت خێمە و یارمەتی بە سەردا دابەش کردین، هەندێك دەستیان بە کار کرد، لە هەر شوێنێك ئاوارەی زۆر بوایە بنکەیەکمان لێ دادەمەزران، خەڵکی ئەوێ زۆر هاوکاری دەکردین، منیش لە گوندی نەلاسی سەر بە سەردەشت نەخۆشی ئەوانم چارەسەر دەکرد و دەرمانم بۆ دەنووسین، لێرەدا چیرۆکێکم بیر دێتەوە: ڕۆژێك ژنێکی ئێرانی هات بۆ لام گوتی من نەخۆشم، تەواوی تەبریز و مەهاباد و تارانم کردووە، چارەسەرم نەبووە، ناوی تۆیان پێ دام، بۆیە هاتووم چارەسەرم بکەیت، گوتم خۆ من پسپۆریم نییە، گوتی نازانم، بەڵام ناونیشانی تۆیان پێ داوم، -بە باوەڕی من ئەوە گرنگە نەخۆش بڕوای بە توانای پزیشك هەبێت، چونکە ڕاستەوخۆ لایەنی دەروونی پێ ئاسوودە دەبێت- ئیدی بە پێی زانینی خۆم چەند ڕۆژێك چارەسەرم بۆ دانا، پاشان ڕۆیشت و پاش مانگێك هاتەوە بینیم مەنجەڵێك ماست و پەنیری بۆ هێناوم، گوتم ئەوە چییە؟ گوتی لەو کاتەی دەرمانەکانی تۆ بەکاردەهێنم هیچ نەخۆشییەکم نەماوە، من هەرچەندە پزیشکی فەرمی نەبووم، بەڵام ئەزموونێکی زۆرم هەبوو، ئیدی تا کۆتایی ساڵی ١٩٨٩ ئەوها ژیانم بردەسەر، ئیدی براکەم نەخۆش کەوت و بردمە تاران تووشی شێرپەنجەی خوێن بووبوو، هەرچەندە چارەسەری وەرگرت دواتر لە ڕێگەی پاکستانەوە نێردرا بۆ بەریتانیا، منیش مامەوە تا مانگی هەشتی ١٩٩١ گەیشتمەوە سلێمانی.

هەرچی پەیوەندی بە دەرمانەوە هەیە، ئێمە وەك پزیشکان ئەو دەرمانەی کە بۆ نەخۆشخانەی ناوەندی بەرگەڵوو دەهات بەشی نەدەکردین، خەڵکی ناوچەکە زۆر یارمەتییان دەداین، لە ناو شارەوە لە ڕێگەی ڕێکخستنەوە بۆمان دەهات.

هەرچی پەیوەندی بە منەوە هەیە هەڤاڵ محەمەد سەقەر زۆر هاوکاری دەکرین، لەگەڵ شەهید ئاسۆی پێشمەرگە کە پێیان دەگوت ئاسۆ کوێر، بەداخەوە لە ئەنفالەکە بێ

سەر و شوێن کرا، کە کوڕێکی قارەمان و دڵسۆزی گەلەکەی بوو، لەگەڵ پێشمەرگەیەکی دیکە کە پێیان دەگوت محەمەد فەڕەنسی، ئیدی کاری من هەر ئەمە بووە، هەندێك جاریش ڕێنمایی خەڵکیم دەکرد وەك کاری کۆمەڵایەتی و یارمەتیدانی هاووڵاتیان بە گشتی.

ئیدی لە دوای ساڵی ١٩٩١ەوە یەکەمجار لە کۆمەڵەی فریاکەوتن کارم کرد، دواتر چوومەتە قیادەی کەرکووك کە ئەوکات لە بەکرەجۆ بووە، دواتر بە فەرمانی هەڤاڵ عوسمانی حاجی مەحموود کە فەرماندەی ئەوێ بوو بۆ ڕاییکردنی کاروباری پێشمەرگە و پۆلیس و ئاسایش و ڕەوشی تەندروستی زوورێکیان پێ داین، ئەمە وەك یەکەم نەخۆشخانەی شۆڕش کرایەوە، من و برادەرێکی سەر بە پ.د.ك کارمان تێدا دەکرد، دواتر ماوەیەك لە نەخۆشخانەی زەڕایەن کارم کردووە.

لە کۆتاییدا هیچ پلە و پۆستێکم وەرنەگرتووە کە شایەنی باس بێت، دواتر ڕێگەی هەندەرانم گرتەبەر و ئێستا لە وڵاتی ئەڵمانیا دەژیم[٢٩].

---

[٢٩]- چاوپێکەوتن لەگەڵ: سەردار عەبدولقادر ئەحمەد عەلی (د. سەردار)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٢/٢٧.

## سەرکەوت محەممەد زەکی (سەرکەوت زەکی)

لە ساڵی ١٩٦٣ لە دایکبووە، قۆناغەکانی خوێندنی لە شاری سلێمانی و پەیمانگای تەکنیکی لە شاری موسڵ تەواوکردووە. لە ساڵی ١٩٨١ پەیوەندی بە ڕێکخراوی سلێمانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان کردووە، لە ساڵی ١٩٨٥ لە سنووری مەڵبەندی یەکی ی.ن.ك بووە بە پێشمەرگە.

مەڵبەند لەهەر کوێ بووبێت نەخۆشخانەش لەوێ بوونی هەبووە. سەرەتا لە شارباژێر دواتر لە سێوسێنان و بەلەکجار، بەڵام نەخۆشخانەی بەلەکجار لە هەموو ڕوویەکەوە بە پێوەری ئەو سەردەمە نەخۆشخانەیەکی تەواو و ڕێکخراو بووە، لە ڕووی ستاف و شوێن و بیناوە پێشکەوتووتر بووە. لەگەڵ ئەوەی بەرنامە هەبووە بۆ شوێنی باشتری وەك قۆپی قەرەداغ بگوازرێتەوە، بەڵام بەهۆی شاڵاوەکانی ئەنفالەوە بەرنامەکە جێبەجێ نەکرا، لە دوایدا نەخۆشخانەکە بووە شوێنێکی ئارام بوو بۆ پێشمەرگە و هاوڵاتیان. بەهۆی هەبوونی تەختەی خەواندنی نەخۆش جاری وا هەبووە سەروو ٢٠ بریندار لەوێ ماونەتەوە، کە بریندارەکان لە سنوورەکانی شارەزوور و گەرمیان و قەرەداغەوە دەهاتن. لەو سەردەمەدا نەخۆشخانەکە چەند پزیشکێکی لێ بووە، ئەوانیش: د. فائق گوڵپی وەك بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە، د. جەلال عوسمان، د. ناسیح فاتیح، د. ناجیح (سەربەست) و د. مەحمود، لەگەڵ پۆلێك هەڤاڵ لە کادیری پزیشکی لەوانە هەڤاڵان: بۆتان، جوتیار، شوان و ئیبراهیم، چەندین هەڤاڵی دیکەش کە بەردەوام دەهاتن و دەڕۆیشتن بۆ تیپەکانی پێشمەرگەی ئەو سنوورە، هاوشانی تیمێکی کارگێڕی کە نەخۆشخانەکەیان بەڕێوە دەبرد.

لە نەخۆشخانەکە ئامێری تیشك هەبوو، هەموو ستافەکە پێکەوە کاریان پێدەکرد، لەو سەردەمەدا هەڤاڵ مەحمود کە لە گوندی دێلێژە دادەنیشت، خولێکی خێرای بۆ فێربوونی بەکارهێنانی تیشك کردەوە، هەروەها تاقیگەشی لێ بوو. نەشتەرگەری خێرا و هەمەجۆر لە نەخۆشخانەکە ئەنجام دەدرا. دەستخستنی دەرمان لەو سەردەم و قۆناغەدا کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵام بەگشتی سێ سەرچاوە هەبوو ئەوانش:

یەکەم: ڕێکخستنە پتەو و پۆڵاییەکان بوو کە لە ڕێکخراوی شارەکانەوە کە لە (کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان) پێکهاتبوو هەرچییەکیان دەست بکەوتایە کۆیان دەکردەوە و دەیان نارد.

دووەم: هەندێك لە پێداویستییەکانی دیکە لەلایەن دۆستەکانەوە کە لە ڕێگەی پەیوەندی کەسییەوە پەیدا دەکرا.

سێیەم: لە بودجەی مەڵبەند و نەخۆشخانەکان هەندێك دەرمان دابیندەکرا، سەرکردایەتی (ی.ن.ك) و مەڵبەندەکان بۆ ئەو مەبەستە زۆر دەستکراوە بوون، هەرچی پێداویستی پێشمەرگە و بریندار هەیە بە هەر ڕێگەیەك بووایە پەیدایان دەکرد، بۆ نموونە مەفرەزەی پێشمەرگە هەبوو بۆ چەند دەبەیەك دیتۆڵ نارەحەتی زۆریان بینیوە.

نموونەی بینرەوای زۆر هەیە کە باسبکرێت، لە ئەنفالەکاندا لە گوندی (زەردەلیکاو) بە سەرپەرشتی د. فایق بە مشار قاچی نەخۆشێك بڕایەوە، هەڤاڵەکانمان پێش ئەوەی کادیری پزیشکی بووبن، پێشمەرگە بوون، هەر بۆیە هەمیشە لە جووڵەی بەردەوامدا بوون، خۆمان و تفەنگێك و کۆڵەپشتەکان هەمیشە ئامادە بوون.

کاری ئاسایی ستافەکە بریتی بوو لە پێشوازیکردن لە نەخۆش و بریندار بە بێ جیاوازی پێشمەرگە بووبێت یاخود هاوڵاتی، جا لە شەڕ یاخود لە کیمیاباران بریندار بووبێت. بۆ نموونە ڕۆژێك منداڵێکی خەڵکی گوندی تەکیەی قەرەداغ بریندار بووبوو، هێنایان بۆ نەخۆشخانەکە هەر کات نەخۆش لای خۆمان چارەسەر نەکرایە هەوڵمان دەدا بیگەیەنینە نزیکترین شوێن بۆ چارەسەرکردنی، بۆ ئەو نەخۆشخانەیەی کە دڵنیا دەبووین لە دۆخی گواستنەوەیان مەترسی ناکەوێتە سەر ژیانیان، هەر بۆیە کاتێك منداڵەکەیان هێنا دۆخی باش نەبوو و شەو بوو، ئەوەی لەسەر ئێمە بوو بۆمان ئەنجامدا، بەڵام لە دوایدا ناچار بووین بڕیاری گواستنەوەی بدەین و دەبوو یەکێك لە ستاف خۆمان لەگەڵی بچێت، ئەو شەوە من لەگەڵ ئەو منداڵە نەخۆشەدا چووم و هەرچی پێویست بووایە لە ڕێگادا بۆم ئەنجام دەدا، تا گەیەندرایە نزیك ئۆردوگای نەسر، لەوێ کەسوکاریم ئاگادار کردەوە کە بیبەن بۆ نەخۆشخانەی سلێمانی، ئیدی ستاف ئێمە بۆی هەبوو تا ڕێگا سەرەکییەکان بچین لەگەڵ نەخۆشدا، ئەو ڕێگایەی کە لەئەدەبیاتی شۆڕشدا پێی دەگووترا (ڕێگای قیر)، واتە بۆ پێشمەرگە قەدەغە بوو .

نمونەیەکی تر، پێشمەرگەیەکی تیپی ٥٩ی حەمرین بەناوی هەڤاڵ سەمەد کە خەڵکی چوارباخ سلێمانی بوو، لە یەکێك لە چالاکییەکانی تیپەکەیدا بریندار بووبوو، هێنایان بۆ

نەخۆشخانەکە دۆخی باش نەبوو زیان بەر گەدە و ڕیخۆڵەی کەوتبوو، هەر بۆیە شەو بە بەشداری د. فائق، د. جەلال، د. ناسیح، د، جووتیار و بەندە، نەشتەرگەری بۆ ئەنجامدرا، بەڵام پاش ئەوەی کە لە مردن ڕزگارکرا پێویستی بەوە هەبوو ببرێتە نەخۆشخانەیەکی باشتر بۆ چارەسەر. هەر بۆیە بڕیاردرا ببرێتە نەخۆشخانەی مەڵبەندی دوو لە بەرگەڵوو واتە سەرکردایەتی، بە هەمان شێوە من لەگەڵیدا چووم، بەرەو قەرەداغ کەوتینە ڕێ، لە قەرەداغ بۆ پشوو و چا خواردنێك وەستاین، لەوێ هاوڕێیەکی خۆم بینی کە پێشتر پێکەوە لە ڕێکخراوی سلێمانی کاری ڕێکخستنمان کردبوو، ئەویش فائق محەمەد ئەمین (هاوڕێ سۆران) کادیری پزیشکی بوو، پەیمانگای تەواو کردبوو لە تیپی ٥٧ی سەگرمە پێشمەرگە بوو. گووتی چی دەکەیت؟ گووتم ئەو برینداره‌م پێیە و دەیبەین بۆ سەرکردایەتی دێیت لەگەڵمان؟ ڕاستەوخۆ دەستی دایە چەك و تاقم و تفەنگ و کەتینە ڕێ، بە ئۆتۆمبێلێکی فریاکەوتن تا نزیك دێلێژە بردمان، ئەو ئۆتۆمبێلە تایبەت بوو بە نەخۆشخانەکەی شارۆچکەی قەرەداغ، دەستمان بەسەرداگرتبوو لە ناوچە ئازاد کراوەکان بۆ نەخۆش و بریندار بەکارمان دەهێنا، ئیدی ئۆتۆمبێلەکە گەڕایەوە هەروەها پێشمەرگەیەکی تیپی (٥٩)مان لەگەڵدا بوو، بە نەخۆشەکەوە بووین بە چوار کەس، هەرچەندە ئەو کارە بۆ ئێمە ئەستەم بوو بەڵام هێزی پشتگیری گوندەکان یارمەتیان دەدایـن. لە دوایدا گەیشتینە گوندەکانی حاجیاوا و زایەر، لەوێدا شەوێك ماینەوە و دواتر پەڕینەوە بۆ زێوی کە یەکێك بوو لە ناخۆشترین قۆناغەکانی بۆ پەڕینەوەی نەخۆشەکە، چونکە برینداره‌کە چەندین سۆندەی پێوەبوو بۆیە دەبوو پاڵکەوێت، بەڵام لە زێوێ بە ڕێکەوت تووشی پۆلێك لە پێشمەرگە بووین، ئەوانیش بەرەو سەرکردایەتی دەچوون. لەگەڵ ئەوەی لە ڕاستیدا سەرکەوتن بە قەدپاڵی پیرەمەگرووندا بە دەستی بەتاڵیش ئەستەم و دژوارە، چونکە هەندێك شوێنی شاخەکە مرۆڤ بە چنگەکرێش بە ئەستەم دەتوانێت سەربکەوێت، چ جای ئەوەی تاقم و تفەنگی پێبێت و لەگەڵ ئەوەشدا نەخۆشێکی برینداری سەختیشت پێبێت کە دۆخی لەوپەڕی خراپیدا بێت و کۆمەڵێك شتی پێوە بەسترابێت. وەك ئاشکرایە قەد پاڵی پیرەمەگروون بۆ سەختی بە نموونە دەهێندرێتەوە، ڕێگاکەشی بۆ پشوو گوونجاو نەبوو، دەبوو بە بەردەوام ڕێ بکەین. بۆیە دوای لە بارەگای تیپی (٢٣)ی سورداش لە زوێوێ

کاری پێویستمان بۆ ئەنجام دا. بە بەردەوام لەو ڕێگا سەخت و ناخۆشەدا نەخۆشەکەمان لەسەر شان بوو، بە بەردەوامی چوار بۆ شەش پێشمەرگە لەژێر نەقالەکەیدا بوو، هەتا گەیەنرایە بارەگای تیپی (٤٧)ی پیرەمەگروون، لەوێوە بە تراکتۆر گەیاندمانە نەخۆشخانەکەی مەڵبەندی دوو، لەوێ د. شوان و چەند هەڤاڵێکی دیکەی لێ بوو، ئیدی ڕاپۆرتی پزیشکی بریندارەکەمان پێ دان، بۆ شەوێك لەوێ ماینەوە، دواتر چووینە سکرتاریەتی هەڤاڵ مام جەلال و نامەیەکمان پێدا کە دکتۆر فائق بۆی نووسی بوو، شەوێکیش لەوێ بووین، ، کە بە گشتی سێ ڕۆژمان پێ چوو، ئید بۆ بەلەکجاڕ گەڕاینەوە.

لە ساڵی ١٩٨٧ حکومەتی عێراقی بە چەکی کیمیایی بۆردومانی کردین، گازەکەی (خەردەل و سیانید) بوو، گوندەکانی بەلەکجاڕ و تەکیە بەرکەوتن، بەڵام بەهۆی ئەوەی کاتی خۆی لە سەرکردایەتی خولمان بینی بوو، خۆمان پاراست و بەرنەکەوتین، چونکە ئەگەر بۆمبەکە دەنگی گەورەی لە تەقینەوەی دروست نەکردایە گومانمان لە بۆمبی کیمیایی دەکرد، لەوێ بۆمبێك لە دۆڵێکی خوار ئێمەی دابوو، کە لێی نزیك بووینەوە دەرکەوت چەکی کیمیاییە، زۆر نزیك نەکەوتینەوە، ماسکمان بەست و دوورکەوتینەوە، هێندەی نەبرد بۆمان ڕوون بووەوە بە دەیان پێشمەرگەی ئەو سەردەمەی (حیزبی دەعوە و جووڵانەوەی کاری ئیسلامی) کە نزیکەی ١٠٠ کەس دەبوون، بەر چەکی کیمیایی کەوتبوون، دۆخی دوو کەسیان زۆر خراپ بوو، بە گشتی گازەکە کاریگەری لەسەر بیلبیلەکانی چاو دەکات، پێست تووشی بڵقی گەورە دەکات، تەنگەنەفەسی دروست دەکات، ئێمە بەپێی توانای خۆمان بەپێی ئەو دەرمانانەی لەبەردەستمان بوو چارەسەرمان بۆ کردن، لەوانە پاککردنەوەیان بە دیتۆڵ و تەقاندنی بڵقەکانیان و دەرهێنانی ئەو ئاوەی لە پێستیان دروست بووبوو، لەگەڵ گۆڕینی جلوبەرگەکانیان و بەکارهێنانی ئەمپولی ئەترۆپین، بەڵام لە ئەنجامدا ئێمەش بە کاریگەری بریندارەکان بەرکەوتین، کە بریتی بووین لە بەندە و هەڤاڵان: د. ناسیح، شوان، جووتیار و ئیبراهیم، بۆ ئەو شەوە هەستمان کرد کە هەستی بینینمان کەم بوویەوە و گوتمان کارەباکە تەواو نییە، ئەوانەی کە بەشداری چارەسەرەکەیان نەکردبوو، گوتیان تەواوە، ئێمەش بیرمان چووبووەوە کە ئەو گازەی لەسەر جلوبەرگی بریندارەکان بووە و دامان کەندووە و بۆمان شۆردوون لە ماوەی ئەو چوار بۆ

پێنج کاتژمێرەی لەگەڵیان بووین کاریگەری لەسەر ئێمەش دروست کردووە، بەڵام چارەسەرکردنمان پێویست نەبوو، چونکە بەدەستخستنی دەرمان هێندە ئەستەم بووبوو، دەستمان پێوەگرت و هیچمان بەکارنەهێنا.

هەڤاڵێکمان هەبوو بە ناوی عەتای حاجی ئەحمەد، کە لە موسڵ لە سێدارە دراو شەهید بوو، یەکێك بوو لە پێشمەرگە هەرە ئازاکانی چالاکی ناوشار، لە تیپی تایبەتی مەڵبەند پێشمەرگە بوو، ڕۆژێك لە زرگوێز بووین هات بۆ لامان، لەوێ بەیەك ئاشنا بووین، هەر لەو کاتەوە بووین بە هاوڕێ و بەردەوام سەردانی دەکردین، ئێوارەیەك لە نزیك نەخۆشخانەکەی مەڵبەند پیاسەمان دەکرد، چەند کەسێك بووین، هەڤاڵ عەتا پیاوێك بوو سەرکێشی سەرسوڕهێنەری دەکرد، بەبێ ئەوەی پێمان بڵێ بەمەبەستی ئەنجامدانی چالاکی نیازی گەڕانەوەی ناو شاری سلێمانی هەیە، پێ گوتم حەزت لە چییە؟ پرسیارێکی سەیر بوو بە لامەوە، گوتم ئەگەر من و تۆ ئێستا لە سلێمانی بووینایە پێکەوە دەچووین (لوقمەقازی دانا)مان دەخوارد، ئیدی من بەمەبەستی جەولەیەکی کورتی سێ بۆ چوار ڕۆژەی کاری ڕێکخراوەیی چوومە گوندەکانی چواردەوری نەخۆشخانەکە، کە گەڕامەوە هەڤاڵان هەموو بە پێکەنینەوە هاتن بۆ لام، گوتم چییە؟ گوتیان کاتێك تۆ ڕۆیشتووی بۆ جەولە هەڤاڵ عەتا لێرە بووە هاتووە بۆ لات و ڕۆیشتووە، گوتم پێمخۆشە خۆزگە ڕێگەتان نەدایە بڕۆیشتایە تا شەو پێکەوە بووینایە ـ چونکە پیاوێك بوو دانیشتنیشی زۆر خۆش بوو ـ گوتیان واز لەوە بهێنە شتێکی زۆر خۆشی بۆ هێناوی، گوتم چییە؟ گوتیان (لوقمەقازی دانا) و شیرینی هەورامانی لە سلێمانییەوە بۆ هێناوی، کە بەڕاستی ئەوە سەرکێشی بوو لەو کاتەدا.

شەوێك نەخۆشێکمان لابوو کە پیاوێکی زۆر بەهیمەت بوو ناوی هەڤاڵ حەمەی تەلە (شەهید شاهۆ) بوو، کە یەکێك بوو لە پێشمەرگە سەرەتاییەکانی هەرێمی پێنج و ناوچەی قەرەداغ، ئەو شەوە سەری ساڵ بوو، ویستمان کەشێکی شارییانە دروست بکەین، واتە ١٩٨٨/١/١، بیر لەوە کرایەوە چی بکەین تا ببێت بە یادگاری، هەڤاڵ شاهۆ گوێی لە قسەوباسەکانی ئێمە بوو، بۆ ئێوارەکەی هەڤاڵ شاهۆ قەلێکی بە زیندوویی بۆ ناردین، بۆ خواردنی ئەو شەوە، لەگەڵ هەڤاڵێك چووینە سێوسێنان لە ماڵی هەڤاڵ نەوزادی برای

شەهید عەتا، کەماڵەکەی لەوێ بوو، چەندین پێداویستی دیکەمان هێنا، ئیدی شەوی سەری ساڵمان دوور لە شەڕ و لە کەشێکی خۆشدا بەسەربرد و بوو بە یادگاری.

لە شەڕی بورجەکەی دارە ڕەش، دەیان پێشمەرگەمان شەهید و برینداربوون یەکێك لەوانە هەڤاڵ سالار عەبدوڵڵا بریندار بوو، کە برایەکیشی بە ناوی سەردار عەبدوڵڵا هەر پێشمەرگە بوو، لە نەخۆشخانەکە بەداخەوە بەهۆی خوێن لێ ڕۆشتنی زۆرەوە شەهید بوو. لە کاتی ئەنفالیشدا شەوێك گوندی سێوسێنان بە چەکی کیمیایی بۆردومان کرا، من چەند شەوێك بوو مۆڵەتم وەرگرتبوو بە سەردانی چوو بوومە ماڵی چەند دۆست و خزمێك، کە ساڵێك زیاتر بوو کەسوکارم نەبینی بوو، بۆیە بە هەلم زانی چوومە گوندی دەرەویانی خواروو و ماڵی حەسەنی مام شەریف، خەڵکی ئەو گوندە بەوە ناسرا بوون زۆر تێکۆشەر بوون بەوە ناسرابوون لایەنگری بیروباوەڕەکانی (ی.ن.ك) و کۆمەڵە بوون، پێشمەرگەی ئازای وەکو (شەهید هەژار و قارەمانی زیندانی وەك شەهید فائق ئەمین)یان هەبوو، لەوێ هەوڵم دەدا لەو گوندە باوکم ببینم، ئەوکاتە سەروبەندی ئەنفال بوو، هەواڵ بە ئاسانی نەدەگەیشت، هەڤاڵ حەسەن هات بۆ لام و گوتی واز لە بینینی باوکت بهێنە، حکومەت هێرشی ئەنفالی دەست پێکردووە ئێستا د. فائقم بینیوە، دەڵێت بە کیمیایی هێرش کراوەتە سەر سێوسێنان نزیکەی ٧٠ کەس شەهید بوون، چەندین پێشمەرگەمان شەهید بووبوون، – سێوسێنان شادەماری ژیانمان بوو، بۆ ئێمە وەکو شارێك وابوو، چونکە هەموو پێداویستییەکانمان لەوێ دەست دەکەوت، وەکو: دوکان، سەرتاشخانە، چێشتخانە، چایخانە، بەرگدروو...هتد، نزیکەی ١٥٠- ٢٠٠ ماڵێکی لێ بوون، هەروەها بارەگای تیپی ١٧ی زمناکۆ لەوێ بوو، هەڤاڵ جەمیل هەورامیی سەرتیپی بوو، پێشتر بارەگای نەخۆشخانەکەی مەڵبەندیش هەر لەوێ بوو، بۆ هەر پێویستییەك ڕوومان لەوێ دەکرد، کە گوترا بۆردومان کراوە – بۆ ئێمە کارێکی زۆر ئەستەم بوو، هەرچەندە من لەوێ نەبووم، بەڵام لەگەڵ هەواڵەکەدا تیمێکی پزیشکی نەخۆشخانەکەی ئێمە بەهانایانەوە چوو بوون، پێش گەیشتنی تیمەکە بە تراکتۆر بریندارەکان تا چەمی دێوانە هێنرابوون، تیمەکەش وەریان گرتبوون و گەڕابوونەوە بۆ نەخۆشخانەکە، لە سێوسێنان ماڵی کاك حەسەنی هاوڕێم و هەڤاڵ عوبێد کە بەرگدروو بوو، لە ڕێکخستنەکاندا بوو، پیاوێکی خوێندەوار بوو هاوکات هۆزانڤان بوو،

لەو بۆردومانە هاوسەر و منداڵەكانیان شەهید بووبوون، ئیدی لە نەخۆشخانەكە ئەوەی پێویست بوو بێت بۆیان كرابوو، هەندێك لە خەڵكی گوندەكانی كۆشك و ئەستێل هاتبوون شەهیدەكانیان بردبوو لە گوندەكانی دیكە ناشتبوویانن.

من گەڕامەوە نەخۆشخانەكە و بۆ شەوی دواتر لە سەربازگەی دوودارەوە بارەگاكانی مەڵبەند بۆردومان كرا، ئێمەش جگە لە چارسەری بریندارەكان ناچار بووین زۆربەری كات لە دەرەوە بین، كە ڕاجیمەكانمان بینی، هەستمان كرد كیمیاییە، دەنگی تەقینەوەكەی گەورە نەبوو، ئیدی بارەگاكان و گوندەكانی تەكیە و بەلەكجاڕ و بەردێ بۆردومان كران، بۆ ئێوارە هەڤاڵ هۆشیار كە عەدەد جیهازی تیپی ١٧ی زمناكۆ بوو، لێمانەوە نزیك بوو هات بۆ لامان، پێكەوە دانیشتین، داوامان لێ كرد نەگەڕێتەوە، بەڵام بەهۆی ئەوەی ئەو عەدەد جیهاز بوو دەبوو هەموو سەری كاتژمێرێك هەڵوێست وەربگرێت، كاتێكیش بۆردوومانەكە تەواو بوو، دوو كەس و سێ كەس بە سەر بارەگاكاندا دابەش بووین، بۆ ئەوەی سۆراغی هەڤاڵانمان بكەین و یارمەتیان بدەین، هاوكات نەماندەتوانی لایت بەكارهێنین، ناچار هەر بەتاریكی دەگەڕاین و بە بانگكردن ئاگادارمان دەكردنەوە، من و هەڤاڵان جووتیار و بۆتان ڕووە و بارەگای تیپی ١٧ ڕۆیشتین، ویستمان هەواڵی هەڤاڵ هۆشیاری جیهاز بزانین كە بە تەنها لە ژووری ئامێرە بێ تەلەكەی مابووەوە، زۆر بۆی گەڕاین نەدۆزرایەوە، وامانزانی چووەتە شوێنێكی دیكە. بۆ سپێدە كاتژمێر چواری بەیانی لەگەڵ هەڤاڵ جووتیار دووبارە دەستمان كردەوە بە گەڕان بە دوایدا، لە پڕ تەرمەكەیمان بینی كە دیار بوو مووشەكێك دابووی لە بەردەم ژوورەكەی، ئەویش كە هاتبووە دەرەوە بە ناو دووكەڵی چڕی كیمیاییەكەدا ڕۆیشتبوو، بۆیە چەند مەترێك لە نزیكی ژوورەكەی شەهیدی كردبوو، لەو نزیكانە ساترێكی خۆڵی هەڵدراوە هەبوو، بۆ ئەوەی لاشەكەی بەدەرەوە نەبێت لەگەڵ هەڤاڵ جووتیار هەر بە جلوبەرگەكەی خۆیەوە ناشتمان.

دەمەوێت ئەوە بڵێم چەكی كیمیایی زۆر مەترسیدار بوو، ئەوەی لێی نزیك بووایە بێگومان شەهیدی دەكرد، وەك ماڵەكانی سێوسێنان و هەڤاڵ هۆشیار، بۆیە دەكەوتە سەر ئەوەی چەندە ئەو گازە هەڵدەمژی، لەگەڵ ئەوەی چەندە بەر پێست و چاو دەكەوێت، بۆ نموونە ماڵی كاك مەهدی لە سێوسێنان هەموو بنەماڵەكەیان شەهید بوون، جگە لە یەك

کوڕیان نەبێت کە بەهۆی پێشمەرگایەتییەوە لە گوند نەبوو، کوڕێکی دیکەشیان پێشتر لە موسڵ لە سێدارە درابوو، بە گشتی لە سێوسێنان ٦٨ هاووڵاتی و دوو پێشمەرگە شەهید بوون.

کاری ئێمە تایبەت بوو بە نەخۆشخانەی مەڵبەند، هەرچی تیپەکانە کادیری تەندروستی خۆی هەبوو، یان تیمێکی هەبوو، ئیدی (یەك ، دوو، یان سێ) کەس دەبوون، بۆ نموونە لە تیپی ٥٥ی قەرەداغ هەڤاڵ سەلام حەمەکەریم (سەفین) و هەڤاڵ عوسمانی لێ بوو، کە کادیری تەندروستی بوون، ئەگەر چالاکییەکە لەسەر ئاستی مەڵبەند بووایە و گەورە بووایە، بۆ نموونە ئازادکردنی قەرەداغ و پاککردنەوەی شاخی گڵەزەردە، تیمێکی پزیشکی گەورەتر ئامادە دەکرا، لە چالاکی تیپەکانیشدا ئەگەر بریندار هەبووایە و برینەکەی سەخت بووایە دەهێنرا بۆ نەخۆشخانەکەی مەڵبەند.

لە ئەنفالدا ئێمە تووشی شکست بووین و بۆیە ناوچەی قەرەداغمان جێهێشت، سنووری مەڵبەند کرا بە سێ ڕەتڵ ئەو ڕەتڵەی ئێمە هەڤاڵ شێخ جەعفەر فەرماندەی بوو، ئێمە لە ڕێگایەکی دوورترەوە بە گوندەکانی خاوێ و مێولێ و قازانقایەوە هاتینە نزیکی باسەرە لەوێوە بە ئاراستەی ڕۆژهەڵات گەڕاینەوە گوندەکانی نزیکی سەنگاو.

لە نزیك گوندی هاڵدەرە هێزەکەی ئێمە تووشی شەڕ بووین، لە ئەنجامدا دوو پێشمەرگەمان برینداربوو، یەك لەوانە هەڤاڵ ڕەئووف غریب بوو، هەروەها هەڤاڵ بەختیار بەهەڵە کەوتبووە ناو کەمینی جاشەکانەوە و بەدیلی گیرابوو، دواتر لە گوندێکی نزیکی سەنگاو لاماندا، دیار بوو ئەنفال لە هەموو لایەکەوە دەستی پێکردبوو، و هێزی حکومەتی عێراقی بە فڕۆکە دەسووڕایەوە، پێشمەرگەیەکی ئێمە خۆی ڕادەست کردبووەوە، ئیدی شوێنەکە لە ڕووی ئاسایشییەوە مەترسی کەوتەسەر، سەرەڕای هەموو ئەو ماندوویێتییە بەرەو باسەرە جارێکی تر گەڕاینەوە و کەوتینە ڕێ.

ئەو ساڵە ساڵێکی زۆر باراناوی بوو، لە ئاوی باسەرە بۆ ئەوەی ئاو نەمانبات پێشمەرگەکان هەموو بەڕیز دەستی یەکتریمان گرتبوو، دواتر بەرەوە ناوچەکانی چەمچەماڵ و تەکیە و شوان کەوتینە ڕێ، واتە کۆتایی مانگی چوار و سەرەتای مانگی پێنج بوو لە تەکیەی کاکەمەند پەڕینەوە و گەیشتینە گوندی چیاسەوز و شەوێك ماینەوە .

گەیشتینە گوندەکانی تەکەڵتوو و موخەڕەس و جارێکی دیکە تووشی شەڕ بووینەوە، لەوێ ١١ پێشمەرگەمان شەهید بوون، بۆ ئەو شەڕانە RBG و BKC دوو چەکی کاریگەر بوون، ئێمە سێ گوللەی RBG مان پێ بوو، لە شەڕەکەشدا BKC یەکە وەستابوو، بۆیە زیانێکی گەورەمان بەرکەوت، هەلیکۆپتەر لە سەنگەرەکانمان زۆر نزیک بووبوونەوە، شەهیدەکانیان بردبوو، دوو لە تەرمەکانیشیان فڕێدابووە خوارەوە، یەکێك لە شەهیدەکان پێشمەرگەیەك بوو بە ناوی هۆشیار کە شەهید بوو تازە بووبوو بە پێشمەرگە و تەنانەت نەتوانرا کەسوکاری بدۆزرێتەوە تا تەرمەکەیان پێ بدەنەوە، یەکێکی تر لەو شەهیدانە برای شەهید مەلا ئەحمەدی دسکەرە بوو، لە بەرزاییەکانی پشتی تەکەڵتوو ئەو شەڕە ڕوویدا، دواتر پاشەکشەمان کرد.

ئەو هێزە ئیسلامییە نەیارانەی حکومەتیش کە لەگەڵمان بوون لەبەر نەشارەزاییان لە پشتی شەڕەوە دەمانەوە، ئەوان بە دۆڵێکدا پاشەکشەیان کردبوو فڕۆکە لێی دابوون بە دەیانیان لێ شەهید کردبوون، چونکە بەرگرییان نەکردبوو، لە کاتێکدا چەکی زۆر باشیان پێ بوو، هەروەها بریندارییان زۆر بوو.

دواتر چووینە شوێنیکی دیکە و لە خواری ئێمەوە پێشمەرگەکانی تیپی ٥٥ تووشی شەڕ بووبوون، برینداریکیان هەبوو، بۆیان هێنایین لە ژێر تاشەبەردێکدا چارەسەرمان بۆ کرد، بەڵام بەداخەوە چەند کاتژمێرێك دواتر شەهید بوو، بۆ ڕۆژی دواتر بە شاخی هەیبە سوڵتاندا بۆ سنووری مەڵبەندی سێ و دواتر بە بناری قەندیل و دۆڵی و باڵەیان پەڕینەوە.

چیرۆکەکانی پێشمەرگایەتی ئەفسانەیی و بێ کۆتایی و درێژن و ڕۆڵەکانی ئەم گەلە بەم شێوەیە خەباتیان بۆ ئازادی کردووە.[٣٠].

---

[٣٠]– چاوپێکەوتن لەگەڵ: سەرکەوت محەمەد زەکی (د. سەرکەوت زەکی)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٥/٥.

# سەعدوون ڕۆستەم عەبدوڵڵا سەعدوون (د.ئارام)

لە ساڵی ١٩٦١ لە گوندی کاریتانی سەر بە شارەدێی دیبەگەی ناوچەی کەندیناوای پارێزگای هەولێر لەدایك بووم، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییم لەوێ تەواو کردووە، من بە ناوی باپیرە گەورەم ناونراوم، ئەو پیاوێکی ئایینی و سۆفی ناوچەی کەندیناوا بووە، ناوچەی کەندیناوا و قەراج ئەو ناوچەیەن کە لەگەڵ ناوچە عەرەبییەکاندا سنوورن، نزیکەی ٢٠کم لە خوارووی مەخمورەوە دەبێتە سنووری کورد و عەرەب، لە کۆنەوە گۆڕەپانی ململانێی کورد و عەرەب بووە، چونکە عەرەب ویستوویانە داگیری بکەن، باوك و باپیرانی ئێمەش نەیانهێشتووە، بۆیە ئێمە لە ناوچەیەکی هەوکراو بە کێشە و ناکۆکی لەدایك بووین.

لە ساڵی ١٩٣٤ کە بیری شیوعییەت هاتووەتە عێراق و کوردستان خێزانەکەی ئێمە بەهۆی کێشە چینایەتییەکان و ململانێیان لەگەڵ ئاغا و دەوروبەری دزەییدا کە ئاغا بوون زیاتر بەلای بیری چەپدا ڕۆیشتوون، مامم کادیرێکی شیوعی بووە، دواتر چووەتە ڕیزەکانی (پ.د.ك)ەوە، بەجۆرێك ڕێکخستنی بردووەتە ناو شارەدێی دیبەگە، بۆ وێنە جارێك پێشمەرگە هاتبوونە خوارەوە BKCیەك لەسەر مونەزەمەی دیبەگە بوونی هەبووە، بردوویانە و شەڕەکەیان پێ کردووە و دواتر هێناویانەتەوە و لە شوێنی خۆی دایانناوەتەوە، ئەو پێشمەرگە و کادیرێکی پێشکەوتووی پ.د.ك بووە، هەتا هەرەسی شۆڕش هەر بەردەوام بووە، پاشان پەیوەندی بە (ك.ڕ.ك)ەوە کردووە، پیاوێکی نەخوێندەوار بووە، بەڵام زیرەك و دانا و لەسەرخۆ و بەدەستوبرد بووە، دواتر لە ساڵی ١٩٨٨ کۆچی دوایی کردووە، لەو باوەڕەدام بمابا ئێستا تەرازووی هێز لە ناوچەی دیبەگەدا بە جۆرێکی دیکە دەبوو.

باوکم پیاوێکی ئایینی خوێندەوار بووە، پێ گوتراوە مەلا ڕۆستەم، پیاوێکی سادە و ڕۆشنبیر بووە، دووکانێکی هەبووە، ئێمەش چوار خوشك و سێ برا بووین، بە هەوڵی باوکم

خوشکەکانم تا شەشی سەرەتاییان خوێندووە، براکانم یەکێکیان یەکەم شەهیدی ڕاپەڕینی ڕزگارکردنی شاری هەولێرە بە ناوی (شەهید مام تەها)، لە ٦:٣٠ خولەکی بەیانی یەکەم کەس بووە شەهید بووە، براکەی دیکەم بە ناوی ئازاد لە ژیاندا ماوە، ئەو دوو برایەی دیکەم لە من گەورەتر بوون.

من لە تەمەنی شەش ساڵییەوە لە دووکانەکەی باوکم بووم کارم دەکرد، خوێندنیشم دەکرد، تا قۆناغی ئامادەییم تەواوکرد، گوندەکەمان نزیکەی ١٢٠ ماڵ بوو، واتە گەڕەکێك بوو لە گەڕەکەکانی دیبەگە، خەڵکانێکی لێ بوو دەرچووی کۆلێژ بوون، خوێندەوار بوون، گوندەکەمان ئاغای هەبوو کێشەی چینایەتیش لەو سنوورە بوونی هەبوو، لە ساڵی ١٩٥٣ شۆڕشی جووتیاران لە ناوچەکەی ئێمە لە گوندەکانی بناری قەرەچووغ سەریهەڵدا، بەڵام ئاغاکانی ئەو سنوورە خەڵکێکی ڕۆشنبیر بوون هاوسۆز بوون لەگەڵ چینی هەژاردا، کە بە بیری مارکسی لینینی و چەپگەری گۆش کرابوون، سەکۆی گوندەکەمان بۆ ئێمە زانکۆیەکی گەورە بوو، ئێواران دادەنیشتین شیکردنەوە بۆ بوونیادی و شێوازی فەلسەفەی مارکسی لینینی دەکرا، باسی ماتریالیزمی دیالێکتی دەکرا، کێشەکان تاوتوێ دەکران، مامۆستای ئایینی گوندەکەمان بە ناوی مەلا یەحیا پیاوێکی زۆر ڕۆشنبیر بوو، ئەگەرچی مامۆستای ئایینی بوو، بەڵام بیری بە لای چەپدا دەڕۆیشت، چەپ بوونی ئێمە بەهۆی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی نەبوو، بەڵکو بەهۆی کێشە و ململانێ چینایەتییەکان بووە.

لە ساڵی ١٩٨١ پەیمانگای تەندروستیم تەواو کرد، هەر ئەو ساڵە بە شێوەیەکی فەرمی پەیوەندیم کرد بە ڕیزەکانی (ك.ڕ.ك)ەوە، هەرچەندە من پێشتر پەیوەندیم کردبوو لە ڕێگەی مامێکم بە ناوی محەمەد عەبدوڵڵا سەعدوون کە لە ساڵی ١٩٧٦دا پەیوەندی بە ڕیزەکانی (ك.ڕ.ك)ەوە کردبوو، کە هەڤاڵ ئەرسەلان بایز لە یاداشتەکانی خۆیدا چەندین جار باسی دەکات، من لەگەڵ مامم کارم دەکرد، بەڵام لەبەر مەترسی لەسەر ژیانم نەیدەویست ڕاستەوخۆ بێمە ناو کارەکەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کارێکمان پێکەوە دەکرد.

ساڵی ١٩٨١ کە پەیمانگام تەواو کرد دەبوو بچم بۆ خزمەتی سەربازی، پێمان ناخۆش بوو بچین بۆ خزمەتی سەربازی ویستم لەگەڵ مامم بچم ببم بە پێشمەرگە، خوالێخۆشبوو دایکم خۆی هەڵواسی بەو ئۆتۆمبێلەی کە من بەرەو پێشمەرگایەتی سەرکەوتبووم، چەند مەترێك ئۆتۆمبێلەکە ڕۆیشت و دایکم خۆی پێوە گرتبوو بە زەوییەکەدا دەخشا، بە گریان و هاوارەوە دەیگوت بڕۆی خۆم دەکوژم، ئیدی ناچار من گەڕامەوە و بۆ ماوەیەك ددانم بە خۆمدا گرت، چەند جارێکی دیکە ویستم بچمە دەرەوە، ئەو کات شەڕی ناوخۆی کورد لە هەشتاکاندا لە ئارادا بوو، باوکم پێی ڕاگەیاندم لە شەڕی عێراق-ئێران شەهید بی باشترە وەك لە شەڕی ناوخۆی کورد، ئەو کات دەڵێین بە دەستی ئێران شەهید بووە، وەك لەوەی بڵێین بە دەستی کورد شەهید بووە، ئیدی پەشیمان بوومەوە، منیش شوێنەکەم باش بوو، دەمتوانی خزمەتی پێشمەرگەش بکەم و دەرمان بنێرم، چەند جارێکیش داوایان لێ کردم بچم وەك دکتۆری چالاکییەکان بەشداربم، بەڵام بەهۆی مەترسی لەسەر ژیانی تەواوی بنەماڵەکەم لە هەر ئەگەرێکی ئاشکرابوونمدا ئەو کارەم نەکرد، چونکە لە ژێر دەستی ڕژێم بوون، جگە لەوەش تیپەکان کارمەندی تەندروستی ڕاهێنراویان لەگەڵ بوو، دەرمانیان پێ بوو، کە هەندێك کاری وایان دەکرد ڕەنگە پزیشکی پسپۆڕی ئێستا بۆی نەکرێت.

دواتر لە نەخۆشخانەی دیانە گیرسامەوە، لەوێ دەرمانم دەهێنا بۆ ناوچەی خۆمان و دەمدا بە هێزەکانی پێشمەرگە، ئەو بەرپرسەی خۆم بە ناوی محەمەد عەلی فاتیل کە نازناوی دەشتی بوو، هەردووکیشمان سەر بە کەسێکی دیکە بووین بە ناوی عومەر کە نازناوەکەی مام جووتیار بوو، کە خاڵی هەڤاڵ دەشتی بوو، سەرەتای ساڵی ١٩٨٢ من بە نازناوی (هێرش) لە ناو کۆمەڵەدا بووم، لە سنووری ئێمە هەردوو تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر و ٨٧ی قەرەچووغ بوونی هەبووە و لە ناوچەکانی ئێمە کاریان کردووە، ناوچەی ئێمە کەوتووەتە نێوان زێی گەورە و زێی بچووك، ناوی دزەییش هەر لە هەردوو وشەی (دوو

زێیی) هاتووه، که زێی گەوره به گوێردا و زێی بچووك که له دووکان و بەدووبزدا تێدەپەرێ، پێی دەڵێن ناوچەی دوو زێیی، ئێمه به خێڵ دزەیین، بەلام ئاغای دزەیی نین.

ئەوکاته ئەوەی له تەندروستی کاری بکردایه رێز و پێگەی تایبەتی هەبوو، من ئەگەر به ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن بگەرامایەتەوه بێ ئەوەی شۆفێرەکەی بزانێت هەندێك دەرمانم دەخسته ناو جانتاکەمەوه، زۆرجاریش به کۆستەر یان ئۆتۆمبێلی دیکه دەهاتینەوه، شروبێکی بیکۆ هەیه بۆنێکی دیاریکراوی هەیه، واته ئەگەر وردبیتەوه بۆنی نەخۆشخانەی لێدێت، من زۆر جار پێش گەیشتنم به بازگەکان قومێکم لەو شروبه دەدا و له ناو دەمم وەردەدا، که دەگەیشتینه بازگەکه و ئەو کەسەی دەهات داوای ناسنامەکەی لێدەکردم من یەکسەر بێ ئەوەی هەستی پێ بکات هەلاوی هەناسەم روو دەکردە دەموچاوی، ئەویش که بۆنی دەکرد دەیگوت (انت بالصحة)، دەمگوت (نعم)، دەیگوت (یا اهلا و سهلا بکم روحوا)، ئیدی ئەو دەرمانانەم دەهێنایەوه بۆ هەولێر، لەوێش له رێگەی کورێکی خالم به ناوی سلاح عەبدوڵلا له گوندەکەیان به ناوی گردەشینه له بناری قەرەچووغ هێزەکان دەهاتنه ئەوێ و لەوێ دەیان برد، من نەشم دەزانی کێن و چ هێزێکن دێن دەیبەن، کۆتا کۆمەڵەی دەرمانەکانم له گوندەکەی خۆم جێما، دواتر زۆر بۆی گەرام نەمدۆزیەوه، دواتر زانیم دایکم لێی شاردبوومەوه.

له رووداوێکی دیکەدا من له دیانه بووم کەسێك هات گوتی دکتۆر چیا پێویستی به دەرمانه، لیستێکی هێنابوو، من بۆم ئامادە کرد، بەلام بەداخەوه دەرمانەکان له گوندی بەرزێوه گیرا، که دەکەوته نێوان دیانه و ناوچەی باڵەییان، دکتۆر نورەدین ئیسماعیل که خەڵکی ناوچەی پردێ بوو ئەوکات بەرێوەبەری نەخۆشخانه بوو له سۆران که پێیان دەگوت شارۆچکەی صدیق، شەو تەلەفۆنی کرد گوتی بەرێوەبەری ئاسایش داوای تۆ دەکات، گوتی دیاره تۆ دەرمانت ناردووه، گوتم نەخێر، شتی وانییه، گوتی بەڵێ وایه تۆ دەرمانت رەوانه کردووه، دەرمانەکان دەستی به سەردا گیراوه، هەر ئێستا برۆ و خۆت رزگار بکه، ئەگەر نا

تۆ لە سێدارە دەدرێیت، ئیدی منیش هەر ئەو شەوە گەڕامەوە، کاتی خۆی کەسوکاری من لە کێشەیەکی کۆمەڵایەتیدا یەکێك لە ئاغان دەکوژن، کە ئەمە بۆ ئەوکات کارێکی ئەستەم بووە، دواتر کەسوکارم هەڵهاتوون بۆ موسڵ لەوێ نیشتەجێ بوون، لەگەڵ عەرەبەکان تێکەڵاوی پەیدا دەکەن، بۆ چارەسەری کێشەکەم باوکم چووە ئەو گوندەی خزمەکانی خۆمانی لێ بوو لە موسڵ، ئەوان باوکی ئەو بەڕێوەبەری ئاسایشەیان دەناسی کە لە سۆران بوو، لە ڕێگەی ئەوەوە کێشەکەم بۆ چارەسەر کرا، بەو مەرجەی کە جارێکی دیکە کاری لەو شێوەیە دووبارە نەکەمەوە، چونکە ئەگەر بگیرابام تووشی لە سێدارەدان دەبووم، تا ئێستاش بە دکتۆر نورەدین دەڵێم بەخوێن قەرزارباری تۆم، کە ئەو کات وەکو کوردێك ئەو هەستەی هەبوو ڕزگاری کردم.

لە ساڵی ١٩٨٥ کاتێك لە ڕێکخستندا بووم هاوڕێیەکی ئەزیزی منداڵیم کە زۆر کات پێکەوە بووین، لە پێشمەرگایەتی دەست بە سەر کرا و لە نەخۆشخانەی عەسکەری قاچێکیان بڕییەوە، من سەردانم دەکرد و لە دۆخیم دەپرسی و ئاستی ئاسایشی نەخۆشخانەکەشم هەڵسەنگاندبوو، پێشتر خۆشم ماوەیەك لەوێ بووم، پرسم بە هەڤاڵانی ڕێکخستنی هەولێر کرد، کە دەمەوێت ئۆتۆمبێلێکی فریاکەوتن پەیدا بکەم و بچمە نەخۆشخانەکە و ئەو هاوڕێیەم ببەمە دەرەوە، ڕادەستی ڕێکخستنی بکەم تا ڕزگاری بکەم، ئەوە سەرکێشییەکی گەورە بوو بۆیە هەڤاڵانم ڕێگەیان نەدام، گوتیان نەك هەر سەرکەوتوو نابیت، بەڵکو هەموومانیش ئاشکرا دەبین، کابرایەکیش هەبوو ئیمام تابور بوو خەڵکی لای ئێمە بوو باوکمی دەناسی، بریندار و کوژراوی حکومەت دەچوونە لای ئەو، من هەواڵەکەم لەو وەردەگرت کە چەند کەس کوژراوە و هەواڵەکەم ڕەوانە دەکرد، وام دانابوو کە ئەگەر بشپرسن بۆ کوێ دەچی، دەمگوت دەچم بۆ لای مامۆستا مەلا سابیر کە خزمی باوکم بوو عەقیدی سەربازی بوو.

ئیدی له ساڵی ١٩٨٦ پێیان ڕاگەیاندم کە بچمە دەرەوە و شۆڕش پێویستی پێمە، منیش لەگەڵ ئامۆزایەکم بە ناوی کەریم چاوشین و خزمێکی نزیکی خۆشم بە ناوی ئدریس کە دواتر لە شەڕی دێگەڵە شەهید بوو، پەیوەندیمان بە تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێرەوە کرد، ئەوکات هێزەکان لە چالاکی گەورە بوون، هەندێك هێز بە جێمابوون، ئێمە چووینە گوندی کاریتان و قوشاغلۆو دواتر گوندی ئاومار، چووینە لای پێشمەرگەیەك بە ناوی (س.ش) لەبەرئەوە ناوی ناڵێم چونکە دواتر خۆی ڕادەستی ڕژێم کرد و کوژرا، پاش ئەوەی خۆم پێناساند، من جانتایەکم پێ بوو لەگەڵ ئەو دوو کەسە چووین بۆ لای، گوتی چەکتان پێیە؟ گوتم نەخێر، گوتی بچن هەر یەك و هاوانی مزەلیان بۆ بهێنن، ئەو قسەیە بۆ من زۆر ناخۆش بوو، پێشوازییەکەشی زۆر نەشیاو بوو، ئەو قسە ناخۆشەشی کرد، من گوتم هەڤاڵ س.ش بەڕاستی من ڕێکخستنم و کارم کردووە و پشتگیریشم هێناوە، نەهەڵهاتووم، هاوکات ڕێگەپێدراوی سوپاش بووم، دەفتەرەکەم هەر پێ بوو، چونکە من کاری تەندروستیم دەکرد، پێم گوت نەمتوانی زیاتر خۆم ڕاگرم، لەبەرئەوەی شۆڕش پێویستی بە منە، هەروەها بەهۆی مامم و بنەماڵەکەمانەوە بە کێشەی چینایەتی خەڵکی ئێمە خەڵکێکی دڵگەرم بووین، گوتم بەڕاستی دڵگرانم لێت من دەگەڕێمەوە، بشمزانیبا خەڵکی وەك تۆ لەم شۆڕشەیە هەرگیز نەدەهاتمە دەرەوە و نەدەبوومە پێشمەرگە، ئیدی بە ئەو دوو کەسەم گوت کە لەگەڵم بوون هەڵسن با بگەڕێینەوە، لەوێ تووشی هەڤاڵ فاروقی عەلی مەولود بووم گوتی چ بووە، منیش بۆم باس کرد، گوتی ناوت چییە؟ گوتم ناوم سەعدوونە، گوتی واز لەو بێنە دەستی لەسەر شانم دانا و گوتی ناوت لێدەنێم (ئارام) لەبەر دوو هۆکار یەکەم بەناوی شەهید ئارام، دووەم هەتا جارێکی دیکە تووڕە نەبیت، گوتم ئێوە کەسی وا دابنێن بۆ پێشوازی خەڵك چۆن تووڕە نابم، ئیدی ئێمە ماوەیەکی باش لەگەڵ هەڤاڵ فاروق ماینەوە، کە ڕابەر سیاسی تیپی ٨٧ی قەرەچووغ بوو، هەرچەندە تیپی ٨٦ و ٨٧ زۆر تێکەڵ بوون، ئیدی لەو تیپانە بووین، بەمجۆرە لە گوندەکانی بەستی شەڕێ وەکو ئاومار و

سێگردكان و شەیتان ماینەوە، لەگەڵ: (د. محەمـەد، د. جـەمیل، د. نەبـەز، د. خەسـرەو، د. حەیدەر و د. ئاری)د پێكەوە بووین.

سروشتی ژیان و پەروەردەم وابووە لە پێشمەرگایەتی كە دەچووینە مـاڵی خـەڵكی زۆر شەرمن بووم، باپیرم وای پەروەردە كردبووین، زۆر شتمان پێ عەیب بوو، دەشمزانی خەڵكی ئەو ناوچەیەی ئێمە زۆر هەژارن، من بەیانی نانم دەخوارد ئیدی تا ئێوارە نانم نەدەخوارد، نەدەچوومە مـاڵی كـەس، دەمگـوت خـەڵكی بـۆ خـۆی نییـەتی، چ جـای ئێمـە، مەگـەر خـۆم هەندێك جار پارەم پێ بوو لەگەڵ یەك بـۆ دوو هـەڤاڵ مریشـكێكمان دەكـڕی و لێمانـدەنا و دەمانخوارد، ڕۆژێك دەمە و ئێوارە من لـە كەرتەكـەی خـۆم لـە تیپـی ٨٦ ڕووداوێـك ڕوویـدا، گوتیان دوو كەس لـە گونـدی ئۆمەرگومـەت سـوتاون، بـە نـاوی عوسمـان و ئەبوبـەكر كوڕی پیاوێك بوون بە ناوی مام حەمەدەمین، لە كاتی زەوی كێڵان بـە تەرەكتـەر هاتبوونـەوە لـە گەڕانـەوەدا تەماشـای تـانكی تراكتۆرەكـە دەكـەن بـۆ دڵنیابوونـەوە لـەوەی بـزانن كـە گـازی تێدایە یاخود نەخێر، شقارتەیەكیان لە تانكی گازەكـەدا دابـوو كڵپـەی كردبـوو سـووتابوون، ئیدی داوای پزیشكیان كرد، چووم تیمارم كردن و لەگـەڵیان مامـەوە تـا باشـتر بـوون، ئیـدی من نزیـك بـووم لێیانـەوە دواتـر جلـی باشـیان پێـدام و خواردنیـان پـێ دەدام، بۆیـە تـا ئـەو ڕووداوە ڕووی نەدابوو من نیوەڕوان نانم نەدەخوارد، چونكە خەڵكی خۆی هیچی نەبوو، كە پێشمەرگە دەچوونە ماڵی خـەڵكی و سـڵاویان دەكـرد بـە ئەسـتەم وەڵامیـان دەدایـەوە، پـاش ماوەیەك دانیشتن ئینجا هەندێك نان و پیاز...هتد بۆ دەهێنایـن، ئەمە نیشانەی ئـەوە نییـە دڵسۆز نەبوون، زۆر خەڵكی باش بوون، بەس بۆ خۆیان نەیان بوو چ جای پێشمەرگە، بـەڵام ئەوبەری زێ واتە بەری خاڵخاڵان خەڵكەكەی دۆخی باشتر بوو، خواردنیش باشتر بوو.

ئیـدی مـن تـەواوی كاتـە بەتاڵـەكان دەمخوێنـدەوە، حـەزم لـە كارەكـەی خـۆم بـوو، شارەزاییەكی باشم هەبوو زیرەكیش بووم، بـەوە دەزانم زۆرجـار پرسـیاری وردی دەرمانیـان

لە من دەکرد، کارەکەی خۆشم بە دڵ بوو، ئەوەش دەڵێم (د. خالید، د. نەبەز. د. محەمەد، د. خەسرەو و د. ئاری) لە پێش من لەوێ بوون هەموو پزیشکی ئازا و زیرەك بوون.

لە داستانی ڕزگاری لە بەهاری ساڵی ١٩٨٧ کە کۆمەڵێك ڕەبایەی زۆر گیران و پێشمەرگە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەی بەدەست هێنا، شەڕەکە زۆر سەخت بوو، پێشمەرگە پێویستی بە هاوکاری هەبوو، هەڤاڵ مام ڕۆستەم وەکو فەرماندەیەکی ئەو شەڕە بروسکەیەك بۆ هەڤاڵ مام جەلال دەکات و دەڵێت: "**پێویستمان بە ساروخ و دکتۆرە**"، بۆیە ئەگەر بمانەوێت لە ڕۆڵی پزیشکان و کادیرانی تەندروستی لە خەباتی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان لەو ساڵانەدا تێبگەین، ئەوە دەکرێت لەم گوزارشتەوە لە گرنگی و ڕۆڵی دکتۆری شاخ و شۆڕش بنوارین، کە فەرماندەیەکی سەربازی و مەیدانی پێشمەرگە دەیەوێت ساروخ و دکتۆری هەبێت، هەر لەسەر ئەم تێڕوانینە دوای ئەوەی کە لە نەخۆشخانەی بەرگەڵوو بووین هەڤاڵ جەبار فەرمان هاتە لامان و گردینی بە دوو بەشەوە بەشێکمانی بەرەو پاشەکشە نارد و نەبادا لە هێرشێکدا هەموومان لە ناو بچین، بۆیە ئێمە لە نەخۆشخانەکە پێنج کەسمان ماینەوە و گوتی: "**بە دڵنیایی ئێمە سەردەکەوین لەبەرئەوەی شاخمان لە پشتە هەروەها ئێمە دکتۆرمان لە پشتە**".

لە کۆتایی مانگی شەش و سەرەتای مانگی حەوتی ساڵی ١٩٨٧ وەك دیارییەك بۆ یادی دامەزراندنی ی.ن.ك شارۆچکەی تەقتەق ڕزگار کرا، ژمارەیەك پێشمەرگە بریندار بوون لەوانە هەڤاڵ فاروق کە بۆ نەخۆشخانەی سماقوڵی ڕەوانە کرا، هەروەها ئازاد داربەسەریی زۆر بە سەختی بریندار بوو کە یەکێك بوو لە فەرماندەی کەرتەکانی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر، لەگەڵ د. ئاری چارەسەرمان کرد، کۆڵەپشتێکی پێ بوو، بەڕاستی د. ئاری یەکێك بوو لە هەرە پیاوە ئازا و بوێرەکان ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە بواری تەندروستیی تیپەکانی ناوچەکانی هەولێر، من خوێنەکەم +O بوو، برینەدارەکەش پێویستی بە خوێن بوو، د. ئاری خوێنەکەی لێوەرگرتم و بوتڵێك خوێنم پێ بەخشی، لێرەدا بۆ خۆشی ئەمە دەگێڕمەوە:

"لای ئێمە کە کەسێك خوێنی دەبەخشی جەرگ و هەناویان بۆ دەهێنا، کەچی یەك قاپی گەورەی شلەی ساوەر بە تەماتەیان بۆ هێنام"، هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ هاتە ئەوێ گوتی کێ دەیبات بۆ سەرکردایەتی؟ واتە نەخۆشخانەی گشتی سەرکردایەتی ی.ن.ك لە بەرگەڵوو، گوتم من دەیبەم، گوتی باشە د. ئارام چاوەڕێت دەکەم و هەتا دەگەڕێیتەوە دەمانچەیەکیشت بۆ دادەنێم، لێرەدا بە ویژدانەوە شتێك دەڵێم ڕەنگە وتەکەم زانستی نەبێت: **"هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵی شاخ باس دەکەم، بەڕاستی پیاوێکە ڕەنگە مادەی ئەدرنالین لە لەشیدا نەبووبێت، کە غودەیەکە لەسەر گورچیلە دەڕژێ، ئەرکی ئەو غودەیە زۆرە یەك لەوانە کاتێك کەسێك تووشی شەڕ دەبێت کەسەکە دەترسێنێ و تووشی لەرزینی دەکات، دەم و چاوی سپی دەبێت و خوێنی زیاد بۆ دڵ دەچێت، ئەمە یەکێکە لەو بەرگرییانەی کە خودا دایناوە بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی کاتێك زەبرێکت بەر دەکەوێت خوێنت لێ نەیەت، بۆ نموونە کاتێك گوللەیەك، یان چەقۆیەك بەر لەشت دەکەوێت و خوێنی لێ نەیەت و خوێنە پێویستەکە دەگەڕێتەوە بۆ دڵ و مێشك تا بیری پێ بکەیتەوە و فریای خۆت بکەویت، بۆیە وادەڵێم من بۆ خۆم هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵم بینیوە ئێمەی لە شوێنێکی پارێزراو داناوە و خۆی بە پێوە بووە و RBG بە فڕۆکەوە ناوە و فڕۆکە تەقەی لێ کردووە و هەر بە پێوە بووە، نە هاتووە بۆ لای ئێمە نە خۆی داوە بە زەویدا نە ڕای کردووە"**.

هەڤاڵ کۆسرەت مەفرەزەیەکی بە فەرماندەیی مامۆستا یاسین بۆ پاسەوانیکردنمان پێکهێنا، لێرەوە من بە بریندارەکەوە کە هەڤاڵ ئازاد بوو گوللەیەك بەر سەری کەوتبوو بۆ سەرکردایەتی بە ئۆتۆمبێلێك بەڕێکەوتین بوتڵێك خوێنم پێ دابوو، ئیدی موغەزیم بۆ هەڵواسی، دەرمانی ئەنتیبایۆتیکم پێدا، ویستمان بە ڕێگەی کۆیەدا بڕۆین، بەڵام جاشەکانی قاسم ئاغای کۆیە ڕێگاکەیان گرتبوو، ناچار گەڕاینەوە بەرەو زێی بچووك بە ڕێکەوتین و پەڕینەوە بۆ بەری خالْخالان و چووین بۆ گوندی مۆردخوارده بۆ لای شەهید د.هادی و د.

محەمەد فەرەنسی، کە ئێمەیان بەو شێوازە بینی کە بوتڵێك خوێنم دابوو، برسی بووم، ماندوو بووم، بە ڕێگەی مەترسیشدا هاتبووین، شەکەتیمان پێوە دیاربوو، د. هادی گیسکێکی بۆ سەر بڕین، هەروەها بوتڵێك خوێنی بە بریندارەکە بەخشی، دۆخی بریندارەکە باشتر بوو، لەوێ پیکابێکی تۆیۆتامان پەیدا کرد و بەرەو سوورقاوشان بەڕێکەوتین، لە ڕێگە تووشی دۆخێك بووین هێندەی نەمابوو ئۆتۆمبێلەکە لەسەر شاخێکی زۆر سەختەوە بکەوێتە خوارەوە بیرمە نیوەی ئۆتۆمبێلەکە کەوتبووە بۆشایی و لە کەناری بەربوونەوە بوو، کەچی وەستا، شۆفێرەکە خۆی فڕێدا، ئەوەی لەگەڵیشی بوو خۆی فڕێدا، من و بریندارەکە ماینەوە، ئەگەر من خۆم فڕێبدابایە ڕەنگە بریندارەکە بمردبایە، چونکە من موغەزییەکەم بە دەست گرتبوو خوێنەکە دەگەڕایەوە ناوی و دەمرد، بە سەرسڕمانەوە دەڵێم زۆر بە ڕێکەوت ڕزگارمان بوو، هەرچۆنێك بێت ئۆتۆمبێلەکەیان ڕاکێشایە دواوە، تا ئەو نزیکانەش ڕێگەی ئۆتۆمبێل هەبوو، ئیدی دەبوو بە وڵاخ بڕۆین، ئێمەش شارەزاییەکی باشمان لە بارکردنی بریندار لەسەر هێستر هەبوو، گوازەرەوە (نقال)یەکی تایبەتیمان هەبوو، من کیسەی خوێنم پێ بوو لە سوورقاوشان بوتڵێك خوێنی دیکەم بۆ پەیدا کرد، کە لە هەڤاڵێکم وەرگرت بە ناوی تەڵعەت کە عەدەد جیهاز بوو، هەرچەندە ئەو هەڤاڵە خۆشی خوێنی کەم بوو، ئیدی لە گوندی تەلانەوە بۆ قەمچووغە پەڕینەوە، چووینەماڵی کەسێك بە ناوی مام عومەر لەوێ نانمان خوارد و دوای چەند ڕۆژێك گەیشتینە گوندی بەرگەڵوو، من لەو ڕێگەیە بەردەوام فشاری خوێنی بریندارەکەم دەگرت و موغەزی و دەرمانی پێویستم پێ دەدا، کە گەیشتین لە نەخۆشەکە ماندووتر بووم، ئەوکات ئەو پزیشکانەی لەوێ بوون بریتی بوون لە: د. شوان، د.خالید، د. موحسین، د. ئاکۆ، د. بەیان، د. مونسور و د. نەوزاد، هەموو لێی کۆبوونەوە و بریندارەکەیان لێ وەرگرتم و منیش کەمێك ماندوویێتیم دەرچوو، من دڵم نەهات بریندارەکە بە جێبهێڵم و شەو هەر لە هۆڵەکە مامەوە، هەرچەندە جلوبەرگی پزیشکی و هیچ پێداویستییەکی دیکەم پێ نەبوو، ویستم

ڕیشم بتاشم شەو بە لایتێکەوە لە پێشی نەخۆشخانەکە دەگەڕام بۆ لەتە موسێك تا بیدۆزمەوە و تەراشی پێ بکەم، کەسێك هات گوتی: (لیش تدور؟) بەڕاستی من زۆرم پێ سەیر بوو، دواتر زانیم کە سەربازێکی دیل بوو، لەبری زیندانی خزمەتی نەخۆشخانەکەیان پێ دەکرد و لە سەرگەڵووەوە خواردنی دەهێنا بۆ بەرگوڵوو، ئیدی ئەو پارچە مووسێکی خۆی پێدام و ڕیشم پێ تاشی.

بەمجۆرە من لەوێ مامەوە و ئاگام لە نەخۆشەکان دەبوو، یەك لەوانە هەڤاڵ مامە ڤالە بوو، دواتر لە شەڕێکدا حکومەت لە زێوە کیمیایی بە سەر خەڵکدا ڕژان، برینداریکی زۆر هات، ئێمەش جێگەمان کەم بوو، چونکە نەخۆشخانەکە تەنها یازدە ڤەرەوێڵەی نەخۆشی هەبوو، بۆیە د. شوان پێی ڕاگەیاندم ئەو بریندارەی هێناوتە دۆخی باشترە پێویستە بیبەنەوە، ئیدی من ویستم بمێنمەوە د. شوان گوتی پێویستە خۆت لێرە بمێنیتەوە، گوتم من ناتوانم چونکە هەڤاڵ کۆسرەت پێی گوتووم بگەڕێمەوە و بەڵێنیشم پێداوە، گوتی من خۆم جیهازی بۆ دەکەم، چونکە ئێمە پزیشکی کەرکووکی و سلێمانی و بەغدادیشمان لەگەڵە پێم خۆشە خەڵکی هەولێریشمان لەگەڵ بێت، جیهازی بۆ هەڤاڵ کۆسرەت کرد و من لە بەرگەڵوو مامەوە، پێکەوە خزمەتی نەخۆش و بریندارمان دەکرد، ئەو بریندارەی کە خۆم هێنابووم بەداخەوە لە گەڕانەوەدا بەرەو دەشتی هەولێر بەهۆی جووڵەیەکی هەڵەوە شەهید بووبوو، کە برینەکەی سەخت بوو، چونکە گوللە لەسەریدا بوو، نەدەبوو هەندێك جووڵە بکات، هەرچەندە من پێشنیاری گواستنەوەیم بۆ ئێزگە کرد کە نزیکی خۆمان بوو، چەندین برینداری دیکەی لێ بوو، بەڵام گوتیان دەیبەینەوە.

بەڕاستی لە ساڵی (١٩٨٧)ەوە بەرگەڵوو بۆ من بووە زانکۆیەك، پێش هاتنم بیستبووم کە دوو دکتۆری لێیە بە ناوەکانی د. شوان و د. هەڵۆ ناوی تەواوی د. هەڵۆ (ئەدیب محەمەد عەلی) بوو خەڵکی بادینان بوو جەراح بوو) کە ناوبانگی ئازایەتییان هەبوو، هەرچی د. شوان بوو زۆر جدی بوو، هەروەها د. خالید، د. موحسین، د. ئاکۆ و د. نەوزاد زۆر حەزیان

دەکرد من بمێنمەوە، هەڵە نەبم هەر ئەوانیش بە د. شوانیان گووتبوو با بمێنێتەوە، چونکە خزمەتی هەموو نەخۆشەکانم دەکرد، زۆرجار پیسایی ژێر نەخۆشەکانم پاك دەکردەوە، نەخۆش هەبووە لە کاتی پاککردنەوەی ژێری لێی داوم، پێی گوتووم بۆ ئەزیەتم دەدەی، کە بە گیانێکی وەرزشییەوە وەرم دەگرت، ڕۆژێك چووم بۆ دەروازەی نەخۆشخانەکە کە هەر دەرمانێکت ویستبا لەوێ دەتهێنا حەزم لەوێ بوو کاتی خۆی لەو بەشە کارم کردبوو، لە کاتی پێویستی دەبوو ١٥ بۆ ٢٠ خولەك بگەڕێی تا بیدۆزیتەوە، بینیم شوێنەکە شپرزە، پێم باش نەبوو، ئەو کوڕەی کە لەوێ بوو ناوی مەحموود بوو، پێم گوت کە هەندێك کارتۆن و کاغەز و تیانووسی تۆمار (سجل) و پێنووسی ماجیکم بۆ پەیدا بکات.

دوای ئەوەی بۆی پەیدا کردم، هەموو دەرمانەکانم هێنایە دەرەوە، بەردم هێنا بۆ ژێریان وەکو ڕەفە دروستم کرد، بۆ ئەوەی کە ئاو هاتە ژوورەوە نەگاتە کارتۆنەکان کە کۆگای دەرمانی سەرەکیمان بوو، ئیدی هەموو دەرمانەکانم دانا، چەند قەرەوێڵەیەکی ئاسنمان هەبوو ئەوانیشم هێنا تا دەرمانیان لەسەر دابنێم، هەموو دەرمانەکانم ژمارد و ڕێکم خستن، ڕۆژی بەسەرچوونەکەیان و ژمارە و جۆرم لە تیانووسی تۆمارەکەدا نووسی و هاتمەوە، دوو سێ ڕۆژ دوای ئەوە د. شوان دەیبینێت ئەو کۆگایە زۆر بەجوانی ڕێکخراوە، هات گوتی ئەوە کێ وای لێ کردووە، گوتیان ئارام کردوویەتی، بانگی کردم گوتی ئەوە تۆ ئەنجامت داوە؟ گوتم بەڵێ، گوتی کێت لەگەڵدا بوو؟ گوتم هەموومان بووین پێکەوە، گوتی نا ئەوە تەنها کاری خۆتە، لەمەودوا من پەیوەندیم بە دەرمانەوە نییە، تۆ لێپرسراوی دەرمانی شۆڕشی، بەڕاستی ئەوە بۆمن شانازیی و متمانەیەکی گەورە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا گوتی حەز دەکەم لە سڕکردن (تخدیر)یش کار بکەیت، کە د. ئاکۆ لەوێ کاری دەکرد، سڕکار (مخدیر)ێکی زۆر باش بوو، خەڵکی سلێمانی بوو، د. نەوزادیشی لەگەڵ بوو، ئیدی من لەگەڵ د. ئاکۆ دەستم پێ کرد، کاری سڕکردنم ئەنجام دەدا، شارەزاییم پەیدا کرد، هێندەم نەمابوو بە تەواوی فێر ببم، ڕۆژێك هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ هات زۆری خۆش

دەویستم و گوتی چی دەکەی لە کوێ کار دەکەی؟ گوتم لە سڕکردن، گوتی باشە خۆت بە تەواوی فێر بکە و دەچینەوە لە مەلەکان نەخۆشخانەیەك دەکەینەوە و وەرەوە بۆ ئەوێ، کە د. شوان گوێی لەو قسەیە بوو زۆری پێ ناخۆش بوو حەزی نەکرد من بچمەوە، بۆیە منی لە بەشی سڕکردنەوە گواستەوە بۆ پاككردنەوە (تعقیم)، تا فێر نەبم و نەگەڕێمەوە.

نەخۆشخانەکە پێکهاتبوو لە هۆڵێکی نەشتەرگەری، کە نەشتەرگەری گەورەمان دەکرد، هۆڵی خەوتنی نەخۆش و برینـدار، ئامێری بێهۆشکاریی و تیشك بە سکرینەوە، لەگەڵ بەشی تاقیگە و بەشی ددان، ئەوەی لەوێ کاری دەکرد بەتەواوی کەسی بیناکراو ڕاهێنـراو و شارەزابوو، ئەرکەکان بە نۆرە بوو، بەڵام کاتێك بریندار دەهات ئیدی هەموو پێکەوە دەچووینە سەری، چەندین جار هەبووە لەسەر خوێن بەخشین بە بریندار بووە بە کێشە، ئەو دیگوت من خوێن دەبەخشم، ئەم دەیگوت من خوێن دەبەخشم، ئەو گیانی هاوکاریی و دڵسۆزییە هەبوو.

ئێمە سێ کچیشمان لەگەڵ بوو کە لە دوای ئاشکرابوون لە ڕێکخستنەوە هاتبوون ئەوانیش: (گەشاو، داباn و سابات)، کە ڕۆڵێکی زۆر کاریگەریان هەبوو، ئەو ماوەیەشی لێپرسراوی بەشی دەرمان بووم هەڵسام هەموو دەرمانەکانم کرد بە دوو بەشەوە، بەشێکیم برد لە شوێنێکی دیکە لە ژێر شاخێك شاردمانەوە، تا لە ئەگەری لێدان لە نەخۆشخانەکە بە فڕۆکە لایەنی کەم نیوەی دەرمانەکانمان پارێزراو بێت، کاتی خۆی من فیلمێکم بینی بوو باسی شەڕی یوگسلافیای دەکرد، لە فیلمەکە بینیم دکتۆرەکان دوای بەکارهێنان لەفاف و گۆز دەشۆنەوە و دووبارە بەکاری دەهێننەوە، من بانگی گەشاو و دابان و ساباتم کرد لەفافە کۆنەکان کە بە خوێنەوە بوو بیشۆینەوە بۆ دووبارە بەکارهێنانەوە، دوای شۆردن و وشككردنەوە، پاك (تعقیم)مان دەکردەوە، ئەمە بۆ ئەوەبوو نەبادا تووشی شەڕێکی درێژخایەن ببین و گەمارۆ بدرێین و هیچمان بەدەست نەگات، ئیدی من بە درێژایی ساڵی ١٩٨٧ لەوێ مامەوە.

شەڕەکان زۆر بوون و لە هەموو مەڵبەندەکان بریندارى زۆرمان بۆ دەهات، ڕۆژێك پێشمەرگەیەکى بریندار بە ناوى هەڤاڵ کەمال براى حەمە عەلى بوو کوڕى حاجى مەحموودى گەلاڵى بوو چەند گوللەیەکى دۆشکە بەر پێى کەوتبوو پێویستمان بە پلێت و بورغوو هەبوو، بورغوومان نەبوو، پوورێکى لەگەڵ بوو بە ناوى باجى ئایشێ، پێمان گوت بچۆ لە سلێمانى بورغوو بهێنە، چوو لە ڕێگە دەست بە سەر کرا و ئەنفال کرا، چووم لە وەرشەى ئێزگەى دەنگى گەلى کوردستان لە لاى هەڤاڵ ڕزگارى لێپرسراوى وەرشەکە، ئەو بورغووەم هێنا ئەوەى کە دارى پێ دەبەستى، ژەنگاوى بوو، ژەنگەکەمان لێ کردەوە و بەکارمان هێنا و قاچى ئەو پێشمەرگەیەمان پێ گرتەوە، بەشێوەیەکى کاتى بۆمان کرد، تا دەگاتە ئێران، بەڵام گەیشتبووە ئێرانیش هەر لێى نەکردبووەوە لەوێ چوو بوو بۆ پاکستان -کە لەوێوە دەچوون بۆ ئەوروپا- لەوێ هەوى کردبوو، کە دەیکەنەوە دەبینن بورغووى دارى تێدایە، پێیان گوتبوو تۆ لە چ جەنگەڵستانێك هاتووى! ئێمە بەو شێوەیە کارى گەورەمان دەکرد، ڕەنگە زۆر کەس بڕوا نەکات.

ئێمە بێ جیاوازى خزمەتى پێشمەرگە و هاووڵاتیمان دەکرد، هەروەها چارەسەرى بریندار و نەخۆشى پارتەکانى دیکەمان دەکرد، بۆ نموونە پێش ئەوەى من بچم بۆ بەرگەڵوو هەڤاڵ سامى عەبدولڕەحمان لەسەر هێسترێك کەوتبووە خوارەوە و قاچێکى شکابوو هێنایان بۆ بەرگەڵوو لەوێ نەشتەرگەرى بۆ کراوە و چارەسەر کراوە، لە پەرتووکەکەیدا بە ناونیشانى (الجولة في الارض المحروقة) ئەم چیرۆکە دەگێڕێتەوە و باسى ڕۆڵى کاراى د. شوان و هاوڕێکانى دەکات، جارێکى دیکە کە خۆم لەوێ بووم، سامى عەبدولڕەحمان هات بۆ لامان گوتى: "من تەنها دەتوانم یەك شتتان پێشکەش بکەم ئەویش فرمێسکى خۆشییە، کە ئێوە کۆمەڵێك گەنجن لە ناو ئەو شاخەدا و لە خانوویەکى گڵدا، لەو شوێنە سەختە نەشتەرگەرى ئەستەم و گەورە دەکەن".

بۆیـە ئێمـە ئەوەنـدە بـە دڵسۆزی کارمـان دەکـرد، تەنانـەت یـەك نـەخۆش نـەبوو لـە نەشتەرگەریکردنیدا سەرکەوتوو نەبێ، یان برینەکەی هەو بکات، هاووڵاتی هـەبوو هەشت بوتـڵ ئۆکسـجینمان بـۆ بـەکارهێناوە، لێـرەدا پێویسـتە ڕۆڵـی پارتـەکانی ئێـران زۆر گـرنگ هەڵبسەنگێنین لە پەیداکردنی دەرمان و ئۆکسجین بۆ نەخۆشخانەکەی ئێمـە، هـەروەها لـە ڕێگــەی ڕێکخســتن و کــڕین و ڕێکخراوەکانــەوە دەرمانمــان بــۆ ڕەوانــە دەکــرا، ح.د.ك نەخۆشخانەیەکیان هـەبوو نـاوی نەخۆشـخانەی ٢٥ی گەلاوێـژ بـوو، لـە کـانی مێـو لـە نێـوان گەڕەدێ و گەورەدێدا بوو لـە دۆڵـی جافـەتی، ئـەوان دەچـوون لـە سـلێمانی ئۆکسجینیان بـۆ نەخۆشـخانەکەی خۆیـان دەهێنـا، منـیش شـەو دەچـووم بـێ ئـەوەی کـەس بزانێـت بـە ئۆتۆمبێلێـك دەمانهێنـا بـۆ نەخۆشـخانەکەی خۆمـان، جـاری وا هـەبووە دەچـووم سـێتی نەشتەرگەریم لە نەخۆشخانەی ٢٥ی گەلاوێژ دەهێنا، ئەمەش بۆ مێژوو دەڵێم، هەڤاڵ مـام جـەلال بـە شـێوازێکی زۆر سەرسـڕهێنەر (ی.ن.ك)ی بـە گشـتی و ئـەو نەخۆشـخانەیەی بـە تایبــەتی بــەڕێوە دەبــرد، د. شــوان کــە بەڕێوەبــەری نەخۆشــخانەکە بــوو زۆر لێهــاتوو بەدەستوبرد بوو، جگە لەوەی چەندین دکتۆری دیکە ڕۆڵـی زۆر کارایـان هـەبوو لەوانـە د. هـەڵۆ، د. هێـرش و د. دلێـر، شـایەنی ئاماژەیـە د. دلێـر پزیشـکی ح.ش بـوو لـە لای ئێمـە دەمایەوە.

بۆ تێگەیشتن لە شێوازی بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکە نموونەیەك باس دەکەم: **"ئێمـە لە نەخۆشخانەکە جاری وا هەبوو پزیشکی پاسدارانمان بۆ دەهات، هـەمان کـات برینـداری (ح.د.ك)یشمان بۆ دەهـات، کارێکمـان دەکـرد پزیشـکی پاسـداری ئێرانـی نەشـتەرگەری بـۆ پێشمەرگەیەکی ح.د.ك بکات بێ ئەوەی بزانێت و هەستی پێ بکات، هاوکات واشمان کردووە پزیشکێکی ح.د.ك بریندارێکی پاسداری ئێرانی چارەسەر و تیمار بکات، بێ ئەوەی بزانێت ئەمـە لـە ڕاسـتیدا پاسـدارێکی ئێرانییـە، هەرچی میوانییـە جـاری واهـەبوو لـە ژوورێـك میوانێك، یان نێردەیەکی ح.د.ك لە ژوورێك دانیشتوون و لە ژوورێکی دیکـە میـوان، یـان**

نێردەیەکی سوپای پاسداران دانیشتوون"، لە ڕاستیدا ئەمە بوو شێواز و هونەری بەڕێوەبردنی ئەو نەخۆشخانەیە.

کاری گەورەمان دەکرد، پێش من ڤاچی شەهید ملازم کەریمیان بە مشار بڕیبووەوە، لە ١٩٨٨/٣/١٤ تۆپبارانێکی زۆر لەسەر بەرگەڵوو بوو، هەڤاڵ جەبار هاتە لامان گوتی ئێوە تیادەچن، با نەخۆشخانەکە بکەین بە دوو بەشەوە بۆ ئەوەی هەمووتان لە دەست نەدەین، ئێوە سامانێکی نەتەوەیین، ئیدی نیوەمان ڕەوانە کراین، د. هەڵۆ، د. هێرش، د. محسن، د. ئاکۆ و من ماینەوە، ئامێرەکانمان کۆ کردەوە، گوندێك هەبوو ناوی کانی شینکە بوو، لەوێ دامان نان، تا لە ئەگەری گرتنی بەرگەڵوودا ئەوانەی ئەوێ بگوازینەوە بۆ شوێنێکی دیکە و نەخۆشخانەیەکی دیکەی پێ بکەینەوە، لەو کاتی گواستنەوەیە بریندارێکمان بۆ هات لەو کاتەی کە هیچمان نەمابوو، بریندارەکە پێشمەرگەیەك بوو بە ناوی کەمال لە تیپی ٥٥ی حەمرین، گوللەیەك بەر سکی کەوتبوو، دەبوو نەشتەرگەری بۆ بکرێت، ئێمەش لەسەر ڕۆیشتین بووین، یان چواردە، یان پازدەی سێ بوو، بێ هیچ شتێك برینەکەمان کردەوە و دەستمان کرد بە نەشتەرگەری بۆی، شتێکی هەیە پێی دەڵێن (ئەمبوباك) هەناسەی ئاسایی پێ دەدا بەس ئەوەمان لابوو، لەگەڵ ئەمپولێکی پافیلۆن و پەسیدین هەرچەندە مادەی بێهۆشکردن نییە، بەس کەمێك ئازار کەم دەکاتەوە، ئێمە بێ نایترۆن ئۆکسایدو ئۆکسجین و سڕکردن ئەو نەشتەرگەرییەمان کرد، ئێستا بە هەر پزیشکێك بڵێیت بڕوا ناکات، کە گوللەیەك ڕیخۆڵەکانی بڕی بوو دووریمانەوە و پاکمان کردەوە، هێسترێکمان هێنا و سەرمان خست و بەڕێمان کرد و ئیدی دوای سێ چوار مانگ کە چوو بووینە سەقز ئەو پێشمەرگەیەم بینییەوە پیاسەی دەکرد و باش بووبوو کێشەی نەبوو، کە ڕەنگە لای زۆر کەس جێگەی بڕوا نەبێت.

سێ جاریش بە کیمیایی بەرکەوتبووم دوو جار لە بەرگەڵوو جارێکیش دواتر لە شاناخسێ، ئەوکات ڕێکخراوێك هەبوو ئەڵمانی بوو نزیکەی ٥٠٠ بۆ ٦٠٠ ماسکی بۆ

هێنـابووین، ئێمـەش بەکارمانـدەهێنا، هـەروەها هەنـدێك لـە پێشـمەرگەکانیش ماسـکیان هەبوو، ڕۆژێك چووین لە ژێر زەویدا ژوورێکمان دروست کـرد لـە دووری ٥٠٠ بـۆ ٦٠٠ مـەتر ژوورێکی نەشتەرگەری بوو، بۆ دۆخی لە ناکاو هەتا ئەگەر تۆپبارانیش کراین پـارێزراوبین، نۆرەی من بوو بچم ڕێگاکە پاك بکەمەوە، بینـیم تۆپبارانـە، بـەڵام تۆپەکـە نەدەتەقییـەوە، زانیمـان کیمیاییـە، جار جار تۆپبـارانی دەکـرد خـەڵك دەچوونە کونـەکان ئینجا کیمـیایی لێدەداین، خەڵك ناچار دەهاتـەدەر و ڕووە و بـەرزی ڕایـان دەکـرد، چـەندین پێشمەرگەمان بـەو شـێوەیە شـەهید بـوو، بیرمـە جارێـك تـۆپ دای لـەو ژوورەی کـە هـەڤاڵ نەوشـیروان مستەفای تێدا دەمایەوە، بەڵام پێشی پێنج خولەك بۆ دەست شۆردن چوو بووە دەرەوە، کـە هەڤاڵ ئەمیر لەوێ شەهید بوو، هەڤاڵ مەحموود سێدەری و کوڕەکەی لەوێ برینداربوون.

ئیدی دوای ئەوەی حکومەت سێ جار بە کیمیایی لـە بەرگەڵوویـدا ئێمـە پاشەکشەمان کـرد، لێـرەدا بەسـەرهاتێکی خـۆش دەگێڕمـەوە: لـەو زسـتانە کـە بـەفرێکی زۆر کـەوتبوو پاسدارەکان پووتیـان بـۆ هێنـابووین پێـی مـن و د. هـەڵۆ چل و یـەك بـوو، د. هـەڵۆ چل و پێنجی بەرکەوت، زۆر گەورە بوو، لە ڕێگـە هـەر دەیگـوت کاکـە مـن ئێسـتا پووتەکـەی خـۆم دەگۆڕم، کە چووینە گوندی یاخیان و گۆمەزەڵ دەبیـنم پووتەکـەی مـن نـەماوە، گـوتم کـاك دکتـۆر لـەو هـەموو خەڵکـە تـۆ ئـەوەی مـن دەبـەیت، ئیـدی بـەرەو سیتەك و شاناخسـێ بەڕێکـەوتین، کـە گەیشـتینە شاناخسـێ پێشـمەرگەکان باوەشـیان پێـداکردین، زۆر ڕێزیـان گرتین و لەوێ ماینەوە، هەرگیز ئەو هەڵوێستەم لـە یـاد ناچێت هـەموو دەگریـان، چونکە بیستبوویان ئێمە هەموومان پێکەوە شەهید بووین.

لە ١٩٨٨/٢/٢٢ کاتژمێر سێی بەرەبەیان من پاسەوانی نەخۆشخانەی بەرگەڵوو بووم، لـە ئاسمانەوە گوێم لـە دەنگێکی زۆر بـەرز بـوو، هـەڤاڵان کۆبوونـەوە گوتیـان ئـەوە ڕاجیمەیـە بینیمان بەرەو هەڵەدن و یاخسەمەر دەڕۆیشت لە ماوەی سێ کاتژمێردا سێ سەد برینـداری چەکی کیمیاییمان بۆ هات هەمووی بـە گـازی خـەردەل و گـازی سـارین و هـی پارچـە بـوون

بەرکەوتبوون، ئێمە خۆشمان بەهۆی هەناسەی ئەوانەوە تووش بووین، ئیدی بە ئاوی گەرم دەمانشتن و ئەتروپینمان لێ دەدان و دڵۆپەمان بۆ چاویان بەکاردەهێنا، شڵەژانێکی زۆرمان پێوە دیاربوو، دواتر گوندی نۆمەر قەومی گرتەوە، فریاکەوتنی ئەو هەموو بریندارە زۆر ئەستەم بوو، هێندە بەپەلە بووین هەڤاڵێکمان لەبری ئەتروپین، ئەدرنالینی بۆ چەند نەخۆشێك بەکارهێنا، کە یەك شێوەیان هەبوو بەس ناوەکەیان جیاواز بوو، ئەو دەرمانە بەپێچەوانەوە دۆخی نەخۆشەکە لەبری باش بوون خراپتر دەکات، پاش کەمێك وریا بووینەوە کە بەهەڵە بۆ چەند نەخۆشێك بەکارهاتبوو، دواتر چارەسەرمان کرد، ئیدی هەڤاڵانی ئەو دیوی ئێران هاوکارییان کردین، هەندێك لە بریندارەکانمان ڕەوانەی ئێران کرد، هەروەها چەند کەسێکیان لێ شەهید بوون، بۆیە لە ٢/٢٢ هەتا ٣/١٦ شەڕێك کرا وێنەی نەبوو، من ئێستا قسەیەك دەکەم ڕەنگە زانستی نەبێت، هەرچەندە زۆر (متدین) نیم، بەڵام هەندێك پابەندی ئایینییم هەیە، دەڵێم هەر پێشمەرگەیەك دوو فریشتەی لەگەڵ بوو ئەگەر نا، هیچ کەس ڕزگاری نەدەبوو، ٢٤ کاتژمێر تۆپباران لەسەر چیای دابان بوو، کەچی ڕۆژی دواتر یەك بۆ دوو بریندارمان هەبوو، بەڵام دۆخمان زۆر خراپ بوو، دوای چوونمان بۆ سەقز ڕۆژێك پێشمەرگەیەکی هاوڕێم بینی، لێم پرسی ئەرێ ئەوە چۆن توانیتان لەسەر چیای دابان بمێننەوە لە کاتێکدا ٢٤ کاتژمێر تۆپبارانتان لەسەر بوو؟ گوتی من ڕۆژێك بەتەنیشت نەخۆشخانەکەی ئێوەدا ڕۆیشتم و بینیم لە دۆڵەکە تاومیەکتان فڕێداوە، هەڵم گرتبوو، لە شەڕەکەش ئارد و ڕۆنم پێ بوو ئیدی بەو تاومیە خەنی بووم، بۆ خۆم هەر ناوساجیم دەکرد و دەمخوارد، منیش بیرم کردەوە کاتی خۆی نەخۆشێکمان هەبوو پیرێژنێکی پەککەوتە بوو گوللەی بەر کەوتبوو، پیسایی دەکردە ژێر خۆی، ئێمەش ئەو تاومیەمان لە ژێری دانا تا پیسایی تێ بکات، دوای ڕۆیشتنی ئەو تاومیەمان فڕێدایە ئەو دۆڵەوە چونکە بە کەڵکی بەکارهێنان نەمابوو، ئیدی ئەو هاوڕێیەم هەڵی گرتبووە بۆ ناوساجیکردن لە شەڕی دابان بەکاری هێنابوو.

لێرەدا دەمەوێت باسی د. شێرکۆ بکەم کە خەڵکی ژاراوەیە، لە بەری مەرگە و سێروان بوو لە گوندی سێروان نەخۆشخانەیەکی هەبوو، نەخۆش و برینداری هەموو ئەو ناوچەیەی لەسەر شان بوو، لە ئەنفالی یەکدا لە ١٩٨٨/٢/٢٢ حکومەت بە پێنج فەیلەق و چەندین فەوجی جاشەوە چواردەوری دۆڵی جافایەتیاندا، لە ٣/١٠ هێرشەکان چڕتر بوونەوە، لە قۆڵی بەری مەرگە و سێروان و لە قۆڵی دابان هەلاج و لە قۆڵی کارێزەوە هاتن، مەکتەبی عەسکەری ی.ن.ك لەوێ بوو ئەوکات ملازم عەمەر بەرپرسی بوو، د. شەماڵیش لەوێ بوو، لە کاتی پاشەکشە لە دەوروبەری ٣/١٥ گوندێك هەیە بە ناوی کانی توو، بە خەتی گوندی کانی شینکەدا سەرکەوتبوون هەورازێکە لای کانی شینکە و کانی توو حەفتا کەسیان لە سەرکەوتن بە سەر ئەو هەورازە بەفرەدا کە بەستبووی ڕەق بوونەوە، کاتێك سەرکەوتبوون خزیبوون بە تەقلە بەرەو خوار هاتبوون لەو کەوتنە خوارەوەیە سەریان بەر بەرد کەوتبوو شەهید بووبوون، بەڵام خۆشبەختانە د. شەماڵ کیسە خەوی پێ بووە و خورمای پێ بووە، دوو بۆ سێ ڕۆژ لە ژێر بەفرەکەدا شوێنێکی بۆ خۆی کردبووەوە و ڕەق نەبوو بووەوە، لەو بەفرە مابووەوە، ئێمە وامانزانی ئەویش لە شەهیدەکانە و ڕەقبووەتەوە و زۆر بۆی بە داخ بووین، کاتێکیش خۆی گەیاندە شاناخسێ، ئیدی زۆر دڵخۆش بووین، کە زیندووە.

من لە شاناخسێ ویستم سەرێك لە د. هادی بدەم، چونکە هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویستم بوو، لە شوێنێك بوو ئاوێك لە نێوانمان بوو، پاش نیوەڕۆیەك بوو هەرچەندە کەش سارد بوو، بەڵام کە تیشکی خۆرەکە لە تاشەبەردەکانی دابوو کەمێك گەرمی کردبوو، من کە ویستم بپەڕمەوە و بچم بۆ لای د. هادی لەو چەمە دەست و دەموچاوم شت، کە هەستم بە گەرمایی تاوێرەکان کرد خەیاڵی ئەوەم بۆ هات کە کەمێك لەسەر تاوێرێك پشوو بدەم، ئیدی بە خەیاڵی کەسوکارم ومنەوزێکمدا و سەرخەوێکم شکاند، لەناکاو بە دەنگی گرمەیەکی بەرز بە ئاگاهاتمەوە، هەڵسام و هەستم بە بۆنی سیر و سێو کرد، زانیم

کیمیاییـە، بەداخـەوە د. هـادی و چـەندین پێشمەرگەی دیکـەی شـەهید کـرد، برینـدارێکی زۆرمـان لـەوێ چارەسـەر کـرد، ئـەو ڕووداوەی کـە لـە مـردن گەڕامـەوە وەك یاداشـتێك بـە ناونیشانی (**وەنەوزێك لە کەناری مەرگدا**) نووسیومەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا چیرۆك و ڕۆمان خولیای منە و لەو بوارەدا دەخوێنمەوە.

کاتێك پاشەکشەمان کرد بۆ ئێران لە ناوچەی بانە و سەردەشت، لە نێوانی سەردەشت و قاسمەڕەش بە تراکتۆر و عەرەبانەیەك ئێمە و جەماعەتی ڕاگەیاندن و ئێستگە ٣٥ کەس بـووین سـەرکەوتبووین، لای گونـدی کـانی زەر عارەبانەکـە وەرگـەڕا، بـەڵام خۆشـبەختانە زیانێکی قورسمان نەبوو، بیرمە تەنانەت من شوێنی سەرکەوتنم نەبوو دۆشەکێکم لە پێشی شۆفێرەکە دانا لەسەر تراکتۆرەکە نزیکی ئاگرجۆزەکەی، چۆن لەسەر وڵاخ دادەنیشی ئـەوها هـەر قاچـێکم بـە لایەکـدا شـۆڕکردبووەوە، پارچـەی دۆشـەك بـوو یـان قـایش بـوو لـە ئاگرجۆزەکەم ئاڵاندبوو دەستم پێوە گرتبوو، بۆیە ئێمە بە هـەموو مەکتـەبی سیاسی یـەك لاندکرۆزەرمان هەبوو، هەڤاڵ مام جەلالیش یەك لاندکرۆزەری هەبوو، هـەڤاڵ دلێـری سـەید مەجید یەك جێبی هەبوو پشتەکەی چادر بـوو، لەگـەڵ یـەك تراکتـۆری جـۆری عەنتـەری مۆدێل سـاڵی ١٩٨٠، ئـەو حیـزب و شۆڕشـە گەورەیـە ئـەوها بـەڕێوەدەبرا، زۆر جـار مـن بـەو جێبە دەچووم لە کرماشانەوە دەرمانم بۆ ناوزەنگ پێ دەهێنا.

دواتـر لـە شاناخسـێوە چـووین بـۆ بانـە و سـەقز گوتیـان هـەڤاڵ نەوشـیروان مستەفا دەیەوێت لە سنووری هەڵەبجە نەخۆشخانەیەك بکاتـەوە کێ دەچێت؟ گوتیـان د. دانـا و د. ئارام بـا بچن، پێکەوە چووین لـە گونـدی جەلیلـە نەخۆشـخانەیەکمان دانـا، دەنگـۆی ئـەوە بڵاوبـووەوە کـە حکومـەت دەیـەوێت ئـەو ناوچـانە بگرێتـەوە، ئێمـە نەخۆشـخانەکەمان بـۆ گوندی هاوار گواستەوە دواتر بۆ گوندی دەرەتـوێ، ئـەو دەرمانـەی کـە هـەمان بـوو بـە وڵاخ گواستمانەوە، هەموو کات لە هەر هێسترێك سێ فەردەمان بـار دەکـرد، فەردەیەکیشمان دەدا بە کۆڵماندا، ڕۆژێك لە گوندی دەرەتوێدا دەڕۆیشتم هـەورازێك هەیـە پێـی دەڵێن هـەورازی

گاکوژە، زۆر سەختە، لەوێ هەرچۆنێك بێت زۆر بەئەستەم بە هێسترێك بە سێ فەردە دەرمانەوە، فەردەیەکیش بە کۆڵی خۆمەوە سەرکەوتم، لە شۆڕبوونەوە بۆ گوندی قولاگەی دیوی ئێران، نشێوێکی زۆر سەختتر هەبوو، بەڵام شارەزای بووبووم، بەرەو خوار بە هێسترەکەوە کەوتمە ڕێ، کلکی هێسترەکەم گرتبوو تا نەخزێ، خۆیشم وردە وردە لەگەڵی دەچوومە خوارەوە، کابرایەك هەبوو خەڵکی هاوار بوو ناوی مام هادی بوو لە گوندی قەلاگەوە دەهاتەوە کەمێك باری دەرمانی تەواو نەبوو، هەمیشە پێ دەکەنی، هات و گوتی دکتۆر ئارام وەزعت چۆنە دەنگوباس چییە؟ منیش گوتم تەماشای ناو دەستم بکە کلکی هێستر لە ناو دەستی دکتۆر بێت دەبێ وەزع چۆن بێت!

ئیدی نەخۆش دەهاتنە لامان، ڕۆژێك ژنێك هات بۆ لامان پاش مانگێك لە کیمیاباران تەنها جلی بەرکەوتەی کیمیایی لەبەر کردبوو، هەموو لەشی بووبوو بە کیمیایی، لەوێ دەرمانم پێدا، شەوێك لە گوندی دەرەتوێ ئەوەندە ماندوو بووم، زۆریش تاریك بوو ڕاست لە شوێنی خۆم پاڵکەوتم بخەوم دەستم بەر بەرزییەك کەوت وەك گردێك وابوو گونجاو بوو بۆ ئەوەی لەبری سەرین سەر بخەمە سەری، منیش سەرم لەسەری دانا و خەوتم، کە سبەی هەڵسام بینیم گۆڕی منداڵێکە، واتە گۆڕ لەوێ ئەوەندە زۆر بوو.

ڕۆژێك لە دەرەتوێ لە ژێر دارگوێزێك پیاوێك هات ناوی حەمەسەعید بوو (باوکی هەڤاڵ حەمەی حەمەسەعید) کچێکی خۆی پێ بوو ناوی کوێستان بوو، تووشی ئازارێکی زۆری گورچیلە بووبوو، لە تاو ئازار تەقڵی دەدا، منیش دەرزیم بۆ کرد و موغەزیم بۆ هەڵواسی و بە بزمار لە دار گوێزێکمدا، بۆ سبەی باشتر بوو، باوکی گوتی دکتۆر ئارام خۆت دەزانی دۆخەکە خراپە ئەگەری هێرشی حکومەت هەیە بۆ ئەم ناوچانە، ئەگەر هێرشی کرد ئاگاداربە کەس نابێت بە برای کەس، من یەك نهێنیت پێ دەڵێم، بەو مەرجەی نابێت بە کەسی بڵێیت، گوتم باش، گوتی ئەگەر کەوتیتە ئەو دیوی ئێران بڵێ من قاڵخانیم، واتە (کاکەیی)، ئەگەر لێشیان پرسی چۆن تۆ کاکەییت، بیسەلمێنە؟ من ئەو وەلامەت پێ دەڵێم

یەکسەر بڕوا دەکەن کە تۆ کاکەییت، لە ڕاستیدا نهێنییەکە، بەڵام بەو مەرجەی ئەو نهێنییە بە کەس نەڵێیت، گوتم باش، ئیدی نهێنییەکەی پێ گوتم، بەڵام من لێرەدا نایڵێم، چونکە بەڵێنم پێدا، بۆیە لەساڵی (١٩٨٨)ەوە ئەو نهێنییەی پێ گووتوم، تا ئێستا من بە کەسم نەگووتووە و بە کەسیش ناڵێم و لەگەڵ خۆم دەیبەمە ناو گۆڕەوە.

ئەو ماوەیەی لەوێ بووین سێ مانگی خایاند، دواجار من لەسەر ترۆپکی گاکوژە بووم هێلیکۆپتەرێك بۆم نزم بوویەوە، ئەو کۆڵەپشتە دەرمانەی کە پێم بوو فڕێمدا و هەر ئەوەندە توانیم خۆم ڕزگار بکەم، دواتر بەرەو ناوچەی جوانڕۆ بەڕێکەوتین دواتر بۆ سێلاسی باوەجان لە ملەی ئاوارە کە سەر بە جوانڕۆ بوو ماینەوە، تا ڕاوەستانی شەڕی عێراق–ئێران لە ١٩٨٨/٨/٨ ماینەوە، دواتر پێیان ڕاگەیاندم لە ناوچەی قەندیل شەڕە و حکومەت هێرشی کردووە و پێویستە بگەڕێنەوە بۆ ئەوێ، ئیدی لەگەڵ هەڤاڵ دانا و هەڤاڵ هەندرێن گەڕاینەوە، لەوێ تووشی د. هەڵۆ بووین، گوتی ئێوە تازە هاتوون نابێت ئێوە وا زوو یەکسەر بگەڕێنەوە.

دواتر گەڕاینەوە دیوی باشووری کوردستان، لە مەڵبەندی دوو لە گوندی بلەکێی سەر بە شارەدێی ئارماوا لای شاخی چەمپاراوا نەخۆشخانەیەکمان دانا، د. جەبار عەبدول نەریمانیش لەوێ بوو، دواتر لەوێوە بۆ قاسمەڕەش و پاش ماوەیەك گەڕاینەوە بۆ گوندی قوڵەهەرمێ کە نەخۆشخانەیەکی کۆنی شۆڕشی لێ بوو کە لە ساڵی ١٩٨١ دامەزرابوو، ئاوەدانمان کردەوە، بەڵام زۆر لەوێ نەماینەوە، دواتر هاتینە زەڵێ و ناوزەنگ و نەخۆشخانەیەکمان کردەوە، بەتەواوی لەسەر سنووری عێراق–ئێران بە جۆرێك تەنها جۆگە ئاوێك نێوانمان بوو.

لەوێ من و د. شێرکۆ و د.خالید بۆ شوێنێك دەگەڕاین ئاوی هەبێت، د. شێرکۆ گوتی من دەزانم کانی لە کوێ هەیە، بگەڕێم دەیدۆزمەوە، ئیدی زۆر گەڕاین نەماندۆزیەوە، من کەمێ دوور کەوتمەوە هەتا میز بکەم، لەو کاتەدا شینکاییەکم بینی گوتم د. شێرکۆ وەرە،

گوتی چییە؟ گوتم تەماشا ئەوە شینکاییە، گوتی وەڵا ئەوە کانییە، ئیدی دەستمان کرد بە هەڵکەندن پاش کەمێك ئاو هاتە دەرەوە، کە کەمێك لە سەرووی نەخۆشخانەکەوە بوو، من بە گاڵتەوە گوتم ناوی لێدەنێم (کانی میز)، ئەویش هەر بە گاڵتەوە گوتی با ناوی لێ بنێین (کانی ڤونێ)، ئیدی بۆ نەخۆشخانەکەمان زۆر پێویست بوو، ئاومان بۆ لای نەخۆشخانەکە لێوە ڕاکێشا.

لە ناوزەنگ خزمەتی زۆری پێشمەرگە و برینداری هاوولاتیی خەڵکی سنوورمان دەکرد ئەوانەی مینیان پێدادەتەقی، نەخۆشخانەکەمان بە ناوی شەهید د. هێمن ناونا، کە پزیشکێکی خۆمان بوو، د. هێمن حەمەصالح، کە لە ناوچەی قاسمەڕەش ئۆتۆمبێلەکەی وەرگەڕابوو شەهید بووبوو.

جارێك لە نەخۆشخانەی ناوزەنگ من و دکتۆرێکی هاوڕێم بووین، ژنێك هات منداڵی دەبوو، کەس نەبوو ناچار دەبوو ئێمە ڕزگاری بکەین، ژنەکەمان لەسەر قەرەوێڵەیەك دانا و من و دکتۆرەکەی هاوڕێم هەر یەك لە لایەکی ژنەکە بووین، ئیدی لە کاتی ئەوەی هێندەی نەمابوو منداڵەکەی بێتە دەرەوە زۆر ئازاری هەبوو، لە تاوی ئازار ویستی بە توندیی لێواری قەرەوێڵەکە بگرێت، لەناکاو دکتۆرەکەی هاوڕێم هاواری کرد، سەیر بوو بە لامانەوە، کەچی تەماشامان کرد ژنەکە لەبری لێواری قەرەوێڵەکە بگرێت بە توندی گونی دکتۆرەکەی هاوڕێمی گرتبوو، دواتر بەخۆشحاڵییەوە ژنەکە ڕزگاری بوو، واتە منداڵەکەی لەدایك بوو، جگە لەوەش بەسەرهاتی خۆشمان هەبوو خەڵکی هەبوو دەهات تووشی کۆکە بووبوو دەیگوت دکتۆر دوو شروبی کۆکەم بدەنێ یەك بۆ خۆم ئەوی دیکە بۆ هێسترەکەم.

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٩ هەڤاڵ مام جەلال لە قاسمەڕەش کۆبوونەوەیەکی پێ کردین، بە گشتی نزیکەی ٣٠ سی کادیری تەندروستی مابووین، زۆر ستایشی کردین و دەستخۆشی لێ

کردین، گوتی هەر کەسە و لایتێکم بۆ هێناون[٣١]، دواتر گوتی تیپەکان وا دەچنە خوارەوە بۆ کاری پارتیزانی، ئێوەش لەگەڵ پارتیزانەکان بچنە خوارەوە، گوتی کێ قسەی هەیە؟ گوتم مامە من قسەم هەیە، گوتی فەرموو، گوتم مامە جەنابت بۆ هەر کوێ بڵێیت ئێمە دەچین، بەڵام ئەو هەڵبژاردەیەمان بدەرێ کە ئێمە خۆمان ئەو کەسانە هەڵبژێرین کە لەگەڵی دەچین، پێشنیارەکەی بە دڵ بوو، قایل بوونی نیشاندا، ئیدی دابەش بووین بە سەر تیپەکاندا، پێشتریش لەوێ خولێکمان کردبووە، کە هەر پێشمەرگەیەکی پارتیزان کە بڕیار بوو بچێتە خوارەوە لە خولەکەی ئێمە فێری خۆپاراستن و برینپێچی و سکچوون و کۆکە و مار و دووپشك پێوەدان بکرێت، لەفاف و حەبی سکچوون و سەرئێشە و شروبی کۆکەمان پێ دەدان.

ساڵی ١٩٨٩ هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ نەخۆش کەوتبوو، هات بۆ نەخۆشخانەی ناوزەنگ پێویستی بە هێلکاری سنگ هەبوو، من لەگەڵ یەکێك لە دکتۆرەکان لەوێ بووم، دکتۆرەکەی هاوڕێم لیدەکانی دانا، من گوتم لیدەکە شوێنەکەی تەواو نییە، گوتی تەواوە، گوتم ببورە تەواو نییە، گوتی نەخێر، من دکتۆرم دەزانم، گوتم بچم پەرتووکێك بهێنم باسی ئەو دۆخە دەکات؟ گوتی بیهێنە، پەرتووکەکە ناوی هەریسنە کە لە کۆلێژی پزیشکی دوو پەرتووك دەخوێنرێ، یەك ئەمریکی بە ناوی هەریسن و ئەوەی دی بەریتانی بە ناوی داڤیسین، کە هێنام قسەکەی من تەواو بوو، هەڤاڵ کۆسرەت پێی سەیر بوو، دەرچوویەکی پەیمانگا ئەو زانیارییەی هەبێت لە دکتۆرێك باشتر بێت، جگە لەوەش منی زۆر خۆش دەویست، گوتی چۆن ئەوەت زانی گوتم من یەکەمی خولی خۆم بووم، گوتی د. ئارام بەڵێن بێت بچینەوە لە کۆلێژی پزیشکی وەرت بگرمەوە و بەڵێن بێت پەیکەرێکی زێڕیشت بۆ دروست بکەم.

یەکێك لە مەترسییەکان بریتی بوو لە خۆڕادەستکردنی پێشمەرگە، ئەویش حکومەت بەو مەرجە وەری دەگرتن دەبوو چالاکییەك بکات و زیانێك لە پێشمەرگە بدات، بەڕاستی

---

(٣١)- بۆ بینینی وێنەی لایتەکە بڕوانە پاشکۆی وێنەکان.

ئەمە مەترسییەکی زۆر شاراوەی ناخۆش بوو، واتە دەبوو کەسێك، یان چەند کەسێك شەهید بکات، نموونەیەکی لەو شێوەیەم لە بیرە پێشمەرگەیەك خۆی ڕادەست کردبوو، داوای چالاکییان لێ کردبوو، ئەویش چوو بوو دوو کادیری ح.ش عەرەبیش بوون شەهید کردبوو، ئیدی هەتا ڕاپەڕین لە ناوزەنگ مامەوە، بەدرێژایی ئەو ماوەیە نەخۆش و بریندارمان چارەسەر دەکرد.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٩ و دەوروبەری ساڵی ١٩٩٠ هەڤاڵ نەوشیروان و هەڤاڵ فەرەیدوون، بە سەر مەڵبەندەکاندا دەگەڕان، گوتیان بچنەوە و خۆتان بپارێزن، بەڵام نەبنە جاش، ڕەنگە نەتوانین لێرە هەمووتان بهێڵینەوە، هەر کات پێویست بوو دەتانگەڕێنینەوە، ئیدی ژمارەیەك دکتۆر و پێشمەرگە خۆیان ڕادەست کردەوە، کە بەهۆی ئەو بڕیارەی هەڤاڵ نەوشیروان و هەڤاڵ فەرەیدوونەوە بوو، نەك ویستی خۆیان، بەڵام من هەر مامەوە لە ناوزەنگ و ئەو ئامادەییەم نیشان نەدا، بڕیارم دابوو هەتا سەدام مابێت نەگەڕێمەوە.

دوو مانگ پێش هەڵایسانی ڕاپەڕین دوو کوڕ هاتنە نەخۆشخانەکەی ئێمە بە ناوی (چیا و سەیوان) چاپخانەیەکیان هێنابوو، هەڤاڵ نەوشیروان ناردبوونی، لەبەرئەوەی نەخۆشخانەکەی ئێمە پارێزراو و جێگەی گومان نەبوو، ئەو دوو گەنجە لەوێ نامەیان دەنووسی بۆ جاشەکان کە ئەگەر ڕاپەڕین کرا هاوکاری ڕاپەڕین بن، لەو ماوەیەدا لەلایەن هەڤاڵ کۆسرەتەوە نامەیەکم بۆ هات تێیدا نووسرابوو: "د. ئارامی خۆمان کەس بەکەڵکمان نایەت، هەر خۆمان بە کەڵکی خۆمان دێین، هێسرێکت بۆ دەنێرم هەندێك دەرمانی لێ بار بکە و وەرە خوارەوە"، منیش یەکسەر خۆم گۆڕی و دەستم دایە چەکەکەم و فەردەیەك دەرمانم لێ بار کرد و چوومە خوارەوە، هەڤاڵ کۆسرەت لە گوندی سوونێ لە ناوچەی قەڵادزێ چاوەڕێی دەکردم، ئەو ڕۆژە ١٩٩١/٣/٥ بوو، چەندین ڕەبایە لەوێ هەبوون دەستی بە سەردا گیرا، لە دەوروبەری قەڵادزێ نزیکەی ٣٠٠٠ سێ هەزار پێشمەرگە هەبوون، ئەوەی

لەو قۆڵەوە من بینیم لە دکتۆرەکان بریتی بوون لە د. گرنگ و د. عەبدولواحید ئیدریس و سەید عەلی و هەڤاڵ دلێر کە لەگەڵ شەهید کوێستانی هاتبوونە خوارەوە.

ئیدی لە دوای ڕاپەڕین نەخۆشخانەی ڕانیەمان ئاوەدان کردەوە، هەڤاڵ کۆسرەت پێی گوتم تۆ ببە بە بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە، ئەگەر برینداریشمان زۆر بوو ڕەوانەی ئێرانی بکە، بەڕاستی نەمانـدەزانی ئایا سەردەکەوین یاخود نەخێر، لە ٣/١٥ هەڤاڵ کۆسرەت بروسکەی نارد بگەڕێمەوە هەولێر، نەمزانیبوو براکەم شەهید بووە، کە لە ٣/١١ شەهید بووبوو، بەناوی شەهید مام تەها، شاعیر و چیرۆکنووس بوو، لەم دواییە بەرهەمەکانیم چاپکردووە، بەناونیشانی (توێشووی شاسواری ڕاپەڕین)، کە د. عەبدولواحید ئیدریس ئەو ناونیشانەی بۆ هەڵبژادووە، ئێستا کە (٢٠٢٢)ە ڕێگەنادەن لە پەرتووکخانەکانی هەولێر بفرۆشرێت، لە کاتێکدا یەکەم شەهیدی ڕاپەڕینی ڕزگارکردنی هەولێرە.

من لە هەولێر بووم کۆڕەو دەستی پێ کرد، دوای کۆڕەو هاتمەوە ڕانیە، لە دەزگای تەندروستیی کوردستان کە پێشتر لە ١٩٨٧ دامەزرابوو، هەڤاڵ مام جەلال گووتی دەمەوێت ئێوە بەشێوەیەکی فراوانتر کار بکەن، لەبری نەخۆشخانەی شۆڕش وەك دەزگای تەندروستیی کوردستان کاربکەن، وەك دەزگایەکی خێرخوازی تەندروستی، ئیدی چەندین ڕێکخراوی جیهانی هاوکاری دەکردین، د. شوان سەرۆکی بوو، من و د. خالید و چەند دکتۆرێکی دیکە کارگێڕ بووین، ئەو کاتە حکومەتی هەرێم دانەمەزرابوو ئێمە وەکو دەزگای تەندروستی هەموو نەخۆشخانەکانی کوردستانمان بەڕێوە دەبرد، نزیکەی ٨٠ نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستیمان بەڕێوە دەبرد، دوای دامەزراندنی حکومەت هەموو دامەزراوەکانمان ڕادەستی حکومەت کرد.

ئیدی ئێمە لێرەوە دەستمان کرد بە ناردنی خزمەتگوزرای تەندروستی بۆ گوندەکان، وەك دروستکردنی تیمی تەندروستی و دابینکردنی ئاوی پاك بۆ خواردنەوە، لەگەڵ Local NGO , International NGO، هەروەها ICRC و NPA و Medico

International و MSF و NDM چەندانی دیکە پەیوەندی باشمان هەبوو، کە نەخۆشخانەمان دەبردە گوندەکان و ئاومان بۆ دابین دەکردن ئیدی خەڵکەکە دەگەڕایەوە گوندەکەی خۆی، تا ئێستا بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەو دەزگایە لە خزمەت بەردەوامە.

لە دوای ڕاپەڕین من بووم بە بەڕێوەبەری گشتی لە تەندروستیی کۆیە، لەوێ کەمپێکی ح.د.ك هەبوو، بە ناوی ٢٥ی گەلاوێژ نەخۆشخانەیەکم بۆ دروستکردن، ئەوکات د. زریان وەزیری تەندروستی بوو زۆر هاوکاری کردم، هەروەها ئۆتۆمبێلێکی فریاکەوتنیشم بۆ دابینکردن، هەرچەندە کارەکەم نایاسایی بوو، بەڵام من دەمزانی بۆ کێی دەکەم و ئەوان کێن، تا ئێستاش خۆم بە قەرزارباری ئەوان دەزانم.

دوای دامەزراندنی حکومەت چوومە لای هەڤاڵ کۆسرەت گوتم کاتی خۆی بڕیار بوو من بچم کۆلێژی پزیشکی تەواو بکەم، تەنانەت ناوەکەم ڕۆیشتبوو، بەڵام کەسی دیکە لە شوێنی من دانرابوو، پێم گوت فڵان کەس دانراوە، فڵان کەسیش هۆکار بووە، ئیدی لیژنەیەکیان پێکهێنا، تەماشای تۆمارەکان کرا و هەر وادەرچوو، ئیدی لە ١٩٩٣ بڕیار درا من وەربگیرێمەوە، بەڵام دۆخی ماڵی ئێمە خراپ بوو، برایەکم شەهید بووبوو، موڵك و سەروەتێکی زۆرمان تێداچوو بوو، بۆیە پێویستم بەکارکردن هەبوو، لە ساڵی ١٩٩٦ پێشکەشم کرد، بەڵام بەهۆی شەڕی ناوخۆوە چووین بۆ سلێمانی، لە سلێمانی وەرگیرام، خێزاندار بووم و دوو منداڵم هەبوو، دایك و باوکم لەگەڵ بوون چونکە بەهۆی لێکەوتەکانی شەڕی ناوخۆوە لە هەولێر دەرکرابووین، ئیدی لە ساڵی ١٩٩٧ لە کۆلێژی پزیشکی دەستم بە خوێندن کردەوە، واتە تەمەنم ٣٦ ساڵ بوو، خوێندکارەکان وایاندەزانی مامۆستام، دواتر لە ساڵی ٢٠٠٣ تەواوم کرد، بۆ من زۆر ناخۆش بوو لەبەرئەوەی خێزانم هەبوو، هەروەها هیچ داهاتێکیشم نەبوو، دەبوو لەبری خوێندن کار بکەم، ئەو کۆلێژەش بەشێوازێکە دەبوو بەردەوام بخوێنی واتە بواری کارکردنم نەبوو لەگەڵ خوێندندا، بۆیە ئەگەر ڕۆڵی خێزانم نەبووایە نەمدەتوانی بەردەوام بم، لە ڕیزبەندی خوێندکارەکانیشدا بە

نزیککراوەیی لە ناوەڕاستەوە بووم، دواتر لە ۲۰۰۳ داوام لە د. محەمەد خۆشناو کرد کە وەزیری تەندروستی بوو لە خوێندنی باڵا وەربگیرێم، گوتی بەسەرچاو بەڵام بەمەرجێك شوێنێکمان هەیە دەبێت ببیت بە بەڕێوەبەری گشتی، ئیدی بووم بە بەڕێوەبەری گشتی تەندروستیی کۆیە و دواتر پسپۆری جومگە و ڕۆماتیزمم لە کۆتایی ساڵی ۲۰۰۷دا تەواو کرد، لە هەشت کەس سێیەم کەس بووم، واتە دیبلۆمی باڵا، دواتر نۆرینگەم دانا.

ئەو ماوەیەی کە بەڕێوەبەری گشتی بووم هەفتەی دوو ڕۆژ لە نەخۆشخانە نەخۆشم دەبینی، هەروەهاماڵیشم لە کۆیە بوو، بەڵام لەوێ پزیشك کەم بوو داوای پزیشکم لە د. بەرهەم ساڵح و هەڤاڵ عومەر فەتاحیش کرد بۆیان دابین نەکردم، ئیدی بۆ ئەوەی کەمتەرخەمییەکە نەیاتە سەر من دەستلەکارکێشانەوەم پێشکەش د. تاهیر هەورامیی وەزیری تەندروستی کرد، گوتی باشە بەڵام لە وەزارەت دەتکەم بە ڕاوێژکار، ڕاستەوخۆ هەر ئەو ڕۆژە لەبری خۆی ناردمی بۆ بەغداد بەمەبەستی کۆبونەوەیەك لەگەڵ وەزیری تەندروستیی عێراق، هەرچەندە لە ساڵی ۱۹۸۳وە بەغدادم نەبینی بوو، ئیدی لە ساڵی ۲۰۱۱وە ڕاوێژکارم لە وەزارەتی تەندروستی، هەرچەندە ئێستا وەزیری تەندروستی لە حیزبەکەی خۆم نییە، کەچی هەستیارترین و وردترین کارەکان بە من ڕادەسپێرێت، لەبەرئەوەی لە شارەزایی و دەستپاکیم دڵنیان.

لە ۱۹۹۲/۵/۸ هاوسەرگیریم کردووە، خێزانم کارمەندی تەندروستییە، چوار منداڵم هەیە سێ کوڕ و کچێك[۳۲].

---

[۳۲]– چاوپێکەوتن لەگەڵ: سەعدوون ڕۆستەم عەبدوڵڵا سەعدوون (د. ئارام)، هەولێر، ۲۰۲۲/۲/۱۸، ئیسماعیل خالید: تەندروستیی شۆڕش، گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە، ژ٥، سلێمانی، ۲۰۲۰، ل١٤-١٥.

# سلێمان محەممەد حاجی قادر (د. سلێمان)

ناسراوم بە دکتۆر سلێمان لە ١٩٦٦/٣/٢١ لە گوندی بیرەسپانی پردێ/ کەرکووك لەدایك بووم، لە سەرەتای هەشتاکان پەیوەندیم کردووە بە ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ک)ەوە، لە ساڵی ١٩٨١دا دەستگیرکرام و لە ساڵی ١٩٨٢ بەر لێبووردنی گشتی کەوتم و ئازاد بووم، ساڵی ١٩٨١ چوومە ناوچەی شێخ بزێنی لە کەرتی ١ی ساڵەیی لە تیپی ٢١ی کەرکووك، ناوچەکە لە کەرکووك نزیك بوو، پێشمەرگە چالاکی زۆری دەکرد، ڕژێمیش بە فڕۆکە و بۆمباران و پیادە هێرشی دەکرد، لە نێوان پێشمەرگە و هاووڵاتی بێ چەکدا چاوپۆشی نەدەکرد، هەروەها ناوچەکە زۆر پێویستی بە کادیری تەندروستی هەبوو.

کادیری تەندروستی کاری فریاکەوتنی سەرەتایی و چارەسەرکردنی پێشمەرگە و هاووڵاتی لەسەر شان بوو، کاتێك پێشمەرگە و هاووڵاتی کە بریندار دەبوون، یان نەخۆش دەکەوتن، دەبوو ئێمە چارەسەری بۆ بکەین، بۆ نموونە پێشمەرگەی دیاری ناوچەکە هەڤاڵ عەلی مەزهەر لە شەڕێك لە شیوەسوور ناوچەی شوان بریندار بوو، هەر لە ساڵی ١٩٨٦ چەند هاووڵاتییەکیش بریندار بوون.

لە شەڕەکانی بان شوان چالاك زەردکی برینداڕر بووبوو، لە ماڵی ئەحمەد حاجی ساڵحی گوندی شەوگێڕ بوو، ڕۆژانە چارەسەرمان دەکرد، هەرچی دەرمان و پێداویستی پزیشکییە لە لەلایەن خەڵکانی دڵسۆزەوە بۆمان دەهێنرا.

لە ساڵی ١٩٨٧ بۆ ١٩٨٨ هێرش لەسەر ناوچەکە فراوانتر بوو، لە سەرەتای مانگی شەشی ١٩٨٧ ڕژێم بەرەو بناری خاڵخالان هێرشی کرد، دواتر لە ١٩٨٧/٦/١٣ هێرشی بەرەو گوندەکانی ناوچەی شێخ بزێنی خواروو لەوانە: کانی ڕەش، مەرزیخە و عەمدۆن دەست پێ کرد و شەڕ هەڵایسا، چەند برینداڕێکمان هەبوو لەوانە هەڤاڵان؛ (سەرکەوتی ئاسایش، دارای مام سدیق، ئاکۆ سوور و پێشمەرگەیەکی هێزی پشتگیری)، لە نێویاندا برینەکەی

سەرکەوت قوورس بوو چەندین پارچەی گەورە بەر ڕان و پێی کەوتبوو، فریاکەوتنی سەرەتاییمان بۆ ئەنجامدا و گواستمانەوە بۆ تولکی مالی هەڤاڵ مەلا شاخی، دوای چەند ڕۆژێك هێرش بۆ چەمی تولکی کرا و لەوێوە گوێزرایەوە بۆ گوندی مەرزیخە، کاتێکیش هێرش کرا بۆ سەر چەمەکە پێشمەرگە و هێزی پشتگیری بە توندی بەرپەرچیان دانەوە، ڕژێم شکا شەڕەکە بەرەو قوورستر دەڕۆیشت و دوژمن زیانێکی زۆری بەرکەوت و چەندین کوژراوی لێ بە جێما.

بەڵام ئێمە چەندین شەهید و بریندارمان هەبوو شەهیدەکان بریتی بوون لە:

١. کەریم فارس (مام کەریم) خەڵکی بیرەسپان بوو.

٢. مەلا یوسف دوبزی.

بریندارەکانیش بریتی بوون لە:

١. سەرباز مام حسێن لێپرسراوی کەرتی یەکی ساڵەیی

٢. فازڵ حەمەڕەش ڕۆژبەیانی، پێشمەرگە

٣. سیروان تەپەیی کە هەر زوو چارەسەری سەرەتایی بۆ کرا.

دواتر ناچاربووین لە ناوچەکە دووریان بخەینەوە بۆ گوندی عەمدۆك و مەرزیخە، فازڵ و سیروان برینەکەیان قوورس بوو، پێشمەرگەکانی کەرتەکە لە شەڕەکە بوون، بۆیە بۆ من و عەلی گەرمیانی (حاکم عەلی) گواستنەوەی دوو بریندار قوورس بوو، خەڵکی ناوچەکە یارمەتییان داین، بە تایبەت کوڕانی مام شکور عەمدۆن، دواتر لە مەرزیخە چووینە مالی مامۆستا شێرکۆ کە مالی لە شوێنێکدا بوو چڕ بوو بە دار و درەخت، لە نزیکی زێ بوو، بەس دایکی لە ماڵ بوو، کەسێکی باش و بەڕێز بوو کوڕەکانی پێشمەرگە بوون، ناوچەکە پڕ مەترسی بوو گەمارۆ درابوو، پاش دوو ڕۆژ دەرمانمان نەما، بەتایبەتی موغەزی، دواتر بریندارەکان بەرەو باش بوون چوون و خۆشبەختانە تا ئێستا لە ژیاندان.

**شەڕی سماقە:**

لە نێوان تەقتەق و کۆیە ڕوویدا، شەڕێکی قوورس بوو، سێ برینداریان گواستەوە بۆ ناوچەی شێخ بزێنی، لە گوندی شەوگێڕ بۆ ئەوەی ڕەوانەی سەرگەڵوو بەرگەڵوویان بکەن کە نەخۆشخانەی شۆڕش و مەڵبەندی دووی لێ بوو، لەبەرئەوەی برینەکەیان سەخت بوو، لە ماڵی کەسێك بە ناوی کاك سدیق مانەوە مەفرەزەیەکی پێشمەرگەیان لەگەڵ بوو، یەکیان بڕبڕەی پشتی شکابوو، دووەمیان بەر دەم و لووتی کەوتبوو، سێیەم بەر سکی کەوتبوو، باری تەندروستیی خراپ بوو، وابزانم ناوی سەلیم بوو، بۆیە داوام کرد پەلە بکرێت بۆ بردنیان بۆ سەرگەڵوو، هەروەها زۆر هاوکاری کران.

**نەخۆشی مەلاریا:**

لە ساڵی ١٩٨٧ – ١٩٨٨ ناوچەکە نەخۆشی مەلاریای زۆر بە توندی گرتەوە، هەروەها چارەسەری پێویستیش لە سەرەتادا لە بەردەست نەبوو، بۆیە داوا لە کادیرەکان کرا هەوڵی پەیداکردنی دەرمان بدەن، بۆیە هەڤاڵ مەلا شاخی کە کادیر بوو لە ڕێگای ڕێکخستنەکانەوە توانی چەند پێداویستییەکی پزیشکی دابین بکات، ئێمەش بۆ چارەسەری پێشمەرگە و هاووڵاتیانی ناوچەکە بەکارمان هێنا، شایەنی باسە حەبەکە لە ڕێگای سەید حەسەن قەباغەوە، نێردرابوو.

ئیدی ژیانی پێشمەرگایەتی و پزیشکیم تا ساڵی ١٩٩١ بەردەوام بوو، دواتر لە ١٩٩٢ چوومە سکرتاریەتی هەڤاڵ مام جەلال و بوومە لێپرسراوی نەخۆشخانەی سکرتاریەت، تا ٣١ی ئابی ١٩٩٦ بەردەوام بووم، پاشان چوومە نەخۆشخانەی سلێمانی لە دامەزراندنی نەخۆشخانەی شۆڕش بەشدار بووم، من لە پێنج کەسی یەکەمی سەرەتایی دامەزراندنیم، کە لە نزیك بینای حەسیب ساڵح لە شوێنی ئێستای لقی پ.د.ك تەنیشت باخی گشتی سلێمانی بوو، پاشان تیمێکم دروست کرد بۆ لەشکری سلێمانی کە نزیك باخی بەختیاری بوو، پاشان شوێنەکە بووە وەزارەتی پێشمەرگە، کە فێرگەی مەشقی سلێمانی دامەزرا،

چووم بنکەیەکی تەندروستیم لە فێرگەکە دروستکرد، کە سەر بە نەخۆشخانەی شۆڕش بوو، تا ڕزگارکردنی کەرکووک لە ساڵی ۲۰۰۳ پاشان گوازرامەوە نەخۆشخانەی شۆڕشی کەرکووک، تا ئێستاش بەردەوامم لە خزمەتی پێشمەرگە و کەسوکاری پێشمەرگە و کەسوکاری سەربەرزی شەهیدانی کوردستان و خەڵکی هەژار[٣٣].

[٣٣]– سلێمان محەمەد حاجی قادر (د. سلێمان)، کەرکووک، ٢٠٢٢/٢/١٩.

# شۆڕش عەزیز خزر عەزیز (د. بەڵێن)

لە ساڵی ١٩٦٤ لە گەڕەکی ڕزگاری شاری هەولێر لەدایك بووم، ئێمە خوشکێك و چوار برا بووین، من سێیەم منداڵی خێزانەکەمان بووم، لە ساڵی ١٩٧١ لە قوتابخانەی باباتاهیری هەمەدانی چوومە بەر خوێندن، دواتر لە خوێندنگەی سەربەستی خوێندوومە، دواتر بەشی زانستیم لە ئامادەیی ئەربیل تەواو کرد، پاشان ناوم لە ئامۆژگای باڵای تەندروستیی هەولێر هاتەوە.

لە ساڵی ١٩٨١ لە ڕێگەی هاوڕێیەکم بە ناوی حاکم شێرزاد پەیوەندیم بە (ك.ڕ.ك)ەوە کرد، یەکێك لەو کەسانەی کە شانازی پێوە دەکەم کە پێکەوە لە یەك شانە کارمان کردووە ئەویش شەهید سەرداری سەعید سۆفییە، بەگشتی شێوازی ڕێکخستن نهێنی بوو بۆ نموونە ژمارە یەك، چوار کەسی لابوو واتە ٢ و ٣ و ٤ و ٥، ژمارە یەك هەموویانی دەناسی، تەواوی ژمارەکانی دیکەش ژمارە یەکیان دەناسی، بەڵام ژمارەکانی دیکە یەکدیان نەدەناسی، بۆیە لە خراپترین دۆخدا لە خوار ژمارە یەکەوە، کەسێك ئاشکرا بووایە، جگە لە ژمارە یەك کەسی دیکەی نەدەناسی.

بەمشێوەیە لە ڕێکخستن بەردەوام بووین، تا لە ساڵی ١٩٨٣ لە ناو شاری هەولێر دەستگیرکرام، ئەو سەردەم لە هەموو پارێزگایەکدا هەڵبژاردنێك هەبوو، تێیدا دوو دەستە بۆ بەڕێوەبردن هەڵدەبژێردران، (تشریعي و تنفيذي)، لەبری هەر وەزارەتێکیش بەڕێوەبەرایەتییەکی گشتییش دادەنرا و لەسەر ئاستی پارێزگاکان هەڵدەبژێردران، حاکم شێرزاد کۆمەڵێك دروشمی پێدام کە لەسەر دیوار بینووسم، ئەو کات ئەو دروشمانە بە هەر کەس بگیرایە وەك ئەوە وابوو چەکی پێ بگیرێت، ئەو دروشمانە دژی ئەو هەڵبژاردنە بوو، لەگەڵ برایەکی حاکم شێرزاد بە ناوی هەڤاڵ هاشم عوسمان کە دواتر بوو بە پێشمەرگە بە نازناوی (پەروەر) دەستمان پێ کرد، ئیدی لەگەڵ ئەودا شەوی ٣٠ لەسەر ٣١ی مانگی ٧ی

ساڵی ١٩٨٣ دەستمان بە نووسینی دروشمەکان لەسەر دیوار کرد، لە گەڕانەوەمدا لە ڕێگای شەست مەتری ڕێگای مەخمور کەوتینە ڕێ، هەڤاڵ هاشم ڕۆمانەیەکیشی پێ بوو، بەهۆکاری ئەوەی بچێت میز بکات کەمێك لە من دوور کەوتەوە، بە ڕێکەوت لەو کاتەدا هێزێك دەگەڕا بە ناوی هێزی ئاسایشی هاوبەش (المشترکة) تووشی من بوون، من هیچ بوارێکی ڕاکردنم بۆ نەمایەوە تەنها ئەوە نەبێت توانیم بۆیاغەکە فڕێ بدەم، ئیدی لایتیان لێدام و گەیشتنە سەرم، دواتر چواردەورم گەڕان ئەو بۆیاغەشیان دۆزیەوە و لەگەڵ خۆیان بردیانم، هەڤاڵ هاشم دواتر بۆی گێڕامەوە کە بینیویەتی من دەستگیرکراوم و پێی وتم ویستوومە ڕۆمانەکە هەڵبدەمە ناویان، بەڵام بە کارێکی هەڵەم زانیوە، دواتر هەواڵی دابوو بە ماڵی ئێمە، من پێش لێکۆڵینەوە بۆیاغەکەم لە دەستم کردبووەوە، لە لێکۆڵینەوەش گوتم هی من نەبووە، دوای ٣٣ ڕۆژ مانەوە لە زیندان و ئەشکەنجە، دانم بە هیچدا نەنا، تەمەنیشم منداڵ بوو، یەکێك لەو قسانەی کردم کە بیرۆکەیەك بوو بە ڕێکەوت بە خەیاڵمدا هات گوتم: ماڵی ئامۆزایەکی باوکم لەو نزیکانە بووە هەموو هەفتەیەك شەوی دووشەمە تەلەفزیۆن تەمسیلی کوردی پێشکەش دەکات من لە ماڵی ئەوان بوومە و هاتوومەتەوە، هەرچەندە من بۆ ماڵی ئەوان نەچووبووم، بەڵام بەڕاستی ئەو شەوە دراما هەبوو، هەروەها ماڵی ئەو ئامۆزایەمان لەو نزیکانە بوو، پۆلیسەکانیش ئەوەیان دەزانی، ئیدی ئەوە تا ڕادەیەك فریام کەوت.

لەگەڵ ئەوەشدا من بە جۆرێك کارم دەرکرد چاوەڕێی مردنم دەکرد، ئەوەشم دەزانی کە ئەگەر لە لێکۆڵینەوە دانبنێم بە شتەکاندا ئەوە دەبوو بەرپرسیارێتی گیانی ئەوانەش هەڵبگرم کە هاوڕێم بوون، بۆیە هەرگیز ئامادەی ئەو کارە نەبووم، جگە لەوەی خۆشم لە ناو دەچووم، دواتر ئازاد کرام، ئەوەش دەڵێم حیزبی بەعس سەرەڕای هەموو خراپییەکانی هەر کاتێك ئەگەر کەسێك دەستگیر بکرایە و هەتا چل ڕۆژ دانی بە هیچدا نەنایە ئیدی ئازاد دەکرا، ئێمە ئەوەمان دەزانی، بۆیە خۆمان بۆی ئامادە کردبوو، جگە لەوەش دوو کەس

هەبوون هەوڵیاندا ئازادم بکەن ئەوانیش: (مەلا عەولا و شێخ لەتیف) بوون، ئەوەش ڕۆڵی هەبوو.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٧ خوێندنم تەواوکرد، ئەو کات کەسێك خوێندنی بکردایە ساڵێك دادەمەزرا، بەڵام من دوو مانگ و نیو بۆ سێ مانگ لە ئاکرێ کە ئەو کات سەر بە موسڵ بوو دامەزرام، لەو ماوەیە توانیم ئامێرێکی تاقیگە بهێنم و بۆ شاخی ڕەوانە بکەم، دواتر کە چوومە شاخ ئەو ئامێرەم بینییەوە کە خۆم لە هەولێرەوە ناردبووم هەستم بەشانازی کرد، چەندین جاریش دەرمانمان دەنارد کە د. عەبدولواحێد ئیدریسمان لەگەڵ بوو.

لە داستانی بێتواتە لە ساڵی ١٩٨٣ کە هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد، داوای یارمەتی و جلوبەرگ و پێخەف و پارەیان لە ناو شار کرد، ئیدی ئێمە بە ئەو ئەرکە هەڵساین و هەرچیمان دەست دەکەوت دەمان نارد.

هەر لە ساڵی ١٩٨٧ لە ڕێگەی د. ڕەوەند (عەبدولواحێد ئیدریس) چوومە دەرەوە و بووم بە پێشمەرگە، ئیدی من و د. ڕەوەند و هەڤاڵێکی دیکە بە ئۆتۆمبێلێك بە ڕێکەوتین، بیرمە شۆفێری ئۆتۆمبێلەکە برای حاکم سابیر بوو، لە ڕێگای هەولێر کۆیە، لە نێوان دوو ڕەبیەی ڕژێمدا دابەزین، بە بنەباو و باواجیدا ڕۆشتین و چووینە گوندی دارۆکان کە بارەگایەکی پێشمەرگەی لێ بوو، دواتر چوومە گوندی سوسێ دواتر چوومە دۆڵی سماقووڵی، کە لە چەند گوندێك پێکهاتبوو لەوانە: سەروچاوە، گرتك، کرۆژ، جەلی و سێنان، ئیدی من چوومە سەروچاوە، بارەگایەکی لێ بوو کە بریتی بوو لە کەرتی زیندانی و پاسەوانی زیندانەکە بوون زیندانیەکانیش، یان جاش بوو، یان سەربازی حکومەت بوون، نزیکەی دە ڕۆژ لەوێ مامەوە.

دواتر کە زانیان تەندروستکارم گوتیان تۆ بچۆ بۆ نەخۆشخانەی شەهید دکتۆر کاوە کە لەو دیوی چیاکەی بارەگاکە بوو -د. کاوە خەڵکی سنووری کۆیە بوو، پێشمەرگەی تیپی ٩٣ی کۆیە بوو، دواتر شەهید بوو- نەخۆشخانەکە لە گەلییەکدا بوو بەرامبەر گوندی گرتك

کە دە خولەك لە سەروچاوەوە دوور بوو، کە بارەگای مەڵبەندی سێی تێدا بوو، هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ لێپرسراوی بوو، د. حسێن عەلی حەمەساڵح بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە بوو، پێشتر ماڵی د. حسێن لەلایەن جاشەوە هێرش کرابووە سەریان دوو خوشکی و باوکی لەلایەن جاشەکانی عەباسی باویل ئاغاوە وەك دژایەتییەك بۆ هەڤاڵ مام جەلال شەهید کرابوون.

هاوکات لە بالیسان نەخۆشخانەمان هەبوو کە د. زریان و ستافێك بەڕێوەیان دەبرد، هاوکات لە مەلەکانیش نەخۆشخانەمان هەبوو لەلایەن د. هەژار و ستافێکەوە بەڕێوەدەبرا، لە نەخۆشخانەکەی ئێمە د. خەسرەو، د. موەفەق (برینپێچ)، د. غازی (دەرمانساز) و بەندە کارمان دەکرد، ئامێرێکی تیشکمان هەبوو لەگەڵ چەندین جۆر دەرمان و ژوورێك بۆ نەخۆش و ژوورێکیش بۆ دەرمان، هەتا خەڵکی گوندیش دەهاتن بۆ لامان، لەوانە خەڵکی گوندی گرتك، تیپەکانی ئەو سنوورە چالاکییان زۆر بوو، بۆیە بریندارەکانی تیپی ٨٥ی بەڕانەتی، ٨٦ی دەشتی هەولێر و ٨٧ی قەرەچووغ و ٩٠ی باواجی و ٩١ی سەفین و ٩٣ی کۆیەش لە ئێمە نزیك بوون، دەهاتن بۆ نەخۆشخانەکانی ئێمە.

ئێمە برینپێچی و فریاگوزاری سەرەتاییمان دەکرد، بۆ نموونە ڕۆژێك بریندارێکیان بۆ هێناین بە ناوی حەمەڕەشید هاوڕێیەکی بە ڕێکەوت گوللەی لەدەست دەرچوو بوو، چەند گوللەیەك لە سکیدا بوو، بەسەرپەرشتی د. حسێن دەستمان بە چارەسەرکردنی کرد، بەڵام دۆخی زۆر خراپ بوو شەهید بوو، بەو شێوازە لەسەر ئەو کارانە بەردەوام بووین و لەو ناوچانە ماینەوە، هاوینان، یان لە ژێر گەلیدا بووین، یان دەهاتینە باخچەکانی خوارەوەی نەخۆشخانەکە.

ڕۆژێك گەنجێکیان هێنا شوان بوو مین پێیدا تەقی بوو، قاچێکی لە ئەژنۆیەوە زۆر بەخراپی بەری کەوتبوو دوای چارەسەری پێویست و خوێنپێدان و بەستنی، قاچیمان بڕیوە، ماوەیەك دکتۆرێکی ح.ش کە عەرەب بوو لەگەڵمان بوو، خەڵکی بەغداد بوو جەراح

بوو ماستەری لە نەشتەرگەری گشتی هەبوو، زانیاری باشی پێداین، فێری ئەوەی کردین کە چۆن خوێنبەربوون ڕابگرین و چۆن لە ناوەوە دوورینەوە بکەین.

لە شەڕی سماقووڵی من بۆ ماوەی هەفتەیەك بەشدار بووم، لەوێ بریندارەکانمان بە ڕێکوپێکی چارەسەر دەکرد لەلایەن مەڵبەندیشەوە پشتگیری دارایی باش دەکراین، جگە لەوەی دەرمانی پێویستیشمان هەبوو، هاوکات خواردنی باش دەدرا بە بریندارەکان، هەندێك لە بریندارەکان کە پێویستیان بە نەشتەرگەری گەورە هەبوو ڕەوانەی ئێران دەکران، پێشمەرگەیەك هەبوو بەناوی هەڤاڵ عومەر ناسر لەو ماوەیەی کە من لەوێ بووم شەش بۆ حەوت جار بە برینداری هێنایان بۆ لای ئێمە.

پێشمەرگەیەکمان هەبوو بە ناوی هەڤاڵ بەختیار، گوللە بەر سەری کەوتبوو، لای ئێمە چارەسەر کرا و خۆشبەختانە چاك بوویەوە، دواتر پێشمەرگەیەکی دیکەیان هێنا بە ناوی سەنگەر کە هەڤاڵ هەرێمی کەمال ئاغا بەهەڵە گوللەی لەدەست دەرچوو بوو هەر لە سەریدا بوو، ئەمەیان شەهید بوو، چونکە برینەکەی هێندە سەخت بوو لە هەر کوێ بوایە شەهید دەبوو.

ئەو شوێنانەی کە دەستمان بە سەردا دەگرت، دەبوو بە سەرچاوەی دەرمان، بۆ نموونە شەڕی دێگەڵە و تەقتەق و ڤاتعی ئەبو جەعفەری مەنسوور و سەری ڕەش، کە دوای دەست بە سەردا گرتن دەرمانەکانیان دەهێنا، هەروەها لە شارەوە لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانەوە بۆمان دەهات، لە هەندێك شوێن ناوەندی تەندروستی هەبوو، جاری وا هەبوو پێشمەرگە لە چالاکیدا دەیدا بە سەریدا و دەرمانەکانیان دەهێنا و دەکشانەوە.

ئەو ماوەیەی کە لە سماقووڵی بووین چەند جارێك بە چەکی کیمیایی لێمان درا، جارێك ئێمە بەشداری خولێك بووین لە سنووری ئێمەوە دە کەس بەشدار بووین، لە سنوورەکانی دیکەش کادیری تەندروستی هاتبوو، بەسەرپەرشتی د. حسێن چووینە گوندی گوێزیلە دوو شارەزای کیمیایی هاتن خولیان بۆ کردینەوە بۆ ماوەی دە ڕۆژ، باسی ڕووپۆش

(قیناع) و دەمامك بەستن و جۆری چەکی کیمیایی و چارەسەر و خۆپاراستن دەکرا، بۆ نموونە لاچوون لە بەردەم ئاڕاستەی با، چوونە سەر شوێنە بەرزەکان، لەبەرئەوەی کیمیایی قورس بوو لە نزمایی دەنیشت، هەروەها کردنەوەی ئاگر، چونکە دەیانگوت دوکەڵ کاریگەرییەکی کەم دەکاتەوە و بۆنەکەی ناهێڵێت، د. شاڵاو وەرگێڕانی لە فارسییەوە بۆ کوردی بۆ دەکردین، دواتر گەڕاینەوە زانیارییەکانمان بۆ پێشمەرگە گواستەوە هەتا لە ناو ڕووپۆش (قیناع)ەکەدا دەرزییەك هەبوو فێری ئەوەمان کردن کە چۆن ئەو دەرزییە لە خۆیان بدەن، دواتر چۆن ڕووپۆش (قیناع) ببەستن، لە کاتی بەرکەوتن بە کیمیاییدا جل گۆڕین و جل شۆردن و خۆشۆردن و دەست و دەموچاو شۆردن گرنگ بوو، بە پێی جۆری گازەکەش دەرزییەکەش دەگۆڕا بۆ نموونە جۆرێك لە گازی کیمیایی بەرکەوتەکەی تووشی عەساب دەکرد، کە دەرزی تایبەتی هەبوو.

لەو ماوەیە چەندین برینداری خۆمان و هاووڵاتی و پێشمەرگەی حیزبەکانی دیکەشمان چارەسەر دەکرد، واتە ی.ن.ك دامەزراوەیەکی گەورەی تەندروستی هەبوو، هەرچی (پ.د.ك)ە هیچی نەبوو تەنانەت مەفرەزەیەکی ح.ش هێندەی هەموو پ.د.ك لەو سنوورە ڕۆڵی بینیوە، لە کاتێکدا شیوعی و (ی.ن.ك) هێندەیان جیاوازی هەبوو لە هاوسەنگی هێزدا هەر بەراورد ناکرێت، واتە لە ناو (ح.ش)دا کادیری تەندروستی هەبوو، زۆرجار برینداەکانی سنووری گەرمیان کە دەنێردران بۆ ئێران بەلای ئێمەدا دەهاتن و ئێمە چارەسەرمان بۆ دەکرد و دەماننارد بۆ ئێران، لەگەڵ ئەوەشدا لە شەڕی گۆجاڕدا برینداری سوپای عێراقمان چارەسەر کردووە، کە لە هێرشێکی ئێراندا خۆیان ڕادەستی پێشمەرگەی ی.ن.ك کردبوو، هەندێکیان لە بەفردا تووشی دۆخی گانگرین بووبوون و قاچیان ڕەش بووبووەوە دواتر هەندێکیان ئازاد کران.

دواتر تیپێکی نوێ بە ناوی ٩٠ی باواجی دروستکرا، من چوومە ئەو تیپە، هەڤاڵ جەنگی فەقێیان بووە سەرتیپ، هەڤاڵ ئازاد چاوشین بە فەرماندەی کەرتی ئێمە دانرا،

ئیدی ماوەیەکیش لەو تیپە بووم، چووینە شەڕی کارووخ، مانگی ٨-٩/١٩٨٨ بوو، ئێمە چووینە شوێنی کەرتێکی تیپی ٨٧ی قەرەچووغ، کە نزیکەی ٥٠ پێشمەرگە بووین، تیپەکەی ئێمە ٥٠ بۆ ٦٠ پێشمەرگە دەبووین، لەو شەڕە بریندارێکمان هەبوو گولله بەر ڕانی کەوتبوو چارەسەری پێویستم بۆ کرد و ڕەوانەی نەخۆشخانەی پشتەوەم کرد، دوو شەهیدمان هەبوو یەکێکیان بە ناوی هەڤاڵ ئەحمەد خەڵکی کۆیە بوو، ناوی ئەوەی دیکەم بیر نییە، یەکێك لەو دوو شەهیدە فەرماندەی مەفرەزە بوو سەر بە کەرتێکی تیپی ٨٧ی قەرەچووغ بوو.

ئیدی دۆخێك دروست بوو بە ناوی (اختفاء)، من لە تیپی ٩٠ی باواجی هەتا ئەنفال مامەوە، گوتیان ئەوەی برای شەهید نییە، ئەوەی دۆخی تەندروستی باشە و بریندار نییە، بمێنێتەوە، منیش لەگەڵ ٢٥ کەس مامەوە، ئێمە لە چیاکان دەماینەوە، حکومەت هەموو ناوچەکانی کۆنترۆڵ کردبوو، ئێمە دەمانتوانی هەتا دەواجینێك بچین ناوی دەواجینی دلاوەر بوو، لە نزیکی دێگەڵە بوو، تا خواردن وەربگرین پاشان دوور بکەوینەوە، یەکێك لە پێشمەرگەکانمان بە ناوی هەڤاڵ موحسین جارێك ناردمان بۆ دێگەڵە بۆ خواردن لەوێ دەستگیرکرابوو دواتر بێسەروشوێن کرا، بەو شێوازە بۆ ماوەی دوو مانگ اختفاء بووین هەتا پێنج بۆ شەش کەسمان مایەوە، دواتر بەهۆی لێبوردنەوە خۆمان ڕادەستی حکومەت کردەوە، لە اختفاء دۆخێکمان هەبوو بێ وێنە بوو لە خراپیدا یەك ڕۆژێکی هێندەی یەك مانگی پێشتری پێشمەرگایەتی سەخت بوو، چونکە ئاوەدانی نەمابوو، خواردن پەیداکردن ئەستەم بوو.

دوای بڕیاری لێبوردنەکە ئێمە سێ کەس بووین لەسەر ڕێگای کۆیە خۆمان ڕادەست کرد، براین بۆ عەنکاوە و دواتر بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش (الامن)، بەڵێننامە و زانیارییان لێ وەرگرتین، پێیان گوتین ئێوە لەلایەن سەدام حوسێنەوە لێبووردنتان بۆ دەرکراوە، نووسراوێکیان بۆ کردین بۆ ئەوەی لە شاردا لەبری پێناس هاتوچۆی پێ بکەین.

دوای ماوەیەك بووین بە سەرباز، لەو ماوەیە دوو بڕیار دەرچوو، هەموو موالیدەکانیان نارد بۆ سەربازی، ئیدی لە نزیك دهۆك دانراین، دواتر شەڕی کوەیتی بە سەردا هات، نێردراین بۆ کەرکووك و بەغداد لەوێ کارمەندە تەندروستییەکان بە سەر یەکەی پزیشکیدا دابەش کراین، هەتا ڕاپەڕین لەوێ ماینەوە.

سێ ڕۆژ پێش ڕاپەڕین بە کارێك گەڕامەوە بۆ هەولێر تا بچم لە شاوێس هەندێك کەرەستەی تاقیگەی پزیشکی بگوازمەوە، لەو چەند ڕۆژە هەواڵ هات گوتیان لە ڕانیە ڕاپەڕین دەستی پێ کردووە، ئێمە لە دوای خۆڕادەستکردنیش ڕێکخستنمان بە نهێنی دروست کردەوە کە حاکم شێرزاد بە ئاگاداری هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا سەرپەرشتی دەکرد، ئەوانەی متمانەمان پێی هەبوو پەیوەندیمان پێوە دەکردەوە، کە ڕاپەڕینیش کرا من چەکم نەبوو لە بنکەی پۆلیسی ئازادیی چەکمان دەستکەوت، هێرش کرایە سە دامەزراوەی هەواڵگری سەربازی هەولێر کە گەورەترین دامەزراوەی سەربازی و حکومی هەولێر بوو، من بەشداری ئەو هێرشەم کرد.

دواتر لە چوارچێوەی کاری دەزگای تەندروستیی کوردستان لەگەڵ د. ڕەوەند دەستمان بەکارکردن کرد، تیپەکان بوون بە هێز، بە ناوی هێزی دەشتی هەولێر کە شەهید ڕێباز سەرپەرشتی دەکرد، وەکو کارمەندی تەندروستی بەشداری ئەو هێزەم کرد، دوای نەمانی دەزگاکەش لە ساڵی ١٩٩٦ بەدواوە، گەڕامەوە سەر ئەرکەکەی خۆم لە وەزارەتی تەندروستی، تا ئێستا لە بنکەیەکی تەندروستی ناو شاری هەولێر بەردەوامم، لە ساڵی ٢٠١١ پەیوەندیم کرد بە بزووتنەوەی گۆڕانەوە، لە ساڵی ٢٠١١ چوومە کۆلێژی دەرمانسازی و سێ قۆناغم بڕی، بەڵام دەستبەرداری بووم، دواتر چوومە بەشی یاسا و ئێستا بەکالۆریۆسم هەیە لە یاسا، لە ساڵی ١٩٩٤ هاوسەرگیریم کرد، سێ کوڕم هەیە بەناوەکانی هێدی، هەکار و ئەحمەد[٣٤].

---

[٣٤]– چاوپێکەوتن لەگەڵ: شۆڕش عەزیز خزر عەزیز (د. بەڵێن)، هەولێر، ٢٠٢٢/٣/٢٥.

## عەبدولڕەحمان عوسمان یونس (د. زریان)

ساڵی ١٩٥٤ لە شاری کەرکووك لە دایکبووم، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییم لە کەرکووك تەواو کردووە، ماڵمان لە گەڕەکی ئەڵماس بوو، باوکم دوکانی پێداویستی وشکەی هەبوو، لە شەڕی سەفینی ١٩٦١ دوو خاڵم شەهید بوون، بە هەردوو شۆڕشی (ئەیلول و نوێ) لە نزیکەکانم ١٤ شەهیدمان هەیە، لە حەفتاکان ئەندامی یەکێتیی قوتابیان بووم، دواتر ساڵی ١٩٧٣ چوومە کۆلێژی پزیشکی موسڵ و لە ساڵی ١٩٧٩ تەواوم کرد.

بە هۆی کاریگەری خاڵەکانم بەشداریی کاری سیاسی بووم، ویستی خۆم خوێندنی ئەندازیاری بوو، بەهۆی هەڵوێستی نەتەوەیی باوکمەوە چەند جارێك لەلایەن تورکمانەکانی کەرکووکەوە دوکانەکەیان سووتان، چەند جارێکیش تەقەیان لە باوکم کرد، چەند جارێکیش زیندانی بووە، بەهۆی ناردنی جلوبەرگ و دەرمانەوە بۆ شۆڕشی ئەیلول سزای لە سێدارەی بۆ دەرچوو، دواتر بەر لێبووردنی گشتی کەوت، ئیدی منداڵی من چاوم بەوە کراوەتەوە کە باوکم بەردەوام لە زیندان بووە، هەر لەسەر داوای باوکیشم چوومە بەشی پزیشکی تا لە ئایندە خزمەتی شۆڕشی کورد بکەم.

لە موسڵ دەستمان کرد بە بڵاوکردنەوەی بەیانی دامەزراندنی ی.ن.ك، ئێمە لە موسڵ بەهۆی نسکۆی شۆڕشی ئەیلولەوە زۆر دەشکاینەوە و سوکایەتیمان پێ دەکرا، بەڵام دامەزراندنی ی.ن.ك هیوایەك بوو بۆ ئێمە، لە موسڵ د. بەختیار سەرپەرشتی دەکردین، ئەو بڵاوکراوەکانی بۆ دەهێناین، لە ساڵی ١٩٧٩ بوومە پزیشکی موقیم لە سلێمانی، ناوم لە سەربازی هاتەوە، سەربازیم نەکرد لە ڕێگەی ئامۆزایەکم لە ساڵی ١٩٨١ بووم بە پێشمەرگە، کەسوکارم لە ڕێکخستنەکانی سنووری هەولێر بوو، بۆیە منیش چوومە ئەوێ، لە سەرەتای شۆڕش لەگەڵ هێزی دەشتی هەولێر پارتیزان بووین، چونکە ناوچەی ڕزگارکراومان نەبوو، نزیکەی دوو مانگ بەوشێوەیە ماینەوە.

لە ڕێگەی هەڤاڵ شاخەوانەوە چووین بۆ سەرکردایەتی و نامەیەکی کۆمەڵەمان پێ بوو، لەوێ چووینە بارەگای ناوەندی کۆمەڵە بۆ لای هەڤاڵ نەوشیروان و نامەکەم پێدا، ناردمی بۆ نەخۆشخانەی ناوەندی شۆڕش لە سنووری زەڵێ و نۆکان و ناوزەنگ.

بەیانییەکی زووی ساڵی ١٩٨١ پێشمەرگەیەك هاتبوو بە شوێنمدا گوتی هەڤاڵ مام جەلال بەپەلە و هەر ئێستا بانگت دەکات، منیش خەفەری چێشتلێنان بووم، ڕاستەوخۆ چووم، هەڤاڵ مام جەلال لە ژوورەکەی خۆی دانیشتبوو، کابرایەکی تەمەن مامناوەندی لەلا دانیشتبوو لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا دەبوو، گوتی ئەم کابرایە هاتووە من بکوژێت، سەدام حەبی سیانیدی پێداوە، بەڵام دانی پێداناوە، ئیدی چیرۆکەکەی بۆ گێڕامەوە: هەواڵگری عێراقی لە ئەورووپا ئەم پزیشکەیان دۆزیوەتەوە، پێیان گوتووە خۆت شێت بکە و دەتبەینە نەخۆشخانەی دەروونی، لەوێش بە پاسپۆرتی ئاسایی دیبلۆماسی گەیاندوویانەتە بەغداد، لەوێ پێیان ڕاگەیاندووە ئەگەر بەشداریی ئەو پیلانە نەکەیت و مام جەلال نەکوژیت، ئەوا دایك و باوکت دەکوژین، لەوێ ئامادەکرابوو بۆ ژەهر خواردکردنی هەڤاڵ مام جەلال بە ژەهری سیانید، بەڵێنی دامەزراندنی باشترین نەخۆشخانەی تایبەتی لە بەغداد پێدرابوو، دوای ئەوەی قایلی دەکەن و دەچێتەوە ماڵەوە لە ترسا بەسەرهاتەکە بۆ باوکی دەگێڕێتەوە، باوکیشی ئامۆژگاریی دەکات و پێی دەڵێت، هەرگیز کاری وانەکەیت و خەمی گیانی ئێمەت نەبێت، مام جەلال هیوای گەلێکە و سەرکردەی شۆڕشی کوردە، ئەگەر بشمانکوژن تۆ خەمت نەبێت، بڕۆ بۆ لای مام جەلال و لەوێ دان بە هەموو شتێکدا بنێ، لێرە ئێمە بشکوژن ئەوان تۆ دەپارێزن، ئیدی بە چەند ڕێگەیەك تا قەڵادزێ هێنرابوو، هەڤاڵ مام جەلال گوتی ئەو خانەوادەیە بە ئەسڵ تاڵەبانیین و خزمایەتییەکی دوورمان هەیە و دڵی نەهاتووە بمکوژێت، هەمان ڕۆژ هەڤاڵ فەرهاد سەنگاوی لە ئێستگەوە هەواڵەکەی خوێندەوە و باسی پەیوەندی ئەو پزیشکەی بە شۆڕشەوە کرد، ئیدی هەڤاڵ مام جەلال ڕایسپاردم لەگەڵ خۆم بیبەم و هەمیشە چاوم لەسەری بێت، چونکە هەر لێی بە گومان بوو، گوتی

نەبادا یەکێك لە سەرکردەکانمان شەهید بکات، ئەو پزیشکە پسپۆڕی هەبوو لای ئێمە نەخۆشی چارەسەر دەکرد[٣٥].

لە ساڵی ١٩٨٢ یەکەم کۆمیتە لە سنوورەکانی خوارەوە دروست کرا، بەسەرکردایەتی هەڤاڵان سەید کەریم و د. کەمال خۆشناو بوو، داوایان لێکردم لەگەڵیان بچم، منیش چووم لە گوندی وەرتێ نەخۆشخانەیەکمان دامەزراند و باری ولاخێك دەرمانمان پێ بوو، بۆ چارەسەری پێشمەرگە و هاولاتی، ساڵێك لەوێ ماینەوە.

لە ساڵی ١٩٨٣ ناوی کۆمیتە گۆڕا و بوو بە مەڵبەند و چووینە بالیسان، ڕۆژێك لە دۆڵی بالیسان بە سووکی بریندار بووم، لەوێ نەخۆشخانەمان دامەزراند، جگە لە پێشمەرگە و هاولاتی، جاری واهەبوو چارەسەری ئاژەڵی گوندنشینانمان دەکرد، یەکەم کاری پزیشکی ئەوەی لە یادم ناچێت ئەوەیە ئەو کەسەی کە منی لە هەولێرەوە بە ئۆتۆمبێلە جێبەکەی خۆی بردە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی بە ناوی هەڤاڵ فەقێ گۆمەشینی، خۆی لە شەڕێکدا بریندار بوو، گوللەیەك لە سینگیدا بوو هێنایانە نەخۆشخانە من گوللەکەم بۆ دەرهێنا، گوتی هێنانە دەرەوەی تۆ بەو مەترسییەدا یەکەم سوودی بۆ خۆم بوو، ڕۆژانە خەڵکم چارەسەر کردووە، بۆیە ناتوانم و ناکرێت هەموو ئەوانەم بیربێتەوە.

ڕۆژێك هەڤاڵ مام جەلال بانگی کردم و گوتی بچۆ بۆ ئێران ئامێری تیشك بکڕە، چووم و کڕیم و هێنامانەوە، ئەو ئامێرە زۆر هاوکار بوو بۆ دیاریکردنی شوێنی گوللە لە پێش دەرهێنانی لە لاشەدا، چونکە پێشتر هەڕەمەکی گوللەکان دەردەکرد.

لە ساڵانی ١٩٨٣ – ١٩٨٤ لە نەخۆشخانەی بالیسان بووین، چارەسەری دەیان نەخۆش و برینداریم کردووە هەر لە نەشتەرگەری بچوك و گەورەوە تا دەست بڕینەوە و قاچ بڕینەوەشمان کردووە، زۆرینەی دەرمان و پێداویستی پزیشکیمان لەلایەن ڕێکخستنەکانی

---

[٣٥]– ئەم چیرۆکە لە ٢٠١٧/١٠/٨ لە سایتی (puk media) بلاوکراوەتەوە.

شارەوە بۆ دەهات، یاخود لە ڕێگەی چالاکی پێشمەرگەوە دەرمانی نەخۆشخانەکانمان دەهێنا.

ئێمە بەهۆی ئەوەی بارەگای جێگیرمان هەبوو، توانایەکی باشمان هەبوو، زۆرجار بریندارى حیزبەکانی دیکەمان چارەسەر کردووە، لەوانە بەرپرسێکی پ.د.ك لە ڕەبیەیەکی ڕژێمدا کەوتبووە سەر مین بەناوی حەسەن ئاغا، ناوبراو پیاوێکی بەڕێز بوو، دۆخی زۆر خراپ بوو، قاچی تووشی گانگرین بووبوو، هێنایان بۆ لای من گوتم چارەسەری نییە، هەر دەبێت بیبڕمەوە، هەرچەندە دەرمانی سڕکردنمان نەبوو، بەڵام دەرمانێکمان هەبوو بۆ خەواندن، قاچیم بڕییەوە، پیاوێکی زۆر بە وره بوو، دواتر لە ئێران بینیمەوە، قاچی دەستکردی دروست کردبوو.

ڕۆژێك پێشمەرگەیەك گوللە بەر سکی کەوتبوو، ڕیخۆڵەی بڕی بوو، لە پشتییەوە دەرچوو بوو، ناو سکی یەك پارچە خوێن بوو، لە دۆخی شەڕیشدا بووین، بواری نەشتەرگەریمان نەبوو، چارەسەرم بۆ کرد، برینداریەکانی ڕیخۆڵە و سکیم دووریەوە، بۆ ماوەی سێ هەفتە بەس بە موغەزی ژیاندم تا چاك بووەوە، لە ڕووداوێکی دیکەدا پێشمەرگەیەك گوللە لە ناو چاویدا بوو لە دەماغەوە لە پشتی سەرییەوە دەرچوو بوو، دۆخی زۆر سەخت بوو پێشمەرگەکان کەسیان چاوەڕێی چاك بوونەوەیان لێ نەدەکرد، بەڵام من نائومێد نەبووم، چەندین پارچەی دەماغی لە شوێنی گوللەکەوە هاتبووە دەرەوە، من بەردەوام بووم لە چارەسەرکردنی تاکو کەمێك باشتر بوو، بیرمە خۆی مەسینەیەکی هەڵگرت و چوو بۆ ناو ئەو شاخانە دەست بە ناو بگەیەنێت، کە هاتەوە بە خۆمم گوت: "بەخوا ئەمانە لە مردنیش بەهێزترن".

لە دانوستانی ساڵی ١٩٨٤ هەڤاڵ مام جەلال ڕایسپاردین تیمێك پێکبهێنین و بچین لە کەرکووك دەرمان پەیدا بکەین و لە شاخ ژووری نەشتەرگەریی دروست بکەین، ئێمەش چووین، لەوێ لەگەڵ چەند ئەفسەرێك کۆبووینەوە پێکنەهاتین، چونکە گومانیان لە

داواکەمان هەبوو، گوتیان ئێمە لە دانوستانین و ئێوە داوای دەرمان دەکەن، دیارە نیازی هەڵگیرسانەوەی شەڕتان هەیە!

بینایەکی حکومی هەبوو لەوێ کردبوومان بە نەخۆشخانە واتە تاکە بینای بلۆك و کۆنکریتی ئەو سنوورە بوو، ناومان لێنا نەخۆشخانەی شەهید شێخ سلێمان ـ ناوبراو کادیرێکی ئازا و بە توانای کۆمەڵەی ڕەنجەرانی کوردستان بوو، شەهید بوو، خەڵکی ئەو گوندەش بوو، بە ناوی ئەو ناومان نا ـ لەوێ ڕۆژانە و شەوانە هاوڵاتی و پێشمەرگە دەهاتن بۆ لامان بێ جیاوازی چارەسەرمان دەکردن، هاوڵاتی هەبووە لە نیوە شەودا لە تاو ئازاری ددانی هاتووە بۆ لامان و ئێمە چارەسەرمان کردووە، ئەوانیش بۆیان نەبوو بچنە شار، چونکە ناوچەی قەدەغەکراو (محرمة) بوو، تیمەکەمان بریتی بوون لە هەڤاڵان: (کاروخ، هۆشیار و جەمیل) کە یاریدەدەری پزیشك بوون، پێشمەرگەش هاوکاری دەکردین و دەیپاراستین، هەروەها بە نۆرە خەفەریاتمان دەگرت و چێشتمان لێ دەنا، جاری وا هەبوو دەستم لە ناو چێشت بوو بانگیان دەکردم وەرە بریندار یان نەخۆشیان هێناوە، واتە باوەڕی چەپبوونمان هێندە پتەو بوو، بڕیارمان دابوو، دەبوو هەموو وەکو یەك کار بکەین، هەر لەو ساڵە بە یارمەتی شۆڕش ژیانی هاوسەرگیریم پێکهێنا.

لە کاتی هەر دوو کۆنفرانسی دوو و سێی کۆمەڵەدا بۆ هەردووکیان بە ئەندامێتی هەڵبژێردرام، ئەو کات خەڵکێکی کەم بۆ ئەو کۆنفرانسە هەڵدەبژێردرا، لە کۆنفرانسەکەدا پیاوێك هات بۆ لام قیناعی لەسەر بوو خۆی پێناساندم، گوتی ناوم هەڤاڵ کۆسرەتە، ڕووخساریم نەبینی، دوای ماوەیەك لە ساڵی ١٩٨٤ کەسێك هات بۆ لام و گوتی دەمناسیتەوە، گوتم نەخێر، ئیدی باسی کۆنفرانسەکەی کرد و ناسیمەوە، گوتی من ئەو کەسەم کە لە کۆنفرانسەکە هاتم بۆ لات، پێی گوتم من مەڵبەند لە بالیسانەوە دەبەمە سماقووڵی، چونکە لە بالیسان شەڕ کەمترە و دوورترە، دەچینە سماقووڵی تا لە ڕووداوەکانەوە نزیك بین، بۆیە پێویستە لەگەڵمان بیت، هەرچەندە سماقووڵی شوێنێکی سەخت نییە، گوتی بەهۆی نزیکی

لە هەولێر ڕۆژانە دەتوانین چالاکی بکەین، ئیدی نەخۆشخانەکەمان بردە ئەوێ، ئیدی من لەگەڵ مەڵبەندی چوار بەهاوەڵی هەڤالان کۆسرەت ڕەسووڵ و عەبدولڕەزاق (کە دواتر شەهید بوو) هاتمە خوارەوە، هەڤاڵ شێخ جەعفەر لێپرسراوی سەربازی بوو، بارەگامان لە سماقووڵی سەروچاوە دانا، نەخۆشخانەکەمان لە گوندی سووسێ دانا، دواتر پزیشکێکی دیکەمان هاتە دەرەوە و بوو بە پێشمەرگە، ناوی د. حسێن تاڵەبانی بوو، نەخۆشخانەیەکی دیکەمان بۆ ئەویش لە گوندی گرتکی سماقووڵی کردەوە.

لەو سنوورەی ئێمە هەموو ڕۆژ شەڕ بوو، فڕۆکە دەهات بۆردومانی دەکردین، یەکێك لە فڕۆکە ترسناکەکان مێك و سیخۆ بوون، زۆر بەخراپی تۆپبارانی دەکردین، لە درەنگانی شەو و نزیکی بەرەبەیان فڕۆکە بۆردومانی کۆمەڵێك پێشمەرگەی کرد، هەڤاڵ کۆسرەتی تێدا بوو، بریندار بوو، شەو بوو زۆر بەخراپی ملی و سینگی بەرکەوتبوو، پارچەی ساروخ چوو بووە ناو سینگی خوێنی تیا نەمابوو، خوێن چوو بووە سینگییەوە و (مەیی) بوو، بە باوەڕی من لە چرکەکانی کۆتایی ژیانی نزیك دەبووەوە، بەخێرایی چوار بوتڵ خوێنمان پێدا و موغەزیمان بۆ هەڵواسی و نەشتەرگەریمان بۆ کرد، پێشمەرگەکان کە بیستبوویان هەڤاڵ کۆسرەت برینداره هەموو بە پەرۆشییەوە هاتبوون بۆ ئەوەی خوێنی خۆیانی پێ ببەخشن و ژیانی ڕزگار بکەن، هەرچەندە تاقیگەی پشکنینی جۆری خوێنمان نەبوو، ناچار هەموو پێشمەرگەکانم کۆکردەوە، گوتم کێ جۆری خوێنی خۆی دەزانێ، زۆرینە گوتیان بیرمانە لە سەربازی پشکنینمان بۆ کراوە، ئیدی ئەوەی گوتی (O+)ە، جیام کردنەوە، چونکە وەك زانراوە ئەو جۆرە خوێنە بەخشەری گشتییە، هەرچەندە زۆر ڕاڕای ئەوە بووم نەك پێشمەرگەیەك بیری چووبێتەوە و بەهەڵە خوێنی لێ وەربگرین، هەڤاڵ کۆسرەت پیاوێکی زۆر ئازا و چالاك بوو، بیرمە هەڤاڵ مام جەلال بە بێتەل لەسەر خەت بوو، زۆر پەرۆش بوو پێی گوتم بەس مەهێڵە بمرێت، بە زووترین کات دەیگەیەنمە ئەڵمانیا، منیش گوتم دۆخی زۆر خراپە هی ئەوە نییە ئەوها بگوازرێتەوە، پێویستمان بە سۆندەیەکی

خوێن دەرهێنان بوو لە سینگدا نەمان بوو، هەڤاڵ (جەلال ساڵەح) کە زاوای هەڤاڵ کۆسرەت بوو ناردمان بۆ هەولێر و بۆ ئێوارە گەڕایەوە و پەیدای کردبوو، یەکسەر سۆندەکەمان بۆ سینگی بردە ژوورەوە و خوێنێکی زۆر لە سینگیدا مابووە و چەند بوتڵ خوێنمان لێ هێنایە دەرەوە، دۆخی باشتر بوو، بۆ ڕۆژی دواتر هەڵسایە سەر پێ.

دواتر نزیکەی دە کەس لەگەڵ هەڤاڵ کۆسرەت چووین سەرکردایەتی، لەوێ پزیشکێکی فارسی لێ بوو، لەوێ نەشتەرگەری بۆ دەستی هەڤاڵ کۆسرەت کرد کە دەمارێکی بڕا بوو، ئیدی بۆ ماوەیەک لای هەڤاڵ مام جەلال مایەوە.

لە ژیانمدا چارەسەری سەدان کەسم کردووە، بریندار و نەخۆش پزیشکەکەیان دەناسنەوە، بەڵام مەرج نییە پزیشک هەموو بریندار و نەخۆشەکانی بناسێتەوە، بۆ نمونە دەیان کەس هەبووە قسەی لەگەڵ کردووم و پێی گوتوم دکتۆر دەمناسیتەوە، کە دەڵێم نەخێر دەڵێت تۆ لە لە فلان ڕۆژ نەشتەرگەریت بۆ کردووم و ڕزگارت کردووم، ڕۆژێک لە بازاڕی هەولێر کابرایەک بە دارشەق دەڕۆیشت، گوتی دکتۆر دەمناسیتەوە، گوتم نەخێر، گوتی لە شاخ تۆ قاچت بۆ بڕیومەتەوە.

لە دۆڵی سماقووڵی ڕۆژانە بریندارمان لە چالاکییەکانی ناو هەولێرەوە بۆ دەگەڕایەوە، ڕۆژێک پێشمەرگەیەک گوللە بەر گورچیلەی کەوتبوو، ئەمە بە هیچ شێوەیەک چاوەڕێی ڕزگاربوونی نەبووین، خۆشبەختانە لای ئێمە نەشتەرگەری بۆ کرا و ڕزگاری بوو، ڕۆژێک پێشمەرگەیەکی برینداریان هێنا لە سەر سەرییەوە تا قاچی پارچە و ساچمەی گوللەی (RBG) بوو، بەشێکی لە دەماغی لەناوبردبوو، بیرم نایەت کەسێک بەزیندوویەتی گەیشتبێتە لای ئێمە و گیانی لە دەست دابێت.

دوای ئەوەی دۆڵی سماقووڵی لەلایەن ڕژێمەوە داگیرکرایەوە، هەڤاڵ کۆسرەت پێی گوتم نەخۆشخانەکەت بۆ بالیسان بگوازەوە، گەڕاینەوە لە گوندی خەتێ نەخۆشخانەیەکمان دانا، دوو ساڵ لەوێ بووین (١٩٨٧ - ١٩٨٨)، لە خزمەتێکی زۆری پێشمەرگە و هاووڵاتییانمان کرد،

لە ساڵی ١٩٨٧ دکتۆر هەڤاڵ پەیوەندی کرد بە شۆڕشەوە، هەروەها هەڤاڵان: فەرهاد، محەمەد (خەسرەو)، کارووخ و سەلام یاریدەدەری پزیشك بوون، شەوان تا سپێدە بە دیار نەخۆشەوە بوون، لە دوای ڕووخانی ڕژێم یەکێك بووم لە گەواهیدەرەکانی دادگاییکردنی سەدام حسێن، لە دادگاکە سوڵتان هاشم ناوی نەخۆشخانەی خەتێ دەهێنێت و ڤیدیۆکەی ماوە، ئەمە نیشانەی بەناوبانگی نەخۆشخانەکە بوو.

لە نەخۆشخانەی خەتێ، بەردەووام بووین تا نەخۆشخانەکە بە چەکی کیمیایی لێی درا، سەدان بریندداری چەکی کیمیایی شێخ وەسانان و بالیسان دەهاتنە لای ئێمە، هەرچەندە شارەزایی چارەسەری بریندداری چەکی کیمیایی نەبووین، چەند سەد کەسێك لەو چەند گوندە شەهید بوون بە چەکی کیمیایی خەردەل و گازی عەساب، هەندێك تووشی گەشکە دەبوون و دەمردن و هەندێك گیانیان دەسووتا و دەبوو بە تلۆق (بلۆق)، لەلایەکی دیکەوە دەنگی تۆپ و دەبابە و فڕۆکە دەهات، دۆخێك بوو گێڕانەوەی ئەستەمە، ئیدی هێرش گەیشتە سەرمان، برینددارانی کیمیایی نەیاندەتوانی هەڵبێن، خەڵکی هەندێکی سەری لێ دەشێوا و ڕووە و سوپای ڕژێم دەڕۆیشتن و دەستگیر دەکران و ئەنفال دەکران، ئیدی ڕژێم گوندەکانی بە ناوچەکەوە سووتان، خۆم بەهۆی چارەسەری بریندداری کیمیایی بەرکەوتم و قۆڵ و بنی باڵم سوتا.

دواتر بەرەو ئێران کەوتینە ڕێ، دوا شەڕ، شەڕی شاخی (کونەکۆتر) بوو کردمان، دوازدە تەرمی پێشمەرگەی شەهیدمان بە جێما، لە ئێران بووم بە پزیشکی ئۆردوگاکان، ئەو ئۆردوگایانە لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە دروستکرا کە لە خانوو یان خێمە پێکهاتبوو، لەوێ دەستمان کرد بە خەتەنەکردنی منداڵانی ئاوارەی کورد.

ئیدی تا ساڵی ١٩٩٠ لەوێ بووین، دواتر لەسەر داوای هەڤاڵ مام جەلال و هەڤاڵ کۆسرەت چووم بۆ دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن، لە سووریاوە گەیشتمە بەریتانیا، لەوێ دەستم کرد بە خوێندن تا بڕوانامەی دکتۆرام بە دەستهێنا (FRCP)، دەستم بە کاری پزیشکی کرد و بووم

بە پزیشکی هەناوی، لە ٢٠٠٧ شەوێك لەلایەن هەڤاڵ کۆسرەتەوە لەماڵی هەڤاڵ مام جەلال لە بەغدادەوە تەلەفۆنم بۆ کرا، کە بێمەوە ببم بە وەزیری تەندروستی، ئیدی هاتمەوە و بووم بە وەزیر، هەرچەندە ساڵانێکی زۆر ناخۆش بوو بۆ من، دوای تەواوبوونی ئەو کابینەیە داوام لێکرایەوە ببمەوە بە وەزیر، بەڵام ڕەتم کردەوە، لە ئێستادا لە وڵاتی بەریتانیا دەژیم، باوکی کوڕێك و سێ کچم[٣٦].

[٣٦]- چاوپێکەوتن لەگەڵ عەبدولڕەحمان عوسمان یونس (د. زریان)، پەیوەندی تەلەفۆنی، ٢٠٢٢/٦/٢٢.

## عەبدولهادی ساڵح سەعید (شەهید دکتۆر هادی)

لە ساڵی ١٩٥٧ لە کەرکووك لەدایك بووە، دەرچووی پەیمانگای پزیشکی بووە، چەند ساڵێك لە نەخۆشخانەی (جمهوری) کەرکووك خزمەت دەکات، لە ساڵی ١٩٨٠ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی (ك.ڕ.ك)ەوە کردووە، ئەندامی کارای کۆمیتەی ئاگر بووە لە شاری کەرکووك[٣٧].

لە ساڵی ١٩٨٢ ناوی بۆ خزمەتی سەربازی دێتەوە، بەڵام نایەوێت خزمەتی بەعس بکات، بۆیە لە ساڵی ١٩٨٢ شاری کەرکووك جێدەهێڵێت و بۆ گوندەکەی خۆی (مۆردخواردەی خواروو) دەگەڕێتەوە، ئەو ماوەیەی لە گوندەکەی دەبێت دەست دەکات بە کردنەوەی خوێندنگەیەك و لەلایەن خەڵکی گوندەکەوە پێشوازی لە پرۆژەکەی دەکرێت و شوێنی بۆ دابین دەکەن و ئیدی دکتۆر هادی هەر خۆی دەبێت بە مامۆستای خوێندنگەی گوندەکەی، نەوەیەکی گوندەکە لەسەر دەستی ناوبراو فێری ئەلف و بێ و نووسین و خوێندنەوە دەبن و پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتیی پتەو لە نێوان خوێندکارەکانیدا دروست دەکات و تا ئێستاش ئەو نەوەیەی کە خوێندکاری دکتۆر هادی بوون لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە پەیوەندییەکی پتەویان لە نێواندا ماوە.

دواتر لە ڕیزی کەرتی ڕێکخستنی چەمچەماڵ و پۆلی خاڵخاڵان لەلایەن (مەلا شاخی) نووسراوی پشتگیری بۆ دەکرێت و دەبێت بە پێشمەرگە[٣٨].

لە تیپی ٢١ی کەرکووك دەبێت بە پێشمەرگە، پاشان بووە بە لێپرسراوی پزیشکی و فەرماندەیی مەفرەزە، دواتر دەبێتە لێپرسراوی هەردوو تیمی پزیشکی هەردوو تیپی ٢١ی

---

[٣٧]- ئاوات کۆکەیی، کسپەیەك لە کەرکووکەوە لە یادی پۆلێك شەهیدی خێزانێکدا، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ساڵی بیست و دووەم، ژ٦٠٦٦، هەینی ٢٠١٣/٤/٢٦، ل١٦.

[٣٨]- مەلا شاخی؛ چاوپێکەوتن، کەناڵی ئاسمانی گەلی کوردستان، ٢٠٢١/٣/٢٣.

کـــەرکووك و ٢٥ی خاڵخـــاڵان، دەیـــان پێشـــمەرگە و هـــاووڵاتی لـــە لێـــواری مـــەرگ گەڕاندووەتەوە[٣٩].

لە دانوستانی ساڵی ١٩٨٤ سوپای عێراق ڕووی کردە گوندی چیمەنی گەورەی شەهیدان، بە مەبەستی بردنی خەڵك بۆ دەنگدان بە سەدام حسێن بۆ هەڵبژاردنەوەی بە سەرۆك کۆماری عێراق، لەو دۆخەدا گرژی دروست دەبێت و شەڕی لێدەکەوێتەوە، پێشمەرگە پەلاماری سوپای عێراق دەدات و لە ماوەیەکی کورتدا سوپاکە پاشەکشەی کردووە، لەو شەڕە دکتۆر هادی لە یەکەم هەڵمەتیدا سەربازێك بە دیل دەگرێت، دوای ئەوەی لەلایەن هاوڕێیەکی پێشمەرگەیەوە پێی دەگوترێت: "ئەوە کاری تۆ نەبوو، نابێت بەشداری شەڕ بکەیت" بەڵام دکتۆر هادی جگە لە پیشەکەی هاوشانی پێشمەرگە بەشداری شەڕەکانیشی کردووە و بە گوتەی هاوڕێکانی هەرگیز ترس نەیگەڕاندووەتەوە.

هاوینی ساڵی ١٩٨٧ بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی کەرکووك لە ڕێگەی ڕایەڵەکانییەوە نامەیەکیان بۆ دکتۆر هادی ناردووە، چونکە زانیبوویان دکتۆر هادی بووە بە داینەمۆی چالاکییەکانی هێزی پێشمەرگە لە سنووری کەرکووکدا، بەڵام دکتۆر هادی گوێی پێ نەداون، لەو کاتەدا و لە دوای شەڕێکی سەخت ژمارەیەك پێشمەرگە بریندار دەبن و دەبرێنە دیوەخانی کەسایەتییەکی گوندی مۆردخواردەی بناری خاڵخاڵان بە ناوی مەلا محەمەد مەولود، یەکێك لە پێشمەرگەکان بە سەختی بریندار بووە بەناوی محەمەد عوسمان ناسراو بە (حەمەسوور دووشیوانی)، هەروەها هەوراز فەخرەدین گلی یەکێکی دیکە بووە لە بریندارەکان، کە نزیکەی دە پێشمەرگە بریندار بوون، بە گوێرەی گوتەی هاوڕێیەکی پێشمەرگەی کە دکتۆ هادی ئەو نامەیەی پیشانداوە دەڵێت: "نامەکە چەندین ئیمتیازاتی گەورەی تێدا بوو، وەك ئازادکردنی باوکی و براکانی و ئۆتۆمبێل و پارە"، هەروەها دەڵێت: "کەم کەس هەبوو خۆی لە ئاست ئەو دەستکەوتانەدا بگرێت کە بۆی خرابووە ڕوو، لە کاتێکدا شەش برا و باوکت لە زیندان بن" دواتر دکتۆر هادی نامەکەی بردووە بۆ مام جەلال لە یاخسەمەر، دواتر دکتۆر هادی بە ورەی بەرزترەوە هاتووەتەوە بۆ لای

---

[٣٩]- بەختیار ڕاستی: لە یادی شەهیدبوونی مام ساڵح و کوڕەکانیدا، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ساڵی بیست و یەکەم، ژ٥٧٦٣، هەینی ٢٠١٢/٤/٣، ل١٢.

برینداره‌كانی، دوای دوو مانگی دیكه نامه‌یه‌كی دیكه‌ی بۆ ده‌نێرن به شێوازی هه‌ڕه‌شه، داوای لێكراوه پێویسته جێبه‌جێی بكات، دكتۆر هادی نامه‌یه‌ك ده‌نووسێت و له‌گه‌ڵ نامه‌كه‌ی ئه‌مندا بۆ مام جه‌لال به پێشمه‌رگه‌یه‌كدا ده‌ینێرێت و پێی ده‌ڵێت كه ته‌نها ده‌بێت مام جه‌لال خۆی بیبینێت، ئه‌مجاره‌یان مام جه‌لال وه‌ڵامی بۆ ده‌نێرێت: "كه ئه‌گه‌ر دیل گۆڕینه‌وه و ئاگربه‌ستیش بێت من له‌به‌ر كه‌سوكاری تۆ ده‌یكه‌م" ئیدی لێره‌وه دكتۆر هادی سوورتر ده‌بێت له‌سه‌ر به‌رگری و خه‌بات، لێره به‌دواوه هێرشه‌كانی ڕژێم چڕتر ده‌بنه‌وه، دكتۆر هادی بنكه‌ی نه‌خۆشخانه‌كه‌ی ده‌گوازێته‌وه ناو چه‌می (به‌ڕمزه) له نێوان گونده‌كانی مۆردخوارده و ئاوباره و داره‌قووته‌ی بناری خاڵخاڵان، به وته‌ی گێڕانه‌وه‌كه دوو نامه‌كه له ئه‌رشیفی هه‌ڤاڵ مام جه‌لالدا ماون، ئه‌م چیرۆكی نه‌به‌ردییه‌ی دكتۆر له كاتێكدا بوو كه ته‌واوی خانه‌واده‌كه‌ی له كه‌ركووك له زینداندا بوون و ڕژێم مامه‌ڵه‌ی پێوه ده‌كردن، كه‌چی دكتۆر هادی هێنده وره‌ی پۆڵاینی به‌رز بووه بۆ ساتێكیش بیری له خۆبه‌ده‌سته‌وه‌دان و جێبه‌جێكردنی داواكانی ڕژێم نه‌كردووته‌وه، ئه‌مه مشتێكه له خه‌رمانی به‌رخۆدانی كه هه‌ر له سه‌ره‌تای لاوێتییه‌وه شه‌یدای بووه[٤٠].

دكتۆر هادی هه‌م پزیشك هه‌م پیاوێكی سه‌ربازی و قاره‌مان و جه‌ربه‌زه هه‌م كادیرێكی كۆمه‌ڵایه‌تی بوو، هه‌میشه له ڕێگه‌ی كۆڵه‌پشت و جانتاكه‌یه‌وه ده‌یویست كه‌مترین قوربانی هه‌بێت، له‌گه‌ڵ پێشمه‌رگه برینداره‌كان ماوه‌ته‌وه هه‌تا به ته‌واوی چاك بوونه‌ته‌وه خۆی چووه‌ته سه‌نگه‌ره‌كان[٤١].

دكتۆر هادی یه‌ك ڕۆژ پێش شه‌هیدبوونی به (سه‌باح)ی برای ڕاده‌گه‌یه‌نێت كه (مام جه‌لال) داوای لێ كردووه بچێت له ده‌ره‌وه‌ی وڵات خوێندن ته‌واو بكات، دكتۆر هادی ڕووه و سنووره‌كانی ئێران كه‌وتووه‌ته ڕێ و له ڕێگه‌ی هه‌ڤاڵ سه‌باحی برایه‌وه نامه‌یه‌كی بۆ كه‌سوكاره‌كه‌ی ناردووه، هه‌روه‌ها چه‌كه‌كه‌شی كه له جۆری (B.K.C) بووه به‌ناوبراودا بۆ گونده‌كه‌ی ناردووه‌ته‌وه، ڕۆژی دواتر كه ناوبراو ده‌گاته‌وه گونده‌كه‌ی خۆی، خه‌ڵكی گونده‌كه

---

(٤٠)- له ڕاگه‌یاندنی په‌یوه‌ندییه‌كانی كه‌ركووكی (ی.ن.ك) وه‌رگیراوه.

(٤١)- لێدوانی چه‌تۆ ساڵح سه‌عید: كه‌ناڵی ئاسمانی گه‌لی كوردستان، ٢٠٢١/٢/٢٣.

پێی ڕادەگەیەنن کە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان بڵاویکردووەتەوە کە دکتۆر هادی شەهید بووە، سەباحی براشی ڕای دەگەیەنێت کە ڕاست نییە و ئەوەندە نییە نامەیەکی پێ داوم، کاتێك نامەکە دەبینن مێژووی یەك ڕۆژی پێش ئەو هەواڵەی لەسەر دەبێت، ئیدی شەهید بوونی نابێتە جێگەی بڕوای خەڵکی و باوەڕ بە شەهیدبوونی ناکەن، دوای گەرمتر بوونی هەواڵی شەهید بوونی برایەکی دیکەی دکتۆر هادی بەناوی هەڤاڵ چەتۆ دەچێتە سماقووڵی و لەوێ هەڤاڵ کۆسرەت ڕسووڵ عەلی هەواڵی شەهید بوونی دکتۆر هادی پشتڕاست دەکاتەوە، ئیدی فریای دانانی پرسە ناکەون و تراژیدیا و مەرگەساتی ئەنفالی بەسەردا دێت[٤٢].

دکتۆر هادی ڕەحمەتەی چارەسەرەکانی برینداران و پێداویستی کۆڵپشت و جانتا پزیشکییەکەی دەنووسی و (سەباح)ی برای ڕادەسپارد تا دەرمانیان بۆ پەیدا بکات، دەینارد بۆ شەقامی کۆماری لە شاری کەرکووك زۆرجار دەبووە جێگەی سەرنج چونکە داواکارییەکانی هەموو پێویستی فریاگوزاری خێرا، سەرەتایی بوون، لە کاتی شەڕدا بەکاردەهاتن[٤٣].

لە درێژەی ساڵانی خەباتیدا دوو جار بریندار بووە، لە ماوەی خەباتیدا پزیشکێکی بە وره و چاونەترسی ناو هێزی پێشمەرگەی کوردستان بووە، لە ناوچەکانی کەرکووك و گەرمیان هەناسەی گەرمی بە نیشتیمان بەخشی، دوای شەهیدبوونی باوکی و شەش برای، هادی وره قەندیل.. هادی سەربڵند.. هادی دکتۆر و پێشمەرگە و شۆڕشگێڕ وره و جۆشی خەباتی لە گوڕگوڕ گەرمتر و چالاکتر کردووە، دوای ئەوەی بە بڕیاری ی.ن.ك هێزی پێشمەرگە لە بەرەکانی شەڕ بەرەو سنووری عێراق - ئێران پاشەکشە دەکات و پۆلێك پێشمەرگە دەچنە گوندی شاناخسێ*[٤٤]، کە بڕیار بووە لەوێوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی

---

(٤٢)– سەباح ساڵح سەعید، کەناڵی ئاسمانی گەلی کوردستان، ٢٠٢١/٣/٢٣، سەباح ساڵح سەعید، کەناڵی کوردسات، ٢٠٢١/٣/٢٣.

(٤٣)– چاوپێکەوتنی سەباح ساڵح سەعید، کەناڵی کوردسات، ٢٠٢١/٣/٢٣.

(٤٤)– گوندی شاناخسێ، یەکێکە لە گوندە دڵگیرەکانی نۆدێی ئالان، وەك ملوانکە بە گەردنی چیای سەرکەشی گمۆدا هەڵواسراوە، تا چاوی بینین بڕ بکات ڕەز و باخ و سەوزاییە، هەتا گوێی بیستنیش بڕ

کوردستان بەرێ بکەون، بەڵام پێش دەرچوونیان و لە ١٩٨٨/٣/٢٣ لەلایەن فڕۆکەکانی ڕژێمی بەعسەوە گوندی شاناخسێی ئالانی شارباژێڕ کیمیاباران*[٤٥] دەکرێت، تێیدا زیاتر لە پەنجا پێشمەرگە شەهید بوون، کە یەکێك لە شەهیدەکان دکتۆر هادی بوو[٤٦]، شایەنی باسە دکتۆر هادی جگە لە خۆی شەش برای دیکەی شەهیدن[٤٧]، هەروەها باوکی شەهید دکتۆر

---

بکات، خوڕەی ئاو و جۆگە و تریفەی کانییە، درەختە شۆخ و شەنگەکانی بەهاران لەنجە دەکەن، قاسپەی کەوی نسارانی دەقاسپێنن شاخەکانی دەستی سڵاوێ هەڵدەبڕن و خەندە دەکەن، دێی شاناخسێ لە (مووچەکانی، کاولان، پشتئاشان، دێبەران، سنجەڵێ، سارکێ، بەرجۆ، دڕەڵە، سوورە قانگ، دەڵاو، دوازدەمووچە و ناوەندی گوندەکە) پێکهاتووە، بنەمای ئابووری خەڵك لە ئاژەڵدار، باخداری، کشتوکاڵ، توتن، گوێز و بازرگانی بچووك و هاموشۆ و ئەمبەراوبەری ئێران پێکهاتووە، ئاستی بژێوی خەڵك بە گشتی مامناوەندی بووە، گوندەکانی دیکەی نۆدێی ئالانیش بە گشتی ئاستی گوزەرانیان هاوشێوەی شاناخسێ بووە و لە یەکەوە نزیکن، شاناخسێ هەواری هەمیشەیی مەفرەزە پارتیزانەکان و شۆڕش بووە لە دوای ساڵی ١٩٨٧ەوە تیپی ٣٧ی شارباژێڕی لە ژێر سێبەری دارگوێزەکانی کارەشدا لە باوەش گرتووە، لە ١٩٨٧/٩/١٥ گوندی شاناخسێ ڕاگوێزراوە و لە ئۆردوگای زۆرەملێی قەلاچوالان گیرساونەتەوە، پێش ڕاگواستن ١٦٩ ماڵ بووە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئازاد سەراوی: خاکپۆشەکان، س.پ. ل ٣٢٥-٣٢٦.

[٤٥]- لە ١٩٨٨/٣/٢٣ کاتژمێر ١ی دوای نیوەڕۆ پۆلێك فڕۆکەی مەرگهێن بە بۆمبی قەدەغەکراوی کیمیایی گوندی شاناخسێیان کیمیاباران کردووە، کە بەشێك لە بارەگاکانی (ی.ن.ك) بەتایبەت تیپی ٣٧ی لێ بووە، بۆمبارانەکە شەهید و برینداری زۆری لێکەوتووتەوە، تێیدا دکتۆر هادی، عوسمان وڵاخلوویی، ئاسۆی شێخ مارف کوڕەداوێ، حەمەمینی خەجێ پێنجوێنی، شێخ عەزیز و مامۆستا ڕەئووف شەهید بوون، هەروەها سەید ئەحمەد و عومەر چاوشین دڕەیی و کاوە سەراوی و دەیانی دیکە بەر چەکی کیمیایی کەوتوون و بە مەبەستی وەرگرتنی چارەسەر ڕەوانەی نەخۆشخانەکانی ئێران کراون، هەندێك لە بریندارەکان گیانیان سپاردووە، هەندێکیشیان بۆ هەمیشە بەو ئازارەوە مانەوە، یان دواتر گیانیان سپاردووە، بە نموونە هەڤاڵ عومەر چاوشین تا ئێستاش لە نەخۆشخانەکانی ئەوروپا چارەسەر وەردەگرێت، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئازاد سەراوی: هێلانەی هەڵۆکان، پێنجوێن، شارباژێر، دوکان، چاپخانەی بەهەست، سلێمانی، ٢٠١٨، ل٢٢٨.

[٤٦]- ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان، ج٤، ب١، س.پ، ل٦٣٧، ئاوات کۆکەیی، س.پ.

[٤٧]- ئەوانیش بریتین لە: (شەهید عادل ساڵح سەعید ١٩٥٢، شەهید مەهدی ساڵح سەعید ١٩٥٤، شەهید عەبدولوەهاب ساڵح سەعید ١٩٦٢، شەهید سەلاحەدین ساڵح سەعید ١٩٦٣، شەهید ڕەفیق ساڵح سەعید ١٩٦٨، شەهید سەعدوون ساڵح سەعید ١٩٧٥)، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئاوات کۆکەیی، س.پ.

هادی بە ناوی ساڵح سەعید بایز[٤٨] یەکێك بووە لە ڕێکخستنە دێرینەکانی شاری کەرکووك، هەروەها دایکی شەهید دکتۆر هادی بە ناوی مەحبوبە عوسمان عومەر[٤٩]، یەکێك بووە لە تەتەری ڕێکخستنەکان لە شاری کەرکووکدا و چەندین چالاکی ئەنجام داوە.

---

[٤٨] ساڵح سەعید بایز: مام ساڵح سەعید باوکی ئەم پۆلە شەهیدە لە ساڵی ١٩٢٢ لە گوندی (مۆردخواردە)ی بناری خاڵخاڵان لەدایك بووە، ساڵی ١٩٥٤ چووەتە شاری کەرکووك، ساڵی ١٩٦٩ لە شۆڕشی ئەیلوولدا بووە بە پێشمەرگە، لە هێزی کاوە بووە بە سەرلق و دوو جار بریندار بووە، لە ساڵانی ١٩٧٥-١٩٧٩ لە ئۆردوگاکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان ژیانێکی سەختی گوزەراندووە، دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق بەزۆر ڕای دەگوێزن بۆ شارەکانی دیالە و بەعقوبە، دواتر بە لێبووردنی گشتی گەڕاوەتەوە بۆ کەرکووك و لە ساڵی ١٩٨٤دا پەیوەندی کردووە بە ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)ەوە، دوای چەندین کۆبوونەوەی نهێنی لەگەڵ ڕێکخستنەکانی شاردا چەندین جار لەلایەن ئەمنی کەرکووکەوە بانگ دەکرێت، کوڕێکی مام ساڵح بە ناوی (ڕەفیق) لە ڕێگەی دکتۆر هادی برایەوە لە ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك) شاری کەرکووکدا کاری کردووە، لە (کۆمیتەی ئاگر) لەگەڵ شەهید (مەلا محێدین) کاری کردووە، کە هاوکات خوێندکاری ئامادەیی پیشەسازی بووە چەندین جار لەلایەن ئیتیحادی تەلەبەی کەرکووکەوە بانگ دەکرێت و ئاگادار دەکرێتەوە، بەڵام ناوبراو لەسەر کارەکەی بەردەوام دەبێت، لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/١٠ لە ئەنجامی چالاکی ڕێکخستنەکانی کەرکووك لە گەڕەکی ڕەحیمئاوا، لە چالاکییەکەدا بەشداربووە، کە تێیدا (نارنجۆکێك) هەڵدەدەنە ناو ئۆتۆمبێلێکی پیاوانی ڕژێمەوە و دوو ئەندامی ئەمنی تێدا دەکوژرێن، ماڵی مام ساڵح نزیك بووە لە شوێنی ڕووداوەکە لە ئەنجامی ئەمەدا ڕژێم زیاتر لە ٢٠٠ هاووڵاتی ئەو گەڕەکەی دەستگیر کردووە، کە مام ساڵح یەکێك بووە لە دەستگیراوەکان، دوای سێ ڕۆژ دواتر جگە لە مام ساڵح هەموویان ئازاد کراون، دواتر لە شەوێکدا ڕژێم هەڵدەکوتنە سەر ماڵەکەی و پێنج کوڕی و بوکێکی دەستگیر دەکەن، ڕەفیق خۆی دەگەیەنێتە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە، دواتر ڕژێم مام ساڵح و پێنج کوڕەکەی و بوکەکەی ئازاد دەکەن، بۆ ئەوەی ڕەفیق بگەڕێتەوە و دەستگیری بکەن، بۆیە پاش ڕۆژێك دەگەڕێتەوە شاری کەرکووك و ناچێتەوە ماڵی خۆیان و دەچێتەوە خوێندنگەکەی لە ئامادەیی پیشەسازی کەرکووك، هەر هەمان ڕۆژ بەڕێوەبەری خوێندنگەکە تەلەفۆن بۆ ئەمنی کەرکووك دەکات و دێن دەستگیری دەکەن، بۆ شەوەکەی جارێکی دیکە مام ساڵح و پێنج لە کوڕەکانی دەستگیر دەکرێنەوە، لە ڕۆژی ١٩٨٧/٤/٢٤ لە گەڕەکی ڕەحیمئاوا بەئامادەبوونی بنەماڵەکەی و نزیکەی ٥٠٠٠ هاووڵاتیی شارەکە کە بەزۆر خڕکرابوونەوە لەسەر شەقامی سەرەکی کەرکووك هەولێر کە نزیکی ماڵی مام ساڵح بووە، بەبەرچاوی مام ساڵح و پێنج براکەیەوە کە دەست بە سەربوون و بە ئامادەبوونی (عەلی حەسەن مەجید)، (ڕەفیق ساڵح سەعید)ی لە تەمەنی ١٩ ساڵیدا گوللەباران دەکرێت و شەهید دەکرێت، هاوکات ماڵی شەهید عادلی برای کە کرێچی بوو بە شۆفڵ تەخت دەکرێت، دواتر مام

سالّح خۆی و پێنج کوڕەکەی دیکەی شوێن بزر دەکرێن، تاکو پرۆسەی ئازادیی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣ ئاشکرابوونی بەڵگەنامەکانی ئەمنی عامەی کەرکووك و بەغداد خۆی و پێنج کوڕی دیکەی کە لەگەڵی زیندانی کرابوون گوللەباران کراون، هەتا ئێستاش گۆڕبزرن، ئەو کردە قێزەونەی ڕژێم بۆ چاوترسانی کورد بوو لە کوردستان بە گشتی و لە کەرکووك بە تایبەتی تاکو مل بۆ دەسەڵاتی شۆڤێنی ستەمکاری بەعس کەچ بکەن، لێرەوە مام سالّح پیرە هەڵۆی بابەگوڕگوڕ خۆی و حەوت ڕۆڵەی لە تاو گڕی چەوسانەوەی میللەتێکدا یەك لە دوای یەك وەك قەتارە هەڵۆیەکی بەرزەفڕ بەرز فڕین و بوون بە ملوانکەی خوشکان و دایکانی کەرکووك و کوردستان، ڕۆحی ئەوان لە چیاکاندا بوون بە گوڵ و لە نێو دڵەکاندا بوون بە خوێن، لە ناو بەرخۆدانی جۆشدراوی پڕ شکۆی تێکۆشان بوون بە کڵپە، ئینتیما و ورە و ئازایەتییان بە گەل بەخشی، لە ئێستادا لە شاری کەرکووك مۆنۆمێنتیان بۆ دروست کراوە، پێشتر هەر لەم شارە بە ماڵی (نۆ براکە) ناسرابوون، باوکیان بوو بە پێشەنگی جۆشدانی بزاوت و گڕوتینی کوردایەتی، وەك بڵێسەی بابەگوڕگوڕ بە گڕ تاوی دەدا، شا درەختێك بوو نۆ لقی سەوزی لێ بەجێما، کە حەوتیان بوون بە داینەمۆ و بزاوت و کوانووی جۆشدانی بەرخۆدان، بوون بە حەوت هەڵۆ و بەرەو قەد پاڵی چیاکانی کوردستا ن هەڵفڕین لەوێشەوە بوون بە ئەستێرەی درەوشاوەی ئاسمانی نیشتتیمان، بوون بە حەوت پایە بۆ بووبنیادنانی کۆشکی نیشتیمان. (لێدوانی سەباح سالّح سەعید، ڕاپۆرتی کەناڵی ئاسمانی گەلی کوردستان، ئیبراهیم عەبدوڵڵا ئامادەی کردووە، ٢١ی نۆڤەمبەری ٢٠٢١ پەخشکراوە)، (لێدوانی سەباح سالّح سەعیدی برای شەهید دکتۆ هادی، شیروان سەعید و ئەمرۆ سەعید هاوڕێ و شایەتحاڵانی گوللەبارانکردنی شەهید ڕەفیق سالّح سەعید، ڕاپۆرتی کەناڵی ئاسمانی کەرکووك، هەردی عادل ئامادەی کردووە، ٢٣ی ئەپریلی ٢٠٢١ پەخشکراوە)، (ئاوات کۆکەیی، س.پ)، (بەختیار ڕاستی، س.پ)

(٤٩)- مەحبوبە عوسمان عومەر: دایکی ئەم پۆلە شەهیدە لە ساڵی ١٩٣٧ لە شاری کەرکووك لەدایك بووە، لە کۆتایی چلەکان لەگەڵ (سالّح سەعید بایز) ژیانی هاوسەرگیری پێکدەهێنێت، هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە لایەنگری شۆڕش بووە، وەك تەتەرێکی ڕێکخستنەکانی ناو شاری کەرکووك کاری کردووە، چەندین نامەی ڕێکخستنەکانی شار و گوندەکانی گواستووەتەوە، سێ جار بە خێزانەوە ئاوارە بووە، شانبەشانی هاوسەرەکەی لە شاخ بووە، ساڵی ١٩٨٧ دوای دەستگیرکردنی هاوسەرەکەی و پێنج کوڕی و گوللەبارانکردنی کوڕی شەشەمی فەرمانی گرتنی بۆ دەردەچێت و خۆی دەگەیەنێتە گوندی مۆردخواردە بۆ لای هەردوو کوڕی دیکەی (دکتۆر هادی و چەتۆ)، کە ئەو کات پێشمەرگەی تیپی ٢١ی کەرکووك بوون، پاشان بە ئاوارەیی لە شاری ڕانیە لە پڕ چاوەکانی لە یەك دەنێت و ژیانئاوایی دەکات و لە شاری هەولێر بە خاك دەسپێرد رێت، لێرەوە دوای بەخشینی پۆلێك ڕۆڵەی بەرەو لای هاوسەر و حەوت کوڕی شەهیدی ئۆغری کرد، دایکە مەحبوبە بە شیری خۆی ئەو بێچوە شێرانەی پەروەردە کرد تا بۆ ڕزگاری کوردستان سەنگەر بگرن و قارەمانانە شەهید ببن، ئەو پۆلە شەهیدە قارەمانە بوون بە سیمبول و هێمای نەتەوەیەك کە بە

لە ساڵی ١٩٩٢ دوای پەردە لادان لەسەر وێنەی شەهید دکتۆر هادی لەلایەن مام جەلالەوە، مام جەلال وتارێکی پێشکەش کردووە تێیدا و دەڵێت: **"لە پای بەخشینی ئەو ژمارە زۆرە لە شەهید، ڕەوایە ی.ن.ک بە ڕێکخراوی شەهیدان ناوزەندە بکرێت"**[٥٠].

---

درێژایی مێژوو چەوسێنراوەتەوە، بوون بە حەوت مەشخەڵ بۆ ڕووناکی ڕێی ئایندەی ئەم گەلە، لەم بنەماڵە تێکۆشەرە تەنها دوو ڕۆڵەیان دەمێننەوە بە ناوەکانی (چەتۆ ساڵح سەعید و سەباح ساڵح سەعید)، بڕوانە: (سەباح ساڵح سەعید: ژنێك لە بۆتەی خەباتدا، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ساڵی بیست و یەکەم، ژ٥٦٨١، هەینی، ٢٠١٢/١/٣٠، ل١٩)، (ئاوات کۆکەیی، س.پ) (بەختیار ڕاستی، س.پ).

[٥٠]- چ. پێکەوتنی چەتۆ ساڵح سەعید: کەناڵی کوردسات، ٢٠٢١/٣/٢٣.

## عەبدولواحید ئیدریس شەریف ڕەسووڵ (د. ڕەوەند)

ساڵی ١٩٦٥ لە گوندی دووزتەپەی دەشتی شەمامك سەر بە پارێزگای هەولێر لەدایك بووم، لە ساڵی ١٩٧٠ بەهۆی کاری باوکمەوە کە پۆلیس بوو دەوامی لە هەولێر بوو، هاتوچۆی پێ نەدەکرا، چووینە هەولێر و لە گەڕەکی کوران نیشتەجێ بووین، بەهۆی ئەو هاتنەوە بەختی خوێندنمان هەبوو، ئەگینا هاوتەمەنی ئێمە لە گوندەکەمان نەیانتوانی بخوێنن، براگەورەکەشم چوو بوو لە ماڵی باوکی دایکم لە کۆزەی پانکەی کەندیناوا دەیخوێند، برایەکی لە خۆم بچووکتر و سێ خوشکیشم هەیە.

لە سەرەتادا باوکم ئەندامی پ.د.ك بووە، لە کاتی شۆڕشی ئەیلوولدا و لە ساڵی ١٩٦١ پۆلیس بووە، لە چالاکییەکدا ئامادەیی دەربڕیوە بنکەی پۆلیس ڕادەستی پێشمەرگە بکات، لەو چالاکییەدا دەستگیرکراوە و سزای زیندانی هەمیشەیی دراوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٣ کە دوو ساڵ بوو زیندانی بوو بەهۆی گۆڕینی دەسەڵاتدارێتی عێراق و کودەتا بە سەر فەرمانڕەوایەتی عەبدولکەریم قاسمدا بەر لێبوردنی گشتی کەوتووە.

قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و ئامادەییم هەر لە هەولێر تەواو کرد، بەگوێرەی ئەوەی لە کاتی خوێندکاریم سەر بە ڕێکخستنەکانی ك.ڕ.ك بووم، دەمویست لە بوارێك بخوێنم تا لە ئایندە خزمەت بە پێشمەرگە بکەم، لەو تەمەنەدا هێندە دڵگەرم بووین لەسەر کاری سیاسی بە ڕێکخستنن قایل نەدەبووین بەرنامەمان هەبوو لە داهاتوو ببین بە پێشمەرگە، بۆ ئەو مەبەستەش پەیمانگای تەندروستیم هەڵبژارد.

لەو کاتەی لە پەیمانگا بووین، من لەگەڵ چەند هاوڕێیەکم دەرمانمان کۆ دەکردەوە و بۆ پێشمەرگەمان دەنارد، ئەوکات بڕیار بوو دوای تەواوکردنی پەیمانگا ڕاستەوخۆ دادەمەزراین دواتر دەنێردراین بۆ خزمەتی سەربازی.

لە قۆناغی ئامادەیی واتە لە ساڵی ١٩٨١ لە ڕێگەی هەڤاڵ سەرداری سەعید سۆفی پەیوەندیم کرد بە ڕێکخستنەوە، کە هاوڕێیەکی زۆر نزیکم بوو، ئەو لە ساڵی ١٩٨٣ بوو بە پێشمەرگە پەیوەندی ڕاستەوخۆم لەگەڵی هەبوو هەتا شەهید بوو، لە ڕووی کار و چالاکییەوە من لە نزیکترین هاوڕێکانی شەهید سەردار بووم، لە بەشێك لە چالاکییەکان هاوکاری بووم، ئێستاش ساڵانە یادی دەکەمەوە و وتاری لەسەر دەنووسم.

شۆڕشەکەی ئێمە لەو ساڵانەدا بەردەوام لە گەشەسەندندا بوو، بۆیە هەمیشە شەهید و بریندارمان هەبوو، پێویستیان بە چارەسەر بوو، وەك شۆڕش هیچ سەرچاوەیەکی هێنانی دەرمان نەبوو، تەنها دەبوو لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانەوە کۆی بکەینەوە و بیگەیەنینە بارەگاکانی پێشمەرگە، من بەرپرسی چەند هەڤاڵێکی خۆم بووم وەکو شانەی ڕێکخستن، بەشێکیان یاریدەدەری پزیشکی بوون.

هاوڕێیەکم بە ناوی هەڤاڵ سلاّح ماجیدی لە خوێندندا ساڵێك لە پێش من بوو، دواتر بەهۆی شەڕی عێراق-ئێرانەوە سەربازی هەبوو، ئەو دەرمانی بۆ دەهێنانین، واتە ڕێکخستن نەبوو، بەڵکو دۆستی ڕێکخستن بوو، ڕۆژێك:

- گوتی عەبدولواحێد ئەگەر تۆ کارێك بۆ من بکەیت، من بەردەوام دەرمانتان بۆ دەهێنم.

+ گوتم چییە؟

- گوتی من ئێستا ساڵەکەم تەواو بووە، بەمزووانە دەمنێرن بۆ سەربازی، جا ناشمەوێت ببم بە سەرباز، تۆ دەتوانیت بە بیانووی ونکردنی پێناسی پەیمانگاکەت، پێناسێکی پەیمانگا بە ناوی خۆت بۆ من دەربهێنیت، بەلاّم بە وێنەی خۆم، چونکە من ئەگەر پێناسم پێ بێ بەردەوام دەتوانم بچم دەرمانت بۆ بهێنم.

+ گوتم باشە.

ئیدی چوومە پەیمانگا، هەرچەندە ئەوکات وێنە وەك هی ئێستا ڕوون نەبوو، من وێنەیەکی ڕەش و سپی ئەو هاوڕێیەم برد، فەرمانبەرێکی ئافرەتی لێ بوو، قایل بوو، گوتی باشە بچۆ داواکارییەك بنووسە، منیش وێنەی هاوڕێکەم پێ بوو، گوتی ئەوە بە تۆش ناچێت، گوتم وەڵا نیمە هەر ئەو وێنەیەم هەبووە، لەبەرئەوەی ڕەش و سپییە بۆیە لە خۆم ناچێت، ئیدی قایل بوون، بە ون بوو (بدل ضائع) بۆیان دەرکردمەوە، بەڵام بە وێنەی ئەو و بە ناوی من.

دواتر ئەو هاوڕێیەم داوای (دفتر خدمة)کەشی لێ کردم، چونکە گوتی ئەگەر لە بازگەکان گومان لە پێناسەی پەیمانگا بکەن، کە دەفتەر خیدمەکەم بێت ئیدی گومانیان دەڕەوێتەوە و بڕوا دەکەن، هەروەها پێی گوتم تۆ پێناسە ڕاستییەکەی پەیمانگات بە وێنەی ڕوونی خۆت پێیە، بۆیە کەس داوای بەڵگەی دووەم لە تۆ ناکات واتە دەفتەر خیدمە، هەروەها ئەگەر لێکۆڵینەوەشت لێ بکەن ئەوا کێشەت نابێت، چونکە تۆ بەڕاستی خوێندکاریت، واتە ئەو لە دوای تەواوکردنی ساڵی دامەزراندنەکەی ڕاستەوخۆ دەبوو ببوایە بە سەرباز لە ئەگەری نەچوونیشدا بە هەڵهاتوو (فیرار) ئەژمار دەکرا، بۆیە بە پێناسی من ئەو کێشەیەی چارەسەر کرد.

ئیدی ئەو هاوڕێیەم ماوەی ئەو ساڵە خاوەنی بەڵێنی خۆی بوو، بەردەوام هاوکاری دەکردین، ئۆتۆمبێلی پێ بوو، لەناو هەولێریشدا کاری دیکەیان هەبوو، ڕۆژێك لە دووکانی هاوڕێیەکم بە ناوی (سەربەست) کە دەکەوتە سەر ڕێگای مەخمور، بڵاوکراوە و دەرمان و پێویستی و تەنانەت دەمانچەشمان لەسەر جیبسمبۆرد، یاخود تەپەتۆر (سقف ثانوي)ی دووکانەکەی دەشاردەوە، لەو سەردەمە لەناو شار هێزێکی ئاسایشی هاوبەش هەبوو -المشترکە: تێکەڵەیەك بوو لە تەواوی هێزە ئەمنییەکانی شار- لە ناو شار دەگەڕان، لە هەموو شوێنێك داوای پێناسیان لە خەڵکی دەکرد، لە شەقامی کوران ڕیزە دوکانێك هەبوو ڕۆژێك بەرێکەوت من و ئەو هاوڕێیەم کە پێناسەکەمان یەك بوو لەو دوکانە بووین، ئەو

هێزە هاوبەشە هاتنە ئەو شەقامە، من بەپەلە دەرچووم بەرەو ڕوویان ڕۆیشتم و دوو دوکان دوور کەوتمەوە و گەیشتم بەهێزەکە و داوای پێناسیان کرد، تەماشایان کرد و خێرا ڕۆیشتم و لەو ناوە دوور کەوتمەوە، ئەو هاوڕێیەشم لە شوێنێکی گونجاوی دووکانەکە خۆی حەشاردابوو، نەبینرابوو، ڕاستی من کێشەم نەبوو، بەڵام کە بەو ناوە پێکەوە لە یەك شوێن داوای پێناسمان لێ بکرابا ئەوە نەك ئەو منیش تیادەچووم، ڕاستی ئەو هێزەش هێزی پشکنین نەبوون، بەڵکو هێزێك بوون کە دەسووڕانەوە هەر کەسیان بویستبا داوای پێناسیان دەکرد، بۆیە لە بەردەم دووکانەکەی ئەو هاوڕێیەمان داوایان لە دوو کەس کردبوو ئیدی نەچووبوونە ژوورەوە، ئەگەر ئاگادار نەبووینایە و بگەیشتنایەتە دوکانەکە ئاشکرا دەبووین، چونکە هەردووکمان لە دوکانەکە پێکەوە دانیشتبووین.

سەرەڕای ئەوەی چەند کەسێکمان لە ڕێکخستنەکانی ناو شار دەستگیرکران، ئەمە وای نەکرد ئێمە لە کاری ڕێکخستن پەشیمان و دووربخاتەوە، بەڵکو هەر بەردەوام بووین و پەیوەندیمان کرد بە کەرتی ڕێکخستنی دەشتی هەولێر واتە (تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر)، لە ڕێگای مامۆستا تاهیر بەکرەوە، لێپرسراوی ئەو کەرتی ڕێکخستنە هەڤاڵ مەلا خدر بوو، کە ماڵی لە سێکانی بوو، بۆیە ئێمە دەستبەرداری ڕێکخستن نەبووین، لەم ڕێگایەوە لە چەند گوندێکی نزیکی هەولێر چەند هەڤاڵێکمان ناسی، من کە دەرمانەکانم بە دەست دەگەیشت چەند جارێك کۆمدەکردنەوە و بە چەند دەسێك دەمگەیاندە دەستی هەڤاڵ مەلا خدر، لە گوندی هەمزەکوێر، ئێمە وەك ڕێکخستن مامۆستا مستەفامان هەبوو، دەمان بردە ماڵی ئەوان، دواتر بە تراکتۆر، یان بە ئەو ئۆتۆمبێلە پیکابانەی کە بە شەو هاتوچۆیان دەکرد بە ماڵی هەڤاڵ مەلا خدرمان دەگەیاند.

ئەوکات ڕێگە نەدەدرا ئەو دەرمانانە، یان هەر پێویستییەکی دیکەی نهێنی و ڕێکخستنن ڕادەستی هەموو کەس بکرێت، واتە پەیوەندی بە متمانە و نزیکایەتی نەبوو، بەڵکو دەبوو ئەو شێوازە، ڕێکخستن دیاری بکات کە دەدرێت بە کێ، هەم لەبەر پاراستنی

گیانی کەسەکە هەم گیانی بەرامبەر، لە کۆتایشدا گیانی هەموومان، هەر ئەندامێکی ڕێکخستن ناوی خوازراوی هەبوو، هاوکات هەر پۆل و شانە و کەرتێك بەرپرسی خۆی جیابوو، بۆئەوەی سبەی ئەو ناوە بەر گوێی هەر کەسێك بکەوێت و بچێت هەواڵت لێ بدات ئەو ناوە لای ڕژێم نەدۆزرێتەوە، چونکە ئەگەر کەسەکە دەستگیریش بکرابا هیچ بەڵگەو پێناسێکی نەبوو بەو ناوە خوازراوەوە، بۆیە وەك زانیارییەکی هەڵە لێکدەدرایەوە و ئازاد دەکرا.

هاوڕێیەکی دیکەمان هەبوو بە ناوی (عەبدولوتەلیب)، یەکێکە لە هۆزانڤانەکانی شاری هەولێر، هەرچەندە هیچ پەیوەندییەکی ڕێکخستنی نەبوو، بەڵام دۆستی ی.ن.ك بوو، هاوڕێی ئێمە بوو، بەردەوام دەرمانی پێ دەداین، چونکە یاریدەدەری پزیشك بوو، ئەوکات تازە ئۆردوگاکانی نیشتەجێ بوون دروست کرابوون، نەخۆشخانەیان نەبوو، هەموو ڕۆژێك بەیانیان لە کۆگاکانی شارەوە دەرمانیان بۆ دەچوو، تیمێك دەچووە ئۆردوگاکە لە شوێنێك دەوەستان ئەگەر نەخۆش هەبووایە، چارەسەریان دەکرد و دەگەڕانەوە هەولێر تیمەکەش بریتی بوو لە یاریدەدەرێکی پزیشك (معاون طبي) لەگەڵ شۆفێرێك بە ئۆتۆمبێلێکی لاندکرۆزەر، بۆیە هاوڕێکەی عەبدولوتەلیب کە دەرمانەکانی وەردەگرت کە دوور دەکەوتەوە بەشێکی دەدا بە من، دەرمانەکانیش بە گشتی بۆ چارەسەری برینداری بوو، چونکە پێشمەرگە زیاتر پێویستی بەوە هەبوو، لەگەڵ دەرمانی هەوکردن و سڕکردن.

سەرەڕای ئەوە من سەرکێشیم بە گیانی خۆم کردبوو، وەك دروستکردنی ناسنامەکە و وەرگرتنی دەرمان و ناردنی لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانەوە، بەڵام بەو دوو هاوڕێیەم سەرسام بووم، چونکە تەنها دۆست بوون.

لەو ماوەیە دوو هاوڕێی دیکەم هەم ڕێکخستن بوون هەم تەندروستکار بوون، ئەوانیش د. بەڵێن کە هەرچەندە لە شانەکەی من نەبوو، ساڵێك پێشی من خوێندنی تەواوکردبوو، ویستی پەیوەندی بکات بە پێشمەگایەتییەوە من بردم بۆ پێشمەرگایەتی، هەروەها د.

ئامانج کە لە خوێندن ساڵێك پێش من بوو، بەڵام لە ڕێکخستن لای خۆم بوو، ئەویش کە بوو بە پێشمەرگە خۆم لەگەڵی چووم.

من ساڵی ١٩٨٨ خوێندنم تەواو کرد، پێشتر نیازی چوونە دەرەوەم هەبوو بۆ پێشمەرگایەتی، هەڤاڵ مەلا خدر، لێپرسراوی ڕێکخستنمان بوو، ئەو کاتەیش لە پەیمانگا داوای مەشق (تدریب)یان لێ کردین -ئەوکات ڕژێم لە وەرزی هاوین و پشووی خوێندندا خوێندکارانی ئامادەیی و پەیمانگا و زانکۆی دەبرد بۆ مەشق و ڕاهێنان تا ئامادەبن بۆ هەر پێویستییەك کە حکومەت مەبەستی بوو، بەو خوێندکارانە دەگوترا (الجیش الشعبي)- منیش نەم کرد، بۆیە ساڵێك دواکەوتم، چووم ببم بە پێشمەرگە، هەڤاڵ مەلا خدر دوو شەو لە ماڵی خۆیان ڕای گرتم، گوتی نابێت ببیت بە پێشمەرگە، ئێمە لە شار کارمان بە تۆیە، تۆ لە شار پێشمەرگەی، خۆمان بڕوامان وانەبوو، بەڵام لای ئەوان وابوو، چونکە چەندە لە شار بەهێز بووینایە زیاتر پشتیوانی پێشمەرگە بەهێز دەبوو، ئیدی باوەڕی پێهێنام کە بگەڕێمەوە هەولێر و درێژە بە خوێندن بدەم، بۆیە هۆکاری دواکەوتنم لە هاوڕێکانم بۆ ماوەی ساڵێك ئەوە بوو.

من کاتێك چوومە دەرەوە ئەنفال بوو، دۆخێکی زۆر ناخۆش بوو، خەڵك ڕادەست دەبووە، ئەو ڕێکخستنانەی کە من پەیوەندیم لەگەڵیان هەبوو پێیان سەیر بوو، زۆر تکایان لێ کردم کە نەچم، بەڵام هەر چووم، پەیوەندیم بە تیپی ٨٥ی بەڕانەتییەوە کرد وەك دکتۆری تیپ، دواتر کە چووینە ئێران ئیدی لە ناوزەنگ نەخۆشخانەیەکمان دامەزراند و لەگەڵ د. ئارام لەوێ کارم دەکرد، دواتر بەتالیۆن دروستکرا، هەر سێ تیپێك کرا بە بەتالیۆنێك من بووم بە پزیشکی بەتالیۆن، بارەگامان لە نۆکان بوو، بەیانیان دەچوومە ناوزەنگ بۆ لای د. جەبار، د. شوان و د. ئارام، کە د. شوان بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە بوو، د. شوان و د. جەبار ئەوکات دەرچووی کۆلێژی پزیشکی بوون، بۆیە پزیشکی فەرمیشمان هەبووە لە شۆڕشدا، بۆ نموونە دکتۆر جەبار بە کۆڵەپشتێکەوە لەگەڵ تیپەکان دەگەڕا،

لەگەڵ ئەوەشدا تەنها پزیشکی پێشمەرگە نەبوون، بەڵکو پزیشکی هەموو خەڵکی کوردستان بوون، هەروەها هەرگیز پشوویان نەبوو، شەو و ڕۆژ هەر کاتێك پێویستی هەبووایە ئەوان ئامادەبوون، جاری واهەبوو دکتۆرەکانی ئێمە خۆیان دەچوون بۆ لای نەخۆشەکە نەك ئەوەی نەخۆشەکە بهێنن بۆ لامان، جگە لەوەی لە کاتی شەڕیشدا هەمیشە بە کۆڵەپشتێکەوە لەگەڵ پێشمەرگە بوون، هەروەها گیانی دەیان پێشمەرگە و هاووڵاتی لەسەر دەستی ئەو پزیشکانە لە مردن گەڕاوەتەوە.

لەو کاتەی لە ناوزەنگ و نۆکان بووین خەڵکی ئەو سێ چوار گوندە دەهاتن، زۆر جار شەوان منداڵی نەخۆشیان دەهێنا و چارەسەرمان دەکرد، چونکە هەر ئەو نەخۆشخانەیە هەبوو، نەك هەر خەڵك پارتەکانی دیکەش بە هی خۆیان دەزانی، واتە لە کوردستان سێ بۆ چوار گوند مابوون لە دەسەڵاتی پێشمەرگە بوون ئەویش لە سنووری شارۆچکەی قەڵادزێ بوون، لەو ماوەیە د. جەبار و د. ئارام لەوێ بوون سنوورەکە دەکەوتە پشتی چیای مامەندەوە.

ڕۆژێك لەبەر هەتاو دانیشتبووین، ئۆتۆمبێلێك هات، دوای سڵاو، خۆیان وەك دامەزراوەکانی سەردەشت ناساند گوتیان بیستوومانە ئێوە دکتۆرتان هەیە، داوا دەکەین دکتۆرێك هەفتەی سێ ڕۆژ بێت لە نەخۆشخانەی سەردەشت دەوام بکات و پارەی پێ دەدەین، نەیاندەزانی کام لە ئێمە پزیشکە، کە باسی پارەیان کرد د. جەبار وەڵامی دانەوە و گوتی: "ئێمە پێشمەرگەین، بۆ پارە نەهاتووین، ئەگەر بە پارە کارمان بکردبا لە شار و گەڕەکەکەی خۆمان خزمەتمان دەکرد، بۆیە ئێمە پێشمەرگەین و خۆبەخشین لەگەڵ هێزەکەی خۆمان و بۆ پێشمەرگە و خەڵکی کوردستان بە خۆبەخشی کاری پزیشکی دەکەین، بۆ پارە بووایە نەدەهاتینە ئێرە، بەڵام وەکو کارێکی مرۆڤایەتی دەکرێت ئێمە بێین هەفتەی دوو بۆ سێ ڕۆژ خزمەتی خەڵکی شاری سەردەشت بکەین"، بە بۆچوونی من ئەمە وەڵامێکی گونجاو بوو بۆ کارگێڕی شاری سەردەشت، هەروەها هەڵوێستێکی جوان بوو.

لە ماوەی پارتیزانیدا، پارتیزانەکانی سنووری دەشتی هەولێر تووشی نەخۆشی مەلاریا بووبوون، چەند هاورێیەکمان ڕاسپارد دەرمان پەیدا بکەن، ئەو دەرمانەش نەدەفرۆشرا، چونکە دەبوو نەخۆشەکە ببینرێت، بۆ ئەوەی شوێنی نەخۆشییەکە کۆنترۆڵ بکرێت کە نەخۆشییەکەی لێ بڵاوبووەتەوە، بۆیە پەیداکردنی ئەو دەرمانە کارێکی زۆر ئەستەم بوو، هۆکاری تووشبوونیان جۆرە مێشوولەیەکە لەسەر گۆماو و شوێنە پیسەکان دەنیشێت، واتە پارتیزان ژیانی لە شوێنی ئەوها خراپ و ناتەندروست بووە، بۆیە نەخۆش کەوتبوون، ئیدی هەتا ئەو دەرمانانەمان بۆ پەیداکردن زۆر ماندوو بووین، من هەرچەندە لەگەڵیان نەبووم، بەڵام چونکە پێشتر لە ڕێکخستن بووم بۆ ئەو کارانە پێیان دەگوتم، منیش لە ڕێگەی پەیوەندیی خۆمانەوە ڕێکخستنەکانی شارم ئاگادار دەکردەوە چونکە تا ئەو کاتەش هەر ڕێکخستنمان هەبوو لە شار، دوای پەیوەندیکردن بە ڕێکخستنەکانی شار شوێنێک دیاری دەکرا بۆ وەرگرتنی، کە دەیانهێنا نەدەکرا شوێنی پارتیزانەکانیش بزانرێت، بۆیە شوێنێکمان دیاری دەکرد لێی دابنرێت، دواتر پارتیزانەکانمان ئاگادار دەکردەوە کە بچن لە فڵان شوێن دەرمانەکان دانراون، زۆرینەی ئەو کارانە بە نامەی نهێنی دەکران.

پارتیزانەکان برینداریان کەم بوو، چونکە شەڕ کەم بووبووەوە، تەنها نەخۆش کەوتن هەبوو، هەروەها ئێمە چارەسەری نەخۆشی هاووڵاتیشمان دەکرد، ئەوەی پێویست بووایە بۆمان دەکرد و ڕەوانەی شارمان دەکرد، بە تایبەتی کاتێک پزیشکەکانمان لەوێ نەبوونایە و خۆمان بۆمان چارەسەر نەکرایە ڕەوانەمان دەکرد، چونکە زۆرمان پاریدەدەری پزیشک بووین نەک پزیشک، ئیدی تا ساڵی ۱۹۹۱ ماینەوە.

بیرمە ڕۆژێک پێشمەرگەیەکمان نەخۆش کەوت، نەخۆشییەکەی بریتی بوو لە گرانەتا، بۆ ئەو نەخۆشییەش دەرزییەک هەیە کەمێک قورسە، بەتەواوی ماندووت دەکات، من دەرزییەکی گرانەتام بۆ نەخۆشەکە کرد، پێشمەرگەکەش زۆر خۆی هیلاک نیشاندا وەک ئەوەی کە من دەرزییەکەم خراپ لێدابێت، کەچی سەرەڕای چاکە فەرماندەی مەفرەزەکەی

نیمچە هەڕەشەیەکی لێ کردم و گوتی ئەگەر ئەو پێشمەرگەیە هەر شتێکی لێ بێت تۆ بەرپرسی، من زۆرم لەلا ناخۆش بوو، چونکە هەم نەخۆشییەکە قورسە و هەم دەرزییەکەی قورسە.

لە ڕاپەڕینیشدا لەسەر سنوورەوە هەتا کەرکووک بەشدار بووم، ئێمە لە نۆکانەوە بەڕێکەوتین، پێش بیست ڕۆژیش پارتیزانەکان بەڕێکەوتبوون، ئێمە هێزە زۆرەکەی سنووری هەولێر بووین، واتە تیپەکانی سنووری هەولێر و باڵەکایەتی پێکڕا بەسەرکردایەتی هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ و هەڤاڵ حەسەن کوێستانی هاتینە خوارەوە، هاتینە سونێ، وا بڕیار بوو هەتا ئاشتی و ڕادەستکردن هەبێت شەڕ نەکرێت، لە پێناو ئەوەی کەمترین پێشمەرگە شەهید ببێت، لە سونێ بارەگای فەوجێك هەبوو، ڕادەست نەدەبوون، شەو تا سبەی چاوەڕێمان کرد لە بەرەبەیاندا چەند پێشمەرگەیەکمان بۆ ناردن، بێ تەقە ڕاست چوونە ناو بارەگاکەوە، قسەیان لەگەڵ کردن، ئەوانیش قایل بووبوون، ئیدی دەستی بەسەرداگیرا و دواتر بەرەو قەڵادزێ بەڕێکەوتین، قەڵادزێ چۆڵ کرابوو، حکومەت هەمووی کردبوو بە سەربازگە هەتا ڕانیە چۆڵ بوو، ئێمە هەر بەپێ هاتین، تا گەیشتینە بارەگایەکی ح.د.ك لەوێ بە دوو بۆ سێ ئۆتۆمبێلی ئەوان بەرەو ڕانیە کەوتینە ڕێ.

بەهۆی ئەو بارەگای فەوجەوە ئێمە شەوێك دواکەوتین، واتە ١٩٩١/٣/٦ گەیشتینە ڕانیە، بەهۆی دەنگۆی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بۆ سەر شاری ڕانیە خەڵکی هەڵدەهاتن، بەڵام کە پێشمەرگەیان دەبینی لە ڕووی دەروونییەوە بەهێز دەبوونەوە، بۆیە ئۆتۆمبێلەکانیان دەدا بە پێشمەرگە کە گەیشتینە ڕانیە ئەو هێزە زۆرەی ئێمە یەك مەفرەزەی ح.ش و یەك مەفرەزەی (حسك)مان لەگەڵ بوو هیچ مەفرەزە و پێشمەرگەیەی (پ.د.ك)ی تێدا نەبوو، دواتر بەرەو کۆیە بە ڕێکەوتین، لە پێش ڕێگای هیزۆپ و سماقوڵی بووین بە دوو بەشەوە، زۆرینە بە فەرماندەیی هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ و هەڤاڵ حەسەن کوێستانی بەرەو شەقڵاوە بەڕێکەوتن، ئێمەش بەرەو کۆیە، بە شاخی هەیبەسوڵتاندا، کە

مامۆستا چەتۆ فەرماندەیی هێزەکەی ئێمە بوو، شەو لە قەتپاڵی شاخەکە باران دەستی پێ کرد، ئەوەی وەك ڕێنیشاندەر لە پێشمان بوو گوتی من چاوم نابینێت و بەرپرسیارێتی هەڵناگرم، ئیدی شارەزای دیکەمان لەگەڵ نەبوو گەڕاینەوە گوندەکانی قەمتەران و کانیماران کە بەهۆی ئەوەی لەسەر ڕێگا بوون تێکنەدرابوون، کە گەیشتین کاتژمێر ١٢ی شەو بوو، جلوبەرگی هەموو پێشمەرگەکان بەهۆی بارانەوە بەتەواوی تەڕ بووبوون، بە سەر ماڵەکاندا دابەش بووین، پێیان گوتین لە ناو گوند دوکانێك هەیە زۆپای داری هەیە بەیانی ئاگادارتان دەکەمەوە بچن لەوێ جلوبەرگەکانتان وشك بکەنەوە، ئەو کات دۆخی خەڵك خراپ بوو ئامێری گەرمکردنەوە و نەوت نەبوو، خەڵکی هەژار بوون، بۆ بەیانی چووین لەو شوێنە خۆمان وشك کردەوە، دواتر هێز کۆ کرایەوە و بەڕێکەوتینەوە، لە نزیکی نیوەڕۆ بەڕێکەوتین و لە نزیکی ئێوارە گەیشتینە ناو کۆیە، پارتیزانەکان چاوەڕێمان بوون.

پێشتر ئەرکی پارتیزانەکان دیاری کرابوو کاری خۆیان کردبوو، کارێکیان بریتی بوو لە نووسینی نامە و ناردنی بۆ پێشمەرگە ڕادەست بووەکان، هەروەها بۆ سەرۆك جاشەکان هەتا لە کاتی ڕاپەڕیندا چەك بدەنە خەڵك و بەشداری ڕاپەڕین بکەن، ئەگەر ئەوانەش ناکەن بێلایەن بن، ئەو نامانە بە ناوی هەڤاڵ مام جەلال و هەڤاڵ نەشیروان مستەفا و هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ دەنووسرا، چونکە ئەو کاتە هەڤاڵ مام جەلال لە کۆبوونەوەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بوو لە سووریا، بەڵام نامەکان بە ناوی ئەوان دەنووسرا بەپێی کاریگەریی و ناسینی ئەو سەرۆك جاشانە، واتە بە ئامێر پەیوەندی هەبوو، بەڵام نامەکە بە دەستوخەتی ئەو هەڤاڵانە نەبوو، چونکە شەوان پەیوەندی هەبوو دەگوترا بۆ فلان و فلان نامە بنووسن، هەروەها دەشیانگوت کە چی بنووسن، هەتا هەڤاڵ مام جەلال لە ڕێگەی زاخۆوە گەڕایەوە کوردستان.

من کامێرای خۆم و دوو (فیلمی کامێرام) پێ بوو، لە سوونێ هەتا کەرکووك وێنەم دەگرت، ئیدی لە کۆیە هاتینە هەولێر، من لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەم یەکم گرتەوە کە

پارتیزان بوون، دواتر بەرەو کەرکووك کەوتینە ڕێ، شەوی ١٩ لەسەر ٢٠ لەناو کەرکووك بووین و ڕۆژی ٣/٢٠ دوای ڕزگارکردنی کەرکووك گەڕاینەوە.

ئیدی کە پێشمەرگە گەیشتنە شارەکان پێویستیان بە ئێمە نەما، هەرچەندە ئەو شەوەی لە سوونێ بووین، د. ئارام بارێکی دەرمانی لە وڵاخێك بار کردبوو، هێندە خەمی دەرمانەکانی بوو ئەو شەوە دەرفەتی ئەوەی نەبوو خۆی بنوێت، ئەوەش لە دڵسۆزییەوە سەرچاوەی گرتبوو.

هەرچی پەیوەندی بە کۆڕەوەوە هەیە ئێمە لە کەڵەك بووین، لەوێ بریندارمان هەبوو چارەسەرمان دەکرد، پێشمەرگەمان لێ شەهید بوو، هەڤاڵ بورهانی سەعید سۆفی بەرپرسمان بوو، هەڤاڵ بورهان بریندار بوو، ساچمەی تۆپی بەرکەوتبوو، فریاگوزاری خێرام بۆ کرد، لە کۆڕەودا هەولێر چۆڵ کرا، ئێمە چووینە شەقڵاوە، ڕێگا نەبوو، هەڤاڵ بورهان گوتی با بچینەوە سەر ڕێگای پێشمەرگایەتی کە دەربەندی گۆمەسپان بوو، ڕێگاکەش گڵ بوو، ئۆتۆمبێلەکەشمان لە جۆری قەمەرە بوو، چووینە ئۆردوگای چوارقوڕنە لەوێ پیاوێك هەبوو بەناوی عەلی خەیات بەریدی سەرکردایەتی و ناو شار بوو، ماڵی شارەزا بووین، کاتژمێر دووی شەو بوو شوێنی بۆ کردینەوە، تا بەیانی گەیاندمانە نەخۆشخانە و چارەسەر کرا، دواتر چووینە دیانە، ماڵی هەڤاڵ بورهان لە شنۆ بوو، پێویستی بە پشوو هەبوو، ڕۆیشت هەفتەیەك پشوویدا و گەڕایەوە، گەڕاینەوە شەقڵاوە و بارەگامان دانا، ئیدی لێرەوە هێزەکان ڕێکخرانەوە، ئێمە بەتالیۆنی دووی بەڕانەتی بووین و هاتینە بەحرکە بارەگامان دانا.

لە دوای ڕاپەڕین زانیم ئەرکی من لە بواری تەندروستیدا تەواو بووە، دەستبەرداری ئەو بوارە بووم، پێشتریش لە پێناو خزمەتی شۆڕش و پێشمەرگە ئەو بوارەم هەڵبژاردبوو، نەك ئەوەی هیوا و ئاواتی خۆم بێت، پێشتر هەر لە قۆناغی ناوەندییەوە ویژەی کوردی خوولیام بوو، هەر لەو بوارەشدا دەمخوێندەوە، ئیدی لە هەلی خوێندن دەگەڕام، چونکە ئەستەمە بەبێ بوونی حەز لە هیچ بوارێکدا سەرکەوتوو ببیت، ئەوە بوو بەشی کوردیم لە

کۆلێژی پەروەردە تەواو کرد و لە ساڵی ٢٠٠٤ بڕوانامەی بەکالۆریۆسم لە زانکۆی سلێمانی بەدەستهێنا کە ئەو کات ئەو کۆلێژە لە کۆیە بوو، دواتر لە ساڵی ٢٠٠٨ بڕوانامەی ماجستێرم لە زانکۆی کۆیە و دکتۆرام هەر لە هەمان بەش بەدەستهێنا، لە ساڵی ٢٠٠٩ بووم بە مامۆستا لە زانکۆی کۆیە و تا ئێستاش بەردەوامم[٥١].

[٥١]- چاوپێکەوتن لەگەڵ: عەبدولواحید ئیدریس شەریف ڕەسووڵ، (د. ڕەوەند)، هەولێر، ٢٠٢٢/٣/٢٤.

## عومەر کەریم محەمەد ئەحمەد (د. عومەر)

من بەر لەوەی بچمە شاخ خوێندکار بووم، پەیوەندیم بە (ك.ڕ.ك)ەوە هەبوو، بۆیە لە ساڵی ١٩٨٤دا لە کەرتی غەریب هەڵەدنی پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە کرد، ئەو کات لە زۆربەی تیپەکاندا مەفرەزەی پزیشکیمان هەبوو، لە هەموو مەڵبەندێك بنکەیەکی تەندروستی هەبوو، ئەو بنکە تەندروستییانە هەم بۆ هێزی پێشمەرگە بوو، هەم بۆ خەڵکی سنوورەکە سوودی هەبوو، چونکە بەبێ جیاوازی خزمەتی خەڵکی سنوورەکە و هێزی پێشمەرگە وەکو یەك دەکرا.

ئەم بیرۆکەیە بۆ دامەزراندنی نەخۆشخانەکان بیرۆکەی هەڤاڵ مام جەلال بوو کە گرنگی زۆری بە نەخۆشخانە و کارمەندانی پزیشکی دەدا، باشترین نەخۆشخانەمان نەخۆشخانەکەی بەرگەڵوو بوو، کە من و دکتۆر موحسین پێکەوە لەو نەخۆشخانەیە کارمان دەکرد، ئەو چارەسەرەی لە نەخۆشخانەی بەرگەڵوو دەکرا، هەر ئەو چارەسەرە بوو کە لە نەخۆشخانەکانی ناو شار دەکرا، لە ڕووی پێشکەوتنی دکتۆر و کارمەندەوە لە هیچی کەم نەبوو، زۆربەری نەشتەرگەرییەکانی تێدا ئەنجام دەدرا.

هەرچی پەیوەندیدارە بە پەیداکردنی دەرمانەوە، دیارە ڕۆڵی ڕێکخستنەکانی شار کەمتر نەبوو لە ڕۆڵی پێشمەرگەکانی شاخ، ئەگەر ئەوان هاوکار نەبوونایە ئێمە نەماندەتوانی خزمەتێکی ئەوها بکەین، هەموو پێداویستیی و هاوکارییەکانمان لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانەوە بە دەست دەگەیشت، لەو کات و سەردەمەدا جەماوەر زۆر دڵسۆز بوون، وەفا هەبوو، سۆز و بەزەیی هەبوو، بۆ هێنانەوەی تەرمی شەهیدێك دەیان پێشمەرگە گیانی خۆیان دەخستە مەترسییەوە، تا تەرمەکەی بگەڕێننەوە، یاخود ئەگەر نەخۆشێکی هاووڵاتی لە گوندێك هەبوایە، کە نەدەگەیشتە لامان، ئێمە بە کۆڵە دەرمانێکەوە دەچووین بە هانایەوە، بەڵام بەداخەوە ئێستا ئەو دڵسۆزیی و لە خۆبووردەییە کاڵ بووەتەوە.

لای ئێمە هەر تیپێك کادیرێکی پزیشکی تایبەت بە خۆمان هەبوو، هەرچەندە هەموو تیپەکان کادیری پزیشکی تایبەت بە خۆی نەبوو، چونکە کادیری پزیشکیمان کەم بوو، ئەو کادیرەش لە ڕووی پۆست و مافەوە لە ئاستی فەرماندەی تیپەکەدا بوو، چونکە لە هەموو چالاکییەکاندا بەشدار بوو، کادیری پزیشکی دەبوو هەم دکتۆر و هەم پێشمەرگە بووایە، بەشداریمان دەکرد و بۆ چالاکییەکان دەچووین، تا لە نزیکەوە ئاگاداربین، ئەگەر بریندار هەبووایە دەبوو چارەسەری بکەین، پێشمەرگەش کە دەیزانی کادیری پزیشکی لەگەڵە ورەی بەرزتر دەبوو، چونکە ئێمە تا ڕادەیەك دڵنیاییمان بە پێشمەرگەکانمان دەدا بۆ چارەسەری برینداره‌کان.

هەڤاڵ مام جەلال بیرێکی زۆر فروانی هەبوو، گرنگی زۆری بە لایەنی تەندروستی دەدا و تەنانەت لە دوای ڕاپەڕینیشدا بەردەوام گرنگی بە لایەنی تەندروستی دەدا، چەندین نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی دامەزران، بە ناوی نەخۆشخانەکانی شۆڕش، بۆ خزمەتی پێشمەرگە و کەسوکاری شەهیدان، بۆ نموونە نەخۆشخانەی شۆڕش لە شاری سلێمانی، نەخۆشخانەیەك لە باوەنوور، نەخۆشخانەیەك لە سەرای سووبحان ئاغا بۆ حەوزی شارەزوور، نەخۆشخانەیەك لە ڕاپەڕین بە ناوی شەهید ئەحمەد ئسماعیل، لە دوای پرۆسەی ئازادیی لە ساڵی ٢٠٠٣ نەخۆشخانەیەکی لە شاری کەرکووك دامەزران.

هەرچی قۆناغی شاخە، سێ نەخۆشخانەمان هەبوو لەگەڵ تیمە تەندروستییەکان و لە دانوستانیشدا نەخۆشخانەیەکی دیکە بڕیاری لێ درا، کە ئەویش هەر بە هەوڵی هەڤاڵ مام جەلال لە ناوچەی سووورداش دامەزرا، کە خزمەتی زۆری بە خەڵکی ناوچەکە گەیاند، لە سنووری مەڵبەندەکانیش بۆ نموونە مەڵبەندی یەك نەخۆشخانەی بەلەکجار کرایەوە، لە مەڵبەندی دوو نەخۆشخانەی بەرگەلۆو کرایەوە، لە مەڵبەندی سێ نەخۆشخانەی بالیسان کرایەوە.

سەرگوزشتەی ئێمە دەیان یادەوەری تاڵی تێدایە، ئەوەی کە هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە شەوێك مەفرەزەکەمان بە پارتیزانی لە بێتوشەوە بۆ بەری ئاسۆس دەچووین، لە دوای کارەساتی ئەنفال ئەو رەتڵەی پێشی ئێمە کەوتبوون، کەوتنە کەمینەوە یەکێك لە پێشمەرگەکان کە زۆر قارەمان بوو بە ناوی هەڤاڵ حەمەی عەلی شەمام زۆر بە سەختی بریندار بوو، نەمانتوانی چارەسەری بکەین و شەهید بوو، ئەوە زۆر کاریگەری لەسەر جێهێشتم، لە ڕووداوێکی دیکەدا و لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١دا مەفرەزەکەمان کەوتە کێڵگەی مینەوە ئەو پێشمەرگانەی لە پێشی منەوە دەڕۆیشتن یەکێکیان مینی پێ دا تەقی و قاچێکی لە دەستدا، بەڵام خۆشبەختانە، سەرەڕای کەمئەندام بوونی توانیم چارەسەری بکەم و ئێستاش لە ژیاندا ماوە[٥٢].

---

[٥٢]- ئیسماعیل خالید: لەگەڵ پزیشکە پارتیزانەکانی شاخدا، گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە، ژ٧، سلێمانی، ٢٠٢١، ل٦٤-٦٧.

# فائق محەمەد ئەحمەد محەمەد (د. فائق گوڵپی)

لە ساڵی ١٩٥٧ لە گوندی گوڵپی ناوچەی هەورامان لەدایك بووم، لە ساڵی ١٩٦٣ باوكم لە شۆڕشی ئەیلوولدا شەهید بووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندیم لە قوتابخانەی گوڵپ و هەڵەبجە و سلێمانی تەواو كردووە، ساڵی ١٩٧٦ پەیوەندیم بە ڕێكخستنە نهێنییەكانی (ی.ن.ك)ەوە كردووە، ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ پۆلی شەشەمی ئامادەیی بەشی زانستیم لە قوتابخانەی ئامادەیی هەڵكەوت لە شاری سلێمانی تەواو كرد، یەكەمی قوتابخانەكە و سێهەمی پارێزگای سلێمانی بووم، ساڵی ١٩٧٥ لە كۆلێژی پزیشكی زانكۆی موسڵ وەرگیرام.

لە كاتی خوێندنمدا زۆر گرنگیم بەو بەشانەی بەرنامەی خوێندن دەدا كە پەیوەندی بە برینداری و چارەسەركردنی بریندارانەوە هەبوو، واتە زۆرتر بەلای بەشی نەشتەرگەریدا دەمشكانەوە، چونكە خۆم بۆ ئەوە ئامادە كردبوو، كە لە دوای تەواوكردنی خوێندن پەیوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە بكەم و ببمە پزیشكی پێشمەرگە، ساڵی ١٩٨٠-١٩٨١ كۆلێژی پزیشكیم تەواو كرد، بۆ ماوەی ساڵێك لە نەخۆشخانەكانی بەغداد و هەولێر و سلێمانی وەكو پزیشكی موقیم كارم كرد، تا كاری پراكتیكی پێش چوونە دەرەوەم وەك پێشمەرگە فێرببم، لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٢ لەسەر داوای ڕێكخستنەكانی كۆمەڵە پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەی كوردستانەوە كرد.

ڕۆژی ١٩٨٢/٤/٤ پەیوەندیم بە تیپی هەورامانی هێزی پێشمەرگەی كوردستانەوە كردووە، سەرەتای كاری پزیشكیی پێشمەرگایەتیم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوكاتە كە لە گوندی هاوار بووم، برینداری ئەو دەڤەرەم دەبینی و چارەسەرم دەكردن، ئیدی لە مایسی ساڵی ١٩٨٢ بەرەو گوندەكانی ناوزەنگ و توژەڵە و شێنێ و قوڵەهەرمێی بناری شاخی مامەندە كە سەركردایەتی لێ بوو بەڕێ كەوتم، لە سەركردایەتی (ی.ن.ك) لە گوندی قوڵەهەرمێ نەخۆشخانەیەك هەبوو بەناوی نەخۆشخانەی شەهید دكتۆر بەختیار، لە ناوەندی كۆمەڵە نامەیەكیان بۆ ئەو نەخۆشخانەیە بۆ نووسیم، بۆ ئەوەی بچم لەوێ كار بكەم،

منیش پەیوەندیم بە نەخۆشخانەکەوە کرد، دکتۆرێکی لێ بوو ناوی دکتۆر فوئاد تاڵەبانی بوو، پسپۆڕی نەخۆشییەکانی خوێن بوو، دوای ڕۆیشتنی ئەو، من و دکتۆر شوان و دکتۆر سەرداری ددان و دکتۆر تاریق جاف و ژمارەیەك یاریدەدەری پزیشکی و کارمەندی تر لە نەخۆشخانەی قولەهەرمێ ماینەوە و کاری خۆمانمان بەشێوەیەکی ئاسایی ئەنجام دەدا، چارەسەری چەندان نەخۆش و بریندارمان کردووە، چەندین جاریش بە نۆرە سەردانی بەرەکانی شەڕمان دەکرد.

لە ڕێکەوتی ١٩٨٢/١٢/٣ لە کاتی دروستبوونی مەڵبەندەکاندا من لەگەڵ مەڵبەندی ٢ی ئەوکات چووم بۆ گوندی سەرگەڵوو، کە بارەگای مەڵبەندی لێ بوو، دوای ساڵێك گفتوگۆی نێوان ی.ن.ك و حکومەتی عێراق لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە ڕاگەیەندرا، من چووم بۆ گوندی ئاوەژێ، لە ناو گوندەکەدا لەگەڵ دکتۆر سەعدوون بنکەیەکی تەندروستی بچووکمان بۆ خزمەتی پێشمەرگە و جەماوەری ناوچەکە دانا، لەو کاتەدا بارەگای گشتی ی.ن.ك و سکرتێری کۆمەڵە (بارەگاکانی سەرکردایەتی ی.ن.ك) لە سنووری ناوچەی مەرگە بوون، تا دوای ڕاگەیاندنی بڕیاری ڕاگرتنی شەڕی نێوان ی.ن.ك و ڕژێمی بەعس و دەستپێکردنی گفتوگۆ لە سنووری ناوچەکە مامەوە، نەدەچوومەوە بۆ ناو شار، نەخۆشم دەبینی و چارەسەری نەخۆشییەکانیانم دەکرد، شانبەشانی کارە پزیشکییەکانم کار و چالاکی ڕێکخستن و سیاسیم لە ناو ڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەدا بەڕێوە دەبرد، ئەندامی پۆلی کەرتی ڕێکخستنی قەڵادزێ بووم، لە کاتی گفتوگۆدا زۆربەی کادیر و پێشمەرگەکان شوێنی چالاکی خۆیان بەجێ دەهێشت و ڕوویان دەکردە ناو شارەکان، من نەدەچوومە ناو شار لە نزیك سکرتێری گشتی ی.ن.ك و مەکتەبی سیاسی مابوومەوە، بە جدی کارم دەکرد، لەو کاتەدا هەستم دەکرد بەرپرسەکان گرنگیم پێ دەدەن، دەیانەوێت لە بواری سیاسی و جەماوەریشەوە پلەم بەرز بکەنەوە، بە جەماوەریشم بناسێنن، هەر کە هەڤاڵان مام جەلال و نەوشیروان مستەفا میوانیان دەهات، منیان بۆ لای خۆیان بانگ دەکرد و بە میوانەکانیان

دەناساندم، باسی خۆڕاگری خۆم و قارەمانی باوکمیان بۆ میوانەکان دەکرد، بەڵام من لەو کاتانەدا خولیای دەسەڵات نەبووم، ئامادە نەبووم سوود لەو هەلۆیستە جدییانەی خۆم و پشتیوانی ئەوان بۆ وەرگرتنی پلەی سیاسی وەربگرم، بڕوام بە خۆم نەبوو کە بتوانم بەرپرسیاری گەورە لە ئەستۆ بگرم، حەزم دەکرد کاری پزیشکی بکەم.

دوای دانوستانی ی.ن.ك و حکومەت چەندین بارەگای حیزبی و ئیداری لە سووورداش دامەزران، نەخۆشخانەیەك بۆ نەخۆشی پێشمەرگە و جەماوەری ناوچەکە لەلایەن حکومەتی عێراقەوە لە سووورداش کرایەوە، بەرپرسیارێتی بەڕێوەبردنی نەخۆشخانەکەی سووورداش و بنکە تەندروستییەکانی مەڵبەندەکانی دیکە و هەموو کاروباری تەندروستیی ی.ن.ك بە من سپێردرا.

هەر لە کاتی دانوستاندا لە سلێمانی چوومە خولی موقیمی پێشکەوتووی پزیشکی نەشتەرگەرییەوە، بۆ ماوەی ٧–٨ مانگ لەوێ مامەوە، ئەو ماوەیە سوودێکی باشم لە ئەزموونی پزیشکە پسپۆڕەکانی نەشتەرگەری ئەو کاتە بینی، دکتۆرەکانی سلێمانی واتێگەیشتبوون کە من بۆ ئەوە خول دەبینم تا لە دواییدا بچمە دەرەوەی وڵات و خوێندنی باڵای پزیشکی تەواو بکەم، بۆیە لە کۆتاییدا دکتۆر حیلمی پێی گوتم با ڕیکۆمێندەیشنت بۆ بنووسم، بەڵام من پێی قایل نەبووم، وام دەزانی بەوە خیانەت لە کورد دەکەم، ئەو ماوەیەی لە سلێمانی بووم بەشێکی باش لە دەرمان و کەرەستەی نەشتەرگەریم پێکەوە نا، تا دوای گەڕانەوەم بۆ ناو هێزی پێشمەرگە، لەگەڵ ئەو زانستەی وەرم گرتبوو لە خزمەتی برینداره‌کاندا بەکاریان بهێنم و هەر واشم کرد.

لە دوای دانوستان ئەرکی من بۆ مەڵبەندی یەکی ئەو کات کە لە شارباژێر بوو گوازرایەوە، سەرەتای مانگی یەکی ١٩٨٥ پەیوەندیم بە مەڵبەندی یەکەوە کرد، نەخۆشخانەی مەڵبەند لە گوندی (کانی دڕکە)ی ناوچەی شارباژێر بوو، چەند مانگێك لەوێ ماینەوە، لە ئەنجامی شەڕی نێوان پێشمەرگە و سوپای عێراقدا بارەگاکانی مەڵبەندی

یەك لە ناوچەی شارباژێڕەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ گوازرانەوە، نەخۆشخانەکەمان بردە گوندی سێوسێنان، لە کاتی گواستنەوەی مەڵبەندا، ئێمە وەك بەشی تەندروستی دەرمانەکانمان لەگەڵ خۆماندا نەبرد، بەرپرسی مەڵبەند گوتی دواتر خۆمان دەرمانەکانتان بۆ ڕەوانە دەکەین، بەڵام من ئەو دەرمانانەی خۆم بە گرنگم دەزانی لە ناو کۆڵە پشتێکدا هەڵم گرت و بردمنە ناوچەی قەرەداغ، دوای دوو ڕۆژ لە گەیشتنمان بە گوندی سێوسێنان نەخۆش کەوتم، دەرمانی ئەو نەخۆشیەمان پێ نەبوو تا بۆ چاکبوونەوە بەکاری بهێنین، خەڵکی ئاوایی زۆر بەزەییان پێمدا دەهاتەوە، کە بەو شێوەیە دەیانبینیم هەر یەکە و بە گوێرەی ئەزموونی خۆی جۆرە دەرمانێکی بۆ دادەنام، منیش هەموو ئەو شتانەم دەخوارد کە بەلای خەڵکییەوە بۆ چاکبوونەوەی نەخۆشییەکەم سوودی هەبوو، پاش چەند ڕۆژێك چاکبوومەوە و لە بینای بنکەی تەندروستیی گوندی سێوسێنان بنکەیەکی تەندروستیمان کردەوە، دەستمان بە خزمەتکردنی نەخۆش و بریندارى دەڤەرەکە کرد.

ماوەی دوو ساڵ لە گوندی سێوسێنان بووین، دواتر لە بناری قوپی قەراغ نەخۆشخانەیەکمان کردوە، چەندین چالاکی پزیشکی گەورەمان بۆ هێزی پێشمەرگە و جەماوەری ناوچەکە ئەنجامدا، چەندین پێشمەرگە و خەڵکی بریندارمان بینی و چارەسەر کرد، کاتی خولی پزیشکییەکەم هەندێك پسوولەی نەخۆشخانەکانی ناو شاری سلێمانیم لەگەڵ خۆم هێنابوو، هەر نەخۆشێکی ئەو ناوچەیە پێویستی بەوە هەبوایە بچێتە نەخۆشخانە من یەکسەر لە ناوچەی قەرەداغەوە دەمناردە نەخۆشخانەکانی ناو شاری سلێمانی بێ ئەوەی حکومەتی عێراق بزانێت، کە لە کوێوە هاتوون.

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٦ بریندارێکی تیپی ٥٣ شێروانەیان بۆ هێنامە نەخۆشخانەکەی سێوسێنان و گوللە بەر لاقی کەوتبوو، نەخۆشەکە دووچاری گانگرینی ترسناك ببووبوو (gaz gangrin)، پێویستی بەوە هەبوو بە زووترین کات لاقی ببڕدرێتەوە، بۆ ئەوەی گانگرینەکە زیاتر بە ڕانیدا سەر نەکەوێت و بە خوێنیدا بڵاونەبێتەوە، هەرچی بیرم

کردەوە ئەگەر ئەو بریندارە بۆ هەر جێگایەکی دیکە بنێرم، تا دەگاتە شوێنی دیاریکراو شەهید دەبێت، بۆیە بڕیارمدا لە ژێر کاریگەری دەرمانی (پەسیدین) و سڕکردنی لۆکاڵیدا لاقی ببڕمەوە بۆ ئەوەی لە مردن ڕزگاری بکەم، بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە کاری نەشتەرگەرییەکەم بۆ ئەنجامدا، لە نەشتەرگەرییەکەدا دکتۆر حەسەن عەلی سەعید و هەڤاڵان نەجم و عادل هاوکارییان کردم، بریندارەکە ناوی عوسمان بوو خەڵکی کەلار بوو.

ساڵی ١٩٨٧ پێشمەرگەیەکی دیکە کە خەڵکی شارەزوور بوو، دووچاری نەخۆشی ڕیخۆڵە کوێرەبوو، ئەوکات نەخۆشخانەکەمان لە بناری قۆپی قەرەداغ بوو، برادەرانی مەڵبەندی یەکمان ئاگادار کردەوە، کە نەخۆشێکی وامان هەیە و پێویستی بە کاری نەشتەرگەری هەیە، دەبێت بینێرین بۆ شوێنێك تا کاری نەشتەرگەری بۆ بکرێت، مامۆستا ساڵح ژاژڵەیی کە ئەوکات بەرپرسی کارگێڕی مەڵبەند بوو، گوتی ناتوانین بۆ هیچ شوێنێکی بنێرین، ئێمەش گوتمان خۆمان نەشتەرگەری بۆ دەکەین، بەڵام دەبێت ئەوە بزانن لێرە لە نەخۆشخانە دکتۆری سڕکردنمان نییە، لەبەرئەوە ئەگەری کاری سەرکەوتنی نەشتەرگەرییەکە کەمترە لە کاتی ئاسایی، دکتۆر ناسیح بە دەرمانی کیتامین و ڤالیوم نەخۆشەکەی بۆ بێهۆش کردم، دکتۆر جەلال هاوکاری کردم، منیش لە ماوەی نیو کاتژمێردا کاری نەشتەرگەری ڕیخۆڵە کوێرەم بۆ ئەنجامدا، نەخۆشەکە چاك بوویەوە، پاش دوو مانگ نەخۆشەکە هاتەوە لامان، لە شوێنی برینەکەیدا دووچاری فتق جراحی (incisionalhernia) هاتبوو، هۆکاری ئەو فتقە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە لە کاتی دوورینەوەی برینەکەیدا ماسوولکەکانی نەخۆشەکە خاوەنەبووبوونەوە، تا ماوەیەك لە ژیاندا مایەوە و دواتر لە ئەنفالدا بێسەروشوێن کرا.

ئەو کاتەی کە لە سێوسێنان بووین لەبەر زۆری نەخۆش و بریندار لەبەرئەوەی قوتابخانەی سێوسێنان لەلایەن ڕژێمەوە پاشەکشەی پێکرابوو، قوتابخانەکەمان کردە نەخۆشخانە، بەڵام لە سەرەتای ساڵی (١٩٨٧)ەوە لە نزیك گوندی بەلەکجاری ناوچەی قەرەداغ بە چەند کیلۆمەترێك لە ئیدارەی مەڵبەندی یەك کە ئەوکات لالۆ ئەوڕەحمان

پێنجوێنی سەرپەرشتی دەکرد، نەخۆشخانەیەکی تایبەتیان بۆ دروستکردین، تا سەرەتای ساڵی ١٩٨٧ تەنها برینداری چەکی کلاسیکی و نەخۆشی ئاساییم بینی و چارەسەرم کرد، بەڵام لە بەهاری ئەو ساڵەوە لە شەڕی داستانی ڕزگاریدا ڕووبەڕووی جۆرە برینداریکی دیکە بووینەوە، کە بریندارای چەکی کیمیایی بوون.

نەخۆشخانەی مەڵبەندی یەك لەناو قوتابخانەکەی گوندی سێوسێناندا بوو، لەوێ لەلایەن حکومەتی بەعسەوە هەوڵی تیرۆرکردنمان درا، کاتێك شەوێکی هاوین نزیکەی کاتژمێر یازدەی شەو بوو، گوێم لە دەنگی تەقینەوەیەك بوو کە لە نزیك نەخۆشخانەکەوە بەرزبوویەوە، کاتێك چاوم بەرەو لای دەنگەکە وەرگێڕا گڕێکی گەورەم لە خوارووی نەخۆشخانەکەوە بینی، بەو کلاشینکۆفەی لە لام بوو چەند سەلییەیەکم بەرەو ڕووی ئاگرەکە تەقاند، لەم کاتەدا گوێم بە دەنگێکی دیکە لەناو گوندی سێوسێناندا زرینگایەوە سەرم لێ تێکچوو، نەمدەزانی چۆن دەنگی ئەم دوو تەقینەوەیە پێکەوە گرێ بدەم، لە سەربانی خانووەکەمان هاتمە خوارەوە، کۆمەڵێك کادیر و پێشمەرگە هاتنە پیریمەوە، پرسیاری ئەو تەقینەوەیەم دەکرد کادیرێکی ڕێکخستنی یەکێتیی شۆڕشگێڕان وەڵامی دامەوە، گوتی دکتۆر ئەوە مووشەکی ئاڕاستەکراو بوو تەقییەوە، گوتی لە خوارووی نەخۆشخانەکەوە بۆ ناو گوندی سێوسێنان ئاڕاستە کراوە و کاتی تەقینەوەی بۆ دیاریکراوە، ئەوە یەکەمجار بوو ناوی مووشەکی ئاڕاستەکراو ببیستم، پێشمەرگەیەکم بۆ ناو گوندی سێوسێنان ڕەوانە کرد تا بزانێت هیچ زیانێك بەر خەڵك کەوتووە، پاش دە دەقەیەك گەڕایەوە و گوتی زیانی نەبووە، منیش لەگەڵ پێشمەرگەکانی دیکەدا بەدەم قسە و ڕۆیشتنەوە خەریك بوو نزیکی دەرگای نەخۆشخانە دەبووینەوە دەنگێکی دیکەی تەقینەوە لەناو نەخۆشخانەکەدا بەرزبوویەوە، چوومە ژوورەوە هەواڵی بریندار و مورافقەکانم پرسی، هەر هەموویان سەلامەت بوون، کە ورد بوومەوە تەماشا دەکەم مووشەکی دووەم بەر

ئەو شوێنە کەوتووە، کە ڕۆژانە من نەخۆشی تێدا دەبینم، گوتم باش بوو زوو نەگەیشتمە نەخۆشخانەکە ئەگینا پێوە دەبووم.

لەو کاتەدا ستافی نەخۆشخانەکەمان لە سێ کەس پێکهاتبوو، خۆم وەك پزیشك و هەڤاڵ عادل و هەڤاڵ نەجم وەك یاریدەدەری پزیشك بوون، خەڵکی شاری خانەقین بوون، لە کارەکاندا هاوکارییان دەکردم و بە هەرسێکمانەوە خزمەتی پێشمەرگە و خەڵکی ناوچەکەمان دەکرد، ماوەی دوو ساڵ نەخۆشخانەکەمان لە ناو گوندەکەدا بوو، ماڵی چەند پێشمەرگەیەکیش هەر لە ناو گونددا بوون، هیچ بارەگایەکی هێزی پێشمەرگە، یان بارەگای حیزبی و کۆمەڵایەتی لە ناو گوندەکەدا نەبوون، ئەو ماوەیەی من لە گوندی سێوسێنان بووم چەندین جار بە فڕۆکەی بیلاتۆز و بە تۆپ ناو گوندەکە بۆردومان کرا، بۆردومانی فڕۆکەکان هێندە زیانی بە دواوە نەبوو، بەڵام لە تۆپبارانەکەدا چەندین کەس لە خەڵکی گوند بوونە قوربانی و زیانیش بەر سامانی خەڵکی گوندەکە کەوت، بۆیە نەخۆشخانەکەمان لە سێوسێنانەوە بۆ بناری قۆپی قەرەداغ نزیك گوندی بەلەکجاڕ گواستەوە.

هەر ئەو کاتەی لە گوندی سێوسێنان بووین ماوەیەك بوو پێشمەرگەیەکمان لە بارەگای یەکێتیی شۆڕشگێڕانەوە بۆ هاتبوو، کاری نانەوایی نەخۆشخانەکەی دەکرد، من هیچ گومانێکم لەسەری نەبوو، ڕۆژێکیان هاتە لام و گوتی پێویستیم بە چەند ڕۆژێك مۆڵەت هەیە، بچمەوە سەردانی ماڵی باوکم بکەم و نیازی ئەوەم هەیە خوازبێنی ژن بکەم، منیش مۆڵەتم پێ دا و سەفەری ناوچەی گەرمیانی کرد و پاش ماوەیەك گەڕایەوە، گوتی دکتۆر دەزگیرانم گرتووە، ئەڵقەیەکیشی لە پەنجە کردبوو، پیشانی دام و گوتی بەم بۆنەیەوە لە ئایندەیەکی نزیکدا بانگهێشتی دکتۆرەکان و برادەرانی بەشی کۆمەڵایەتی مەڵبەندی یەك دەکەم، بۆ نان خواردن، منیش بە پیر بانگهێشتەکەیەوە چووم و سوپاسم کرد.

هەر چاوەڕێی بانگهێشتی نان خواردن بووم، بەڵام هیچ دیار نەبوو، هەڤاڵ سامان گەرمیانی ئەو کات بەرپرسی بەشی سەربازی مەڵبەندی یەك بوو، ڕۆژێکیان لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگەدا گفتوگۆمان دەکرد، بانگی کردمەلاوە و پێی گوتم دکتۆر لەم ڕۆژانەدا هەواڵێکی گرنگ دەبیستی، منیش گوتم پێم خۆشە ئەو هەواڵە گرنگە زوو ببیستم، بۆ ڕۆژی دواتر هەڤاڵ سامان گەرمیانی هەواڵەکەی پێ گوتم، بەکورتی هەواڵەکە ئەوە بوو کە: نانەواکەی نەخۆشخانە پیاوی ڕژێمە، لەلایەن دەزگا هەواڵگرییەکانی ڕژێمەوە کارێکی تیرۆریستی لە دژی بریندارەکان و دکتۆرەکان پێ سپێردراوە، کارەکەش ئەوەبوو کە ژنێك بەناوی دەزگیرانی ئەم کەسەوە دێت بۆ گوندی سێوسێنان، مادەیەکی ژەهراوی لەگەڵ خۆی دەهێنێت، پاش چەند ڕۆژێك ئەو ژنە خواردنێکی باش بۆ بریندار و دکتۆرەکانی نەخۆشخانە دروست دەکات، دوای نان خواردنەکە ئەو ژنە و پێشمەرگەکە لە ڕێگەی چەند سیخوڕێکەوە بەزووترین کات لە ناوچەکە دوور دەخرێنەوە و دەگەیەنرێنەوە لای پیاوەکانی ڕژێم، هەر کە ژنەکە لە قەرەداغەوە گەیشتە گوندی سێوسێنان دەستەیەك لە پێشمەرگەکانی مەڵبەند چوونە سەریان و هەردووکیان لە ماڵەکەیاندا دەستگیرکردن، پاش لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتایی هەردووکیان دانیان بە تاوانەکەیاندا نا، بەڵام تا ئەو کاتە مادە ژەهراوییەکە لە شارەدێی قەرەداغ بوو، ژنەکە نەیوێرابوو یەکەمجار لەگەڵ خۆیدا بیهێنێت، لە ماڵێکی سەر بە دەزگا جاسووسییەکانی سەر بە ڕژێم دایناب‌وو، تا لە سێوسێنانەوە بگەڕێتەوە و پاش تاقیکردنەوەی ڕێگا و دڵنیابوون لە سەرکەوتنی پیلانەکە ئینجا ژەهرەکە لەگەڵ خۆی بهێنێت، بە هەوڵ و تێکۆشانی کەسانی دڵسۆز لە کارێکی تیرۆری ژەهراوی بوون ڕزگارمان بوو.

ڕۆژێك لەگەڵ مەفرەزەیەکی پێشمەرگەدا لە گوندی سێوسێنانەوە بەرە و گوندی مەسۆیی ناوچەی قەرەداغ دەچووین، لە ڕێگەدا چاوم بە کەسێکی گەنج کەوت، سەری تازە تاشرابوو جانتایەکی بە کۆڵەوە بوو، دەفتەرێکی گەورەی لەژێر باڵی ڕاستیدا گیرکردبوو،

دوای نزیك بوونەوە پرسیم ئەو دەفتەرە چی تێدایە؟ گوتی ناوم مەحموودە و خەڵکی مەسوێیم ئەندازیارم لە سوپای عێراق هەڵهاتووم، لە خولێکی پاراستنی کیمیایی بەشداربووم و زانیارییەکانیم لەم دەفتەرە نووسیوە و هێناومەتەوە، من خۆم پێ ناساند و گوتم لەسەر چەکی کیمیایی شارەزاییم نییە، ئەو دەفتەرە بدە بە من، پاش گفتوگۆیەك قایل نەبوو، پرسیم بۆ لای کێ دەچیت؟ گوتی بۆ لای وەهابی برام، ئیدی هەستم بە دڵخۆشی کرد، چونکە وەهاب دۆستێکی نزیکی من بوو، ئەندامی ك.ڕ.ك بوو، منیش وێڕای بەرپرسیارێتی پزیشکی، بەرپرسی پۆلی جەماوەری کەرتی ڕێکخستنی قەرەداغی ئەو کاتەی کۆمەڵە بووم، دوای چەند جارێك هەوڵدان دەفتەرەکەم لە هەڤاڵ وەهاب وەرگرت، چەندین جارم خوێندەوە سوودی باشم لێ وەرگرت، ئەگەر ئەو دەفتەرە نەبوایە من شارەزاییم لەسەر جۆرەکانی چەکی کیمیایی و نیشانەکانی لە کاتی تەقینەوەدا و نیشانەکانی ئەو چەکە لەسەر لەشی مرۆڤ و چۆنێتی چارەسەرکردنی بریندارەکان نەدەزانی، کە دواتر ژمارەیەکی زۆرم لە مەرگ ڕزگارکرد، دواتریش لە بەرگەڵوو نامیلکەیەکی دیکەم لەسەر چەکی کیمیایی خوێندەوە، هەروەها لە گوندی بەلەکجاڕەوە دکتۆر ناسیح قەرەداغیمان بۆ خولێك لەسەر چەکی کیمیایی بۆ وڵاتێکی دراوسێ نارد، بۆیە ئەرکی ئێمە هەر چارەسەری بریندار نەبوو بە چەکی کلاسیکی، بەڵکو لێرە بەدواوە ئەرکی پزیشکانی شۆڕش قورستر بوو.

لەو پلانەی کە پێشمەرگە بۆ داستانی ڕزگاری داینابوو کە ناوچەیەکی فراوانی لە خۆی دەگرت، شەوی ١٤/١٣-٤-١٩٨٧ لە ماوەیەکی کەمدا ئەو ڕەبیەیانەی کە بۆ پێشمەرگە دانرابوو دەستی بەسەردا گیرا، ڕژێم زیانێکی زۆری بەرکەوت، ڕۆژی ١٩٨٧/٤/١٤ بریندداری زۆرماندا، یەکێك لە بریندارەکان پێشمەرگەیەکی تیپی ٥١ی گەرمیان بوو، برینەکەی سەخت بوو لەبەر دەستماندا شەهید بوو، بریندارەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاد دەبوون، ڕژێم هەوڵی بەدەستهێنانەوەی ناوچەکانی پێشووتری دەدا، بە چەندین چەك و شێواز هێرشی

دەكرد، لە ڕۆژانی ١٤ و ١٥ و ١٦ برینداریكی زۆریان بۆ هێنام، چەندین برینداری گوللە و پارچەی تۆپم بینی، چارەسەری پێویستم بۆ دەكردن، ئەوانەشی برینەكانیان قورس بوو، ڕەوانەی نەخۆشخانەی بەرگەلۆوم دەكردن، كە دكتۆر هەلۆ (ئەدیب) لەوێ بوو، خەلكی شاری دهۆك بوو، دكتۆر ئاكۆ كە ئەوكات یاریدەدەری پزیشك بوو سڕكردنی بۆ بریندارەكان دەكرد و دكتۆر هەلۆ نەشتەرگەری بۆ دەكردن، یەكێك لە بریندارەكان كە تا ئەمڕۆش لە بیرمە پێشمەرگەیەك بوو بەناوی مامە قالە خەلكی شاری سلێمانی بوو لە تیپی ٥٥ی قەرەداغ بوو، فەرماندەی كەرت بوو بە سەختی سكی بریندار بووبوو، هەر كە گەیشتە لام دەرزی ئازارم بۆ كرد موغەزیم بۆ هەلواسی، دەرمانی ئەنتیبایۆتیكم بۆ كرد، بەپەلە بە موغەزییەكەوە خستمانە ناو تراكتۆرێك و لەگەل برادەرێكدا ناردم بۆ نەخۆشخانەی بەرگەلۆو، ئەو كەسەی كە لەگەلی ناردم ناوی عوسمان بوو خەلكی شارۆچكەی كەلار بوو، دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی بوو، لە پێشمەرگایەتی ناسیم لە شەڕێكی ناوچەی قەراغ بریندا بوو، هاتە لای نەخۆشخانەكەی ئێمە و چارەسەرم بۆ كرد، كە چاكبوویەوە داوای كرد نەگەڕێتەوە كەرتەكەی و فێری كاری سەرەتایی پزیشكی ببێت و منیش قایل بووم و خولێكی ڕاهێنانی سەرەتاییم بۆ ١٥ پێشمەرگەی خوێندەواری تیپەكانی مەلبەندی یەك كردەوە، عوسمان بە پلەی باش دەرچوو، لە تیپی ٥٥ و ٥٣ ڕۆلی باشی بینی بوو، بۆیە لەگەل مامە قالە ناردم و گەیاندبوویە نەخۆشخانەی بەرگەلۆو، دكتۆر هەلۆش نەشتەرگەری بۆ كرد و چاك بوویەوە.

یەكێك لە بریندارەكانی دیكەی ئەو شەڕە هەڤال بێستوون سابوراوایی بوو، ڕابەر سیاسی تیپی ٢٣ی سووورداش بوو، گولەیەك بەر ملی كەوتبوو، بە وردی تەماشای شوێنی برینەكەیم كرد لێدانی خوێنبەر و خوێنهێنەرەكانی ملیم تاقیكردەوە، دەمارەكانی دیكەی ملیم كۆنترۆل كرد، گوتم بێستوون تەواو، گوتی چی تەواو؟ گوتم لە مردن ڕزگارت بوو، چارەسەرێكی واشت پێ ناوێت، گوتی چۆن؟ گوتم برینی مل وایە، یان زۆر مەترسیدارە، یان

زۆر سەلامەتە، ئەگەر ماسوولکەکانی مل بریندارین کێشەیەك نییە، برینداریيەکە سووکە و زوو چاك دەبێتەوە، بەلام ئەگەر خوێنبەر و خوێنهێنەرەکانی بۆری هەناسەدان و سوورێنچك، یان حەبلی شەوکی مل بریندار ببن، مەترسی ژیان لە دەستدان زۆرە، بە تایبەت لە ڕەوشی وەك ئێستای ئێمەدا کە کاری نەشتەرگەری بەپەلە بۆ ئەو جۆرە برینداریيانە ئەستەمە، بێستوون باوەڕی بە هەڵسەنگاندنە پزیشکییەکەی من کرد منیش هەندێك دەرمانی ئازار و دەرمانی ئەنتیبایۆتیکم بۆ ئامادە کرد و ناردمەوە بۆ بارەگای تیپەکەیان بۆ ئەوەی لەوێ چارەسەری تەواو وەربگرێت، هاوکات ناوی بریندارێکی دیکەم لە یادە کە ناوی حاجی عومەر بوو، خەڵکی شاری سلێمانی بوو بیرم نایەت لە چی تیپێك بوو، بەرپرسیارێتیشی هەبوو گوللەیەکی دۆشکە بەر قۆڵی کەوتبوو، ئەویش بەخت یاوەری بووبوو دەمار و ئێسکەکانی قۆڵی بریندار نەبوو بوو، تەنها ماسولکەکانی بریندار بووبوون، هەر لەوێ برینەکەیم بینی و نەشتەرگەری سەرەتاییم بۆ کرد و دەرمانی پێویستم بۆ دانا.

لە درێژەی داستانی ڕزگاریدا لە ناوەڕاستی مانگی چواری ١٩٨٧ شەوێك لە قوتابخانەی گوندی بیرکە خەوتبووین، بە ئاگایان هێنام کە هەڤاڵ سامان گەرمیانی بریندارێکی بۆ هێناوم، کە بەرپرسی سەربازی مەڵبەندی یەك بوو، گوندەکە زۆر نزیك بوو لە سەربازگەی ڕژێمەوە، دەبوو لایت بە کارنەهێنین، بریندارەکەم هێنایەوە ژوورەوە لایتێکم لە دەم و چاویدا، لەو کاتەدا هەستم بە بۆنێکی ناخۆش کرد، کە لە جلوبەرگ و ڕوومەتی بریندارەکەوە بەرەو ڕووم دەهات، چاوی سوور هەڵگەڕابوو ئاوی دەکرد، بەڕووناکی لایتەکە بێزار دەبوو، دەم و چاوی ڕەش هەڵگەڕابوو، دووچاری دڵەڕاوکێ هاتبوو، شپرزەیی زۆر بە سیمایەوە دیار بوو، ئەو نیشانانە و بۆنەکە و ڕەش هەڵگەڕانی دەم و چاوی نیشانە بوون کە ئەو بریندارە چەکی کیمیایی گازی خەردەلی بەرکەوتووە، (Masterd Gaz)، بریندارەکە ناوی هەڤاڵ مەهدی بوو، پێشمەرگەی یەکێك لە تیپەکانی ئەو کاتی مەڵبەندی دوو بوو، بردمانە حەمامی قوتابخانەکە، دەستکێشم لە دەست کرد و لەگەڵ هەڤاڵ سامان گەرمیانی

هاوکاریمـان کـرد و جلـەکانیمان لەبـەر داکەنـد و شـۆردمان، جلەکـەیمان دوورخسـتەوە و خسمانە ژێـر گڵەوە، کـادرێکی ڕێکخسـتن بـە نـاوی هـەڤاڵ (خولـە کۆمەڵە) جلی خـۆی بـە برینداره‌کـە بەخشی، دواتـر کۆمـەڵێك ڕێنمـایم بـۆ بریندارەکـە دانـا بـۆ ئـەوەی بتـوانێ کاریگەری چەکی کیمیایی لەسەر دەم و چاوی کەم بکاتـەوە، دڵۆپی ئـەنتیبایۆتیك و دڵۆپی هەستیاریم بۆ چاوەکانی کرد و پێم گوت دەبێت ڕۆژانە چەند جارێك خۆت بشۆیت.

دوای شـەڕەکە بـەرەو بەرگـەڵوو و سـەرگەڵوو پاشەکشـەمان کـرد، مـن چـوومە نەخۆشخانەی بەرگەڵوو، سەردانی دکتۆر و کارمەند و بریـندارەکانی نەخۆشخانەکەم کـرد، لە کاتی شەڕەکەدا دەیان بریندار لەو نەخۆشخانەیە چارەسەر کرابوون، هەندێك بریـنداری چەکی کلاسیکی و هەنـدێك بریـنداری چەکی کیمیـایی لـە نەخۆشخانەکەدا مـابوون، بـۆ بینـینی بریـندارەکان لەگـەڵ دکتـۆر هـەڵۆ چـووینە ڤاوشـی نەخۆشـەکانەوە، چـەند بریندارێکمان بینی، بەڵام ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام، ئەو منداڵە تەمـەن نـۆ ساڵانە بـوو، کە ڕەوشی تەندروستیی زۆر خـراپ بـوو، لـە تەنیشتیەوە ڕاوەستام برینـەکانی لـە بـرینی گولله و پارچەی تۆپ نەدەچوون، دکتۆر کارەساتی برینداربوونی ئەو منداڵەی بەمشێوەیە بـۆ گێڕامـەوە: ئـەم منداڵە خـەڵکی گونـدی کـانی تـووی نزیـك شارۆچکەی مەرگەیـە، لـە ١٩٨٧/٤/١٦ لە کاتی کیمیایی بارانکردنی ئەو گوندە، ئەم منداڵـە لـە دەرەوەی گونـد سـەرقاڵی لەوەڕانـدنی مـەڕ و مـاڵات بـووە، یـەك لـە بۆمبـە کیمیاییـەکان لـە دەرەوەی گوندەکـە دەتەقێتـەوە، ئـەم منداڵـەش لـەو کاتـەدا نزیکـی بۆمبـە کیمیاییەکـە بـووە، زیـاتر نزیـك دەبێتـەوە و پارچـەی بۆمبەکـە هەڵدەگرێت و دەستکاریيان دەکات، نازانێت کـە بۆمبەکـە کیمیاییە، لە ئەنجامدا بەو شێوەیە، بـە مـادەی کیمیـایی خـەردەل بریـندار بـووە، مەترسی لەسەر ژیانی دروست کردووە، ئیدی چەند ڕۆژێك لای ئەو مابووەوە چارەسـەری دەکـرد، تـا ئەو ڕۆژەی شەهید بوو.

چەند پێشمەرگەیەکی دیکەم بینی کە بە چەکی کیمیایی لە گوندی قزلە و سنگر و مێولاکە و بەرگەڵوو بریندار بووبوون، هەموو بریندارەکان ڕەوشی تەندروستییان بەرەو باشی دەچوون، لەبەر زۆری برینداری ئەو پێشمەرگانەی کە بەر چەکی کیمیایی کەوتبوون، لە نەخۆشخانە دەرکرابوون لە بارەگاکان دەحەسانەوە، ڕۆژانە بۆ ئەوەی پزیشك بیانبینێ، سەر لە بەیانی دەهاتنە نەخۆشخانە، دەرمانیان پێ دەدرا و تیمار دەکران، دواتر بۆ بارەگاکەی خۆیان دەگەڕانەوە، یەك لەو کەسانەی کە لە بەرگەڵوو بینیم هەڤاڵ بەختیار ئیسماعیلی برای هەڤاڵ شۆڕش ئیسماعیل بوو کە بە چەکی کیمیایی بریندار بووبوو.

لە کاتی داستانی ڕزگاریدا هێزی هەر سێ مەڵبەندی ئەو کات کۆبوونەوە، حکومەت بە چەکی کیمیایی چەند گوندێکی سنووری داستانەکەی بۆردومانکرد، لە هەمان کاتدا گوندەکانی ناوچەی خۆشناوەتی لە وانە: خەتێ، بالیسان و شێخ وەسانانی بە چەکی کیمیایی بۆردومان کرد، دکتۆر زریان کە پزیشکی مەڵبەندی سێ بوو ژمارەیەکی زۆر برینداری چەکی کیمیایی چارەسەر کردبوو، ژمارەیەك برینداریش بەرەو نەخۆشخانەکانی هەولێر و ڕانیە ڕۆیشتبوون، لەلایەکی دیکەوە هێزێکی هاوبەشی پێشمەرگە شارۆچکەی قەرەداغیان ڕزگار کرد و لە بەرامبەردا حکومەت بە چەکی کیمیایی چەند گوندێکی بۆردومانکرد، دکتۆر ناسیح قەرەداغی چەندین برینداری لێ چارەسەر کردبوون، یەك لەوانە ناوی هەڤاڵ ڕێبوار ئەنوەر بوو کە کێشەی چاوی بۆ دروست بووبوو.

لە ناوەڕاستی مانگی شوباتی ١٩٨٨ کە ئەو کات من پزیشکی مەڵبەندی یەك بووم، لە ڕێگەی بێ تەلی مەڵبەندەوە لە سەرکردایەتییەوە برووسکەیەك بە پزیشکانی شۆڕش گەیشت، کە دەربارەی هێرشی کیمیایی دەدوا، باسی لە زانیاری بەکارهێنانی ئەو چەکە لەلایەن ڕژێم و چۆنێتی خۆپاراستنی لێی دەکرد، ئەو ڕێنماییانەم بە دکتۆر ناسیح گوت و لە نووسراوێکی هەژدە خاڵیدا، مامۆستا بەهادین نوری تایپی کرد و نزیکەی ٥٠٠ دانەی لەبەر گرتبووەوە، منیش بۆ گوندە قەرەباڵەغەکان و کەرت و تیپەکانی گەرمیان و

قەرەداغم نارد، کە لە زانیاری و کاریگەریی و خۆپاراستن و چارەسەر لەسەر چەکەکە پێکهاتبوو، لە کاتی ڕووخانی ڕژێمی بەعس و ئازادبوونی عێراق، بەڵگەنامەیەك بەر دەست کەوتووە کە باس لە ڕێنماییە پزیشکییەکانی هێزی پێشمەرگە دەکات، لە کاتی کیمیابارانی کوردستاندا بۆ جەماوەری کوردستان و هێزی پێشمەرگەیان بڵاوکردووەتەوە، بۆ بینینی ناوەڕۆکی بەڵگەنامەکە بە زمانی کوردی و عەرەبی بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٢).

دوا نیوەڕۆی ١٩٨٨/٢/٢٧ لە گوندی بەلەکجار گوێم لەدەنگی بۆردومان بوو، دوکەڵێکی خەستی چڕم لە چەند جێگەیەکی نزیك لە یەکتر بینی، لەگەڵ خێزان و منداڵەکم چووینە ژوورەوە و چەند خاولییەکمان لە ناو هەڵکێشا و بەسەرماندادا کە ئەو کات شێنێی کچم سێ ساڵ نەدەبوو، ئیدی ماڵە دراوسێکانم بە دەنگی بەرز ئاگادار کردەوە کە لە شوێنە نزمەکان بێنە دەرەوە و چونکە گازەکە قورس بوو لە نزمایی دەنیشت، ئیدی بەرە و شوێنی بەرز ڕۆیشتین و هەمووان بە گوێی ئامۆژگارییەکانی ئێمەیان دەکرد و چەند گوندێکی دیکە بۆردومان کرا، خۆشبەختانە کەمترین بریندار لێکەوتەوە.

لە ١٩٨٨/٣/٢٢ لە کاتی بۆردومانی سێوسێناندا، دکتۆر ناسیح لە نەخۆشخانەکەوە هات بۆ ماڵەوە بۆ لام، گوتی: بریندار چەکی کیمیاییان بۆ هێناوین، لەگەڵ دکتۆر ناسیح بەرەو نەخۆشخانەکە کەوتینە ڕێ، گوێمان لە دەنگێکی ناسراو بوو هاواری دەکرد فریام بکەون، منیش ناسیمەوە گوتم کاك کەمال ئەوە تۆی؟ چیتە؟ گوتی نابینم بەر چەکی کیمیایی کەوتووم، بردمانە نەخۆشخانەکە لەگەڵ دکتۆر ناسیح تەماشای چاویمان کرد بیلبیلەی چاوی وەك کونە دەرزی لێهاتبوو، بەشەکانی دیکەی چاوی بریندار نەبوو بوو، هیچ بۆنێکی لێ نەدەهات، بۆمان ڕوون بوویەوە ئەو چەکەی بەکارهاتووە چەکی دەمارە، ( Nervous Gas)، جلەکانیمان داکەند و لەشیمان شۆرد و جلی پاکمان لەبەر کرد، چەند دەرزییەکی ئەترۆپینمان بۆ کرد، سوودی لە چارەسەرییەکە وەرگرت و چاك بوویەوە.

ئەو کارانەی کە بۆ بریندارەکانی گوندی سێوسێنانمان کرد بریتی بوون لەمانە:

١. داوامان له پێشمەرگەکان کرد بە ئۆتۆمبێل و تراکتۆر فریای بریندارا ن بکەون و بیانهێنن بۆ نەخۆشخانە.
٢. چەند کارمەندێکی تەندروستیمان نارده سەر چەمی دێوانە، (لە نێوان سێوسێنان و بەلەکجاردا)، هەر برینداڕێکی چەکی کیمیاییان دەهێنا بە ئاوی چەمەکە دەیانشۆرد و دەرزی ئەترۆپینیان بۆ دەکرد و ڕەوانەی نەخۆشخانەکەیان دەکرد.
٣. داوامان لە خەڵکی گوندەکانی دیکە کرد بچن بە هانای خەڵکی سێوسێنانەوە، بەڵام بە دەستی ڕووت دەستیان لێ مەدەن،
٤. حەمامێکی نەخۆشخانەکەمان گەرم کرد بۆ شۆردنی بریندارەکان، داوامان لە خەڵکی کرد جلوبەرگی زیادیان بهێنین تا بۆ برینداران بەکاریان بهێنین.
٥. خۆشبەختانە لەو کاتەدا نزیکەی ١٠٠٠ هەزار ئەمپول دەرزی ئەترۆپینمان هەبوو، کە باشترین دەرمانە بۆ چارەسەرکردنی برینداری گازی ژەهراوی دەمارەکان، هەروەها مەغەزیمان بۆ هەندێك لە بریندارەکان هەڵدەواسی، بریندارەکان هەموو نیشانەکانی گازی دەماریان پێوە دیاربوو، ئەوەی لەوێ چارەسەرمان کرد نزیکەی ٨٠ هەشتا کەس دەبوون.

لە کاتی ئەنفالدا نەخۆشخانەکەمان کرد بە دوو بەشەوە، بەشێکی من لەسەری مامەوە، بەشەکەی دیکەی دکتۆر ناسیح لەگەڵ بریندارەکاندا بردی بۆ قۆپی، لەو بەشەی لای خۆم دەرمانەکانم کرد بە دوو بەشەوە، بەشێکی گرنگی دەرمانەکانم کردە ناو کۆڵە پشتێکەوە و دام بە کۆڵمدا، هێندە دەرمان مابوو کە نەمانتوانی لەگەڵ خۆماندا بیانهێنین، لەگەڵ پێشمەرگەکاندا لە ژێر تاشەبەردێکدا شاردمانەوە، بۆ ئەوەی لە دواڕۆژ ئەگەر دەرفەتمان هەبێت بیدۆزینەوە، ئەو دەرمانانە و چەکێکی کلاشینکۆفم بە کۆڵەوە بوون و پێیانەوە دەگەڕام.

لێرەوە گەیشتینە گەرمیان و بە گوێرەی ئەرکەکانمان لە گوندەکانی دەشتی گەرمیاندا، هەر بارەگایەك و دوو بارەگا لە گوندێکدا جێگیر بووین، لە ئۆتۆمبێلێکدا بووین کاتژمێر پێنجی ئێوارە کاتی کردنەوەی ئامێری بێتەل بوو، هەڤاڵ عەدنانی حەمەی مینا پێی ڕاگەیاندم کە ئەبو فەلاح مین پێیدا تەقیوەتەوە، دەبێت دکتۆر بیبینێت، منیش کۆڵە پشتەکەم ئامادە کرد و پاش دوو کاتژمێر بە ئۆتۆمبێل گەیشتینە لای بریندارەکە، ئەو لە گوندی هەزارکانی مینی پێدا تەقیبوویەوە، ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵی بوون لە سەرووی برینەوە لاقیان بەستبوو بۆ ئەوەی خوێنی لێ نەڕوات، لە گوندی دەرەواری خواروو نزیکیان کردبوویەوە و بە ئۆتۆمبێل گەیاندمانە گوندەکە، بە هەڤاڵ قادری حاجی عەلیم گوت دەبێت لاقی لە خوار ئەژنۆیەوە ببڕینەوە، هەندێك لە پێداویستییەکانی بڕینەوەکەم ئامادە کرد، کە لە کۆڵە پشتەکەمدا بوو، هەڤاڵ جەبار کادیرێکی پزیشکی وریا بوو بۆ هاوکاریکردنم ئامادەبوو، ئەوەی کە پێمان نەبوو بڕیتی بوو لە مشار بۆ بڕینەوەی ئێسك و دەستکێشی پزیشکی و سابوونی دەستشتن و ڕووناکی و دەرمانی خاوێنکەرەوە، بە پێشمەرگەکانم گوت بە گوندەکەدا بگەڕێن هەرچەندە لە کاتی چۆڵکردنندا خەڵکی گوندەکە هەموو کەلوپەلەکانیان بردبوو.

دوای گەڕان مشارێك و مەنجەڵێکی ڕەش و لۆکسێکیان دۆزیبوویەوە، پێشمەرگەکان ئاویان لە مەنجەڵە ڕەشەکەدا گەرم کرد و مشارەکەیان خستە مەنجەڵەکەوە تا پاك ببێتەوە، بە ئاوە گەرمەکە دەستمان شۆرد و لۆکسەکەمان بۆ ڕووناکی بەکارهێنا، بە نۆرە هەر یەك لە هەڤاڵ جەمیل هەورامیی و هەڤاڵ جوامێر بە سەر سەرمەوە لۆکسەکەیان بۆ دەگرتین، ئەمپۆلێکی مۆرفینم بە دەمار بۆ ئەبو فەلاح کرد و دواتر بە سڕکردنی لۆکاڵی زیلۆکاین ئەو شوێنەم سڕکرد، لاقیشی توند بەسترابوو بۆیە پێویست نەبوو بیبەستمەوە، بە پێی بنەماکانی پزیشکی نەشتەرگەری، پێست و ماسوولکە و ئێسك و خوێنبەر و خوێنهێنەرەکانی لاقی ئەبو فەلاحم بڕیەوە و خوێنەکەیم گرتەوە و دەنگێکی لێوە نەهات،

کاتێک گەیشتمە نۆرەی بڕینی شادەماری لاقی (scatic nerve) دەنگێکی لێوە هات و گوتی ئۆف، بەڕاستی ئەبو فەلاح برینداریکی ورەبەرز و بەجەرگ بوو، دوای تەواوکردنی برینەوەی هەموو توێژەکانی لاقی لە بنەوە بۆ دەرەوە، توێژە جیا جیاکانم بۆ دوورییەوە، تەنها پێستەکەی مابوویەوە لەو کاتەدا داوام لە پێشمەرگەیەک کرد ئەو پەتەی کە لاقی لە سەرووی برینەکەوە پێ بەسترابوو بکاتەوە، بەوە ویستم تاقی بکەمەوە، بزانم شوێنی نەشتەرگەرییەکە خوێنی لێ بەرنابێت، کاتێک زانیم کارەکەم سەرکەوتووە، پێستەکەشیم دوورییەوە و سۆندەیەکم لە ژێر پێستی برینەکەوە هێنایەوە دەرەوە بۆ ئەوەی ئەگەر خوێن هەبێت لە ناو برینەکەدا کۆنەبێتەوە و لە ڕێگەی ئەو سۆندەیەوە بێتە دەرەوە، بۆ سبەی ئەبو فەلاح گوێزرایەوە بۆ گوندی کوردەمیر بۆ نەخۆشخانەکەمان لە دەشتی گەرمیان، لەوێ مایەوە بۆ چارەسەرکردن تا کارەساتی ئەنفال سێ دەستی پێ کرد.

لە کاتی ئەنفالی سێدا من لای خۆمەوە لە مەترسی ڕەوشەکە تێگەیشتم و چوومەوە لای برادەرانی نەخۆشخانە، پزیشک و کادیرەکانم هێنایە لای بریندارەکان و بۆ ماوەی چەند خولەکێک قسەم بۆ کردن و پێم گوتن، کە بڕیار هەیە بەرەو قۆپی قەراغ پاشەکشە بکەین، هەندێک بریندارمان لابوو کە لەو کاتەدا پێویستیان بە هاوکاریکردن بوو، زۆربەی برینداراەکان هاوەڵ (مرافق)یان لەگەڵ بوو، ئەبوو فەلاح کە چەند ڕۆژێک بوو لاقیم لە خوار ئەژنۆیەوە بڕی بووەوە، سێ پێشمەرگەی شارەزای لەگەڵ بوو هێسترێکیشیان پێ بوو، هەر یەکسەر بەپەلە سواری هێستریان کرد و لەبەر چاو ون بوون، یەکێک لە برینداره‌کان بە ناوی هەڤاڵ حەمە لەتیف کەسی لەگەڵ نەبوو، پێشمەرگەیەک بە ناوی مام برایم پێی گوتم با بە هێسترەکەی نەخۆشخانە بیبەن، منیش ڕەزامەندیم دەربڕی، ئیدی بۆ قۆپی قەراغ گواستمانەوە، پێشمەرگەیەکی دیکەی بریندار کە خەڵکی کەرکووک بوو پێش چەند مانگێک لاقێکی بە گوللە شکابوو، هەرچەندە چارەسەرم کردبوو، بەڵام چاک نەبوو بوویەوە، پێم گوت لەگەڵمان بێت، گوتی ناتوانم تفەنگێکم بدەنێ با خۆم ڕادەست بکەمەوە،

ئـەو كـات خۆڕادەسـتكردن دەبـوو بـە چـەكەوە بێـت منـیش تفەنگەكـەی خـۆم پـێ دا، پێشمەرگەیەكی گەنجی تیپی ٥١ی گەرمیانیش لەناو بریندارە مەترسیدارەكاندا بـوو، پشتی برینـدار بووبـوو، دووچاری ئیفلیجی هـاتبوو لـە هۆش خـۆی چـوو بـوو، كەسیشی لەگـەڵ نـەبوو، زۆر بـیرم لـەوە كـردەوە ئـەم برینـدارە چـۆن ببـەین و ڕزگـاری بكـەین، بـەڵام بیركردنەوەكەم هیچ ئەنجامێكی نەبوو هەر لەوێدا بە جێمان هێشت.

لە گەرمیانەوە بۆ قەرەداغ پاشەكشەمان كرد، كادیر و بەرپرسانی نەخۆشخانەكە لـەو كاتەدا ژمارەمان ١٣ كەس بوو، دەستەی براكانی شەهید سیراوان تاڵەبانیش لەگـەڵ ئێمـەدا بوون، خۆمان لـەناو پەڵە گـەنمێكی ناوچەی بازیانـدا شاردبووەوە، كـات ١٠ی سـەرلەبەیانی ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٦ بـوو لـە نزیكمانـەوە شـەڕ دەسـتی پـێ كـرد، لـەو شـەڕەدا دوو پێشـمەرگە بریندار بوون، برینەكـەیانم بـینی و هەنـدێك دەرمـانی ئـازار و ئـەنتی بـایۆتیكم پێ دان و ڕێنمایم كردن تا ڕۆژی دواتر بیانبینمەوە.

لە گونـدی قازانقایە ئێمـە مـەفرەزەی نەخۆشخانە لەگـەڵ براكانی هـەڤاڵ قـادردا بـەر گوندی مێوڵی كەوتین، كە تا ئەنفال بارەگای تیپی ٥٧ی سەگرمەی لێ بوو، هەر لەوێ دكتۆر جەبار بنكەیەكی تەندروستی كردبوویەوە، هەندێك دەرمان و پێویستی دیكەی نەخۆشی لە بنەكەكەدا مابوو، منیش پێم باش بوو بەر ئەو گوندە كـەوتین لەبەرئـەوەی پێویستیم بـە گەچ (Plaster of Paris) هەبوو، بۆ گرتنەوەی قۆڵی هەڤاڵ حەمە ڕەئووف بـرای هـەڤاڵ عومەر غەریب، كە لـە شـەڕی ڕۆژی پێشـتر بـە گوللـە ئێسكی قـۆڵی شكابوو، دكتـۆر جـەبار نەهات لەگەڵمان بـۆ گونـدی مێـوڵی، وابـزانم لـە گونـدی قازانقایـە مابوویـەوە، مـن چوومـە شـوێنی نەخۆشـخانەكە و بـۆ گـەچ پەیـداكردن دەسـتم بـە گـەڕان كـرد، بڕێكـی وا گەچـم دۆزیـەوە كـە بتـوانم كارەكـانی خـۆمی پـێ ئـەنجام بـدەم و قۆڵـە شـكاوەكەی هـەڤاڵ حەمـە ڕەئووف پێ بگرمەوە، چاوەڕوانی ئەوەم دەكرد كەسێك بێـت بـە شـوێنمدا و بمبـات بـۆ ئـەو شوێنەی كـە برینـدارەكانی لێیـە، دوای نیـوەڕۆ پێشـمەرگەیەك هـات بـە شـوێنمدا و منـیش

لەگەڵ ئەو پێشمەرگەیە و دکتۆر مەحموودا چووم بۆ لای برینـدارەکان، هەڤاڵان عومـەر فـەتاح و شێخ جەعفـەر و عومـەر غـەریب و کافیـە خـان و ڕەحمـە خـانی خێزانـی عومـەر غـەریب لەگـەڵ هـەردوو بریندارەکـە هـەڤاڵان ڕەئـووف بـرای عومـەر غـەریب و خالیـدی خـاڵۆزای عومـەر فـەتاح لـەناو دارسـتانەکەی پشـتی گونـدی قازانقایـەدا دانیشـتبوون و چاوەڕوانی منیـان دەکـرد، هـەڤاڵ خالیـد گوللەیـەك بـەر سـەری کـەوتبوو، لـە لای چـەپی ناوچەوانییەوە بەرەو پشتی سەری چوو بوو، بەڵام خۆشبەختانە گولەکە نە ئێسکی کەللەی سەری گرتبوو، نە هیچ بەشێك لـە مێشکی گرتبوو، تـەنها پێست و ماسوولکەکانی سـەری برینـدار کردبـوو، بـەهۆی هێـزی جووڵـەی گوللەکـەوە بەشـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ مێشـکی شـڵەقی بـوو دووچاری ئیفلیجییـەکی کـاتی هـاتبوو، قـۆڵ و دەسـت و لاقـی لای ڕاسـتی لاواز بووبوو، وەك پێویست کاریان نەدەکرد، هەڤاڵ خالیدم لە شێوەی برینداریيەکەی و ئەنجامی بـرینداریيەکـەی تێگەیانـد و دەرمـانی ئـازار و دەرمـانی دژەهـەوکردنی بـرینم لـە کۆڵـە پشتەکەمدا دەرهێنا و پێمدا، بـە هاوکارەکـانیم گـوت پێویسـتە بـەردەوام قـۆڵ و لاق و پێـی بجووڵێنن بۆ ئەوەی ماسوولکەکانی نەپووکێنەوە، دواتر چوومە لای هـەڤاڵ حەمـە ڕەئـووف لۆکە و گەچ و ئاو و پێویستی دیکەی گرتنـەوە و پێچانی قـۆڵیم بـۆ دابینکـرد، هـەر لەوێـدا گەچـەکەم تـێ گـرت و کـەمێك بـە دیارییـەوە وەسـتام تـا گەچـەکە وشـك بوویـەوە، دواتـر دەرمانی ئازار و دەرمانی دژە هەوکردنم بۆ دانا.

لە گەرمیان و قەرەداغەوە بـۆ سـنووری دەشـتی کۆیـە پەڕینـەوە، لـە گونـدێکی دەشـتی کۆیە شەوێکیان پێشمەرگەیەك ئێشکگر دەبێت، لەبری پاراستنی هاوسـەنگەرەکانی لـە کـاتی ئێشـکگرتندا هەڤاڵـەکانی دەداتـە بـەر ڕێژنـەی گوللـە و هەڤاڵـەکانی شـەهید دەکـات، پێشـمەرگەکانی دیکـە لـە خـەو ڕادەپـەڕن و پـەلاماری دەدەن و هـەر لەوێـدا دەیکـوژن، پێشمەرگەیەك لەو کارەساتەدا بریندار بووبوو، لە شوێنی کارەساتەکەوە بە شەو هێنایان بۆ گوندی قزلوو، بۆ ئەوەی هەوڵی چارەسەرکردنی بدەم، پێشـمەرگەکەم ناسیوە نـاوی شـەماڵ

بوو، چەند گوللەیەك بەر سكی كەوتبوو، لەگەڵ دكتۆر جەلال و دكتۆر دڵشاددا هەر چەند هەوڵماندا نەمانتوانی چارەسەری برینداریيەكی بكەین، چونكە ناو سكی بریندار بووبوو، پێویستی بە كاری نەشتەرگەری گەورە هەبوو، كاری نەشتەرگەری لەو جۆرەش پێویستی بە سڕكردنی گشتی و ساڵۆنی نەشتەرگەرییە، كە لەو كاتەدا لە توانای ئێمەدا نەبوو كاری نەشتەرگەری بۆ بكەین و نەماندەتوانی ڕەوانەی شارەكانی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمیشی بكەین، پاش دوو كاتژمێرێك شەماڵ لە گوندی قزلوو شەهید بوو.

ئەو چەند ڕۆژەی لە سنووری ناوچەی دەشتی كۆیە و شوان و قەڵاسێوكە ماینەوە، هەندێك پێشمەرگەی نەخۆش و بریندار و ئەوانەی لە كاری كارگێڕیدا ئەركداربوون، ڕەوانەی سنووری مەڵبەندی سێی ناوچەی خۆشناوەتی كران، منیش بیرم لەوە كردەوە، كە لە دەستەی نەخۆشخانە هەندێك كەس ئەوانەی ماندوون، بۆ ناوچەی خۆشناوەتی ڕەوانە بكەم، دكتۆر ناسیح و دكتۆر جەبار و دكتۆر ناجح و كارمەندەكانی تری نەخۆشخانەم پێكەوە نارد بۆ سنووری مەڵبەندی سێ، تەنها من و دكتۆر جەلال و هەڤاڵ جووتیار لە قزلووی دەشتی كۆیە ماینەوە، دوای چەند ڕۆژی دیكە دكتۆر جەلالمان نارد بۆ سنووری مەڵبەندی دوو، لەگەڵ دكتۆر دڵشاد كە پزیشكی مەڵبەندی دوو بوو، لە گوندەكانی شوان مایەوە، دەستەكەی نەخۆشخانە كە گەیشتبوونە سنووری مەڵبەندی سێ لەوێ نەوەستا بوون، بەرەو ناوچەكانی قەندیل ڕۆیشتبوون.

ڕۆژمان گەیاندە ١٩٨٨/٥/٣ سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە دوو پێشمەرگەی تیپی ٣٣ی سلێمانی سەر بە مەڵبەندی دوو، هاتنە لام بۆ گوندی قزلوو گوتیان نەخۆشین، كە لە نیشانەی نەخۆشییەكەیان ورد بوومەوە وای بۆ چووم، كە دووچاری نەخۆشی مەلاریا بوون، گوتم دەرمانی ئەو نەخۆشییەم لا نییە، لەسەر ڕەچەتەیەك دەرمانەكەم بۆ نووسین، پێم گوتن ئەگەر كەسێكتان دەستكەوت سەردانی ناو شار بكات، با ئەم دەرمانەتان بۆ بهێنێت و بەكاری بهێنن.

ئێوارەی ١٩٨٨/٥/٣ فرۆکەکانی ڕژێمی بەعس بە چەکی کیمیایی گوندەکانی گۆپتەپە و عەسکەری ناوچەکەی بۆردومان کرد و بۆ سبەی ئەنفالی چوار دەستی پێ کرد، بریندارێك هەواڵی بۆردومانی کیمیایی گوندەکانی ئەوبەری ناوەکەی بۆ هێنایین، هەر ئەو شەوە بریندارەکەم بینی، برینەکەی سووك بوو، دووچاری کەم بینین هاتبوو، چاوی دەکزایەوە نیشانەی گازی خەردەل لەسەر دەم و چاوی دیاربوو، هیچ جۆرە دەرمانێکم پێ نەبوو بیدەم بە بریندارەکە، دڵنیام کردەوە کە برینەکەی سووکە، مەترسی لەسەر ژیانی نییە، داوام لێ کرد کە خۆی بشوات و جلەکانی بگۆڕێت و تا دەتوانێت دەم و چاوی بە ئاو بشوات.

لە ئەنفالی چواریش ڕزگارمان نەبوو بەرەو ناوچەی خۆشناوەتی سنووری مەڵبەندی سێ ڕۆیشتم، گەیشتینە گوندی مەلەکان، ئەشکەوتی نزیك گوندەکە کرابوو بە نەخۆشخانە، چووینە نەخۆشخانەکە دکتۆر هەڤاڵ (ئیبراهیم)ی لێ بوو، ئەو بڕیاریدا بوو لەگەڵ پێشمەرگەکاندا بمێنێتەوە، بەڵام دکتۆری نەخۆشخانەی گوندی خەتێ و دکتۆری نەخۆشخانەی گوندی سماقووڵی نەخۆشخانەکانیان چۆڵ کردبوو، منیش بڕیارمدا لە سنووری مەڵبەندی سێ بمێنمەوە، دواتر زانیم کۆبوونەوە لە نێوان بەرپرسانی سنووری مەڵبەندی ٣دا کراوە، هەموو کادیرەکان ئازاد بن لە سنوورەکەدا بمێننەوە، یان بەرەو سەر سنوور بڕۆن، نەك هەندێك لە پزیشکەکان بەڵکو ژمارەیەك لە ئەندام مەڵبەندەکانی مەڵبەندی ٣ی ئەو کاتەش بەرەو ناوچە سنوورییەکانی دووری شەڕگەکە پاشەکشەیان کردبوو، من لە نەخۆشخانەی مەلەکان مامەوە و هەڤاڵ جووتیار بەرەو قەندیل بۆ لای هێزەکانی مەڵبەندی ١ ڕۆیشت، بەرپرسەکانی مەڵبەندی ٣ی ی.ن.ك زۆر بەو هەڵوێستەی من خۆشحاڵ بووبوون، ورەیان بەرزبوویەوە، دوای ئەوەی دوو شەو لە نەخۆشخانەی مەلەکان مامەوە، شەهید حەسەن کوێستانی کە ئەو کات جێگری بەرپرسی مەڵبەندی ٣ بوو داوای کرد کە من بچمە گوندی خەتێ و لە نەخۆشخانەکەی ئەوێ کار بکەم، دکتۆر

هەڤاڵ لە نەخۆشخانەی ئەشکەوتی مەلەکان بمێنێتەوە منیش بە داواکەی قایل بووم و چوومە نەخۆشخانەکەی گوندی خەتێ و دەستم بە کارکردن کرد.

ڕۆژێك لە نەخۆشخانەی گوندی خەتێ وە بە پێ بۆ بارەگای مەڵبەند بەڕێکەوتبووم، لەسەر ڕێگایەکی گڵ زیلێکی سەربازیم بینی، لە تەنیشتمەوە وەستا، (ئەم زیلە لە شەڕدا پێشمەرگە گرتبووی و کاری پێ دەکرد)، لە زیلەکەدا دکتۆر دڵشاد بازێکیدا و لە بەردەممدا ڕاوەستا، زۆر دڵخۆش بووم کە بینیم دکتۆر دڵشاد ماوە و شەهید نەبووە، دوای چاك و چۆنی و یەکدی ماچکردن هەواڵی دکتۆر جەلالم لێ پرسی، ئەویش بەم شێوەیە چیرۆکی خۆی و دکتۆر جەلال و دکتۆر ئاسۆی بۆ گێڕامەوە: دکتۆر ئاسۆ یاریدەدەری پزیشکی بوو لە تیپی ٢٣ی سووورداش، کە سەر بە مەڵبەندی ٢ بوو، وەك کادیری پزیشکی کاری دەکرد، دکتۆر دڵشاد گوتی پێشمەرگە ئێمەیان بە جێهێشت، ئێمەش هەرسێکمان پێکەوە شارەزا نەبووین، نەماندەزانی بەرەو کام ئاڕاستە مل بنێین، بۆ خۆمان گیرمان خواردبوو تا هێزێکی جاش هاتن سەرمان و چوار دەوریان گرتین، لەو کاتەدا دکتۆر ئاسۆ دەمانچەکەی خۆی دەرهێنا و گوللەیەکی نا بە سەری خۆیەوە و هەر لەوێدا شەهید بوو، جاشەکان کە ئەو حاڵەتەیان بینی هاواریان لێ کردین خۆتان مەکوژن، ئێمە ناتانکوژین و دەتانپارێزین، هەر خۆمان نەدا بە دەستەوە دواتر یەکێکیان گوتی خۆتان بدەن بە دەستەوە لەسەر شەرەفی مەلا مستەفا بارزانی گیانتان پارێزراوە، گوتی کە ئێمەش ئەو قسەیەمان گوێ لێ بوو هەندێك دڵخۆش بووین، (باوکی دکتۆر دڵشاد لە شۆڕشی ئەیلوولدا شەهید بووبوو)، بڕیارماندا خۆمانیان ڕادەست بکەین، دکتۆر دڵشاد لە قسەکانی بەردەوام بوو گوتی جاشەکان ئێمەیان نەدایە دەستی سەربازەکان، وەك چەکداری خۆیان لەگەڵمان جووڵانەوە، دواتر بردیانینە ڕەبایە و لەوێ بەگاڵتەوە پاسەوانییان پێ دەگرتین، بۆ ئەوەی سەربازەکان گومانمان لێ نەکەن، کاتێك کە شەڕەکە تەواو بوو، بەرپرسی سریەکە پێی گوتین با ڕەوشەکە هێور بێتەوە، ئینجا دەتان نێرینەوە بۆ ناو هێزی پێشمەرگە، ئەو کەسەی کە لە

ناو چەكدارەكاندا پلەی فەرماندەی سریەی هەبوو، قسە و پەیمانەكەی خۆی بردە سەر و ڕاستگۆ دەرچوو، ئەمڕۆ منی تا نزیك ناوچە ڕزگاركراوەكان بە ئۆتۆمبێلەكەی خۆی هێنا و ڕێگەی پیشاندام، هەفتەی ئایندەش بە هەمان شێوە دكتۆر جەلال بە ئۆتۆمبێلەكەی خۆی دەردەكات، دواتریش هەروا دەرچوو، دكتۆر جەلالیش هاتەوە لامان، دكتۆر دڵشاد هێندە لە نەخۆشخانە لامان نەمایەوە گوتی من دەچم بۆ ناو سەنگەری پێشمەرگە و لەوێ كاری پزیشكی دەكەم.

لە ١٩٨٨/٥/٦ پەیوەندیم بە مەڵبەندی (٣)وە كرد، لە نەخۆشخانەكەی گوندی خەتێی ناوچەی خۆشناوەتی لەسەر كارو چالاكی و خوێندنەوەی پەرتووك بەردەوام بووم، جارجار لەگەڵ پێشمەرگە و كادیرە پزیشكییەكانی نەخۆشخانە دادەنیشتم و قسە و باسی هەمە جۆرمان دەكرد، لەو كاتەدا دوو كادیری پزیشكی لەگەڵ مندا كاریان دەكرد، یەكێكیان ناوی هەڤاڵ هاوتا عوسمان بوو خەڵكی كۆیە بوو، یاریدەدەری پزیشك بوو، پێشتر دكتۆری تیپی ٩٣ی كۆیە بوو، لەو كاتەوە كە ئێمە گەیشتینە دەشتی كۆیە، لە گوندی قزلوو پەیوەندی بە منەوە كرد و لە سنووری مەڵبەندی ٣ لە نەخۆشخانەی خەتێ لەگەڵ مندا مایەوە، كەسێكی دیكە لەوێ بوو كە ناوی هەڤاڵ عەبدولقادر بوو خەڵكی هەولێر بوو، خوێندكاری كۆلێژی پزیشكی بوو لەبەرئەوەی سەر بە ڕێكخستنی ی.ن.ك بوو لەلایەن دەزگا داپڵۆسێنەرەكانی ڕژێمەوە فشاری زۆری لەسەر بووە، خوێندنی بەجێهێشتبوو، ڕووی كردبووە شاخەكانی كوردستان و لەناو برا پێشمەرگاكانیدا جێگەی خۆی گرتبوو، خۆشبەختانە هەڤاڵ عەبدولقادر دوای ڕاپەڕین كۆلێژی پزیشكی تەواو كرد و ئێستا پزیشكە، ئەم سێ كەسە كادیری پزیشكی نەخۆشخانەی گوندی خەتێ بووین.

كاتژمێر یازدە و نیوی شەوی دوای بۆردوومانی كیمیایی فڕۆكەكانی ڕژێمی بەعس بۆ سەر گوندی گوڵان و وەرێ، لە ژوورێكی نەخۆشخانەكەدا خەریك بوو خەوم لێدەكەوت، ئاگاداریان كردم كە برینداریان هێناوە، منیش هەڤاڵان هاوتا و عەبدولقادرم لە خەو

هەڵسان و لەگەڵ خۆم بردنم بۆ سەیری برینداره‌کان، زیلێکی سەربازیم بینی لەسەر جادەکەی نزیك سەرچاوەی کانییەکەی خەتێ وەستابوو، پێشمەرگەکانی ڕێکخراوی ك.ڕ.ك لێم نزیك بوونەوە، گوتیان دکتۆر ئەمانە برینداری کیمیابارانی گوندی وەرێن ئێمە هێناومانن تا لێرە چارەسەر بکرێن، نەیانوێراوە بۆ چارەسەری برینەکانیان بچنە ڕانیە، نەوەك دەزگا سەرکوتکارەکانی ڕژێم پێیان بزانن و بیانگرن و ئەنفالیان بکەن، گوتم باشە دوو کیسی نایلۆنم کردە دەستم و لایتێکی پزیشکیم بەدەستەوە گرت و سەرکەوتم بۆ ناو زیلەکە، سەیری دەم و چاوی برینداره‌کانم کرد یەکەم کار کە بۆ من گرنگ بوو کە بزانم ئەو بریندارانە بە چەکی کیمیایی بریندار بوون؟ دووەم کارم ئەوە بوو کە بزانم جۆری چەکەکە چییە؟ پاش ئەوە بۆم دەدەرکەوت کە ئەو بریندارانە بەر چەکی کیمیایی کەوتوون، لە بیلبیلەی چاویان ورد بوومەوە لایتی پزیشکیم گرتە چاوەکانیان، بینیم هەر هەموویان بیلبیلەی چاویان وەك کونە دەرزی لێهاتووە، کەف بە لای دەمیانەوەیە، ئەم دوو نیشانەیە، نیشانەی برینداربوونی چەکی کیمیایی دەمارەکانن، یەکسەر لەگەڵ هەڤاڵان هاوتا و عەبدولقادر قسەم کرد گوتم لەم هێرشە چەکی کیمیایی دەمار بەکارهاتووە، ئەمەش چارەسەرەکەیەتی: داگرتنی برینداره‌کان لە زیلەکە، لابردنی جلە ئالوودەکانیان، شۆردنیان لە حەوزی سەرچاوەکەی خەتێ، بەکارهێنانی دەرزی ئەترۆپین و هەڵواسینی موغەزی بە گوێرەی ڕەوشی گشتی برینداره‌کان.

ئیتر دەستمان پێ کرد من و هاوتا، یان من و عەبدولقادر بەردەوام یەکێکمان لە زیلەکە دادەگرت، جلەکانیمان لەبەر دادەکەند و دەمان کرد بە ناو حەوزی ئاوەکەی گوندی خەتێدا، ئەویترمان دەرزی ئەترۆپینی بۆ دەکرد و پێشمەرگەکانیش هاوکارییان دەکردین، بۆ پەیداکردنی جلوبەرگی پاك و گواستنەوەیان بۆ نەخۆشانەکە و داپۆشینیان تاکو سەرمایان نەبێت، ئەو شەوە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك بەم کارەوە خەریك بووین، هەموو برینداره‌کانمان لە مردن ڕزگار کرد کە ٣٠ کەس زیاتر دەبوون.

بۆ ڕۆژی دواتر کاتژمێر نۆی سەرلەبەیانی عەرەبانەیەکی دیکە بریندارییان بۆ هێناین، مـن و عەبـدولقادر و هاوتـا و پێشـمەرگەکانی نەخۆشـخانە و پێشـمەرگەکانی ڕێکخـراوی ک.ڕ.ك، هەمان کاری شەوی پێشوومان بۆ بریندارەکان دووبارە کردەوە، یەك لە یادەوەرییـە تاڵەکانی ڕۆژانی کیمیاباران و ئەنفال کە هەرگیز لە بـیرم ناچێتەوە، ئەوەیـە کـە ئـەو ڕۆژە لەناو عەرەبانـەی تراکتۆرەکەدا تـەنها دوو کەسـی بریـندار مابوونـەوە دایـانگرم و بیانشۆم منـداڵێك و ژنێکـی بەساڵاچـوو بـوون، ڕەوشـی تەندروسـتیی هـەردووکیان زۆر خـراپ بـوو نەمدەزانی کامیان پێش کامیان دابگرم و چارەسەریان بکەین، خـەریك بـوو سـەرم لـێ تێـك دەچوو، دوای خۆم ڕاگرت و گوتم بـا منداڵەکە دابگـرم و ڕزگـاری بکـەم دواتـر دەگەڕێمـەوە سـەر ژنـە بـە تەمەنەکـە، تـا منداڵەکـەم داگـرت و شـۆردمان، کـە بـۆ نـاو عارەبانەکـە سەرکەوتمەوە بۆ ئەوەی ژنەکە داگرین و بیشۆین، تەماشـا دەکـەم ژنەکـە گیـانی لـە دەسـت داوە، بۆ لای نیوەڕۆکەی یەك لەو بریندارانە کە شەو هێنابوویان شەهید بوو، بریندارەکانی دیکە کە نزیکەی ٧٠ کەس دەبوون هەر هەموویان بە چەکی کیمیـایی گـازی دەمـار بریـندار بووبوون، چاك بوونەوە و دوای چەند ڕۆژ نەخۆشخانەکەیان بە جێهێشت.

دوای ئـەوەی فڕۆکـەکانی ڕژێـم گونـدەکانی (وەری، گـوڵان، وەرتـێ و نازەنین)یـان بـە چەکی کیمیایی بۆردومان کرد لە ١٩٨٨/٥/٢٢ بە دواوە، هێرشـەکانی ئـەنفالی پێـنج بـۆ سـەر ناوچە ڕزگارکراوەکانی سنووری مەڵبەندی ٣ دەسـتی پـێ کـرد، لـەو کاتـەدا هێزێکـی پ.د.ك بەسەرکردایەتی نادر هەورامیی هاتبوونە ناوچەکە و لەگەڵ هێزەکانی ی.ن.ك پەیوەندییان گرت و هاریکاری یەکیان دەکرد، من چوومە نەخۆشـخانەی مەلـەکان کـە لـەو کاتـەدا لـەناو ئەشکەوتی مەلەکاندا بوو، لەگەڵ دکتۆر هەڤاڵ دەستمان بە کارکردن کرد، دکتۆر جەلال کە تـازە گەیشـتبوو لـە ئـەنفالی چوار بـە زەحمـەت ڕزگـاری بووبـوو لـە نەخۆشخانەی گونـدی خـەتێ مایـەوە، شـەڕ لـە هـەموو بەرەکانـەوە دەسـتی پـێ کـرد، هێزەکـانی سـوپای ڕژێـم و جاشەکان هێرشـیان دەهێنـا، هێـزی پێشمەرگەش لـە سـەنگەرەکانی خۆیانـەوە بـەرەنگاریان

دەبوونـەوە، ڕۆژانـە برینـداری پێشـمەرگە دەگەیەنرایـە نەخۆشـخانەکە و پێکـەوە لەگـەڵ دکتـۆر هـەڤاڵ و هـەڤاڵ فـەرهاد کـە یاریـدەدەری پزیشـکی بـوو چارەسـەری برینـەکانیانمان دەکرد، نزیکەی مانگێك لە سنووری مەڵبەندی سێ مامـەوە ڕۆژێکیـان ١٩٨٨/٦/١٦ کاتێـك لـە نەخۆشـخانەی مەلـەکان بـووم، لەلایـەن هـەڤالان مـلازم عومـەر و کۆسـرەت ڕەسـووڵەوە بروسکەیەکم بۆ هات داوایان کردبوو من بۆ سەر سنوور بڕۆم و هەندێك پشوو بـدەم و لـە بروسکەکەدا هاتبوو، کە دکتۆر هێمن (ئازاد ئەحمەد) کە دواتـر شـەهید بـوو، دێتـە شـوێنی کارەکـەی مـن، منـیش بـە گـوێرەی بروسـکەکەی ئـەوان جووڵامـەوە، هەنـدێك برینـدار و کادیرێکی تەندروستیم لەگەڵ خۆم ڕێکخست و بەرەو بناری قەندیل کەوتینە ڕێ.

دوای چەند ڕۆژێك لـە بۆردومـانی کیمیـایی فڕۆکـەکانی ڕژێـم بـۆ سـەر ئـەو ناوچەیە هێرشی ئەنفالی پێنج دەستی پێ کرد، دکتۆر جەلال لە نەخۆشخانەی خەتێ مایـەوە، مـن و دکتۆر هەڤاڵ ئەشکەوتەکەی نزیك گوندی مەلەکانمان کرد بـە نەخۆشـخانە، لـەوێ ماینـەوە برینـداری زۆرمــان بــینی چارەســەرمان کــردن، ڕۆژێکیــان نەخۆشــێکیان بــۆ هێنــام بــۆ ئەشـکەوتەکەی مەلـەکان پـاش ئـەوەی بینـیم بـۆم دەرکـەوت کـەوا دووچـاری نەخۆشـی ڕیخۆڵەکوێرە بووە، ئەو نەخۆشە پێشمەرگەی پاسۆك بوو هاوەڵێکی لەگـەڵ بـوو کـە هـەڤاڵ ئاسۆس هەردی بوو کە ئەویش ئەو کات پێشمەرگەی پاسـۆك بـوو، ڕەوشـی نەخۆشـەکەم لـە هەڤاڵ ئاسۆس گەیاند و گوتم دووچاری ڕیخۆڵەکوێرە بووە، پێویستی بە کاری نەشتەرگەری هەیـە، بـەڵام لـەم کاتـەدا لێـرە توانامـان نییـە ئـەو کـارە ئـەنجام بـدەین، هـەوڵ دەدەیـن بـە دەرمـانی ئـەنتیبایۆتیك و موغـەزی چارەسـەری بکـەین، لەوانەیـە بـەم جـۆرە چارەسـەرییە باش ببێت، بەڵام ئەنجامەکـەی لـە سـەدا سـەد نییـە، نـەخۆش و هـاوەڵ ڕازی بـوون، منـیش چارەسەرییەکم دەست پێ کرد، خۆشبەختانە دوای هەفتەیەك نەخۆشەکە چاك بوویەوە.

دوای ئەم کارەساتانە ڕێگەی ئێرانمان گرتەبـەر، بـێ ئـەوەی کـەس ئامادەبێـت هـەواڵی کەسوکارم لە هەڵەبجە پێ بڵێت کە بەر کیمیایی کەوتوون یاخود نەخێر، تا دواجار شـەهید

قادر كۆكۆيم بينى، بەكورتى و بە كوردى پێى گوتم كە هەر هەموويان (دايك و براكەم و ژن و كوڕەكەى) لەگەڵ پێنج خزمى ديكەتاندا شەهيد بوون و بە دەستى خۆم ناشتوومن، بەلاّم تا ئێستا نەمانزانى گۆڕەكەيان لە كوێوەيە، دواى دڵنيابوونم لە شەهيد بوونى بنەماڵەكەم لە ئۆردوگايەكى نزيك گوندى دزڵى كە خزمانى خۆمانى لێ بوو چەند ڕۆژێك لەگەڵ خزماندا لە ماڵى مامم پێشوازيمان لە ماتەمگێڕان كرد.

پاش ماوەيەك لە شارى سنە نيشتەجێ بووم، لە نەخۆشخانەى (توحيد)ى شارەكەدا، وەك پزيشك بە شێوەيەكى كاتى دامەزرام، دەستم بە كار كرد، ئەو پزيشكە عێراقيانەى كە ئاوارەى وڵاتى ئێران بوون لەلايەن دەسەڵاتى كۆمارى ئيسلاميى ئێرانەوە بە پزيشكى پلە سێ هەڵسوكەوتيان لەگەڵدا دەكرا، ماوەى هەشت مانگ لەو نەخۆشخانەيەدا كارم كرد.

لەگەڵ پريشكى سەرەتاى ڕاپەڕيندا ڕۆژى ١٩٩١/٣/٨ لەگەڵ هێزى پێشمەرگەدا گەيشتمەوە سلێمانى، بەشدارى شەڕى ئازادكردنى كەركووكوم كردووە، لە كۆڕەودا لە شارى هەڵەبجە نەخۆشخانەم دانا و چارەسەرى بريندار و نەخۆشم دەست پێ كردەوە، لە كۆبوونەوەكانى بەرەى كوردستانيدا بەشداريم كردووە، دواتر بووم بە كارگێڕى مەڵبەندى يەكى سلێمانى ى.ن.ك، پاشان بووم بە لێپرسراوى ڕێكخراوە ديموكراتييەكانى ى.ن.ك لە سلێمانى، ئەندامى خولى يەكەمى پەرلەمانى كوردستان بووم، ساڵى ٢٠٠٠ بەڕێوەبەرى بەڕێوەبەرايەتى تەندروستيى سلێمانى بووم، ساڵى ٢٠٠١ دەستبەردارى كارى سياسى بووم لە ڕيزەكانى (ى.ن.ك)دا، لە ٢٠٠٦/١٢/٦ لە دادگاى ئەنفالدا شايەتيمدا، لە نێوان ساڵانى ٢٠٠٤-٢٠٠٨ سەرۆكى پارتى چارەسەرى ديموكراتى كوردستان بووم، لە ساڵى (٢٠٠٩)وە بە تەواوى لە ڕووى كارى سياسييەوە بێلايەنيم هەڵبژاردووە، لە ئێستادا لە نەخۆشخانەكانى سلێمانى كارى پزيشك دەكەم[٥٣].

---

(٥٣)– فائق محەمەد گوڵپى: لە توێشووى پزيشكێكى پێشمەرگەوە، سلێمانى، ٢٠٠٨.

# کەیفی مستەفا عەلی ئیبراهیم (د. کەیفی)

لە ١٩٦٦/٩/٢٣ لە هەولێر لەدایك بووم، سەرەتای کاری سیاسی و ڕێکخستنم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨١ بە حوکمی ئەوەی ئێمە خەڵکی دوڵی بالیسان گوندی چیوەی سەروو بووین، مەفرەزە سەرەتاییەکان هەر لە سەرەتای ساڵەکانی ١٩٧٧-١٩٧٨ لەو ناوچەیە بەدەرکەوتن، کە زۆربەی پێشمەرگە و مەفرەزەکان سەر بە ی.ن.ك بوون، لەوانە: سۆسیالیست و کۆمەڵە، من ئەوکاتە لە قۆناغی شەشی سەرەتایی بووم زۆر جار پێشمەرگەکان خەڵکیان کۆدەکردە و قسەیان دەربارەی شۆڕشی نوێ بۆ خەڵك دەکرد و دەربارەی دامەزراندنی شۆڕشی نوێ بە ڕابەرایەتی ی.ن.ك، ئەوەی زیاتر سەرنجی ڕادەکێشام هەڵسوکەوتی کادیر و پێشمەرگەکانی ی.ن.ك بوو بە تایبەتی ك.ڕ.ك.

شەهید شێخ سلێمان بالیسانی یەکێك بوو لە کادیرە دیارەکانی ناوچەکە کە زوو زوو سەردانی گوندەکەمانی دەکرد و باسی شۆڕش و ڕەوایی خەباتی گەلی کوردستان و پلان و بەرنامەی ڕژێمی بەعسی بۆ دەکردین، هەر ئەوەش لە سەرەتاوە کاریگەری لەسەرمان دروست کرد، بێجگە لەوە دوای هەرەسی ئەیلوول و بێ ئومێدی و بەردەوام هاتنی هێزە سەربازیەکانی ڕژێم بۆ سەرخەڵکی دێیەکەمان، زۆر جار بەیبانیان زوو خەڵکیان کۆ دەکردەوە زۆر بێزاریان دەکردن، ئێمەش بەتایبەتی باوکم دۆستی شۆڕش و لایەنگری باڵی مەکتەبی سیاسی مام جەلال بوو، هەروەها لە گوندەکەشمان کەسایەتی ڕۆشنبیر و نیشتمانپەروەر سەلام سەلیم چیوەیی ناسراو بە کاك سەلام کە لە شۆڕشی ئەیلوول لە هێزی بێتواتە حاکم بووە، هاوڕێی باوکم بوو، ئێمە گوێمان بۆ گفتوگۆکانیان شل دەکرد و هەموو ئەوانە کاریگەری لەسەرمان دروست کرد، بێجگە لەوە ڕۆژێك فرۆکەکانی ڕژێم لە شوباتی ساڵی ١٩٧٥ ماڵی یەکێك لە ئامۆزاکانی باوکمیان بۆردومان کرد، مامێکم بەناوی حاجی برایم عەلی و چوار کەسی تر لە خێزانەکەی ئامۆزای باوکم لە هاوسەری و دوو لە

کچەکانی لەگەڵ ژنێکی تر کە تازە لە ئامۆزایەکمان مارەبڕ کرابوو، تەدارەکی بووك لە خشڵ و جلی بوکێنی بۆ ئامادەکرابوو، کە ئەویش هەر خزمی خۆمان بوو خانوەکەیان بە سەردا ڕووخا، بەهۆی لێدانی سارۆخی فڕۆکەکانەوە هەموویان شەهید بوون، هەروەها ناوچەکە بەردەوام ماڵ و کوانووی خەبات و تێکۆشان بوو.

ئەگەر لە کوردستان یەك پێشمەرگە دەرکەوتبا دەبوو لەوێ خۆی گرتبایەوە، خەڵکی گوندەکەمان هەمیشە ماڵ و شوێنی حەوانەوەی پێشمەرگە و حەشاردانیان و پاراستنی خۆیان و خێزانەکانیان و هەموو ئەوانە سەرەتای سەرهەڵدانی فکری سیاسی و دنەدانمان بوو بۆ بەشداریکردن لە شۆڕش و کوردایەتی، لەگەڵ شێخ سلێمان لە ساڵانی ١٩٨٧-١٩٧٩ دەمانویست ڕێکمان بخات لە ڕێکخستن، پێی دەگوتین دەبێت جاری ئێوە بخوێننەوە بەتایبەتی بڵاوکراوەکانی شۆڕش و شارەزابوون لە خەباتی گەلانی ڕزگاریخواز، ئەوانە هەمیشە لە بیر و هزرمان دەخولایەوە، هەربۆیە ڕۆژێك من و دووانی تر لە هاوڕێکانم لە ساڵی ١٩٧٧ بڕیارماندا بچین ببینە پێشمەرگە.

ئەوەبوو ملی شاخمان گرت لە دەمی عەسر لە شوێنێك کە پێی دەگوترێت چیای تاتوك تووشی دکتۆر خالید و هێزەکەی بووین، پێمان ڕاگەیاند ئێمە دەمانەوێت ببینە پێشمەرگە، ئەویش کە زانی خوێندکارین ئامۆژگاری کردین کە بەردەوامبین لە خوێندن و گەلەکەمان پێویستی بە خوێندەوار و خاوەن بڕوانامە هەیە، کە خوێندن شێوازێکی تری خەباتی نوێی شۆڕشی نوێیە و ئێمەی گەڕاندەوە، هەروەها ڕۆڵی هەڤاڵ مەلا غەفور وەك کادیر و لێپرسراوی ڕێکخستن لە ناوچەکە کاریگەری هەبوو، هەروەها هەڤاڵ جوامێر کە لە تیپی ٨٣ی هەورێ و هەڤاڵ جەمال هەروتی گرنگ بوو، تا لە ساڵی ١٩٨٢ بەشێوەیەکی فەرمی لە ڕێگەی هەڤاڵ حەسەن قادر ناسراو بە هەڵمەت کە ئەندامی کەرت بوو لە کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە ئەو کاتەش من خوێندکاری پۆلی چواری ئامادەیی بووم لە شاری

هەولێر پەیوەندیم کرد، لە پۆلێك ڕێکخرام کە لێپرسراوی پۆلەکە ناوی هەڤاڵ عەزیز حاجی نەجار عەبدولڕەحمان (شوان) بوو، هەروەها لە هەمان کاتدا ڕۆڵی دکتۆر ساڵح حەمەسادق ناسراو بە دکتۆر شوان لە پەروەردەکردنمان لە بیر ناکرێت.

لە ١٩٨٣/٣/١٩ پەیوەندیم بە ڕێکخستنەوە کرد، لێرە دەستم کرد بە چالاکیی بەردەوام هەم لە کاری ڕێکخستن و هەم لە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر دوژمن و سیخور و بەکرێگیراوەکان و هێنانی بڵاوکراوەی ڕێکخستن بەتایبەتی بۆ هەڤاڵ دلێر ملاشینە کە لە ساڵانی ١٩٧٨—١٩٧٩ خوێندکار بوو لە بەشی ناوخۆی ئیسکان لە هەولێر، لە ساڵی ١٩٨٣ پلەی ئەندامی پۆلم وەرگرت لە هەمان ئەو پۆلەی کە تێیدا ئەندام بووم، ئەو هەڤاڵانەی کە لە پۆلەکەم بوون هەر یەك لە هەڤاڵان: جەنگی ڕەشید قادر، سەمەد سیاوی، شوکر سلێمان، سوارە عوسمان و حەسەن ئەحمەد، کە ئەوانە هەمویان خوێندکاربوون لە بەشی ناوخۆ پێکەوە بووین و من ڕێکم خستبوون.

دواتر لە ساڵی ١٩٨٤ کە ئەوکاتە پۆلی شەشی ئامادەیی بووم بەهۆی پێ دانی زانیاری لەلایەن چەند کەسێکەوە بە دەزگاکانی ئەمنی هەولێر کەوتنە دووم، بەهۆی مامۆستایەکی نیشتمانپەروەر بەناوی عەبدولکەریم کە دەرسی فیزیا و یاریدەدەری بەڕێوەبەرەکەشمان بوو لە ئامادەیی کوردستان ڕزگارم بوو، ئەوەبوو گەڕامەوە گوندەکەی خۆمان و لای هاوڕێیانم: هەڵمەت و دکتۆر شوان، ئەوکات دکتۆر کەمال خۆشناو لێپرسراوی مەڵبەند بوو، ئەویش بە بابەتەکەی دەزانی، ئەوەبوو ڕۆژێك قائید فەیلەقی چوارقورنە بە ناوی سەمیر هاتە مێرگەسەر بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ دکتۆر کەمال خۆشناو، یەکێك لە بابەتەکان کە لەگەڵ قائید فەیلەق باس کرا بابەتی فەسڵ و ڕاوەدونانی من بوو لەلایەن دەزگاکانی ڕژێم بەهۆی ئەوەی من تەمەنم ١٧—١٨ ساڵان بوو منداڵ بووم چەند کێشەیەك لە سەرووبەندی گفتوگۆی نێوان ڕژێم و ی.ن.ك بەتایبەتی لە دوای شەڕی بێتواتە هەبوون باسیان

لێوەدەکرا، یەکێك لە بابەتەکان کێشەی فەسڵی من بوو، کە کەسێك خوێندکاربێت و منداڵ بێت ناکرێت بەو شتانە تۆمەتبار بکرێت.

دەمە و ئێوارە بوو من لەگەڵ هەڤاڵ فارس حەمەسادق لە ماڵی دکتۆر ساڵحی برای بووم، کە دکتۆر ساڵح دکتۆری پێشمەرگە بوو منیش چەکێك و شەش مەخزەنم پێ بوو هەروام دەزانی چەند ڕۆژێکی تر و ڕژێم دەڕوخێنین و جیهانێکی پڕ لە ئازادیی و یەکسانیی دەخوڵقێنین، ئەوەبوو بانگیان کردم لە ڕێگەی یەکێك لە پێشمەرگەکانی دکتۆر کەمال خۆشناو کە باوکم هاوڕێی بوو زۆر ڕێزی لە باوکی ڕەحمەتیم دەگرت، چەند جارێك داوای لێ کرد کە باوکم خۆی و خزمەکانی لەگەڵ دکتۆر لە مەڵبەند ببنە پێشمەرگە، بەڵام باوکم ئەمەی پێ قورس بوو لەبەر ژیانی کەسوکاری گوتی ئێمە وەکو دۆست و لایەنگری شۆڕش و ی.ن.ك بمێنینەوە باشترە، باوکم لە هەمان کاتیشدا ئەنجومەنی گوند بوو برایەکیشم بەردەوام وەکو پێشمەرگە و بەرگری میللی لەگەڵ ئامۆزاکانم بۆ هەر شوێنێك پێویستبایە لەگەڵ کەرت و تیپەکان، یان لە کاتی شەڕەکاندا بەشداریان دەکرد ئەوەبوو من چووم، ئەو پێشمەرگەی هاتبوو بەدوامدا گوتی ئەمە چیە ئەو هەموو مەخزەن و چەکە دەی فڕێیدە ئەوە چەندێکە دکتۆر کەمال خۆشناو باسی ستەمی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش (دائرة الامن) دەکات کە منداڵێکی وەك تۆیان دوورخستووەتەوە (فصل)، هیچ تاوانێکت نییە، ئێستا بەو حاڵەوە بتبینێت چی دەڵێت، منیش چەك و شتەکانم دانا و ڕۆیشتم بۆ ژێر ئەو هەیوانەی کە کۆبوونەوەکەی لێدەکرا، کە قائید فەیلەق منی دیت نازانم قسەیەکی لەگەڵ دکتۆر کەمال خۆشناو کرد و دکتۆریش فەرمانی کرد من لە گەڕانەوەیان لەگەڵیان بڕۆم، ئەوەبوو منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم لە گەڕانەوەیاندا لەوێ لە فیرقەی چوارقوڕنە نووسراوێکیان کرد و لە زەرفێکی کاغەزی قاوەییدا دایانە دەستم.

به سەروچاوەی بێتواتەدا گەڕامەوە بۆ بالیسان، بەهۆی شەڕەکەی بێتواتە دۆخە زۆر ناخۆش بوو بەتایبەتی بۆ خەڵکانی وەك ئێمە و ئەندامانی بنەماڵەکەمان، ئیدی لە ڕێگەی ئۆتۆمبێلێکی لاندرۆڤەری تایبەت گەیشتمەوە ناوچە ئازادکراوەکەی دۆڵی بالیسان، لای دکتۆر کەمال خۆشناو لەوێ دوای باسکردنی دۆخەکە گوتی بڕۆ لای کەسێك بەناوی مەلا فازل ناونیشانیم وەرگرت لە هەولێر، ڕۆیشتم و پەیامەکەم پێگەیاند، دوای گەیاندنی نامەکە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی هەولێر قایل بوون کێشەیان نەبوو لە خوێندنم، بەلام نابێت لە هەولێر بمێنمەوە، هەر وەك گوتی: (من زاخو الی فاو) (بس مایصیر تبقی بأربیل).

بۆیە گەڕامەوە بالیسان بۆ لای دکتۆر کەمال خۆشناو، بابەتەکەم بۆ گێڕایەوە، گوتی بڕۆ بۆشەقلاوە، منیش چومە شەقلاوە، دیاربوو ئەو پەیامی بۆ بەڕێوەبەر و بەرپرسانی ئەوێ ناردبوو، بەلام من نازانم وردەکاری ئەوە چی بوو چۆن بوو، بۆیە زۆر بەئاسانی وەریان گرتم، چونکە کێشەکە ئەوەبو ٤٥ ڕۆژ بەسەرکردنەوەی قوتابخانە تێپەڕی بوو بەردەوام بووم، لەوێ لە بەشی ناوخۆش زۆر بەئاسانی وەرگیرام و ژوورێکیان بە تەنیا پێ دام و پێم ڕاگەیەندرا کەم تێکەلاوی خوێندکارەکانی دیکە ببم، بۆ من زۆر ناخۆش بوو بە تەنها لە یەك ژوور و دەبوو خۆشم نان بۆ خۆم ئامادە بکەم، چونکە بەشی ناوخۆییەکەمان لە دەربەندی شەقلاوە بوو قوتابخانەکەشمان لەسەر مەیدان بوو، هەرچەندە زۆربەی خوێندکارەکان خەڵکی دۆڵی بالیسان و بەرکە و هەندێك گوندی تری دەشتی هەریر بوون، هەندێکیش لەو خوێندکارانە لە ڕێکخستنەکانی ی.ن.ك ڕێکخرابوون، چونکە لە گفتوگۆی نێوانمان من ئەدەبیاتی (ی.ن.ك)م دەناسیەوە، واتە هەر حیزبە ئەدەبیاتی تایبەتی خۆی هەبوو، هەندێکیان دەیان ویست منیش ڕێکبخەن، بەلام من خۆم لەو بابەتە دەدزیەوە زۆر جار دەیان گوت کەسێك ئەوەندە زیرەك بێت و لە ئامادەیی کوردستان بێت پێمان سەیرە بێتە شەقلاوە ئەوان بە چیرۆکەکەیان نەدەزانی کەچی هەیە.

هەمیشە پزیشکی پێشمەرگە لە بیر و هزرم دەخولایەوە، چونکە من بەهۆی ئەوەی دۆخی تەندروستیی پێشمەرگە و خەڵکی لادێکانم دەزانی، بەهۆی ئەوەی بەردەوام گەمارۆی ڕژێمیان لەسەر بوو زۆر جاریش پێشمەرگە بەهۆی برینێکی ئاسایی، یان خوێنبەربوونێك شەهید دەبوو، بۆیە بەلامەوە گرنگ بوو بەشی پزیشکی تەواو بکەم، ئەوە بوو دوای بەشداریکردن لە ئەزموونەکانی بەکەلۆریا لە شەشی ئامادەیی بەشی زانستی و پڕکردنەوەی فۆڕمەکان بەداخەوە بەهۆی کاری سیاسی و دابڕانی زۆر و خراپی دۆخی سیاسی خێزانەکمان نەمتوانی نمرەی پێویست بۆ کۆلێژی پزیشکی بهێنم، ئەوەبوو لە کۆلێژی زانست وەرگیرام، بەڵام دام گرت بۆ پەیمانگای پزیشکی موسڵ، چونکە بەپەلە بووم تا پەیمانگا تەواو بکەم و ببمە پزیشکی پێشمەرگە، پێم وابوو شۆڕش تەواو دەبێت و من شانسم نابێت و شەرەفی پێشمەرگایەتیم لە شۆڕشی نوێ پێ نابڕێت.

هاوینی ١٩٨٦ ڕژێم بڕیاریدا کە هەموو خوێندکارانی زانکۆ و پەیمانگاکان بچن بە زۆر بەشداری ڕاهێنانی جەیشی شەعبی بۆ پشتیوانی لە سوپای عێراق لە کاتی پێویست لە شەڕی دژی ئێران بکەن، ئەوە بوو ئێمە بەتایبەت ئەوانەی کە هەڵگری بیر و ڕێکخستنی سیاسی بووین ڕەتمان کردەوە بچینە سەربازگەکانی جەیشی شەعبی، وەك هەڵوێستێك و جێبەجێنەکردنی بڕیارەکانی ڕژێم، بۆیە هەموومان دوورخراینەوە (فەسڵ)، بەداخەوە نەمتوانی هەردوو قوناغی پەیمانگای پزیشکی تەواو بکەم و ئەو خەونەم بێتەدی کە پزیشکی پێشمەرگەبم، بۆیە لە هاوینی ١٩٨٧ پەیوەندیم بەهێزی پێشمەرگەوە کرد، لە تیپی ٨٧ی قەرەچووغ لە کەرتی شەش، دواتر لە مانگی شەشی ١٩٨٨ گوێزرامەوە بۆ مەکتەبی ڕێکخستن لەوێ هەموو جارێك هەڤاڵە پێشمەرگەکان بە گاڵتە پێیان دەگوتم هەستە دکتۆر قاپەکان بشۆ، ئاخر ئەگەر چووبای بەشداری تەدریبەکەت کردبا، ئەوا ئێستا تۆ پزیشکی پێشمەرگە دەبووی ئێمە سوودمان لێوەردەگرتی و خزمەتیشمان دەکردی، ئیدی بەردەوام بووم لەگەڵ ئەو هەڤاڵانە کە کۆتا قۆناغی ئەنفال بوو.

لە سنووری مەڵبەندی سێی هەولێر لە دۆڵی بالیسان و خەتێ لە کۆتاییەکانی مانگی ١٩٨٨/٨ بڕیار درا کە ناوچەکە چۆڵ بکرێت و هەندێك مەفرەزەی پارتیزان لە پێشمەرگەی چالاك و خاوەن ئەزموونەکان جیا کرانەوە تا بمێننەوە، هەڤاڵ دلێر کانی ڕەشی، کە کادیر و پێشمەرگەیەکی نموونەیی بوو بڕیاربوو وەکو سەرتیپی بیتوێن بمێنێتەوە، وەکو پارتیزان گوتی حەزدەکەم تۆش لەگەڵم بیت، منیش بەخۆشحاڵیەوە زۆر کەیفم بەخۆم هات، هەڤاڵ دلێر لەبەرئەوەی بوو من هیچ کێشەی هەڵهاتووی سەربازیم نەبوو، چونکە پێناسی پەیمانگام لابوو کە تا سەرەتای ساڵی ١٩٨٩ کاری پێ دەکرا، بۆ ئەوە بوو بۆ گرێدانەوەی پەیوەندی نێوان پارتیزانەکان و ڕێکخستنەکان و پەیداکردنی خواردن و هێنانی بۆ پێشمەرگە پارتیزانەکان سوودم لێ وەربگرێت، بەڵام دواتر ئێمەش ملی ڕێگامان گرت و بەرەو قەندیل ڕۆیشتین، لەو سەردەمە عێراق و ئێران شەڕەکەیان ڕاگرتبوو و ڕێکەوتبوون، ئەوەبوو ئێمە بە بڕیاری مەڵبەند دوای چەند شەو و ڕۆژێك بە بڕینی دەرەشیر، ساوسێوك، دۆڵی کولان، چیای بێرمەکە و دۆڵی پەرسوێڵوو بەردەوام بووین، لە شەوانی ئەنگوستە چاودا بە ماندوێتی و بێ وەستان و برسێتی و لە ناو کەمین و تەنینی هەموو ڕێگاکان لە خاموشی شەو قەڵا و چۆڵکردنی ئاوەدانی لە دەڤەرەکە بەردەوام بووین، بێجگە لە خەمێکی قووڵی بەجێهێشتنی دەڤەرەکە و ئازیز و خۆشەویستانمان و بێ ئومێد بوون لە بەدیهاتنی هیواکانمان و دوورکەوتنەوەی ئەو خەونەمان، بەڵام ئیرادەی بەهێزی ئێمە دڕی بە شەوەزەنگی تاریکی و نائومێدی و چۆکی بە مەحاڵدا دەدا، باوەڕ و ئومێدمان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانمان بەرچاوی ڕوون دەکردینەوە.

ئەوەبوو دوای شەڕێکی قورسی نێوان هێزەکانی (ی.ن.ك) و ڕژێم لە چیای کونەکۆتر بەداخەوە لەم شەڕدا نزیکەی ٣٣ پێشمەرگە شەهیدبوون بێجگە لە چەندین بریندار، هەر لە هەمان ناوچەدا هەڤاڵ ئازاد هەورامیی سەرکردە شەهید بوو، بەداخەوە شەڕەکە ئەوەندە نابەرامبەر بوو ڕژێم چی جەیش و جاش و فڕۆکەی پیلاتۆز و کۆپتەری جەنگی و

تۆپ و ڕاجمە و هەموو جۆرە چەکانەی بە گازی کیمیاییشەوە دژی پێشمەرگە بەکاردەهێنا، ئەو ڕۆژە پێشمەرگە بێجگە لە مەرگ و بەرگری قارەمانانە و برسیەتی زۆر هیچ شتێکی تر دۆستی نەبوو، ئەوەبوو مەفرەزەکەی ئێمە کە چەند پێشمەرگەیەك بووین بەسەرپەرشتی ماموستا چەتۆ حەوێزی پێکهاتبووین لە هەڤالان دلێر کانی ڕەشی، مام عەلی، شاکر، هێرش، برایم کانی ڕەشی، شێخ کەریم کاولانی، محەمەد سیخو، بارزان ئاغا، نەبەز کۆیی، برزو مەنسوور، لوقمان دارەتوو، کەریم کەرکووکی تەپەی مەلا عەوڵ و ساڵح باڵەکایەتی، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی پەڕاگەندە، بەهۆی دۆخی خراپی ئەو سەردەمە و ئەنفال وێڕای ئەوەی کە نان بەزەحمەت دەست دەکەوت مانگی ئەیلوول و ئۆکتوبەر، قەندیل زۆر سارد بوو ئەسپێکمان هەبوو نەخۆش کەوت، هەر بۆ گاڵتە جەماعەت پێیان دەگوتم دەی دکتۆر چارەی بکە منیش جارێك ئەو دۆخەم لە وڵاخێکی تر بینی بوو، پیاوێکی وڵاخدار چارەسەری بۆ کرد، منیش گوتم دەی بڕۆن خوێ و ڕۆن لەگەڵ سوژنێك و گوێزانێکم بۆ بێنن، ئەسپەکە بخەن قاچەکانی ببەستن چارەسەری دەکەم، ئەمە جۆرە نەخۆشییەکە لە لەوزەتێنی مرۆڤ دەچێت، پێی دەڵێن (کەسمە)، نەشتەرگەریم بۆ کرد و هەر لەوێ ئەسپەکە هەستایەوە، دەستی بەلەوەڕ خواردن کردەوە ئیتر تۆزێك پێڕابواردن بە دکتۆر کەم بوویەوە.

بەهۆی خولیام بۆ کاری پزیشکی بەردەوام هەندێك حەب و دەرزی ژانەشك و گۆز و لەفاف لە کۆڵە پشتەکەمدا هەبوو، ئەوەبوو زۆر برسی و ماندوو بووین لەگەڵ هەڤاڵ برایم لە گۆڕی مالێخی چووینە لای ماڵە ڕەشماڵێك داوای نانمان کرد زۆریان پێ ناخوش بوو ناهەقیشیان نەبوو پێشمەرگە زۆر بوون، ئەوان چەند ماڵێکی مەڕدار بوون هەموو ڕوویان لەوان دەکرد، بەهەرحاڵ بەدەر لە خواستی ئەوان دانیشتین، هەندێك ژاژییان لەگەڵ نان و دۆ بۆ هێنایین، ئێمەش دەستمان کرد بەنان خواردن هەڤاڵ برایمش هەر بۆ گاڵتە گوتی دکتۆر بخۆ، پیاوی ماڵەکە گوتی تۆ دکتۆری خۆم نەشکاندەوە گوتم بەڵێ، گوتی وەڵا

نەخۆشێکمان هەیە ژانی گرتووە ئەگەر چارەیەکی بکەن حەبێ شتێکتان هەبێت، خۆتان دەزانن هیچ ڕێگایەك نییە و هەموو ڕێگاکان گیراون و ئەوەی بشکەوێتە دەست ڕژێم ئەنفال دەکرێت، گوتم بەسەرچاو، تەماشام کرد زانیم ئەوە ژانی گورچیلەیەتی بۆیە دەرزیەکی باسکۆپانی عێراقیم لێدا، پاش دەمێك خوا کردی ژنەکە ژانەکە بەریدا و بەو هۆیەوە ئێوارە بە نان خواردنێکی باش دەعوەت کراین، جا لە هەمووی خۆشتر بۆ من ئەوەبوو ژنەکە دەیگوت من زۆجار ئەو ژانەم گرتووە، دەرزی و حەبیان داوەمەتێ، بەڵام هەرگیز وەك ئەو شریقەیە کاریان نەکردووە، هەر دەهات و دەچوو، یاخوا بەخێر بێیت سەر هەر دوو چاوان دکتۆر، منیش زور کەیفم بەخۆم دەهات و گەزگەز باڵام دەکرد هەر لەو ماوەیە لە بێچارەیی چارەسەری هەم ئەسپەکە و هەمیش ئەو ژنە دڵخۆشیەکی زۆری بۆ من هێنا و تۆزێکیش گاڵتەی برادەرانم لەسەر کەم بووەوە.

دواتر لە گەرووی مالێخ سەرکەوتین بۆ گەرووی شێخ شەرۆ لە قەندیل و ماوەیەکیش ماینەوە لەوێ تا هەموو هێزی پێشمەرگەی مەڵبەندی سێی هەولێر گەیشتنە قەندیل و ئینجا بۆ شێخ ئایش و بادیناوە، ماوەیەکیش لەوێ ماینەوە، دواتر بڕیار درا ئەو چەك و کەلوپەلانەی لامانە بیگەیەنینە قاسمە ڕەش لە ڕێگەی زنجیرە چیای قەندیل و تاتی دۆ ئەوەبوو ئێمە پێنج کەس بەڕێکراین باری سێ ولآخمان بار کرد، بێ بەختی من ئەوەبوو دەمزانی باری ولآخ ببەستم و باری بکەم بۆیە هەر شوێنێك پێویستی بە بارکردن هەبوایە دەبوو من لەگەڵیدابم، ڕێگا دوورەکەمان بڕی تا گەیشتینە قاسمەڕەش، نزیکەی ٧ حەوت ڕۆژمان پێ چوو گەیشتینە کۆتایی مانگی ئۆکتۆبەر، ڕژێم بڕیاری لێخۆشبوونی دەرکردبوو ئەو خوێندکارانەشی کە بەهۆی نەکردنی جەیشی شەعبی لە خوێندن دەرکراون بگەڕێنەوە و پەیوەندی بە زانکۆ و پەیمانگاکانیانەوە بکەن.

ئـەوەبوو بڕیـاری سـەرکردایەتی درا کـە ئێمـە بگەڕێینـەوە بەتایبـەتی ئەوانـەی کـە خوێندکاری زانکۆ و پـەیمانگاکانن، هەرچـەندە مـن پـێم نـاخۆش بـوو، بـەڵام گوتیـان ئێمـە پێویستمان بەوە هەیە بچیت پەیمانگاکە تەواوبکەیت و ساڵێکیش دامەزراندنمان هـەبوو لـە نەخۆشخانە، ئەوەبوو ئێمە چەند پێشمەرگەیەك بـە نابەدڵیـەوە ڕەوانـە کراینـەوە، ئەگـەر هەڵەنەبم لە نۆکان لێکۆڵینەوەیان لەو پێشمەرگانە دەکرد کـە دەگەڕانـەوە، لەلایـەن هـەڤاڵ (حاجی برایم)ەوە لێکۆڵینەوەکە دەکرا، ئێمەیان بردە لای و گوتی ئێوە بۆچـی دەگەڕێنـەوە گـەنجن؟ حەزیشـمان لـێ بـوو نـەهێڵن بگەڕێینـەوە، ڕووی لـە مـن کـرد گـوتی تـۆ بۆچـی دەگەڕێیتەوە؟ گوتم خوێنـدکاربووم لـە پـەیمانگای پزیشکی دوورخراومەتـەوە ئێسـتا بڕیـار دراوە وەربگیرێینەوە بچینەوە خوێندن تەواو بکـەین، گـوتی تـۆ دەبێـت بچیـتەوە و هـەموو ڕۆژێك تۆ پێشـمەرگەی، ئـەوی دیکـەیان دکتـۆر کامـەران ڕەسـووڵ بـوو، ئـەویش لـە زانکـۆی بەغـداد لـە کۆلیـژی پزیشـکی دەرکرابـوو، بۆیـە پێشـمەرگەکانی تێگەیانـد و گـوتی ئـەو دووانـەیان بگەیەننـە کۆتـا خـاڵی گەڕانـەوە ڕێگـەیان نـەدەن بگەڕێنـەوە بـۆ قاسمـەڕەش و سنووری پێشمەرگە، تا دڵنیا دەبن خۆڕادەست دەکەنەوە.

ئەوەبوو ئێمەیان سواری زیلێك کرد، چونکە لیژنەیەکی پێشوازی لەلایەن ڕژێمـەوە لـە پشتی شێنێ لە گەرووەکە دانرابـوو، ئێمـەیان دانـا تـا زیلەکـە پڕبـوو، هـەر شـەو بـۆ فرقـەی چوارقوڕنە ڕەوانە کراین، کە گەیشتین شەو بەو سەرمایە ئێمـەیان لـەناو فرقـە بـەبێ هـیچ پۆشاکێك بە برسیەتی جێهێشت و بەیانی زوو دیسان ناوەکانیان خوێندەوە، بـە زیـل بـراین بـۆ سـلێمانی دواتـر بـۆ عەربـەت لـەوێ فەرمانگەیـەکی ئـەمنی لـێ بـوو، لـەوێ وتـەیان لێوەرگرتین و پێشمەرگەی لایەنەکانیان لە یەك جیا دەکـردەوە، وەك ی.ن.ك، سوشیالیست، شیوعی و پ.د.ك بە زۆر شێوە وێنەیان گرتین و وەك ئەوەی دزیمـان کردبێـت، خولـەك بـە خولەك پەشیمانی گەورەتر دەبوو لە گەڕانەوە هەستم بە شکاندنێکی ئێجگار گەورە دەکرد، ئەمە بۆ سێ ڕۆژ دەچێت هـیچ نانمـان نـەخواردووە زۆر برسـیمانە جا پێشمان دەڵێن بـە

**کـرێگیراوان (عمـلاء)ی ئێـران، شـەو داهـات دیسـان سـواری زیلیـان کـردین و یەکـە و پسووڵەیەکیان دایـنێ کـە نـاوی سیانیمان و شوێنی پێشمەرگایەتیمان و ناونیشانی شوێنی دانیشتنمان تێدا تۆمارکرابوو.**

**ئیتر گوێزراینەوە بۆ مەعەسکەر سەلام، لـەوێ هـەمومان زۆر برسیمان بـوو، چووینە چێشتخانەکەی، هەندێك کوردی لـێ بـوون گوتمـان زۆر برسـیمانە ئـەوە سـێ ڕۆژە هیچمان نەخواردووە، گوتیان هەندێك پاشماوەی خواردنەکان ماوەتەوە لە ناو مەنجەڵی گەورە بـوو، هەموومان بێ دەست شۆردن دەستمان بە خواردن کرد، جگە لەوەی چڵك و ئەسپێ لەسەر جەستەی برسی و شەکەتمان مێوان بوون، ئەوانیش خوێنیان دەمژین لەگەڵیان ڕاهـاتبووین و بووبوونـە هـاوڕێی هەمیشـەییمان، ئیـدی هـەموومان بەیەکـەوە دەسـتمان دەخسـتە نـاو مەنجەڵەکە، لە هەمان کاتدا دەیان دەست دەخزانە ناو مەنجەڵەکە هەر لـە چـاو تروکانێکدا مەنجەڵ تەقەی لێوە هات لێسرایەوە، ئـەوەبوو بـۆ بـەیانی ناویـان خوێندینـەوە و لـە زیـل باریان کردین بۆ عین زالە و دابەشیان کردین بۆ فائیدە و شەنگال و موسڵ و شوێنی تر کـە ژمارەیەکی زۆریش هـەڵهاتوو و موتەخـەلیفی سـەربازی بـەناوی بڕیـاری ٧٣٦ – ٧٣٨، ئەگـەر هەڵە نەبم ڕادەست بووبوونەوە.**

**بۆ ئێوارەکەی گەیشتینە عین زالـە و ناویـان خوێندینـەوە بـە سـەر سـریە و فەسـیل و فەوج دابەشیان کردین، بۆ بـەیانی مـن چـوومە لای فەرمانـدەی سـریەکە، ئەفسـەرێکی پلـە یەك (ملازم الاول) بوو، گوتم گەورەم من خوێنـدکاری پـەیمانگام و (سـید الـرئیس) بڕیـاری داوە بگەڕێینەوە خوێندن، ئیتر ئەگەر ئێستا نەچـم بـۆ پـەیمانگا دیسان لـە خوێنـدن دوور دەخرێمـەوە ئـیتر مـنی نـاردە قەڵـەم و لـەوێ (نائـب عریـف)ێکـی لـێ بـوو، لا ڕوومـەتێکی هەڵدڕابوو، شوێنی گوللە بوو، دەموچاوی شێوابوو، وەرەقەکەم پـێ دا، پـاش کـەمێك هاتـەوە پێی گوتم (امشی یا ولد انت لحد هسە مخرب وترید ترجع للدراسه حتی انـا هنـا مـا اخلیـك**

ترجع) (برۆ کاکە تۆ هەتا ئێستاش تێکدەری، کەچی دەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆ خوێندن، هەتا من لێرەبم ڕێگەی گەڕانەوەت نادەم) وای دەزانی من گوللەکەم لێی داوە، دواتر بڕیار درا هەڵهاتوو و موتەخەلیفە سەربازییەکان بنێردرێنەوە، تەنها لە سەربازگەکەی ئێمە چەند کەسێك ماینەوە، کە بەخراپی مامەڵەیان لەگەڵ دەکردین و شوێنیشمان نەبوو لێی بمێننەوە، بۆیە بەیانیان دەهاتینە سەربازگە و دوای نیوەڕۆ دەگەڕاینەوە موسڵ، دووچاری دۆخێکی خراپ بووین، هەواڵیشمان هەبوو هەندێك لەو پێشمەرگانەی کە گەڕاونەتەوە بێسەروشوێن کراون، بۆیە ئێمەش ترسمان لێنیشت و هیچ چارەیەکمان نەبوو، ڕۆژێك چوومە پەیمانگای پزیشکی موسڵ، ئەو بڕیارەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی ڕژێم و پشتگیری پەیمانگاکەم برد بۆ سەربازگە و قەڵەم، بەرپرسی قەڵەم ئەوەی لە شەڕی پێشمەرگە گوللەیەك بەر دەم و لووتی کەوتبوو لەوێ نەبوو، یەکێکی دیکە بوو بەزەیی پێ دا هاتمەوە شتەکانم ڕادەست کرد گوتی: (روح کاکة باجر تعال اکملك کتاب ودیها للمعهد بس جیبلي دجاج مشوي پاقلە و کابسة وبند ورق ـ برۆ کاکە بەیانی وەرەوە نووسراوەکەت بۆ تەواو دەکەم، بەس مریشکێکی برژاو و پاقلە و کابیسەیەك و بەندێك کاغەزم بۆ بهێنە) زۆر دڵم خۆشبوو بەیانی ئەوشتانەم هێنا و گەڕامەوە سەربازگە و پێمدا، گوتی: (یاالله روح خلصت شغلك من هنا ـ یالاّ برۆ کارت لێرە تەواو)، هەتا هەموو ئەو شتانە کرا گەیشتمە مانگی ١٩٨٩/٢ کە چووم بۆ لای ڕاگری پەیمانگا گوتی برۆ بەشداری تاقیکردنەوە ببە، کە تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵی قوناغی دووی پەیمانگای پزیشکی بوو، منیش گوتم: ئوستاد من یەك وانەش لێرە نەبووم، هیچ نازانم گوتی: (مو مشکلتي ـ کێشەی من نییە) دیسان کێشەم بۆ دروست بووەوە، سەد خۆزگەم دەخواست کە هەر نەهاتبامەوە، نزای باشم بۆ بڕیارەکەی سەرکردایەتی نەدەکرد کە ئێمەیان پێ ناردەوە.

ئیتر دواتر لە ڕێگەی هاوڕێیەکم بەناوی جاسم کە ئەویش لە خوێندکارە دوورخراوەکان بوو، بەڵام ئەو لە سەرەتای ساڵی خوێندەوە گەڕابووەوە ناردمیە لای

لێپرسراوی ئاسایشی پەیمانگا، گوتی ژنێکی باشە زۆر هاوکاری ئێمەشی کردووە چومە لای و یاداشتێکم پێ دا، گوتم دواکەوتووم و ئێستاش نیوەی ساڵە داوا دەکەم ئەمساڵم بۆ دوابخرێت، کە ناوەکەی بینیم، زانی من چیم و چی بوومە، ئەوەی لە دامەزراوەی هەواڵگری عەربەت کە لێکۆڵینەوەیان لێ کردبووین زانیاریەکانیان بۆ ناردبوون، چونکە لێیان پرسی بووین پێش ئەوەی ببیت بە پێشمەرگە کارت چی بووە، ئیتر ژنەکە کە لێپرسراوی حیزبی و ئاسایشی پەیمانگا بوو زانی، گوتی دانیشە با من و تۆ گفتوگۆیەکی هەڤاڵانە بکەین: (ليش اصبحت مخرب وانتم مسئولين علي جلب ايران وضرب هلبجة بالغاز الكيمياوي، بس جاوبني بكل صراحة هذا قرار سيد الرئيس وماحد يقدر يحكي وياكم جاوبني ولاتخاف انتم عراقيين من احسن تنتمون للحزب والديفاع عن العراق ـ بۆچی بووی بە تێکدەر، ئێوە بەرپرسن لە چوونە پاڵ ئێران و لێدان لە هەڵەبجە بە چەکی کیمیایی، بەس بەڕاستی وەڵامم بدەرەوە، ئەوە بڕیاری سەرۆکە کەس ناتوانێت قسەتان پێ بڵێت، وەڵامم بدەوە و مەترسە ئێوە عێراقین و باشترین ئینتیماتان هەیە بۆ حیزب و بەرگریکرن لە عێراق)، کە داوای کرد منیش هەر خۆم لە خۆم بێزار بووبووم، لاواز و هیلاك بووم، هەستم دەکرد لە هەموو شوێنەکان لە دەروازەی (شێنێ)وە تا ئێستا بەس دەشکێنرێم، بۆیە گوتم من پێشمەرگەی گەلێکی خاك داگیرکراوم و هەرگیز ئێوە لە عێراق ئێمەتان بە عێراقی دانەناوە، دواتر ئەگەر ئێمە وەکو پێشمەرگە و چەکدار تاوانمان هەیە تاوانی خەڵکی گوندەکان لە ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە و خەڵکی کاسب چییە؟ هەموویان ئەنفالکردن و گوندەکانیان وێرانکردن؟ ئەدی ئەگەر ئێران کیمیایی لە هەڵەبجەدا کێ لە بالیسان و سێوسێنان و گۆپتەپە و ناوچەی بادینانیدا؟ هیچ حکومەتێك بووە گەلی خۆی قڕبکات و لەناوی بەرێت؟ دواتر حیزبەکەی ئێوە تەنها حیزبی عەرەبە (حزب البعث عربي الاشتراكي) کەی بوو بە حیزبی عێراقییەکان، ئەوا ئەو کاتەش ئێمە بیرێکی لێدەکەینەوە، ئەو قسانەی من تووڕەی نەکرد، بەڵکو بە بیرێکی ساردەوە گوتی من باوکم شیوعی بووە،

پێی گوتووم: (جیاوازی لە نێوان عەرب و کورد و هیچ لە نەتەوەکانی دیکەدا مەکە، هەمیشە مرۆڤدۆستانە هەڵسوکەوت بکە)، منیش سوپاسم کرد گوتم ئەی دەربارەی خوێندنەکەم؟ گوتی برۆ هەفتەی داهاتو وەرەوە، فەرمانی دواخستنی خوێندنەکەت ببەوە بۆ ساڵی داهاتوو، بەس کە لە هەولێر هاتی هەویر (معجون)ێکی ددانی سیگناڵم بۆ بێنە، نازانم بۆچی لەو کاتە لە بازاری موسڵ کەم بوو دەست نەدەکەوت، منیش ترسم هەبوو دەترسام تووشی کێشەیەکم بکات، ئەگەرنا هەویری سیگناڵ چییە داوا لە من دەکات، لە خۆم پرسی بۆچی پێی گوتم ناونیشانی شوێنی دانیشتن لە هەولێر بنووسە؟ بۆیە منیش ناونیشانەکانم هەموو بەهەڵە نووسی، ئیتر لەسەر داوای ئەو گەڕامەوە و سیگناڵەکەشم بۆ برد، گوتی لەسەر ناونیشانەکە فەرمانی دواخستنەکەت بۆ دێتەماڵەوە، یان کێ دەناسی لە پەیمانگا پێی بڵێ کە دەرچوو بۆت بێنێتەوە، بێخەمبە، منیش بیری جاسم حسێنم کەوتەوە کە لە پەیمانگا لەگەڵ خۆمان بوو، هەروەها لە خێزانێکی نیشتمانپەروەر بوو، ناوی ئەومدا کە لە نزیك پردی سەیداوە (چێشتخانەی گەس)یان هەبوو، ئیدی ناوە ناوە سەردانی چێشتخانەکەم دەکرد، تا ڕۆژێك فەرمانی دواخستنەکەی دایەوە دەستم و زۆر خۆشحاڵ بووم، بەهۆی وەرگیرانەوەم بەسەربازبوونیشم دواخرایەوە، گوایە بەردەوامم لە خوێندن بۆ ساڵی ١٩٨٩–١٩٩٠، لە قۆناغی دووی پەیمانگای پزیشکی وەرگیرامەوە بۆ ساڵی ١٩٩٠–١٩٩١ تەواوم کرد.

لە نەخۆشخانەی ڕزگاری هەولێر وەك تدروجی پزیشکی دامەزرام، چونکە چینە پزیشکییەکان ساڵێك پێش ئەوەی بکرێنە سەرباز دادەمەزران ئەوەبوو، لە مانگی ئاداری ١٩٩١ ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان دەستی پێکرد، لە جیاتی ئێمە بچینەوە شاخ و درێژە بەخەباتی چەکداری بدەین ئەوان گەڕانەوە لای ئێمە، جا بەهۆی ئەوەی ئێمەومانان زانیارمان هەبوو لەگەڵ هاوڕێ پێشمەرگە و ڕێکخستنەکان پەیوەندیمان هەبوو خۆشمان بەردەوام چاودێری هەواڵە جیهانییەکانمان دەکرد، بەردەوام ورەی جەماوەرمان بەرز

دەكردەوە، مژدەی ڕووخانی ڕژێمان پێ دەدان، خۆشمان هەستێكی وامان لەلا گەڵاڵە بووبوو كە گومان لە ڕاپەڕینی جەماوەری و پشتیوانی كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لە كورد بكەین، بەتایبەتیش دوای داگیركردنی كوێت لەلایەن ڕژێمەوە، هەر بۆیە شەوانی مانگی سێ لەماڵی ئێمە لەگەڵ هاوڕێیەكی پێشمەرگایەتی و ڕێكخستن هەڤاڵ ڕێبین عومەر چاوەڕێی لێدانی ئەمریكامان دەكرد بۆ تەفروتانكردنی سوپای عێراق و خۆ ئامادەكردن بۆ ڕاپەڕین.

ئەوەبوو بە گەیشتنی برووسكەكان و ژمارەی كۆدی ڕێكخستنمان، ڕۆژی ٣/١١ بەگوێرەی پلانی دانراو لە شەقامی لای شێخ مەعروفەوە بەڕێكەوتین، من ڕۆمانەیەك و چەند هەڤاڵێكیش لەوانە هەڤاڵان جەمال و خەلیل كلاشینكوفیان پێ بوو، هەندێك تەقەیان كرد و دروشم كێشان بە ڕووخانی ڕژێم خەڵك زیاتر ورەیان بەرزبووەوە، بەرەو شەقامی شەست مەتری و ماڵی بەڕێوەبەرە گشتییەكان ڕۆیشتین و كۆنترۆڵ كران، لەگەڵ هێزێك لە ناوچەی ڕاپەڕین كە خزم بوون و براكەشمیان لەگەڵ بوو لە شەقامی شەست مەتری یەكمان گرتەوە و بەرەو دامەزراوەی هەواڵگری ڕۆیشتین تا كۆنترۆڵ كرا.

دوای گەڕانەوە لە كۆڕەو و پێكهێنانی هێزی ١٠ی دەشتی هەولێر من لە تیپی شەهید جەعفەر چیومیی بوومە ڕابەری سیاسی تیپ، كە هەڤاڵ سامی قادر سەرپەرشتیاری ڕابەر سیاسییەكانی بەتالیۆنی بنەباوی دەكرد، هەڤاڵان ساڵح مەولود حەیران و باپیر عەوڵا خۆرانیش ڕابەر سیاسی بوون، لە هەمان كاتدا ئەندامی كەرتی ڕێكخستن بووم، لەگەڵ هەڤاڵ قادر كادیر كە كەرتێكی ڕێكخستنی گەورەمان ڕێكخستبوو، لە نەخۆشخانەش ئێشكگریم دەكرد تا ئەوەبوو لە ڕاپەڕینی دووەم بەتەواوی هێزەكانی ڕژێم لە كوردستان كشانەوە، ئێمە بارەگای بەتالیۆنمان لە سولاوكە بوو، زۆربەی هێزەكەشمان لەناو شاربوو دواتر لە هەمان ساڵ هەڵبژاردن بۆ دەستەی مەڵبەندی هەولێر كرا، كە ڕێكخستنە دێرینەكان بەشداریان كرد لە هۆڵی ڕۆشنبیری هەولێر منیش هەم وەكو ڕێكخستن و هەم

پێشمەرگەی دێرین شەرەفی بەشداری هەڵبژاردنی ستافی مەڵبەندی سێم پێ بڕا، دواتر دامەزراندنی کۆمیتەی دووی هەولێر بەگوێرەی سنووری جوگرافی کەرتەکەی ئێمە کە هاوڕێ قادر کادیر بەرپرسی بوو منیش کارگێری کەرت بووم، کەوتینە بەر کەرتی کۆمیتەی دوو، کە هەڤاڵ بێستوون لێپراسروی کۆمیتەکە بوو، دواتر بێجگە لە ئەرکی رابەری سیاسی ئەرکی پزیشکی و بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و دامەزراندنی سەندیکای کارمەندانی تەندروستیی کوردستان بەجێ گەیاند، لە ساڵی ١٩٩٢ وەکو یەکەمین ڕێکخراوی پیشەیی ئەرکی پزیشکی بەتالیۆنیشم بەجێ دەگەیاند، تا ساڵی ١٩٩٤ و دامەزراندنی کۆمیتەکان لەسەر بنەمای پیشەیی، ئەوەبوو بوومە کارگێری کەرتی تەندروستی و لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی ی.ن.ك لە نەخۆشخانەی ڕزگاری و دەوامی پزیشکی لە نەخۆشخانە، لەگەڵ ئەوەش کە هێزەکان لە تیپ و بەتالیۆنەوە گۆڕدران بۆ فەوج، لە فەوجی هەڤاڵ ئەحمەد کوردە کە هەڤاڵ محەمەد چیوەیی جێگری بوو، زۆربەی کەسوکار و هەڤاڵەکانیشم لەو فەوجە بوون، شەهید فاقە مەخموری لێپرسراوی میحوەری ڕۆژهەڵات بوو، ئەرکی پزیشکی فەوجەکە لە ئەستۆی من بوو، لە یەکێك لە شەڕەکان بەداخەوە شەڕی ناوخۆ پێشمەرگەیەکمان کە پلەی سەرتیپ بوو زۆر بەسەختی بریندداربوو، وێڕای فریاگوزاری خێرا و دابینکردنی خوێن لە شوێنێکی دوورەوە و گواستنەوەی بۆ نەخۆشخانەی فریاکەوتن پێ دانی زیاتر لە هەشت پاینت خوێن و لابردنی گورچیلەی دوای ماوەیەکی زۆر برینەکەی سارێژ نەدەبوو، کە برینەکە لە پشتی بوو وەك دەرچەیەك بۆ هەوکردنەکە، بۆیە ڕۆژێك لە کاتی سارێژکردن مەقەستەکەم زیاتر ڕەوانی ژوورەوە کرد، چونکە دڵنیا بووم لە بوونی شتێکی نامۆ، بۆیە برینەکە سارێژ نابێت، ئەوەبوو پارچە گۆزێکی سەردەمی نەشتەرگەریەکە بەجێمابوو، دەرم کرد، دوای چەند ڕۆژێك برینەکە سارێژ بوو، بێجگە لە خزمەتکردنی سەرجەم نەخۆش و بریندارەکان لە نەخۆشخانە.

دواتر له نەخۆشخانەی رزگاری هەولێر لەلایەن بەڕێوەبەر دکتۆر شوان قادر و دواتر دکتۆر محەمەد خۆشناو ئەرکی لێپرسراوی تافیگە و دواتر دەرمانخانە و چاودێری نەۆمەکانم لە پاڵ ئەرکی رێکخستندا لە ئەستۆگرت، تا شەوی ٣١ی ئاب لەلایەن لێپرسراوی رێکخستنی تەندروستیی هەڤاڵ عەبدولباست کەریم ئاگادارکرامەوە، لە شەودا تیمێکی پزیشکی و ئۆتۆمبێلێکی فریاگوزاری لەگەڵ دوو کارمەندی تەندروستی بۆ میحوەری قوشتەپە ئامادە بکەم، هەروەها کردنەوەی بنکەی تەندروستیی قوشتەپە لە شەودا و خۆ ئامادەکردن بۆ هەر ئەگەرێك لە کاتی پەلاماری هێزەکانی رژێم و پ.د.ك بەیەکەوە.

ئیتر لە کاتژمێر هەشتی بەیانی ئاگادارکراینەوە کە بگەرێینەوە بۆ نەخۆشخانەی رزگاری، لە شەودا لە دەوربەری کاتژمێر ٩-١٠ دەست بە تۆپبارانی سەنگەرەکانی پێشمەرگە کرا، لە قۆڵی کەلکی یاسین ئاغا، لای ئێمە تا بەیانیش دۆخەکە ئاسایی بوو، هەر بۆیە ئێمە گەراینەوە نەخۆشخانەی رزگاری، دواتر دۆخەکە زیاتر شێوا و هێزەکانی پ.د.ك لەسەر پشتی دەبابەی بەعس بە تۆپبارانکردنەوە هاوکات بەهاوکاری گاردی کۆماری عێراقی هێرشیان کرد، بۆ دوای عەسرەکەی و شەری قارەمانەی پێشمەرگەکانی ی.ن.ك بەچەکی سووك و ئاسایی لە هەر چواردەورەی دەشتی پانوپۆری هەولێر و شەر لەگەڵ دەبابەدا ژمارەی بریندار و شەهید زیاتر دەبوون، ئەوەبوو من و هەڤاڵان قاسم ئەبو زێد و نەشئەت محەمەد لەگەڵ دکتۆر محەمەد خۆشناو لەبەر زۆری بریندار و شەهید ئاگامان لە کات نەمابوو، تا کەسێك هات کە دۆستی ی.ن.ك بوو ئێمەی دەناسی، گوتی ئەوە ئێوە چی دەکەن ئەوە هێزەکانی پ.د.ك لە دەرگای سەرەوە وا دێنە ژوورەوە.

بۆیە کاتژمێر دەوروبەری پێنجی ئێوارەوە بریارماندا نەخۆشخانەکە بەجێبهێڵین، ئێمە ئۆتۆمبێلی نەخۆشخانەمان پێ بوو کە شەو بۆ کاری فریاگوزاریمان ئامادەکرد بوو، شۆفێرەکەی ناوی هەحتان بوو، تابڵێی کورێکی دڵسۆز و ئازا بوو، لەگەڵمان بوو دکتۆر

محەمەدمان گەیاندەوەماڵەوە، ئێمەش بەرەو باداوە ڕۆیشتین، لەسەر سەد مەتری تەقەیەکی زۆر بوو کەوتینە کەمینی چەکدارەکانی پ.د.ك هەر ڕاستەوخۆ ئۆتۆمبێلەکەیان برد و ئێمەشیان نەدەناسی، ئەگەرنا لەوانەیە هەر لەوێ گوللەباران بکرابایین، گوتمان ئێمە دکتۆری نەخۆشخانەین، ئەم ئۆتۆمبێلە هی نەخۆشخانەیە ئیتر گوێیان بەو وتانە نەدا و ئۆتۆمبێلەکەیان برد.

بەم دۆخەوە شەو داهات، هیچ زانیاریمان نەبوو، منیش تازە چەند ڕۆژێك بوو ماڵی خۆم دانابوو ژنم هێنابوو لە گەڕەکی باداوە نزیك مزگەوتی بەدر ماڵم لەوێ بوو، گوتم هەڤاڵان بابچینە ماڵی ئێمە تا زانیاری وەردەگرین، ئەوکاتە بڕیارێك دەدەین ئەوەبوو چووینە ماڵی ئێمە هەر لەگەڵ گەیشتنمان و دانیشتن لە دەرگایاندا خزمێك هات کوڕەکەی پێشمەرگە بوو گوللەیەك بەرقاچی کەوتبوو، دۆخی خراپ بوو من سارێژم کرد و برینەکەیم پێچا گوتم بیبە نەخۆشخانە، بڵێ ئەمە هاووڵاتییە و لە ماڵەوە برینداربووە پێشمەرگەکە ناوی بەختیار بوو ئەوانیش بەقسەی منیان کردبوو سوپاس بۆ خوا نەشتەرگەری کرابوو، چونکە ئێسکی قاچی شکابوو.

من لە گەڕەکەکەمان نۆرینگەیەکی لاکۆڵانم هەبوو، سەردانیکەرم زۆر بوو خەڵك زۆر متمانەیان پێم بوو، لە دوای تیمارکردنەکە، هەر بەپەلە گەڕامەوە ماڵەوە، هەڤاڵ قاسم و هەڤاڵ نەشئەت هەر لەوێ بوون برادەرێکمان بەناوی ئیدریس لەگەڵ ڕێکخستنی خۆمان بوو هاتە ماڵمان و گوتی چوومە نەخۆشخانەی ڕزگاری، بەدوای تۆ و قاسم ئەبو زێددا دەگەڕێن، زەخت لە کارمەندی تەندروستی دەکەن کە ماڵی ئێوەیان پیشان بدەن، لەگەڵ بیستنی ئەو وتانە، هەڤاڵ نەشئەت گوتی ماڵی خزمێکمان لێرەیە من دەچمە ئەوێ، ئەگەر دەستگیر بکرێین با هەمووومان پێکەوە نەبین، منیش پێم باش بوو هەڤاڵ قەحتانیش لەو دەوروبەرە چووە ماڵی خزمێکیان، من و هەڤاڵ قاسم ماینەوە شەو نزیکی کاتژمێر ٨-٩

برایەکم هات گوتی هێزەکانی ی.ن.ك لەو سەری باداوەن، هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ و هێزێکی زۆرن، گوتم هەڤاڵ قاسم با بڕۆین، تا ئێمە چووین هێزەکە دەرچووبوو، ئیتر بەناچاری گەڕاینەوە، دۆخێکی ئێجگار ناخۆش بوو، تەقە و هاتوهاوار، تاڵانی، لێدانی خەڵك، دزی، ئەوەی نەبووە و نەکراوە ئەوانە وەك گورگی هار و برسی بەبێ جیاوازی بەربوونە گیانی خەڵك.

شەو ماینەوە خەو نەچووە چاومان بۆ بەیانییەکەی بە هەڤاڵ قاسمم گوت من دەڕۆم ئامادەی؟ گوتی من ناتوانم ئیتر لەگەڵ مامم ناردم بۆ لای هاوڕێیەکی خۆی کە ئەندامی ح.ش بوو، منیش برایەکی خۆم تێگەیاند ئۆتۆمبێلێکی تایبەتی ناسیاوێکمان هەبوو هێنایی و یەکسەر بۆ شەقڵاوە دەرچووین، ماڵی ئامۆزایەکی باوکم لە دەربەندی شەقڵاوە بوون، ئیتر کەس بە کەسیش نەبوو لەبەر دزی و تاڵانی بۆ ڕۆژی دواتر بە ئۆتۆمبێلی تایبەت لە ڕێی ئالانەوە گەیشتمە دۆڵی بالیسان، هەرچەندە لە بازگەی ئالانە دایان بەزاندم و گوتیان تۆ جەلالیت و ڕادەکەی، وەك ئەوەی بە تایبەت بمناسن، بەڵام بۆ بەختی من کەسێکی خزم و ناسیاو کە بازرگانی جگەرەی دەکرد گەیشتە ئەوێ بە بازگەکەی گوت بۆچی داتان بەزاندووە؟ گوتیان دەینێرینە ناوچەی خەلیفان پشتگیری بهێنێت، گوتی کاکە من دەیناسم خزممە گوتیان دەبیە کەفیلی؟ بە بەڵێ، وەڵامی دانەوە، ئیتر لەوێش ڕزگارم بوو گەیشتمە دۆڵی بالیسان، دیسان بۆ هەواری جاران گوندی چیوە کە دایك و باوکیشم لەوێ بوون خەریکی شینایی و ڕەزوباخ بوون بە بینینی من و ڕزگاربوونم دیدەیان ڕۆشن بووەوە، گوتیان لە خەمی ئێوە و ئەو دۆخە ناهەموارە چەند ڕۆژە خەو نەچووەتە چاومان.

چەند ڕۆژێك مامەوە دۆخی هێزەکانی ی.ن.ك تا دەهات خراپتر دەبوو هەواڵەکان خۆش نەبوون، بۆیە بڕیارمدا بچمە شاری ڕانیە، ئیتر دوای ئەوە ی.ن.ك بڕیاریدا هێزەکانی لە هەموو بەرەکانی شەڕ بەرەو سنوورەکان بکێشێتەوە، بۆ ئەوەی جارێکی تر خۆی

ڕێكبخاتەوە چونكە هێزەكانی بەهۆی شەڕی درێژخایەن و هاوبەشی ڕژێم بۆ پ.د.ك زۆر ماندوو بوون، بەهۆی داگیركردنی هەولێرەوە لە ڕانیەوە بە ئۆتۆمبێل چوومە قەڵادزێ لەوێش سەركەوتم بۆ كێلێ، لەوێ هەواڵم بۆهات كە برایەكم بەناوی تالیب لەلایەن (پ.د.ك)ەوە لە گوندی توتمە گیراوە، كە ئەو بۆ سۆراخی ئێمە هاتبوو، لە زیندانی هەریر زیندانیان كردبوو هەر چەندە ئەو پێشمەرگەش نەبوو، بەڵام ڕەشبگیریان دەكرد دواتر بەهۆی ناسیاوێكمان كە لە ڕیزەكانی (پ.د.ك)دا بوو، بوو بە كەفیلی دوای چەند ڕۆژێك ئازادیان كرد، برایەكیشم كە لە كەپكی حەمەد ئاغا بوو، دیار نەمابوو، بۆ من زۆر ناخۆش بوو.

ئیتر لەوێ ماینەوە، تا گەردەلوولی تۆڵە دەستی پێ كرد و گەڕاینەوە دوای گەڕانەومان لە ڕانیە بۆ ماوەیەك جێگیربووم، هەر لە سەروبەندی شەڕەكان چوومەوە گوند و لەوێ بۆ ئەوەی چاوم بەدایك و باوكم بكەوێت ئەوانیش هەواڵی منیان نەدەزانی، كە چووم زۆر دڵخۆش بوون، چەند ڕۆژێك مامەوە كەسێك بەدوامدا هات پێی گوتم ژنێك بەهۆی منداڵ بوونەوە دۆخی تەندروستیی زۆر خراپە، گوتیان دكتۆر دەبێت چارەیەكی بكەی منیش بەردەوام هەندێك دەرزی و حەبی ئازار و هەوكردنم لابوو ناچار چووم دەرزیەكم لێدا، دوای كەمێك هەواڵیان هێنا و گوتیان ڕزگاری بووە و منداڵەكەی بووە.

دواتر بە پێویستم زانی سەردانی كۆیە بكەم، لە هەواڵی هاوپیشە و هاوڕێكانم بپرسم، هەر زووش هەواڵی دكتۆر محەمەد خۆشناوم پێگەیشت، كە گەیشتۆتە قاسمەڕەش و ئیتر لە كۆیە دكتۆر مەجید لەگەڵ هەڤاڵان فەرمانگەی تەندروستیی هەولێریان دامەزراندبووەوە، هەندێك لە برادەرانی كارمەندی تەندروستی هەڤاڵان قاسم ئەبو زێد، نەشئەت محەمەد، سلاح، یوسف عوسمان و حەیدەر و سەباح هیرانی و ژمارەیەكی دیكە لە كارمەندی تەندروستی و كارگێڕی بەهەر شێوەیەك بێت گەیشتبوون، دواتر من گەڕامەوە ڕانیە و

لەگەڵ دکتۆر محەممەد خۆشناو لە قەڵادزە لە نەخۆشخانەکە لەگەڵ کۆمەڵێك کارمەندی تەندروستیی هەولێر دەوامەمان دەست پێ کرد.

لە مانگی ١٩٩٧/٢ لەلایەن هەڤاڵ مام جەلال و هەڤاڵ کۆسرەت ڕەسووڵ، دکتۆر محەممەد ڕاسپێردرا بە دامەزراندنی نەخۆشخانەی شۆڕش بۆ چارەسەرکردنی پێشمەرگە بریندارەکان، چونکە ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگە بەهۆی شەڕەکانی گەردەلوولی تۆڵە و ٣١ ئابەوە بریندار و ئاوارە بووبوون، کە پێویستیان بە چارەسەر و چاودێری هەبوو، هەر سەرەتا دوای گرتنی خانوویەك لە گەڕەکی توی مەلیك کرا، دکتۆر بەدوایدا ناردین و دەستمان کرد بەپەیداکردنی کەلوپەلی پزیشکی کە بەهۆی ئەو دۆخەی کوردستان و سنووری دەسەڵاتی ی.ن.ك و گەمارۆی ئابووری دەستکەوتنی زۆر بەئەستەم بوو، بۆیە بیرمان لەوە کردەوە کە بەشێکی زۆری پێداویستییەکان لە ناوخۆ دابین بکەین، ئیتر چەند ڕەدهە و هۆڵی نەشتەرگەری ئامادەکران، ئێمە چەند کارمەندێکی تەندروستی بووین لەوانە: کەیفی مستەفا، سەباح ئەحمەد، هیوا قادر برای دکتۆر محەممەد، سامان عەبدولڕەحمان، نەشئەت محەممەد، شێرزاد حسێن، کامەران حەمەد، هیمداد حەمەد و لوقمان، ئێمە هەریەکەمان چەندین کارمان دەکرد بەتایبەتی ستافە پزیشکییەکە پێنج کەس بووین: (کەیفی، سامان، نەشئەت، لوقمان ئەحمەد و سەباح)، هەر لە نەشتەرگەریی و ڕەدهەی نەخۆش و چارەسەری و هەرچی پێویست بوو کە لە نەخۆشخانەیەکی گەورە دەکرا لەوێش دەکرا، کە زۆر جێگەی ڕەزامەندی بریندار و نەخۆشەکان بوو، نابێت ئەوەشمان بیر بچێت کە زۆربەی دکتۆرەکانی سلێمانی و کارمەندانی تەندروستی هەمیشە ئامادە و هەڵوێستیان هەبوو بۆ خزمەتکردن دواتر نەخۆشخانەکە فراوانتر و گەورەتر کرا.

ئەوەبوو شوێنی ئێستای لقی پ.د.ك ڕێکخرا بۆ نەخۆشخانەی شۆڕش و لە شوێنی دیکەش لقەکانی نەخۆشخانەکانی شۆڕش کرایەوە، یەکەمین کەسانی دوای ٣١ی ئاب کە

نەخۆشخانەی شۆڕشمان دروست کرد بەسەرۆکایەتی دکتۆر محەممەد قادر خۆشناو ئەو ناوانەی ئاماژەم پێ دا بۆ مێژوو ئەوانە بوون، ئێستا نەخۆشخانەکانی شۆڕش دامەزراوەی تەندروستیی گەورە و پێشکەوتووە، خزمەتی زۆری کردووە.

یەکێکی دیکە لە کارەکانمان دامەزراندنی تیمی پزیشکی بوو بۆ هەموو هێزەکانی پێشمەرگە و دابینکردنی دەرمان و پێداویستی پزیشکی بوو بۆیان، کە ڕۆڵی ئێجگار بوێرانە و پێشمەرگانەیان هەبوو لە سەرجەم میحورەکانی پێشمەرگە، کە چەندین کارمەندی دڵسۆز و خۆنەویست هەر لە کارمەندە تەندروستییەکانی ئاوارەی هەولێر و کۆیە، هەروەها کارمەندانی تەندروستیی سلێمانی و زۆری تریش بەداخەوە ناوی زۆربەیانم لە بیر نەماوە، هەرچەندە لە لای خۆمەوە زۆربەی پێداویستی پزیشکی و دەرمانیان پێ دەدرا، لە کاتی شەڕیشدا لە کانی وەتمان نەخۆشخانەیەکی گوستراوەمان دامەزراندبوو، شەوێك هەواڵیان پێ داین کە تازە گەڕابووینەوە، بۆ پەیداکردنی پێداویستی پزیشکی بە زووترین کات بچینەوە کانی وەتمان و پێداویستیە پزیشکییەکان لەگەڵ خۆمان بهێنینەوە، ئۆتۆمبێلێك لە نەخۆشخانەی فێرکاری هەبوو کە لایتەکانی کاری نەدەکرد، لەگەڵ شوفێرەکە بەبێ لایتی بەو شەوە کە لە مانگی ١٠ی ساڵی ١٩٩٧دا گەیشتینەوە کانی وەتمان، لەسەرخۆ هەندێك جار دادەبەزین بۆ ئەوەی ئاراستەی شەقامەکە بزانین.

هەر لێرەوە دەمەوێت ڕۆڵ و هاوکاری و پشتیوانی هەریەك لە دکتۆر حیسام کە بەڕێوەبەری گشتی تەندروستیی کەرکووك بوو، هەروەها یاریدەری پزیشك بورهان عەلی عوسمان و دکتۆر جەبار لە نەخۆشخانەی کەلار لە دەرمان و پێداویستی پزیشکی و هەر شتێکی تر بۆ نەخۆشخانەی شۆڕش و پێشمەرگە هەبوو کردیان.

لە دوای ماندوو بوون و ڕۆڵی کاریگەر و دڵسۆزانەم لە دروستکردنی نەخۆشخانەکە لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٨دا نەخۆشخانەی شۆڕشم بەجێهێشت، کە بەشەو ڕۆژ بەردەوام کارم دەکرد

بۆ هەر ئەرکێك کە شارەزایم لە زۆربەی کارە پزیشکیەکان و پەرستاری هەبوو، ئەو ماوەیە بۆ من شانازییەکی زۆر گەورە بوو، چونکە جێگەی ڕەزامەندی پێشمەرگەی برینـدار و نەخۆشەکان بووم، هەمیشە لەگەڵ ئازارەکانیان بووم و داکۆکیم لە مافەکانیان دەکرد هەر لەو سەروبەندە دەستەیەکمان دروست کرد بۆ دامەزراندنی سەندیکای کارمەندانی تەندروستیی کوردستان، بە هاوبەشی لە نێوان چەند کارمەندێکی تەندروستیی سلێمانی و هەولێر ئەوانەی کە ئاوارەبوون لەگەڵ چەند کارمەندێکی تەندروستیی کەرکووك کە دەستەی دامەزرێنەری سەندیکا نزیکەی ١٨ کەس دەبووین ئەوانەی بیرم ماون: (کەیفی مستەفا، قاسم ئەبو زێد، سەباح عەبدوڵڵا، بەدریە حسێن، بورهان علی، هادی فەریق قارەمان، ئیبراهیم ئەحمەد، جبار محەمەد ڕەحیم، شێخ حەسەن، شەماڵ ئەحمەد، جەمال مەلا سەعید و شێخ هیشام سلێمانی) و چەند کارمەندێکی تر.

دوای ئامادەسازی لە مانگی ئەیلوولی ١٩٩٩ یەکەمین کۆنگرەی سەندیکا لە هۆڵی زانکۆی سلێمانی گرێ درا، من بە جێگری سکرتێر هەڵبژێردرام، لق و مەکتەبی تەنفیزی و سکرتاریەتمان بۆ هەموو شارەکان دامەزراند، ڕۆڵی کاریگەرمان هەبوو لە ناوەندی تەندروستی و داکۆکیکردن لە مافی کارمەندانی تەندروستی، پشتیوانی زۆربەی بەرپرسانی ی.ن.ك لە خەباتی سەندیکایی و پیشەیی بەتایبەتی کارمەندانی تەندروستی دیار و بەرچاو بوو، لە سەرووی هەموویانەوە هەڤاڵان: مام جەلال، کۆسرەت ڕەسووڵ، مەلا بەختیار و حاکم قادر پشتیوانی دیاریان هەبوو.

ئیتر لە پاڵ خەباتی سەندیکایی لە هەمان کاتدا کاری تەندروستیشمان وەك ئەرکی سەرەکی بەرێوەدەبرد، بۆ ماوەیەك بەڕێوەبەری میلاك بووم لە ناو وەزارەتی تەندروستی و ماوەی ساڵێکیش بەڕێوەبەری کارگێری بووم لە نەخۆشخانەی سەرچنار، لە ساڵی ٢٠٠٠ بڕیارمدا لە کۆلێژی یاسا خوێندن تەواو بکەم، بۆیە لە زانکۆی سلێمانی کۆلیژی یاسای

ئێواران وەرگیرام، تا ساڵی ٢٠٠٣–٢٠٠٤ بڕوانامەی بەکالۆریۆسم لە یاسا و ڕامیاری بەدەست هێنا.

ساڵی ١٩٩٩ بەشداری کۆنفرانسی مەڵبەندی هەولێرم کرد و بە دەنگی یەکەم لەسەر ئاستی کۆمیتەی دووی هەولێر بە ئەندامی کۆمیتە هەڵبژێرامەوە، هەر هەمان ساڵ بەشداری خولی پەیمانگای کادیرانم کرد و لە چوار یەکەمەکە بووم، خەڵاتی هەڤاڵ مام جەلالم پێ بەخشرا، ساڵی ٢٠٠١ هەڵبژێرام بە ئەندامی کۆنگرە و بەشداری کۆنگرەی دووی (ی.ن.ك)م کرد، لە ساڵی (٢٠٠٤)ەوە لەلایەن سەندیکا و مەکتەبی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان بەسەرپەرشتیاری کاری سەندیکایی سنووری پارێزگاکانی هەولێر و دهۆك دانرام، هەر لە هەمان ساڵ بوومە کارگێری ناوەندی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی هەولێر و ئەرکی سەرپەرشتی چەند ڕێکخراوێکم پێ سپێردرا، لەوانە: کارمەندانی تەندروستی، یەکێتیی مامۆستایان، مافپەروەران، کەمئەندامان، جیۆلۆجیستان، وێنەگران و هونەرمەندان، لە ساڵی ٢٠٠٦ پلەی ئەندامی مەڵبەندم وەرگرت و لە ساڵی ٢٠٠٩ بووم بە کارگێڕی مەڵبەند، دواتر ڕاژەکەم لە نەخۆشخانەی فێرکاری بۆ وەزارەتی تەندروستی گواستنەوە، لە ساڵی ٢٠١٠ گۆسترامەوە بۆ وەزارەتی شارەوانی و گەشتوگوزار، بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار و پۆستی بەڕێوەبەری یاساییم وەرگرت، تا ساڵی ٢٠١٨ پۆستی بەڕێوەبەری گشتی شوێنەوار و کەلەپووری هەرێمم وەرگرت، لەو ماوەیەدا لەسەر ئاستی جیهانی بەشداری چەندین کۆنفرانسی شوێنەواریم کردووە، پەیوەست بەبابەتی زانستی شوێنەوار و کارگێڕیی و کەلەپووریی، لە پاڵ بەشداریکردن لە کار و ئەرکە ڕێکخراوەییەکان چەندین سوپاس و پێزانینم لەلایەن زانکۆ و ناوەندە زانستی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتی و کوردستانییەکان پێ بەخشراوە، بەشداری چەندین کۆنفراس و خولی ناوخۆیی و دەرەکیم کردووە، چەندین

لێپرسراوی کارگێڕیم لە ناوەندە تەندروستی و ڕێکخراوەییەکاندا لە ئەستۆ گرتووە، لە ڕووی ژیانی تایبەتییەوە، خێزاندارم کچێکم هەیە بە ناوی لاڤە[٥٤].

---

[٥٤]– کەیفی مستەفا عەلی ئیبراهیم (د. کەیفی)، هەولێر، ٢٠٢٢/٤/٤.

## کامەران ئەسعەد عەلی (شەهید د. کامەران)

لە ساڵی ١٩٦٠ لە گەڕەکی ئیمام قاسم لە شاری کەرکووک لە دایکبووە، لە ساڵی ١٩٨٠ پەیمانگای پزیشکی کەرکووکی تەواوکردووە، لە ساڵی ١٩٨٠ پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانەوە کردووە، لە ساڵی ١٩٨٣ لە تیپی ٢١ی کەرکووک بووە بە پێشمەرگە، دواتر بۆ تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان گوێزراوەتەوە.

هەڤاڵ کامەران لە ماوەی ژیانیدا پێشمەرگەیەکی زیرەك و وریا بووە، بەردەوام کۆڵەپشتێکی پێ بووە کە کەلوپەلی پزیشکی تێدا بووە، چەندین پێشمەرگەی چارەسەر کردووە، لەوانە (نەژدەت کەرکووکی، شەهید باپیرە، شەهید هیوا چیمەنی و شەهید مام ئاراس دوبزی...هتد)، هەروەها هاوکات پزیشکی هاوڵاتیانیش بووە، بێ جیاوازی چارەسەری هاوڵاتیانی کردووە، لە ساڵی ١٩٨٦ لە گوندی گردخەبەری سەر بەناحیەی ئاغجەلەر لە پیلانێکی ڕژێمی بەعسدا لەگەڵ دوو هاوڕێیدا دەرمانخوارد کراوە، لە گوندی مۆردخواردەی خواروو بە خاك سپێردراوە[٥٥].

---

[٥٥]– لە ٢٠٢٢/١٢/٢٩ لە هەڤاڵ ئەحمەد مەلا وەرگیراوە.

# لوقمان ئەحمەد عەباس سالم (د.ئاکۆ)

لە ١٩٦٤/٧/١ لە گوندی ئێنگیجەی تاڵەبانی سەر بە شارۆچکەی داقوقی پارێزگای کەرکووك لەدایك بووم، خێزاندارم و باوکی پێنج منداڵم، قۆناغی سەرەتاییم لە گوندەکەم تەواوکردوە و قۆناغی ناوەندیم لە شارۆچکەی داقوق تەواوکردووە و ئامادەیی و پەیمانگام لە شاری کەرکووك تەواوکردووە، لە ساڵەکانی ٢٠٠٤-٢٠٠٥ کۆلێژی یاسام لە زانکۆی سلێمانی تەواو کردووە.

ساڵی (١٩٨١) پەیوەندیم بە ڕێکخستنە نهێنییەکانی (ك.ڕ.ك)ەوە کردووە، لەناو شاری کەرکووك و شارۆچکەی داقوق و دەوروبەری کاری ڕێکخستنی نهێنیم ئەنجام داوە و لە بوارەکانی: ڕێکخستنی لایەنگر بۆ ڕیزەکانی کۆمەڵە، پێ دانی زانیاری دامودەزگاکانی ڕژێم بە ڕێکخستن و ناردنی پێداویستی پزیشکی بۆ هێزەکانی پێشمەرگە لە ڕێگەی ڕێکخستنەوە، تا ساڵەکانی ١٩٨٥ بەمشێوازە بەردەوام بووم، هەر لە هەمان ساڵ لە دوای تەواوکردنی خوێندن بە هۆی زۆرەملێی ڕژێمی بەعس لە سنووری پارێزگای سلێمانی لەسەر شاخی ئەزمەڕ لە ڕەبیەی سەربازی کرام بە سەرباز، سەرەڕای بوونم بە سەرباز لە پەیوەندی بە ڕێکخستنە نهێنییەکان بەردەوام بووم، لە ڕۆژێکی مۆڵەتدا بە شێوەیەکی نهێنی لە ڕێگای ڕێکخستنە نهێنییەکانەوە پەیوەندیم بە هێزی پێشمەرگەوە کرد و بە دانانی نەخشە و پلانێکی تۆکمە بۆ ڕادەستکردنی ئەو دوو ڕەبیە سەربازیەی کە سەرباز بووم لێی، هەروەها ڕێکەوتین لەسەر ئەوەی کە پلانمان بۆ دانا، لە ماوەی دوو بۆ سێ شەوی دواتر کە چوومەوە سەر ئەرك و لە کات و ساتی پاسەوانی خۆمدا لە کاتژمێرەکانی ١ بۆ ٢ی شەو هێزێکی پێشمەرگەی تیپی ٣٧ شارباژێڕ، کە سەر بە مەڵبەندی ١ی ڕێکخستنی سلێمانی بوون کە هەڤاڵ جەبار فەرمان لێپرسراوی ئەو مەڵبەندە بوو، لەگەڵ هەڤاڵ عەلی بچکۆل و هەڤاڵ عوسمان عەسکەری کە سەر بە دەستەی هەڤاڵ عەلی بچکۆك بوو، توانیم بە بێ تەقە تەواوی هەردوو ڕەبیەکە ڕادەست بکەم، بە پلەدار و سەرباز و سەرجەم چەك و تەقەمەنی

هەردوو ڕەبیەکە و ئامێرێکی (ڕاکاڵ) کە بەکاردەهات بۆ پەیوەندیکردن بە هێزی ئاسمانی عێراقییەوە.

بۆ ڕۆژی دواتر هەڤاڵ جەبار و هەڤاڵ عەلی پێشوازیان لێ کردم، دواتر گەیشتینە بارەگای مەڵبەندی ١ی سلێمانی، کە ئەو کات لە شارباژێڕ بوو، لێرەوە چەکی پێشمەرگایەتیم لە شان کرد، دواتر گەڕامەوە بۆ سنووری مەڵبەندی ٢ی کەرکووک، کە ئەو کات بارەگاکەی لە گوندی سەرگەڵوو بوو، لە چەمی سوورقاوشان لە بارەگای هێز چارەسەری چەندین نەخۆش و بریندارم کردووە، هەروەها هەڤاڵ عوسمان عەسکەریم بۆ کاری دەرزی لێدان و برینپێچی ڕاهێنا، بەمشێوازە تا ساڵی ١٩٨٦ بەردەوام بووم.

سەرەتا بە کاری پزیشکی لە ناو هێزی پێشمەرگە دەستم پێ کرد تا ساڵی ١٩٨٦ بووم بە فەرماندەیی مەفرەزە لە مەکتەبی عەسکەری گوندی هەڵەدن، هاوکات و تا کۆتایی هەمان ساڵ لە کاری پزیشکیش بەردەوام بووم، دواتر لەسەر داوای خۆم گوێزرامەوە بۆ تیپی ٢٥ی خاڵخالان و ڕاستەوخۆ مەفرەزەیەکی پزیشکیمان دامەزراند، لەگەڵ هەڤالان د. دڵشاد و د. ئەنوەر بۆ چارەسەری نەخۆش و بریندارانی هێزی پێشمەرگە لە کاتی شەڕدا و هەر لە هەمان ساڵ بیرۆکەی دروستکردنی بنکەیەکی تەندروستیمان لا دروست بوو، بە هاوکاری تیپی ٢٥ کە لە نێوان گوندەکانی گۆپتەپە و کانی هەنجیر لەسەر زێی گۆپتەپە دەستمان بە دامەزراندنی کرد، هەرچەندە پێشتر بنکەیەکی تەندروستی لە چەمی سوورقاوشان هەبوو، بەڵام زۆر نهێنی بوو، ئێمە توانیمان بەشێوەیەکی ئاشکرا بنکەکە دابنێین، بنکە تەندروستییەکە پێکهاتبوو لە ژوورێك و هۆڵێك بۆ بریندارانی پێشمەرگە و هاووڵاتی لە کاتی ئاسایی، هەروەها بوونی ئەشکەوتێك بۆ باری نائاسایی لە کاتی شەڕ و بۆردوماندا بۆ پاراستنی بریندارەکان.

یەکێك لەو ڕووداوانەی کە ڕوویدا و لە یادەوەریمدا ماوەتەوە ئەوەیە ڕۆژێك: پۆلێك پێشمەرگە دەکەونە بۆسەوە، کە تێیدا بریندار و شەهید هەبوو، یەکێك لەو بریندارانە پێشمەرگەیەك بوو ناسرا بوو بە (خەبات)، کە چەند گوللەیەکی بەرکەوتبوو، بەڵام بەندە و هاوکارانم د.دڵشاد و د. ئەنوەر توانیمان چارەسەری سەرەتایی بۆ بکەین، چونکە لە سنگیدا تووشی خوێنبەربوون بووبوو، توانیمان خوێنبەربوونەکەی بوەستێنین و هەڤاڵ شەمسەدین مەحموود ناسراو بە هیوای جیهاز کە عەدەد جیهازی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان بوو، هەستا بەبەخشینی بوتڵێك خوێن و توانیمان لە مەترسی ڕزگاری بکەینو دوای ئاسایی بوونەوەی بارودۆخەکەی لەگەڵ مەفرەزەیەکی پێشمەرگەدا گواستمەوە بۆ نەخۆشخانەی گشتی شۆڕش لە بەرگەڵوو.

لە بیرەوەرییەکانم لە چالاکییە بەردەوامەکانی پێشمەرگە لە تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان چەند پێشمەرگەیەك لەو سنوورە بریندار بوون، لەوانە هەڤاڵ ئاسۆ و هەڤاڵ فوئاد کە تێیدا هەڤاڵ ئاسۆ دەستی شکابوو، هەڤاڵ فوئاد پارچە بەر سەری کەوتبوو، توانیمان لە بنکە تەندروستییەکەی گۆپتەپە، چەند ڕۆژێك بەمەبەستی چارەسەرکردن بمێنینەوە، خۆشبەختانە هەردووکیان چارەسەر کران و بارودۆخیان ئاسایی بووەوە، لەبەر دۆخی ئاسایش، لەسەر داوای خۆیان هەر یەکەیان لە ماڵی دۆست و خزمی خۆیان بە جیا چارەسەرم بۆ دەکردن، تیمارکردن و دەرمان و دەرزیم بۆ دابینکردن، دوای مانگێك کەوتنە سەر پێی خۆیان، بە تایبەتی هەڤاڵ ئاسۆ، بەڵام هەڤاڵ فوئاد تا ئێستاش تووشی سەر ئێشە دەبێت، چونکە برینەکەی سەری قووڵ و کاریگەر بوو.

لە هێرشە بەربڵاوەکەی ئەنفالی یەکی سەرکردایەتی بەندە لە قۆڵی شارستێن، دۆڵەبی خورخورە و گۆمەزل چارەسەری بریندارى هێرشەکانی ڕژێمم دەکرد، هەروەها چارەسەری

ئەو نەخۆشانەی کە نەیاندەتوانی لەبەر رژێمی بەعس بچنە شار، بە درێـژایی ساڵەکانی ١٩٨٥–١٩٨٦–١٩٨٧ لە ئەم کارە بەردەوام بووم.

شێوازی بەدەستخستنی دەرمان، یان لە ڕێگای ڕێکخستنە نهێنیەکانی ناو شارەوە بووە، یان لە ڕێگای چالاکی هێزی پێشمەرگەوە بووە، بۆ نموونە گرتنی سەربازگەی گەورە، چونکە رژێم لە هەموو سەربازگە گەورەکان مەفرەزەی پزیشکی هەبوو، یان لە ڕێگەی کڕینی دەرمان لە ڕێگای قاچاخەوە.

شایەنی باسە هەڤاڵ ڕەسووڵ ناسراو بە ئاسۆ دەستێکی باڵای هەبوو لە یارمەتیدانمان وەکو برینپێچ و پێشمەرگە، هەروەها یارمەتی چەند پێشمەرگەیەکی تریش هەبوو، بەڵام ناوەکانیان لە بیرەوەریمدا نەماون.

لە شەڕی قەیوان ماوەت، گرتنی شارەدێی کارێزە، گرتنی شاخی پیرەمەگروون، شەڕەکانی سەرکردایەتی.....هتد وەك چالاکی پێشمەرگانە بەشداریم کردووە، لە ماوەکانی پێشمەرگایەتیمدا تووشی بریندار بوون و بەندکردن بوومەتەوە لەوانەش کیمیابارانی گوندی گۆپتەپە کە تیایدا زیان بە چاوم کەوتوو چاوێکم ئێستاش کاریگەری لەسەر ماوە، شایەنی باسە ڕۆژی کیمیابارانکردنی گۆپتەپە لەلایەن فڕۆکەکانی ڕژێمەوە زۆر کارەساتبار و خەمناك بوو، کە بووە هۆی شەهید بوون و بریندار بوونی دەیان کەس، بۆ ڕۆژی دواتر کۆمەڵێك هاووڵاتیی برینداری کیمیابارانکردنی گوندی گۆپتەپە لە ناو دار مۆردەکانی بناری خاڵخاڵان بە هۆی بەرکەوتنیان بە کیمیایی لە ژن و منداڵ و پیر و گەنج هەر هاواری ئازاری چاویان بوو. ئێمەش وەکو مەفرەزەی تەندروستی بە پێی توانا چارەسەرمان بۆیان کرد و هاوکاریان بووین، بەڕاستی کارەساتێکی جەرگبڕ بوو.

وەك هەر نەتەوەخواز و پێشمەرگەیەك تووشی زیندانی و ئەشکەنجەدان بووم، لە سەردەمی ڕژێمی بەعسدا و لە ساڵی ١٩٨٨ لە کاتی ئەنفالدا زیندانی کرام، بەهۆی پێشینەی بەدەستەوەدانی ڕەبایەی سەربازی ڕژێم بە هێزی پێشمەرگە و سزای لە سێدارەدانم هەبوو بە پێی ماددەی ٥٩/١ لە یاسای سزادانی عێراقی و مادەی ٤٤٩ی یاسای سزادانی عێراقی ١/١١٦، بە بڕی ١٣,٢٢,٣٣٣ سیانزە هەزار و بیست و دوو دینار و سێسەد و سی و سێ فلس سزای مادی درام، کە ئەم بڕە پارەیە هاوتا بوو بە بڕی ئەو چەك و تەقەمەنی و ئامێرەی ڕادەستی پێشمەرگەم کرد بوو، بەڵام خۆشبەختانە بەر لێبووردنی گشتی کەوتم و سزای سێدارەدانم لەسەر هەڵگیرا، بەڵام بڕە پارەی سزاکەم هەر لێوەرگیرا، چونکە لێبوردنەکە تەنها سزای لە سێدارەدانەکەی دەگرتەوە، سەرەڕای ئەوەی لەلایەن دادگاوە ئازاد کرام، بەڵام لەلایەن هەواڵگریی ڕژێمەوە ڕێگری لە ئازادکردنەکەم کرا، لە هەواڵگری سنووری پێنجوێن دەست بە سەر بووم، وەڵامی ئەوان بۆ پرسیارکردنم لە ئازادکردن ئەوە بوو: "تۆ سەربازەکانی ئێمەت سێ ساڵ زیندانی کرد تۆش دەبێت باجەکەی بدەیت" دواتر توانیم چانسی هەڵاتن بقۆزمەوە و سنوورم تێپەڕاند و لە نێوان سوپای عێراق و ئێراندا مینێك بە قاچمدا تەقی و قاچێکم لەدەستدا، دواتر لەلایەن سەربازانی هەواڵگرییەوە دووبارە دەستگیرکرامەوە و گەڕێندرامەوە عێراق و بە بەندکراوی ڕەوانەی نەخۆشخانە کرام، (مجلس تحقق)م لەسەر کرا و بە نووسراوی (متجه باتجاه العدو)، بۆ جاری دووەم لەلایەن هەواڵگرییەوە برام بۆ دادگا و سزای ساڵێك زیندانیم بە سەردا سەپێنرا، بەڵام دادگا سزاکەی (ایقاف تنفیذ) کرد و بە هۆی پێ دانی بڕە پارەیەکی زۆر ئازادکرام .

لە ساڵی (١٩٩١) دووبارە هەستاین بە ڕێکخستنەوەی (ڕێکخستنە نهێنیەکان) لە ناو شاری کەرکووك و شارۆچکەکانی داقوق و دووزخورماتوو، توانیمان پێشکەوتنێکی بەرچاو لە ڕێکخستنەکەدا بکەین، من سەرپەرشتی ڕێکخستنی (زەمبوور)م دەکرد و کار و چالاکی باشم ئەنجامدا لەوانە (دروستکردنی شانە و پۆل و کەرت) لە ناو شارەکانی ژێر دەستی

ڕژێـم، بـە کۆکردنـەوەی ئابوونــە و هاوکـاری ئەنــدامانی دەسـت ڕۆیشـتوی ڕێکخسـتنە نهێنییەکان هاوکاری کەسوکار و ماڵە شەهیدەکانمان دەکرد، هەروەها دروستکردنی شانەی چەکداری و دروستکردنی کەسایەتی کۆمەڵایەتی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کۆمەڵایەتی ناو کۆمەڵگا ئەمەش هۆکار بوو کە هاووڵاتی نەچێت بۆ لای دامودەزگاکانی ڕژێم بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیان.

لە ساڵی ١٩٩٢دا لەلایەن ڕژێمەوە بۆ هەولێر و شارەدێی (جدیدة) ڕاگوێزرام، بەڵام لە شاری کەرکووك و داقوق و دەوروبەریدا و تا ساڵی ١٩٩٣ درێژەم بە کارە نهێنییەکانی ڕێکخستندا، لە ١٩٩٣/١٢/٢٧ بەهۆی ناپاکێکەوە کە دزەی کردبووە ناو پۆلێکی ڕێکخستنەکەمانەوە کە پەیوەندی بە هەواڵگری تکریتەوە هەبوو، بووە هۆی دەستگیرکردنی بەرپرسی پۆلێك و چەند هەڤاڵێکمان لەلایەن ڕژێمی بەعس و لە ڕێگای هەواڵگرییەوە. بەندە لە ١٩٩٣/١٢/٢٨ کاتژمێر ١٠:٣٠ بەیانی لە ناو شارۆچکەی داقوق دەستگیرکرام لەلایەن هەواڵگرییەوە گوێزرامەوە بۆ هەواڵگریی تکرت و بۆ ماوەی چوار ڕۆژ ئازار و ئەشکەنجەی زۆر درام، سەرەتا پرسیاری ئەوەم لێکرا کە سەر بە (جەلال تاڵەبانی، یان مەسعود بەرزانی)یت، لە وەڵامدا بێلایەنی خۆم بۆ هەردووکیان دەربڕی، بۆیە ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر درام و دانم بە خۆمدا گرت، هەرچەند یەك گەواهیدەرم لەسەر بوو کە من بەرپرسی ڕێکخستنم، دوای چوار ڕۆژ لە هەواڵگری تکریت خۆم و سێ هەڤاڵی تر گوێزراینەوە بۆ هەواڵگری بەغداد لە گەڕەکی مەنسوور، لە ڕێگا گۆرانی (ئەی ئاغا ئاغا ئاغا بۆم تێکە لەو فۆریاغە، لەگەڵ دایکە بۆمان مەکەن ڕۆ ڕۆ شەهیدبوونمان شانازیە)یان بۆ لێدەداین وەکو گاڵتە جارییەك بە نیشتیمانپەروەریمان، دواتر گەشتینە هەواڵگریی بەغداد و یەکسەر دەستیان کرد بە ئازاردانم بە (کێبڵ و کارەبا و نینۆك دەرهێنان و ئاگر) ئەشکەنجەیان دام، سەرەڕای ئەوە هیچ نهێنییەکم نەدرکان، لە ماوەی ئەو سێ مانگەدا بە هەردوو هەواڵگری تکریت و بەغداد ئەشکەنجەیاندانم، بۆماوەی دوو مانگ لە ژووری

تاکەکەسی یەك مەتری زیندانیکرام، ڕۆژانە دوو جار ئازار و ئەشکەنجە دەدرام (بەیانیان و شەوان)، بەڵام دانم بە هیچ شتێکدا نەنا، دواتر براین بۆ (تابق الاسود)، کە پێکهاتبوون لە سێ کەس بۆ لێکۆڵینەوە و سووکایەتیپێکردنی خۆم و سەرکردە کوردەکان، دواتر براین بۆ دادگا، لەبەرئەوەی من یەك گەواهیدەرم لەسەر بوو، هەروەها نکۆڵیم لێ کرد و دانم بە هیچدا نەنا، بۆیە لە ١٩٩٤/٣/٢ ئازاد کرام، بەڵام هەوالگریی ئازادی نەکردم و برامەوە بۆ هەوالگریی و زیندانی کرام، لە هۆڵێکی هەوالگریی کە ٢٣ بەندکراوی دیکەی لێ بوو کە پێکهاتبوون لە (عەرەب و فارس)، پاسەوانی ئەو زیندانە کە تیایدا بووم شەڕی دەروونی لەگەڵدا دەکردم و پێی دەوتم تۆ بەرانەی دوای چوار مانگی تر ئازاد دەکرێیت، بەڵام ماوەی ٣٦ ڕۆژ لەو زیندانە مامەوە و دواتر لە ٣/٢٩/ ١٩٩٤ لە زیندان دەرکرام و لە ناو شاری بەغداد ئازاد کرام، بۆیە منیش گەڕامەوە بۆ داقوق.

دوای سێ ڕۆژ چووم بۆ شاری هەولێر و بە بڕیاری مەکتەبی ڕێکخستن لە هەولێر جێگیر بووم، دیسان ڕێکخستنەکانی ناو شارم ڕێکخستەوە بە گۆڕینی ناوی (زەمبور) بۆ (ڕۆخانە)، لەم ماوەیەدا هەوالگریی (تکریت) هەڵیان کوتابوویە سەر ماڵەوەمان لە داقوق بە مەبەستی دووبار دەستگیرکردنم، تا ساڵی ١٩٩٦ سەرپەرشتی ڕێکخستنە نهێنیەکانی سەر بە ڕێکخستنی ڕۆخانەم دەکرد و لە ڕێگای بەرید و هاتوچۆی هەڤاڵان کار و چالاکی خۆمان بە نهێنی ئەنجام دەدا.

دواتر لە ٣١ی ئابی ساڵی ١٩٩٦دا چوومە سەیرانبەن و سنووری ئێران دواتر گەڕاینەوە و لە شاری سلێمانی جێگیر بووم، لەسەر کاری ڕێکخستنەکان بەردەوام بووم کە سەر بە مەکتەبی ڕێکخستن بووم و لە ساڵی ٢٠٠٠ لە بەشی یاسای زانکۆی سلێمانی دەستم بە خوێندن کرد.

لە ساڵی ٢٠٠٣ لـە پرۆسـەی ئـازادیی عێراقـدا کـرام بـە بەرپرسـی شارۆچکەی داقـوق، ڕۆڵێکـی بـاڵام بـینی لـە پاککردنـەوەی شارۆچـکەی داقـوق لـە ڕژێمـی بـەعس و عەرەبـە هاوردەکان، دواتر خوێندنی زانکۆم تەواوکرد.

لە ساڵی ٢٠٠٥ بە هەڵبژاردن بووم بـە جێگری مەڵبەنـدی ١٦ حمـرین، دوای ساڵێك بـە هەڵبژاردن بووم بە بەرپرسی مەڵبەندی ٣١ی شارۆچکەی داقوق، بۆ مـاوەی چـوار سـاڵ، لـەو ماوەیەدا ڕۆڵێکی بەرچاوم هەبوو لە پێشخستنی ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)دا، لە هەڵبـژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقدا پلەی یەکەممان بەدەستهێنا، هـەر بـەو هۆیـەوە لەلایـەن هەڤاڵ مام جەلالەوە ستایش و ڕێزلێنانم پێبەخشرا.

دوا وتەم ئەوەیە: "تەمەنێك پڕ لە سەروەری و خزمەتکردنی ئەم نیشتیمانە هەمیشە جێگەی شانازی منە"[٥٦].

---

[٥٦]- لوقمان ئەحمەد عەباس سالم (د. ئاکۆ)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٣/٦.

## مەحموود ڕەزا محەممەد عەزیز (د. مەحموود)

لە ساڵی ١٩٦٣ لە گوندی حاجیتانی سەر بە شارەدێی سووورداش لە بنەماڵەیەکی هەژار لەدایك بووە، لە پاشان هاتوونەتە سلێمانی و خوێندنی سەرەتایی لە خوێندنگەی کانێسکان تەواو کردووە، قۆناغی ئامادەیی لە خوێندنگەی سلێمانی کوڕان تەواو کردووە، دواتر لە ساڵی ١٩٨٤ پەیمانگای تەندروستیی باڵای سلێمانی تەواو کردووە و بڕوانامەی دیبلۆمی بە دەستهێناوە، سەرەتای کاری سیاسی ناوبراو دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٠ کاتێك بۆ یەکەمجار لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی ك.ڕ.ك لە ڕێکخراوی دووی ڕێکخستنی دوکان لە پۆلی سووورداش دەکات، دواتر لە ساڵی ١٩٨٤ دەبێتە ئەندامی کۆمەڵە.

لە ساڵی ١٩٨٦ لە بنکەی تەندروستیی چوارتا دادەمەزرێت، وەك یاریدەدەری پزیشك و چاودێر لە خۆراکی چوارتا و دەوروبەری دادەمەزرێت، ئەمە دەبێتە سەرەتای کاری پزیشکی ناوبراو، لەو ماوەیەدا ئەندامی چالاکی کۆمەڵە و کادیرێکی هۆشیار بووە، دوای ماوەیەك کارکردن لەو بنکەیە بە بڕیاری شۆڕش و دوای ئاشکرابوونی پەیوەندی بە شۆڕشەوە پەیوەندی بە ڕیزەکانی پێشمەرگەوە دەکات و دەچێتە شاخ، دەبێتە پێشمەرگە و دکتۆری شۆڕش.

سەرەتا لای شەهید غەریب هەڵەدنی دەبێت، دواتر دەبێتە ڕێکخەری کەرت و کادیری تیپی پارێزگاری هەڤاڵ مام جەلال لە گوندی یاخسەمەر، لە هەموو کار و چالاکییەکاندا بەشدار دەبێت و ئەرکی گواستنەوەی کەلوپەلی شۆڕشی لە ئەستۆ بووە، پاشان بەشداری خولی مازندەرانی کردووە، جارێك لە گوندی هەڵەدن و جارێك لە ١٩٨٨/٣/٢١ لە شاناخسێ بە چەکی کیمیایی بریندار دەبێت، لەوەی دووەمیاندا برینەکەی سەخت دەبێت و ڕەوانەی ئێران دەکرێت، بۆ ماوەی دوو مانگ لە شاری ئەسفەهان لە ژێر چاودێری پزیشکیدا دەبێت، لەو ماوەیەدا چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕێکخراوی (کۆمکار)دا دەکات، کە دواتر کۆپییەکی بە

دیاری بۆ دەنێرنەوە (Informations Bulletin Kurdistan)، کە تا کۆتایی ژیانی کاریگەری ئەو چەکە لەسەر جەستە و چاو و کۆئەندامی هەناسەی ماوەتەوە، بە جۆرێك لە ساڵی ١٩٨٩ بەهۆی کاریگەری ئەو چەکەوە لە پێشمەرگایەتی دادەبڕێت،

لە ناوچەی دۆڵی جافایەتی و سووورداش لە کۆچ و ڕەوی ئەنفالکراوان و لە ئۆردوگای ئاوارەکانی ئێران خزمەتی زۆری پێشمەرگە و خەڵکی مەدەنی کردووە، لە ماوەی ژیانیدا کادیرێکی چالاك و هۆشیاری ڕێکخستن و ڕابەر سیاسی و پزیشکێکی سەرکەوتوو و شۆڕشگێڕێکی بە توانا بووە.

دواتر لە کاری پزیشکی و بنکەی تەندروستیی سەرچنار و نەخۆشخانەی ئیمێرجنسی و مەڵبەندی دووی تەندروستیی شەهید دکتۆر بەختیار لە خزمەت بەردەوام دەبێت، تا لە ٢٠١٦/٧/٢٠ بەهۆی کاریگەری گازی کیمیایی کاتی پێشمەرگایەتی و دوای چەندین ساڵ مانەوەی بە کاریگەری ئەو گازەوە کۆچی دوایی کردووە، خێزاندار بووە و باوکی چوار کوڕ و دوو کچ بووە[٥٧].

---

[٥٧]- ژیانی مەحموود ڕەزا محەممەد عەزیز (د. مەحموود)، لە تەها ئەوڕەحمان (د. تەها) وەرگیراوە، سلێمانی، ٢٠٢٢/٣/١٠، شاد مەحموود ڕەزا، ٢٠٢٢/٤/٨.

# موحسین لەتیف کەریم (د. موحسین)

من پێش ئەوەی ببم بە پێشمەرگە لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بووم، دوای ئەوەی کە لەگەڵ هاوڕێیەکم ئاشکرا دەبین، بەهۆی بوونی ناومانەوە، ئیدی پێش ئەوەی ڕژێم دەستگیرم بکات لە تیپی ٥٧ی سەگرمە لە ساڵی ١٩٨٥دا بووم بە پێشمەرگە، کە ئەو کات کەس بیری لەوە نەدەکردەوە شەهید ببێت، بیر لەوە دەکرایەوە و کێبڕکێ لەسەر ئەوە بوو کێ پێشتر لە نەبەردییەکی سەرکەوتوودا خۆی بە شەهید بوون دەدات، پێشم وایە ئەو ڕووحیەتە ماوە، چونکە بەڵگەش بۆ ئەوە لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ و دواتریش شەڕی داعش زۆرترین پێشمەرگە و فەرماندە گیانی خۆیان بەخشی، کە نیشانەی بوونی هەمان ئەو ڕۆحییەتەی جارانە، بۆیە لە لای من پێشمەرگایەتی شەرەفە، پێشمەرگە بوون گەورەترین و بەنرخترین بڕوانامەیە.

مێژووی ی.ن.ك خۆی لە چەند ڕەوتێکدا بینیەوە، بەڵام ئەمە نەبووە خاڵێکی نەرێنی بۆی، بەڵکو گرنگی زۆری بە سەرجەم لایەنەکانی دیکەی حیزبەکە داوە، بۆ نموونە ڕاگەیاندن بە هەموو بەشەکانییەوە، هەرچی تەندروستییە یەکێك بوو لە داهێنان و سەروەرییەکانی ی.ن.ك، هەر لە مەفرەزە سەرەتاییەکانەوە پزیشك و کادیری پزیشکی هەبوو، جگە لە بوونی نەخۆشخانەکانی شۆڕش لە سەرجەم قۆناغەکاندا، هەر لە مەفرەزە سەرەتاییەکانەوە کە دەرمان لە کۆڵە پشتدا بووە، تا گەیشتووەتە بنکەی تەندروستیی بچووك و مامناوەند و گەورە، کە ئەمەش لە کۆبونەوەیەکدا لە ساڵی ١٩٧٩ هەڤاڵ مام جەلال بە پزیشك و کارمەندانی تەندروستی ڕاگەیاند کە بیر لە کردنەوەی بنکەیەکی تەندروستی بکەنەوە، دواتر بە پشتیوانی جێبەجێ کرا و گەشەی پێ درا و بوو بە نەخۆشخانەی شۆڕش وەك: (بەرگەڵوو، قوڵەهەرمێ، بالیسان و بادینان).

لە دوای ئەنفال و ڕاپەڕینی گەلی کورد دووبارە بە پشتیوانی هەڤاڵ مام جەلال چەندین نەخۆشخانەی دیکە بە ناوی نەخۆشخانەکانی شۆڕشەوە کرانەوە، بە درێژایی ئەو قۆناغانەش چەندین پزیشك و کارمەندانی تەندروستیمان شەهید بوون، لەبەرئەوەی شۆڕشی نوێ لە هەناوی خۆیدا دەرچوانی زانکۆ و پەیمانگا و ئامادەیی و خوارتری لە خۆگرتبوو، پزیشك و کارمەندانی پزیشکی بە پێی کار و مەفرەزەی ناوچەی خۆیان بوون بە پێشمەرگە و دابەش بوون، سەرەتا بە کۆڵەپشتەوە شان بە شانی پێشمەرگە هەم پێشمەرگە و هەم پزیشك بوون، لە سەرجەم چالاکی و نەبەردیی و ڕووبەڕووبوونەوەکاندا بەشداری و ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە، زۆربەی کەرت و تیپەکان پزیشك و کادیری پزیشکی خۆی هەبوو، لە چالاکییەکاندا بەردەوام لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا بوون، پزیشکان کێوێکی پڕ لە ورە بوون بۆ پێشمەرگە، چونکە لە گۆڕەپانی شەڕدا لەگەڵ پێشمەرگە بوون و گیانی بریندارانیان لە شەهید بوون پاراستووە.

سەرچاوەی پەیداکردنی دەرمانی ئەو پزیشکانە بریتی بوو لە ڕێکخستنەکانی شار، لەگەڵ ئەوەی لە کاتی چالاکیدا ئەو شوێنانەی کە دەستی بەسەردا دەگیرا کەلوپەلە پزیشکییەکان دەدرا بە دکتۆری مەفرەزە و تیپەکان و نەخۆشخانەکان، هەندێك جاریش لە ڕێگەی قاچاخچییەوە پێداویستییەکان دەکڕدران، خەڵکی دڵسۆزی شار و گوندەکانیش بۆ ئەو کارە یارمەتیدەر بوون.

ئیدی لە دوای ڕزگارکردنی هەر ناوچەیەك لە دەستی ڕژێم یەکێك لە کارەکان بریتی بوو لە دامەزراندنی نەخۆشخانە، کە بۆ کردنەوەی بەشی نەشتەرگەری بچووك و گەورە گەشەی کرد و تیشك و تاقیگە و قاوشی نەشتەرگەری تێیاندا دامەزران، لەگەڵ بەشەکانی ددان و دەرمانخانە کە تا کۆتایی ئەنفال بەردەوام بوو، دواتریش لەگەڵ سەرجەم ڕەتڵی پارتیزانەکاندا دیسان پزیشکانی شۆڕش بەشدار بوون و ڕۆڵی بەرچاو و سەرەکییان لە سەرجەم ناوچەکانی کوردستاندا بینیوە.

نەبوونی پێداویستی و کەمی دەرمانی پێویست وای دەکرد کە نەتوانرێت وەکو پێویست چارەسەری برینداران بکرێت، چونکە هەندێك دەرمان هەبوون دەست نەدەکەوتن، یاخود شوێنی تایبەتمان بۆ هەڵگرتن و پاراستنی نەبوو.

هەر یادەوەرییەك لە ژیانی شۆڕشدا تایبەتمەندی خۆی هەیە، مانای خۆی هەیە و خۆشی و ناخۆشی تێدایە، ناخۆشترین یادەوەرییەکان ئەوەیە کە هەندێك جار نەمانتوانیوە گیانی پێشمەرگەیەکی بریندار ڕزگار بکەین، کە بەهۆی سەختی برینەکەیەوە شەهید بووە، ئەو کاتەی لەبەر دەستماندا بەهۆی ئەو ڕووبەڕووبوونەوە قورس و نابەرامبەرانە لەگەڵ هێزێکی پڕ چەکدا دووچاری شەڕ دەبووین و شەهید دەبوون، تا ئێستاش ئەو وێنانە دێننەوە بەر چاوم و هەرگیز لە بیرم ناچنەوە.

ئێمە وەك ئەرکێکی نیشتیمانیی و نەتەوەیی و مرۆڤایەتیی و پەروەردی حیزبی پێشمەرگە و هاووڵاتی و دیلمان بە یەك چاو تەماشا دەکرد، بێ جیاوازی چارەسەرمان دەکردن، زۆر جار ڕوویداوە کە خوێنی پێشمەرگە و هاووڵاتیمان بە برینداری دیلی دوژمن بەخشیوە، لە کاتێکدا ئەو دیلانە دەستیان بە خوێنی پێشمەرگە سوور بووە، هاوکات بۆ نەخۆش و پێشمەرگە و برینداری حیزبەکانی دیکەی کوردستانیش بە هەمان شێوە مامەڵەمان کردووە، چ هی باشوور بوو بێت، یاخود هی پارچەکانی دیکەی کوردستان بوو بێت[٥٨].

---

[٥٨]– ئیسماعیل خالید: ڕۆڵی تەندروستی لە شۆڕشی نوێدا، گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە، ژ٢، سلێمانی، ٢٠١٩، ل٤٠-٤٣.

## محەمەد سەعید سابیر عەلی (د. محەمەد فەرەنسی)

لە ١٩٦٠/٢/٢٩ لە شاری کەرکووك لە خێزانێکی هەژار لە دایك بووم، باوکم دوو ژنی هەبووە، من لە خێزانی دووەمی لە دایك بووم، سێ خوشك و سێ براین، قۆناغی سەرەتاییم لە خوێندنگەی سەرەتایی نالی لە گەڕەکی عاشوور تەواوکردووە، دواتر چوومە ناوەندی شۆڕش لە کەناری خاسە، پاشان چوومە ئامادەیی کوردستان، لێرەوە چوومە خوێندنی شەوان و دوای ئەوە بەشداری خولی پزیشکی بووم و بۆ ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بووم، لەو خولەدا د. هادی بەشدار بوو.

لەو ماوەیە پەیوەندیم لەگەڵ ڕێکخستن هەبوو، ڕۆژێك بۆ لێپرسینەوە بانگ کرام، لە ١٩٨١/١٠/١ چوومە دەرەوە، بۆ گوندی مۆردخواردە لە بناری خاڵخاڵان، هۆکاری ئەوەش ئەو ستەمە بوو کە بەعس لە کوردی دەکرد، ماتۆڕسکیلێك و تفەنگێکم بە پارەی خۆم کڕی و دەرمانم دەگواستەوە.

سنووری ئێمە سەرەتا هەر تیپی ٢١ بوو دواتر تیپی ٢٥ی لێ جیابووەوە، من هەم پێشمەرگە بووم هەم کادیری تەندروستی بووم، لەگەڵ د. هادی کارم دەکرد، چارەسەری بریندارمان دەکرد، لە ساڵی ١٩٨٣ شەڕی بێتواتە ڕوویدا ئێمە چووین، دوای سەرکەوتن گەڕاینەوە سنووری خۆمان، لە ١٩٨٤ دانوستان هاتە کایەوە، لە دوای دانوستان شەڕی چیمەن، حەسار، حاجیتان، سابوراوا، شیوەسوور ڕوویدا، لە هەموو ئەمانە بریندار هەبوو ئێمە چارەسەرمان دەکرد، کوڕێکی بریندار هەبوو خەڵکی گوندی تلیان بوو بە خراپی بریندار بووبوو، د. هادی چارەسەری کرد.

ئێمە فشاری خوێنی برینندارەکانمان دەگرت و ڕەچەتەی دەرمانمان بۆ دەنووسی و لە شار بۆی دەهات، چونکە دەرمان بۆ ئێمە ئەستەم بوو، لەوانە هەڤاڵ مەلا ئەورەحمانی ئاوبارە و هەڤاڵ فەوزی کوڕی دەرمانیان بۆ پەیدا دەکردین، لە ساڵی ١٩٨٦ شەڕی نەبیاوا ڕوویدا برینداری زۆرمان هەبوو چارەسەرمان دەکردن، هەتا هەڤاڵ مەلا ئاراس دەستی لە

ملم کرد و گوتی من ئاگاداری تۆم، زۆر دڵسۆزی برینداره‌کانی، من له‌فاق برینداریم دەشۆردەوە تا وشك دەبووەوە، مقەستەکانیشم دەکردە ناو ئاوەوە و دەم کوڵاند، لە کاتی سارێژکاریدا دەمدا بە د. هادی، من ماوەیەکی زۆر لەگەڵ د. هادی بووم واتە لە ساڵی ١٩٨٢ تا شەهید بوو، ئەو زۆر تێگەیشتوو و زیرەك و دیبلۆماسی بوو، هەروەها لە ڕووی سەربازیشەوە زۆر بەتوانا بوو، هەڤاڵ مەلا ئاراس چەند جارێك گوتی ئێمە لە بواری پزیشکی زیاتر لە سەربازی پێویستمان بە د. هادییە، هەڤاڵ مەلا ئاراسیش پیاوێکی زۆر بە توانا بوو، ئیدی ئێمە بەردەوام بووین، زۆر جار برینداری دەشتی هەولێرمان بۆ دەهات.

هەروەها کەیسی دیکەشمان هەبوو، پیاوێکی خەڵکی گوندی تورکمانباغ دارێکی گەورەی سەر خانووی هەڵگرتبوو قۆڕ بووبوو، ئێمە چارەسەرمان بۆ کرد و ناردمان بۆ کەرکووك. ڕۆژێك هاوڵاتییەك لەلایەن هێزەکانی حکومەتەوە بە تۆمەتی هەڵهاتووی سەربازی دەستگیر دەکرێت فیشەکێك دەنێن بە ناوی دەمییەوە، لە ڕوومەتییەوە دەرچووبوو، وایان زانی بوو مردووە، زۆر بە ڕێکەوت نەمردبوو، جێیان هێشتبوو، ئەو برینداریان هێنا بۆ لای ئێمە، چارەسەرمان بۆ کرد و ناردمان بۆ شار، جگە لەمانەش چارەسەری پێوەدانی مار و دووپشکمان کردووە، هەروەها لەسەر خاسە و جەلەمۆرد و مۆردخواردەی خواروو و مۆردخواردەی سەروو لەگەڵ د. هادی دەیان منداڵمان خەتەنە کردووە.

دواتر شەڕی ساتی کرا، هەڤاڵ شاهۆ لێپرسراوی کەرت بوو شەهید بوو، هەڤاڵ جەمالەسوور بریندار‌بوو، من و د. کامەران چارەسەرمان بۆ کرد، هەڤاڵ جەمال پارچەی تۆپ بەر دەستی کەوتبوو لە مەچەکەوە بۆ پەنجەکانی هیچی پێوە نەمابوو تەنها پێستەکەی پێوە مابوو، د. کامەران گوتی با دەستی لێ بکەینەوە و بیدوورینەوە، گوتم نەخێر، ئەمە گەنجە بۆ دەستی لە دەست بدات، گوتی چی بۆ بکەین؟ گوتم هەندێك دار و چیلکەی باریکم بۆ ببڕە تا دەستی بۆ بگرمەوە و دەستی بە مەچەکییەوە بدوورینەوە،

ئیدی کارێکمان کرد نەبڕدرێتەوە، دواتر هەرچی پێویست بوو بۆم نووسی تا لە شار بۆی بهێنن، هەروەها لە شەڕی قەفار ئافرەتێك منداڵێکی بریندارى بۆ هێنام، پارچە بەر گورچیلەی کەوتبوو گورچیلەی شەق کردبوو، گوتم هیچ چارەسەری نییە ڕەنگە هەر دە بۆ پازدە خولەکی دیکە بتوانێت بژی، هەرواش دەرچوو شەهید بوو.

لە ڕووداوێکی دیکەدا باوکی هەڤاڵ پشتیوانی تیپی ٢٥ بریندار بوو، چارەسەرمان کرد، زۆر جاریش د. هادی ناوی دەرمانەکانی دەنووسی و لە شارەوە بۆمان دەهات، جگە لەوانەش خۆمان بەشداری شەڕەکان دەبووین، لە ساڵی ١٩٨٦ مەفرەزەیەك بە لێپرسراوێتی هەڤاڵ هیوا چیمەنی چووینە ناو کەرکووکەوە، ١٦ بەنگلادیشی و ٢ کۆریمان بە دیل گرت، چونکە لەو کاتە سەرکردایەتی ی.ن.ك بڕیاریدا بوو هیچ کۆمپانیایەك بێ پرسی (ی.ن.ك) بۆی نییە لەو ناوچانەدا کار بکات کە دیاریکرابوو، ئەمە سەرکێشییەکی گەورە بوو، لە چالاکییەکی دیکەی ناو شاری کەرکووکدا سێ شەهیدمان دا، لە شەڕێکی دیکەدا لە ناو ئاغجەلەر دوو شەهیدماندا، بەداخەوە فریای هیچیان نەکەوتم، بەشێکی چالاکییەکە بریتی بوو لە هێنانی دەرمان لە نەخۆشخانەی ئاغجەلەرەوە.

لە شەڕی تۆمار و گورگان پێشمەرگەیەکمان بە ناوی هەڤاڵ ئیحسان بریندار بوو، چارەسەرمان بۆ کرد، موغەزیمان بۆ دانا و هەندێك دوورینەوەمان بۆ کرد، بەڵام چونکە هاوەن لە نێو قاچی تەقیبووەوە دۆخی زۆر خراپ بوو، شەهید بوو، هاوکات دوو شەهیدی دیکەمان بەخشی کە بریتی بوون لە هەڤاڵان (مام ئاراس و شکۆ)، لە شەڕێکی دیکەی سنووری ئاغجەلەردا بریندارێکی زۆرماندا، ئەوەی بۆمان کرا، چارەسەرمان بۆ دەرکرد، هەندێك لە بریندارەکان ڕەوانەی نەخۆشخانەی بەرگەڵوو کران لەوێشەوە بۆ ئێران.

لە ساڵی ١٩٨٨ هەڤاڵ نەوزاد چیمەنی تووشی مەلاریا بوو، ئەوەی توانیم چارەسەرم بۆ کرد، بەڵام دەرمانم لێ بڕا، ئیدی بە نائومێدی بەو ناوەدا دەگەڕام، چوومە سەر زبڵخانێك زۆر بەڕێکەوت چاوم کەوتە سەر دەرزییەکی تۆز، بەناوی پڕۆکاین پێنسلین ئەو دەرزییەم

بۆ گرتەوە و لێمدا دوای پازدە خولەك دۆخی بەرەو باشبوون برد، جگە لە مانەش هاولاتی نەخۆشمان چارەسەر دەکرد. هەروەها لە کێشەیەکی کۆمەلایتیدا هاولاتییەکی خەلکی گوندی مۆردخواردەی خواروو بە فیشەك برینددار بوو، هەندێك چارەسەرم کرد و گوتم بینێرن بۆ چەمچەمال، لەوێ پێیان گوتبوو ئێمەش بووینایە هەر ئەوەندەمان بۆ دەکرد بۆیە بیبەن بۆ سلێمانی.

دەرمانەکانمان بریتی بوون لە دەرزی لینکۆسین ڤیال ٦٠٠ میلیگرام و پرۆکاین پێنسلین ٥٠٠ میلیگرام و کەپسولەکانیش وەکو ئەمپیسیلین و پتراسایکلین و ئەمۆکسیلین، رۆژێك پێشمەرگەیەکمان برینددار بوو، هەروەها لە هەندێك لە گوندەکان پزیشکی حکومەت هەبوو بۆ نمونە لە گوندی مۆردخواردە و گردخەبەر پزیشك هەبوو، زۆرجار بۆ برینداری پێشمەرگە داوامان لێدەکردن، بەلام رازی نەدەبوون، بۆ ئەو پێشمەرگەیە چووم بە دوای ئەو دوو پزیشکەدا کەچی رازی نەبوون.

خۆم لە شەڕی حاجیتان و سابوراوا و لە شەڕی تۆمار و گورگان برینداربووم، لە شەڕێکی دیکەدا لە مۆردخواردەی خوارووەوە چووین بۆ سەر زێیەکە هەڤاڵ کارزان شۆفێرمان بوو، لەوێ پێش شیوەسوور دوو فڕۆکەی جەنگی و حەماڵێك گەیشتنە سەرمان کە یازدە کەس بووین، زۆر بە خراپی لێی داین، تا ئێستاش سێ پارچە لە سەرمدایە و پێنج پارچە لەسەر ئەژنۆی ڕاستم هەیە لە تۆپی کلاوەی ئەژنۆمدایە و لکاوە بە دەماری عەسابمەوە، هیچ چارەسەرێکی نییە، تەنانەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێیان ڕاگەیاندم لەبەر مەترسی بۆ سەر ژیانت ناتوانین دەری بکەین، هەر لەو شەڕە هەموومان بریندار بووین، هۆکاری ئەمە بوونی شەڕێك بوو لە نزیکی کۆیە ئەو سێ فڕۆکەیە بۆ سەر ئەوان هەلسا بوو، هەلە نەبم ناوی دوو گوند هەبوو هاوشێوە بوون، ئێمەی بۆردومان کرد ئینجا چوو بۆ سەر ئەو گوندەی کۆیە، هەموو جارێك کە دەگەڕایەوە بۆ کەرکووك، دەهاتەوە لە ئێمەشی دەدا ئینجا دەڕۆیشت، لەو ئۆتۆمبێلەدا بریندارێکمان پێ بوو

پارچەیەك لە سكیدا بوو بەمەبەستی چارەسەر دەمان گواستەوە، برینەكەی سووك بوو، كە لێی داین دابەزین و ئەو برینداره‌مان لە ژێر پووش شاردەوە و بەرەو چەمێك هەڵهاتین، دوای چەند كاتژمێرێك گەڕاینەوە بۆ برینداره‌كە، ئێمەش هەموو بریندار بووین تا ئێوارە بەو دۆخە ماینەوە، تا گەیشتینە ژێر پردەكەی شیوەسوور، فڕۆكەكان نزم دەبوونەوە و لە هەردوو لای پردەكەوە لێی دەدایین، ئێمەش لە ژێر پردەكە بە ژێر سەقفی پردەكەدا خۆمان هەڵدەواسی بۆ ئەوەی پارچەمان بەرنەكەوێت، چونكە كە لە هەردوو لای پردەكەی دەدا هەمووی چەو بوو ئەو چەوانەشی دەكرد بە پارچەی ئاگر وەكو فیشەك بەرەو ڕوومان دەهات، بۆ ماوەی چوار بۆ پێنج كاتژمێر نەمان توانی لە ژێر ئەو پردە دەربچین، ترسی ئێمە زیاتر لە فڕۆكەكان ئەوە بوو لەو ماوەیەدا سوپا بگاتە سەرمان، چونكە هەم ڕێگەمان نەبوو، هەم بریندار بووین، هەم فیشەكمان كەم پێ بوو توانای بەرگریمان نەمابوو، دوو پێشمەرگەمان پێش چەمەكە گەیشتبوونە قەرغوونێك خۆیان لەوێ شاردبووەوە و نەبینرابوون، ئەم ڕووداوە مانگی چواری ساڵی ١٩٨٧ بوو.

لە ڕووداوێكی دیكەدا هەڤاڵ محەمەد عوسمان (حەمەسوور دووشیوانی) فیشەك دابووی لە سكی، لە گوندی كارێزە نەشتەرگەریمان بۆ كرد، د. هادی ڕۆڵی گرنگی گێڕا لە چارەسەركردنیدا، بۆ ماوەی سێ مانگ بە دیارییەوە بووم تا چاك بووەوە، هەموو بەیانییەك سارێژكاریم بۆ دەكرد، ئەو نەشتەرگەرییە بە ڤیدیۆ لەلایەن هەڤاڵ عەباسی ڤیدیۆوە تۆمار كراوە، تا دوای سێ مانگ برینەكەی وشك بوو، چاكبووەوە.

لە ڕووداوێكی دیكەدا هەڤاڵ سەربەست كە هەڵهاتووی سەربازی بوو، لە ڕێگای چوون بۆ سەرگەڵوو بە ماتۆڕسكیل كەوتبووە كەمینەوە تەقەیان لێكردبوو، قاچی سووتا بوو، هێنایان بۆ جەلەمۆرد سێ بۆ چوار مانگ بە دیارییەوە بووم تا چاك بووەوە.

ڕۆژێك حكومەت بە كیمیایی لە گوندی تۆمار و گورگانیدا، من لەو شەڕە نەبووم، بەڵام برینداریمان هەبوو بە چەكی خەردەل، د. هادی بە ئامێر لەگەڵ د. هەڵۆ (ئەدیب) لە

نەخۆشخانەی بەرگەڵوو قسەی کرد و لێی پرسی کیمیایی چۆن چارەسەر دەکرێت؟ د. هەڵۆ گوتی خۆتان بشۆن، قوماشی تەڕ بدەن بە دەموچاوتاندا، هادی خۆشی بەرکەوتبوو.

لە ماوەی پێشمەرگایەتیمدا چەند جارێك نەخۆش کەوتووم، هەروەها باوکم دوو ساڵ لەسەر من زیندانی بووە، لە ئەنفالدا واتە لە ساڵی ١٩٨٨ هەڤاڵ ئەحمەد کرێکار پێی ڕاگەیاندم کە حکومەت بە کەسێکدا هەواڵی ناردووە باوکی د. محەمەد فەرەنسی زیندانی کراوە بە مەرجی خۆڕادەستکردنی ئازاد دەکرێت، واتە لە ١٩٨٦ەوە زیندانی بوو ، بەڵام هەڤاڵ ئەحمەد کرێکار دوو ساڵ ئەوەی پێی گوتم، گوتی لەوە ترساوم خۆت ڕادەست بکەیت.

ئەو سەردەمە پزیشك و ئامێری ڕاکاڵ گرنگترین شت بوون بەلای حکومەتی عێراقییەوە، هەمیشە ئەو دووانەی بە هەند وەردەگرت، چونکە ئامێر خەڵکی هاندەدا ببێت بە پێشمەرگە، پزیشکیش بریندارى چاك دەکردەوە و دەیناردەوە بەرەکانی شەڕ، بیرمە ڕۆژێك هەڤاڵ ئەحمەد کرێکار داوای لێکردم لە ناوچەی خاڵخاڵانەوە بچم بۆ تەکیەی کاکەمەند لە چەمچەماڵیشەوە برایەکم ئەو پاتریەی بۆ هێنام منیش هەر بە پێ گەیاندمەوە بناری خاڵخاڵان، کە ئەمە لە سەروبەندی ئەنفالدا سەرکێشییەکی گەورە بوو، دواتر بەو ئامێرە لەگەڵ ملازم عومەر قسەمان کرد، گوتی وام زانی نەماون، گوتمان ڕێگەمان لێگیراوە، ئیدی بۆ چەندین مانگ لەو هەڵەتەماینەوە، تا دەم زێ پاك بووە و چووینە دەشتی هەولێر، لەوێ بۆ مەڵبەندی سێ لە مەلەکان، لەوێوە بۆ قاسمەڕەش و ئێران. لە گوندی بلەکێی بانە نەخۆشخانەیەکمان دانا، د. جەبار بەرپرسی بوو، هەڤاڵ قادری حاجی عەلی لێپرسراوی مەڵبەند بوو.

دواتر چووم بۆ لای هەڤاڵ نەوشیروان گوتم من بریندار بووم، دەچمە دەرەوە، گوتی لە ڕێگەی پەیوەندییەکانەوە بچۆ، ئیدی لە ١٩٩٠ لە ئێرانەوە چوومە تورکیا و لە ڕێگەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە درامە باڵیۆزخانەی کەنەدا و نێردرام بۆ کەنەدا، لەوێ بەشی

**زمانی ئینگلیزیم خوێند، دواتر دەستم بە کارکردن کرد، لە ئێستادا ڕەگەزنامەی ئەو وڵاتەم هەیە.**

**بەدرێژایی ژیانم دوو شەڕم بیرناچێ ئەویش شەڕی (حاجیتان و سابوراوا) و (تومار و گورگان) بوو، هەروەها هەرگیز شەهید د. هادیم بیرناچێتەوە[٥٩].**

---

[٥٩]– چاوپێکەوتن لەگەڵ د. محەمەد سەعید سابیر عەلی (د. محەمەد فەرەنسی)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٦/١٣.

## نەبەز خالید ئەمین (د. نەبەز)

لە ساڵی ١٩٦١ لە گەڕەکی مەڵکەندی شاری سلێمانی لە دایکبووم، خوێندنی سەرەتاییم لە خوێندنگەکانی ئیبن خەلەکان و سەرشەقام تەواوکردووە، ناوەندیم لە خوێندنگەی جمهوری تەواوکردووە، ئامادەییم لە خوێندنگەی هەڵکەوت تەواوکردووە، دواتر لە ساڵی ١٩٨٠ پەیمانگای تەندروستییم لە بەغداد تەواوکردووە، پیشەی باوکم پۆلیس بووە، چوار خوشك و دوو براین، بەو مووچە کەمەی کە باوکم هەیبوو، هەموومان زانکۆمان تەواوکردووە.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٠ چوومە دەرەوە و بووم بە پێشمەرگە لەگەڵ خالید مەلا ئەمین و ڕزگاری حاجی حەمەئەمین، ئەوان ڕێکخستن بوون لای هەڤاڵ مام جەلال لە مەکتەبی سیاسی وەرگیرابوون، من بە دوو هەفتە دوای ئەوان چوومە دەرەوە، سەرەتا چوومە لای هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا و هەڤاڵ سالار عەزیز، چونکە منیان دەناسی، هۆکاری ئەمەش بەهۆی هەڤاڵ نەوزادی پورزامەوە بوو کە لە ساڵی ١٩٦٩ لێپرسراوی لقی سلێمانی بووە و دواتر لەلایەن باڵی مەلایی پارتییەوە شەهید کراوە، ئیدی ماوەیەك لە توژەڵە مامەوە و لەسەر متمانەی هەڤاڵ نەوشیروان چووم بۆ لای ئەو دوو هاوڕێیەم و لە مەکتەبی سیاسی وەرگیرام.

ئەوکاتە تازە کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵە تەواو بووبوو، لە ناو سەرکردایەتیدا مقۆمقۆ بوو، ئێمە سەرقاڵی دروستکردنی خانووەکانی ناوزەنگ بووین بە خشتی قوڕ لە بەرامبەر مەکتەبی سیاسی و ماڵی هەڤاڵ مام جەلال دروست کرا، بارەگاکان نەکرابوونەوە لە زەڵێ بارەگایەکی مەکتەبی عەسکەریمان هەبوو، هەموومان لە دارستانەکانی توژەڵە بووین، ئەوکاتە دەنگۆکانی هەردوو چەمکی کوردستانچێتی و عێراقچێتی دەستی پێکردبوو، من لە بەرەی دووەمیان ئەژمارکرابووم، هۆکاری ئەو وشەیە بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئێمە پێمان وابوو چینی کرێکاری کورد و عەرەب هەردوو چەوساوەن و جیاوازییان نییە، پێویستە

پێکەوە خەبات بکەن، لەبەرئەوە ناویان نایەن عێراقچی، هەروەها ئەو ڕەوتە دژی شەڕی ناوخۆش بووین.

سەرەتای کاری پزیشکی من دەگەڕێتەوە بۆ چوونم بۆ نەخۆشخانەکەی قوڵەهەرمێ کە لە نێوان شێنێ و زەڵێ بوو، ئەوانەی لەوێ بوون بریتی بوون لە: د. هەژار عوسمان، د. فائق گوڵپی، د. شاخەوان، د. سەروار، هەڤاڵ بەیان و هەڤاڵ حەمەئاوات. ئەوکاتە کۆمەڵێك تەکنیککار و ئەندازیاری ئەڵمانی لە سەرکردایەتی بوون بە دیل گیرابوون، دواتر بە ڕێکەوتنێك بە ڕێگەی ئێراندا لە بەرامبەر پێداویستی چەك و پزیشکیدا ئازاد کران، ئەمە نەخۆشخانەکەی بووژاندەوە، لەوانە ئامێرێکی پێشکەوتووی تیشك، کە شاشەیەکی پێوە بوو ڕاستەوخۆ نەخۆش دەیتوانی ئەو شوێنەی ببینێت کە تیشکمان بۆ دەگرت، هەڤاڵ حەمەئاوات سەرپەرشتی دەکرد.

ئەو نەخۆشخانەیە بووبوو بە قیبلەگاهی خەڵکی ئەو سنوورە لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێدەکرد، بەشێکی خەڵکی تیشکگرتن بە چارەسەر تێگەیشتبوون، زۆرێك دەهاتن هیچیان نەبوو، کەچی داوایان دەکرد تیشکیان بۆ بگرین، هاوکات دەستکەوتنی فیلمی تیشك بۆ پێشمەرگە ئاسان نەبوو، لە بازاڕیش نەبوو، ناچار دەستمان پێوە دەگرت، کاتێك خەڵکانێك دەهاتن و دەمانزانی کێشەیان نییە، ئێمە تیشکە کۆنەکانمان لە لایەکی دیکەوە دانابوو، کاتێك نکۆڵی دەکرد، ئێمەش دەمان خستە بەر تیشکەکە کە هەڵمان دەسان، لە بری ئەوەی تیشکی بۆ بگرین، دانەیەك لە تیشکە کۆنەکانمان پێدەدا، پزیشکیش بە سیناریۆیەك تەماشای دەکرد و دەیگوت هیچت نییە، ئیدی ڕاستەوخۆ لە ڕووی دەروونییەوە کەسەکە باش دەبوو، ئێمەش دڵنیا بووین کە هۆکارەکەی تەنها ڕاڕاییە، ئەمەمان لەبەرئەوە دەکرد تا کەسەکە بە دڵی شکاوەوە نەڕوات.

ساڵی ١٩٨٢ بەفرێکی زۆر باری، ئێمە لوولەی زۆپاکەمان دوو مەتر زیاتر درێـژ کـردەوە، شوێنی نەخۆشخانەکەش چاڵ بـوو، هـەموو بەیانییـەك ناچـار زیـاد لـە مـەترێك بـەفرمان لەسەر رێگەی چوونە دەرەوە لادەدا.

لەوێ ماوەیەك پزیشکێکمان بۆ هات بە ناوی فوئاد تاڵەبانی لـە ئـەڵمانیاوە هـاتبووەوە، حکومەت ناردبووی بۆ کوشتنی چەندین بەرپرسی ی.ن.ك، بەڵام خۆی ئاشکرا کـرد و دانـی بەوەدا نا، ئیدی لێی خۆش بوون، دواتـر بـوو بـە سەرپەرشـتیاری نەخۆشـخانەکە، هـەروەها حەوت کچ لە بەغداد خوێندکاری بەشی جیاجیا بـوون لـە رێکخسـتنەکانی هـەڵۆی سـووردا بەشداربوون لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانی بەعسەوە ئاشکرا بوون، هاتنـە نـاو شـۆڕش و بـوون بـە پێشمەرگە، ئـەوان لـە ژن و کچـە یەکەمینـەکانی نـاو شـۆڕش بـوون، هـەڤاڵ نەوشـیروان مسـتەفا پێشـنیاری بـۆ کـردن لەگـەڵ ئەنـدامانی سـەرکردایەتی هاوسـەرگیری بکـەن، ئـەوان زۆریان پـێ نـاخۆش بـوو، گوتیـان ئێمـە لـە بەغـدادەوە بـۆ هاوسـەرگیری نـەهاتووین، ئیـدی ناردیانن بۆ لای ئێمە بۆ نەخۆشخانەکە.

مامەڵـەی د. فوئـاد لەگـەڵ کـادیرانی پزیشـکیدا خـراپ بـوو، هاوڕێیانـە مامەڵـەی نـەدەکرد، ڕای خـۆی بەسـەردا دەسـەپاندین، تەنانـەت مـن لەگەڵیـدا بـوو بـە کێشـەمان و کێشەکەمان گەورە بووەوە، تووشی پێکدادان بووم لەگەڵیدا و لەسەر ئەوە سزادرام.

لە چالاکییەکی مەفرەزەیەکی پێشمەرگەدا لە ناو شاردا، پێشمەرگەیەك بریـنـدار بـوو، هێنایـان بـۆ لای ئێمـە لـە خـوار ئانیشـکییەوە دەسـتیمان بڕییـەوە، هەرچـەندە مـن پێشـتر ئـەزموونی پزیشـکیم نـەبوو، بـەڵام بەشـداری ئـەو کارانـە دەبـووم، هاوکـات ئێمـە پێویسـتی تەواوی سڕکردنمان نەبوو مۆرفین بەکاردەهێنرا، لە ڕووداوێکی دیکەدا لەگەڵ دکتـۆر شـوان و ملازم عومەردا قاچی هەڤاڵ حەمەی فەرەجمان بڕییەوە، لە شەڕێکی دیکـەدا هـەڤاڵ مـام ڕۆستەم بریندار بوو، فیشەکێك بەر ئەژنۆی کەوتبوو، لە ناو ئەژنۆیـدا مـابووەوە، ئـازارێکی تاقەتپڕوکێنی هـەبوو، هـەوڵی تـەواومان دا بـۆ ئـەوەی نەبڕدرێتـەوە، کێشـەمان پێداویسـتی

تەواوی ئەو جۆرە کارانە بوو، هەموو هەوڵێکمانـدا و فیشـەکەکمان دەرهێنـا، هێنـدەی ئـازار هەبوو بەجۆرێك دڵی وەستا، تەواوی کارەکانی هەناسـەدانی دەسـتکردمان بـۆ کـرد، سـوودی نەبوو، ناچار دەمان کێشا بە زەویدا، وەك ئەوەی شەڕ لەگەڵ کەسێك بکەیت بە دوو بۆ سێ کەس بە بۆکس دەمان کێشا بە سنگیدا، تا لـە ناکـاو بـە شـێوەیەکی چـاوەڕواننەکراو دڵـی کەوتەوە لێدان، بیرمە د. فوئاد تاڵەبانی ڕۆڵێکی زۆری هەبوو لەو کارەدا.

دواتـر شـەڕ لەگـەڵ ئێـران ڕوویـدا، هێزێـك لەلایـەن سـەرکردایەتییەوە نێـردرا کـە زۆرینـەی ڕەهـای هێزەکـە خـەڵکی خۆشـناوەتی بـوون، بەفەرمانـدەیی هـەڤاڵ حەسـەن کوێستانی، گەواهی ئەوەی بۆ دەدەم کە فەرماندەیـەکی زۆر ئـازا بـوو، لـە هـەموو شـوێنێکی شەڕەکانـدا بەشدار بوو، لە هیچ نەگەڕایەوە و سڵی نەدەکردەوە، من وەك پزیشکی ئەو هێزە دیاریکرام، لە قەندیلەوە بۆ بەری خانە سـەرکەوتین، کـاری ئـەو هێـزەی ئێمـە ڕزگـارکردنی هەڤاڵ عەبدولڕەحمان قاسملۆ بوو، لە ئاڵوەتانەوە و دوای شەڕی قەبری حسێن لـە چـەمێك پەڕینەوە بۆ ئێران، سوپای ئێران بە تۆپی سەد و شەش کە لەسەر ئۆتۆمبێلی جێب جێگیر کرابوو دەستی کـرد بـە تۆپبارانکردنمـان و دۆخـی خـراپ کـردین، لـە چـەمێکدا کـە ئـاوێکی تەنکی پێدا دەڕۆیشت لە ترسی تۆپ هەموو لە پەنا گابەردەکاندا خۆمان حەشاردا، تۆپباران بەردەوام بوو، تەماشام کرد ئـەو ئـاوەی کـە بـە بەردەممانـدا دەڕۆیشت ڕەنگـی سـوور بـووە، زانـیم برینـداری سـەختمان هەیـە، پێشـمەرگەکان هاواریـان کـرد دکتـۆر فریامـان بکـەوە سەرکەوت بریندارە، لەلایەکی دیکەوە هاواریان کرد فریامان بکەوە کاکۆ بریندارە.

لێرەدا ئەو ڕاستیە دەڵێم لە شـەڕدا هـیچ هۆکارێـك بـۆ پاراسـتنی پزیشـك نامێنێتـەوە، ئەگەر بیەوێت کارەکەی خۆی بەدڵسۆزی بکات، چونکە پێویستە پزیشك بیر لـە خۆپاراسـتن و خۆحەشاردان نەکاتەوە و فریای ئەوانی دیکە بکەوێت، بەمەش مەترسـی دەکەوێتـە سەر ژیانی، هەڤاڵ سەرکەوت کە بریندار بوو نزیکـەی پـەنجا مـەترێك لـە سـەرووی منـەوە بـوو هەرچـۆنێك بـوو خـۆم پێگەیانـد و بینـیم لاقـی لـە خـوار ڕانییـەوە لـێ بوومتـەوە و بـەس

پێستەکەی پێوە ماوە، دیاربوو پارچە تۆپێك لە ڕانی سەرکەوت و دارێکی دابوو تەواوی دارەکەی بڕیبووەوە، ئیدی بە جامانەکەی خۆم و هی برینداەکە قاچیم پێچا، وەستانی خوێنی ئەو دەمارە سەرەکییانە ئەگەر لە نەخۆشخانەدا نەبێت کارێکی ئەستەمە، ئیدی هاوارم بۆ پێشمەرگەکان کرد جامانەم بۆ فڕێ بدەن تا زیاتر بیبەستم، بە سێ بۆ چوار جامانە هەتا هێزم تێدا بوو بەستم، کەچی هەر خوێنی نەدەوەستایەوە، چارم نەما ئەوە نەبێت لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا گۆرانی (یاحلاوة الدنیا)ی ئوم کەلسومی بۆ بڵێم، تا گیانێکی خۆڕاگرانەی پێ ببەخشم، دەستی بەتوندی گرتبووم دەیگوت دکتۆر گیان مەهێڵە بمرم، بەوە دڵنیابوومەوە کە شەهید دەبێت و هێدی هێدی دەستی شل بوو تا دەستی بەردام و شەهید بوو.

دوای ئەوەی شەهید سەرکەوتم بەجێهێشت، بەرەو لای کاکۆ چووم، تا بیرمە لێپرسراوی کەرتێك هاواری لە پێشمەرگەکان کرد وەرنە دەرەوە، ئیدی تۆپبارانەکە بەرەو کەمبوونەوە دەچوو، کاکۆ دۆخی خراپ بوو داوای کرد بە تەنها بچم بۆ لای، تێگەیشتم دۆخی خراپە و نایەوێت کەس بە لاوازی ببینێت، ئیدی هاواری چەند جامانەیەکم کرد و بەرەو لای چووم، لێمەوە دیارنەبوو، بەڕێگاوە قسەم لەگەڵ دەکرد دەم گوت لە کوێی؟ گوتی لەسەر ئاوەکەم، گوتم خۆت بخەرە ئاوەکەوە، گەیشتمە سەری سمتی بریندار بوو، بە چەند جامانەیەك بەستم، بیرمە ئەو جامانانەمان لێکردەوە کە ڕانی شەهید سەرکەوتم پێ بەستبوو، جگە لە دەرزی B12 هیچ دەرمانێکم پێ نەما، چونکە ڕەنگی سوور بوو، پێشمەرگە دڵیان پێ خۆش بوو، ئەو دەرزییەم بۆیان بەکاردەهێنا، وەك یارمەتیدانێك بۆ زیادکردنی خوێن دەیانبینی، من خۆشم هەر وام پێدەگوتن، ئەوانیش لە ڕووی دەروونییەوە ئاسوودە دەبوون، لە کاتێکدا بۆ ئەو دۆخانە هیچ کاریگەرییەکی نەبوو، لە شوێنێك گەمارۆدراین، پێویست بوو من ئەو برینانە بدوورمەوە، هەروەها گوێزمرەوەیان بە داری بەڕوو بۆ دروست بکەین و بە شان تا شوێنی مەبەست هەڵیان بگرین.

هاوكات له پشتى شاخێكى نزيك له ئێمه له گوندێكدا كۆمەڵێك فەرەنسى سەر بە پزيشكانى بێ سنوور بوون نيشتەجێبوون، كارى خۆبەخشييان دەكرد، هەندێك جار ئێمه بريندارمان بۆ دەناردن، ئيدى هەڤاڵ كاكۆ دۆخى باشتر بوو، لەلايەكى ديكەوە بريندارەكانى (ح.د.ك)يش دەهاتنە لاى ئێمه.

كه پێشمەرگەى بريندار دەهات هاوەڵەكەى زۆر تكا و فشارى لێدەكردم، كه فرياى بكەوم و نەمرێت، لە كاتێكدا دۆخى زۆرينەى ئەو بريندارانە ئاسايى بوو، هەروەها بريندارەكه بە بينينى خوێنى خۆشى دەترسا، چونكه ئەگەر مرۆڤ بوتڵێك خوێنى خۆى لەبەرچاوى لێ بڕوات وادەزانێت خوێنى تێدا نەماوە، لە كاتێكدا بوتڵێك خوێن بۆ مرۆڤێكى ئاسايى زۆر نييه، ئەو بريندارانەى فيشەك بەريان كەوتبوو، پێويست بوو دواى پاكردنەوە بيان دوورمەوە، ئەوەى لە ناوەوە تووشى خوێنبەربوون دەبوو، نەدەبوو بيدوورمەوە، بەڵام من بەهۆى ترسى بريندارەكه و فشارى هاوەڵەكەى دەم دووريييەوە، دواتر دەم نارد بۆ لاى پزيشكانى بێ سنوور، ئاگادارم دەكردن پێويستە لە ماوەى نيو بۆ يەك كاتژمێر بيگەيەنن بە پزيشكانى بێ سنوور، بەلاى ئەوانەوە من كارێكى هەڵەم بۆ بريندارەكان كردووە، تا پەياميان نارد كه ئەم كەسە كێيه با ئەم بريندارانە نەدوورێتەوە.

لێرەدا ئەوە دەڵێم بينينى خوێنى خۆت كه بريندار دەبووى، دۆخێكى خراپى سايكۆلۆژيت بۆ دروست دەكات، كه مرۆڤ بەدەستى خۆى نييه، پێشمەرگە هەبووە خوێنى خۆى بينيوە بووراوەتەوە، كەچى بە گژ دەبابەشدا دەچووەوە، ئەمە پەيوەندى بە ئازايەتى و ترسنۆكييەوە نييه، ئەوەى هەيە لە سەربازييدا ڕاهێنان و ڕانەهێنراوييە، ئەزموون و بێ ئەزموونييه، لە هەموو دونيادا سەرباز ڕاهێنانى پێ دەكرێت، كاتێك دەچێتە شەڕەوە ئازا دەبێت، ئەگەر كەسێكيش كتوپڕ بخرێتە شەڕەوە شۆك دەبێت.

نزيكەى ٤٥ ڕۆژ ڕێگاى دەربازبوونمان نەما، لە هەفتەى دووەمدا كۆڵەپشتەكەم كه بە پڕ دەرمانەوە هێنابووم هيچى تيا نەما، شوێنێكى زۆر سەخت بوو، هەرچەندە ئەركەكەمان

جێبەجێ کرد کە بریتی بوو لە ڕزگارکردنی هەڤاڵ قاسملۆ و ناردنی بۆ سەرکردایەتی، ئیدی ئێمە کەوتینە ناو هێزی ئاوارەی (ح.د.ک)ەوە کە سەید ڕەسووڵی بابی گەورە فەرماندەیی دەکرد، لەو ماوەیەوە تەنها ڕێگای نێوان بانە و سەردەشت مابوو لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە دەستی بەسەردا بگیرێت، کە تەواوی هێزە بەرهەڵستکارەکانی ئێرانی تێدابوو.

لێرەدا بۆچوونی خۆم لەسەر ئەو پرسە دەردەبڕم، کە بۆچی ئێمە چووین بۆ بەشداری لەو شەڕە لە دژی ئێران؟ ئەویش ئەوەیە: ئێمە لەگەڵ ئێراندا پەیوەندیمان باش بوو، کە شەڕەکە ڕوویدا ئێرانیش بەلایەوە سەیر بوو، سیاسەتی (ی.ن.ک) لەو کاتەدا بریتی بوو لە شەڕ و دانوستان بە دوای یەکدا، چونکە هەمیشە ئەوەی وەکو تاکتیکێک بۆ خۆبەهێزکردنەوە و هەڵسانەوە و خۆپڕچەککردنەوە بەکاردەهێنا، هەروەها لەلایەکی دیکەوە ی.ن.ک فریای ح.د.ک کەوت و هەڤاڵ عەبدولڕەحمان قاسملۆی ڕزگارکرد، هاوکات حکومەتی عێراقی لە شەڕێکی سەختدا بوو لەگەڵ ئێراندا، (ی.ن.ک) ویستی دانوستان ئەنجام بدات، سەدام گوتی ئێمە لەگەڵ (ی.ن.ک) وەك هێزێکی نیشتیمانی گفتوگۆ دەکەین، نەك وەك هێزێکی نا عێراقی، ئێستا (ی.ن.ک)، لەگەڵ ئێران پەیوەندییەکانتان لە باشیدایە، بۆیە ئێمە دانوستان ئەنجام نادەین، ناچار (ی.ن.ک) ئەو شەڕەی لە دژی ئێران وەکو تاکتیکێك بۆ خۆبەهێزکردنەوە و ڕزگارکردنی قاسملۆ ئەنجامدا، تا حکومەتی عێراق ناچار بە هەندێك دانپێدانان بکات، هەر ئەوەش بوو لەساڵی ١٩٨٣ و ١٩٨٤ دانوستان کرا.

لەو شەڕەدا هێزی (ح.د.ک) بە ناو حکومەتی بەعسدا هات بۆ ئەڵوەتان بۆ یارمەتیدانی ئێمە، واتە هێزی عێراقی ئاگاداری ئەو شەڕە بوو، هێزی ئێمە نزیکەی هەزار پێشمەرگە دەبووین، بە ڕۆژ شەڕمان دەکرد و بە شەو دەکشاینەوە، بەرامبەر هێزێکی عەقیدەیی و شەڕێکی بەرەیی کە تێیدا حکومەتی ئێران بە بەردەوامی هەلیکۆپتەری کۆبرا و تۆپی (١٧٠ ملم و ١٧٥ ملم)ی بەکاردەهێنا، بە جۆرێك ١٧ شەهیدمان دا، ئەوەی جێی داخە سەید

ڕەسووڵی بابی گەورە ناپاکی لێ دەکردین، چونکە ئێمە بە پیاوی حکومەتی بەعسمان دەزانی، هەر واش بوو، لەبەرئەوەی چەند جارێك بە هێزەکانی ئێمەی دەگوت بچن لەسەر فلاّن شاخ و گرد و بەرزی خاڵی پاسەوانی دابنێن کە هێزەکەی ئێمە دەچوو، دەمان بینی هێزی ئێرانی لەو شوێنەیە، واتە دەیویست بە کوشتنمان بدات، تا بۆمان ڕوون بووەوە، ئیدی پێوەی پابەند نەبووین، تەنانەت هەڤاڵ قاسملۆش لەم پرسە ئاگادارکرایەوە و گوتی، دەزانم وایە، بەڵام ئێستا ئێمە لە شەڕداین و ئەویش فەرماندەیەکە، بۆیە ئێستا ناتوانم دەستی بۆ بەرم، لەلایەکی دیکەوە سەید ڕەسووڵی بابی گەورە لەلایەن (پ.د.ك)یشەوە خوازراو نەبوو، چونکە بانگەشەی ئەوە دەکرا کە گۆڕی مەلا مستەفای هەڵداوەتەوە.

هەرچی لایەنی پزیشکی (ح.د.ك)ە، لەو شەڕە کچێك کادیری تەندروستیی هێزی ئەوان بوو، خوودی سەید ڕەسووڵی بابی گەورە خراپ مامەڵەی لەگەڵ دەکرد و لە کاتی گفتوگۆدا زۆر جار دەیشکاند، کە بەلای ئێمەوە جێگەی نیگەرانی بوو.

بەمشێوەیە شەڕ بەردەوام بوو تا هێزی هەوشاری (ح.د.ك) گەیشتنە لامان، کە خەڵکی ناوچەی هەوشار بوون، وەك پێشمەرگەکانی ناوچەی گەرمیانی ئێمە وابوون، ناوچەی دەشت و تەخت وا لە مرۆڤ دەکات ئازاتر بێت، مامە ڕیشە و هاوڕێکانی لە شوێنی تەختدا داستانیان تۆمار کردووە، نەبوونی شوێنی خۆشاردنەوە مرۆڤ ناچار بە ئازایەتی دەکات، لێرەدا ئەوە دەڵێم کە ئێمە لە شوێنی خۆمانەوە بەڕێ کەوتین مانگی ١٠ بوو کەشوهەوا ئاسایی بوو بەجۆرێك هەبوو ڕانکوچۆغەی لەبەربوو، کەچی لە لە کۆتاییدا گەیشتین بە بەفر، هاوکات بێ خواردن و خۆراك و دەرمان ماینەوە، دواتر بەشێکی هێزەکەمان لە ئەڵوەتان فەمسەڵەیان پێ گەیشتبوو، بەڵام ئێمە گەمارۆدراوبووین، هیچمان پێ نەگەیشت، دێهاتەکانیش نەمابوون، بە نانەسکی دەژیاین، لەو گوندەی کە شەهید سەرکەوتمان ناشت، لە تەنەکەیەکدا هەندێك پەنیرمان دۆزیەوە، هەر یەکە و هێندەی مشتێکمان بەرکەوت، نزیکەی ١٨ ڕۆژی سەرەتای هەر ئەوەمان پێ بوو پێی ژیاین، لە کۆتاییدا لە ئاوێکی قووڵی

چەمێکی سەرشێت پەڕینەوە، پێش پەڕینەوە جلەکانمان داکەند و بەسەرمانەوە بەستمان و قۆڵمان کرد بە قۆڵی یەکدا و بە ڕووتی لە ئاوەکەماندا بۆ ئەوەی کە پەڕینـەوە جلی وشك لەبەر بکەین، چونکە کەشوهەوا هێندە سارد بوو، بە کەڵکی ئەوە نەدەهات جلی تـەڕ لەبـەر بکرێت، کە چووینە ئەوبـەر هێنـدە سـەرمامان بـوو باوەشمـان لەیـەك دەدا بـۆ ئـەوەی ڕەق نەبینـەوە تـا جلـەکان لەبـەر دەکـەین، ئەمـەش بیرۆکـەی کەسـە بـە ئەزموونـەکانمان بـوو، هەرچەندە پێشمەرگەیەکمان لە سەرەتادا بە مەبەستی گەیاندنی حەبل بۆ ئەوبەری ئاوەکە تا ئێمە پێی بپەڕینەوە، کەچی بەداخەوە ئاو بردی و هەر نەدۆزرایەوە.

کە گەڕاینـەوە سەرکردایەتی، هەڤاڵ حەسەن کوێستانی، بۆ هەڤاڵ نەوشیروان مستەفای گێڕایەوە کە من چیم کردووە داوای کرد مەدالیای ئازایـەتیم پـێ بـدات، هـەڤاڵ نەوشـیروان گوتی دەزانم کە وایە، بەڵام ناکرێت، هەرچەندە تـا ئـەو کاتـە دوو جار هەڕەشـەی کوشـتنی لەسـەر بابـەتی عێراقچـێتی لـە مـن کردبـوو، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا خـەڵکی ئـازای خۆشدەویست، واتە ئەو کەسەی خۆش دەویست کە لـە بەرامبـەری دەوەسـتایەوە و ستایشـی نـەدەکرد، ئیـدی هـەڤاڵ نەوشـیروان گـوتی دەیـان پێشـمەرگەی دیکـەی ئـازا هەیـە، ناکرێـت جیاوازییان بکەین، بەڵام تفەنگێکی بـە دیـاری پـێ بەخشـیم، مـن خۆشـم داوام کردبـوو کـە بچمە ئەو هێزەوە تا نەڵێن ئێوە عێراقچین و شەڕ ناکەن، بۆیـە تاکـە پێشـمەرگەی خـەڵکی سلێمانی لەو هێزە من بووم، دوای ئەوە من لە سەرکردایەتی نەمامەوە.

لەسەر ئەو کێشەیەی نێوانمان د. فوئاد چوو بوو سکاڵای لەسەر تۆمار کردبووم، لەسەر ئەوە بڕیاری گواسـتنەوەم لەلایـەن دکتـۆر خـدرەوە بـۆ بلـەکێ دەرچـوو، لـە کاتێکـدا بلـەکێ چـۆڵکرابوو، واتـە ئەمـە وەك بـە کوشـتدان وابـوو، بۆیـە چـوومە لای هـەڤاڵ نەوشـیروان و بابەتەکەم بۆ باس کرد و بڕیاری گواستنەوەکەم پیشـاندا، ئـەویش نامەکەی پارچە پارچە کرد، من هەرگیز ئەو هەڵوێستەیم لە بیر ناچێتەوە، کە ژیانی ڕزگار کـردم، گـوتی لێـرە لای من بمێنەرەوە، هەم لە ژێر چاودێری مندایت و ئەوەنـدە قسـە ناکـەیت، هـەم ڕۆژی دوو بـۆ

سێ جار بە بەردەم دکتۆر خدردا هاتوچۆ بکە، ئەگەر گوتی بۆ ناڕۆیت؟ بڵێ نەوشیروان ناهێڵێت! دواتر لەبەر ئەو هەڵوێستە کێشەی فکریم لەگەڵ هەڤاڵ نەوشیروان کاڵ بووەوە و کەمتر باسم دەکرد، لەلایەکی دیکەوە وەکو میوان وابووم و پاسەوانیشم نەدەگرت.

ئەمە بۆ مێژوو دەڵێم ڕۆژێك هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا داوای لێکردم بچم لە ناو شاری سلێمانی دەرمان پەیدا بکەم و هێرش بکەمە سەر دەرمانخانەیەك، منیش گوتم بەسەرچاو، ئەو گوتی دەبێت بچی لە فلان دەرمانخانە ئەو کارە بکەیت، شوێنی ئەو دەرمانخانەیەش کۆتایی شەقامی ئۆرزدی (گۆران) بوو، گوتم ئەوە جەنجاڵترین شوێنی شارە چۆن دەبێت! گوتی دەبێت، دواتر زانیم ئەو دەرمانخانەیە هی کچێکە، کە خوشکی بەرپرسێکی پێشمەرگەیە و لەگەڵ هەڤاڵ نەوشیروان ناکۆکی هەیە، مەبەستێتی ئەگەر چالاکییەکە سەرکەوتوو بوو لە ڕووی دەروونییەوە ئەو کەسە ئازار بدات، ئەگەر شکستیشی هێنا ئەوە من لە ناو دەچم کە ناکۆکم لەگەڵی، ئەمە یەکێك بوو لە تاکتیکەکانی ئەو، واتە (پیلانگێڕی)، کە زۆر کاری لەسەر دەکرد، بابەتی تۆڵەی زۆر لا گرنگ بوو، هەر ئەوەش بوو وای لە دەوروبەرەکەی دەکرد لێی بترسن، لەسەر ئەو ناکۆکییە فیکرییانە هاوڕێیەکم پێی گوتم هەڤاڵ نەوشیروان گوتویەتی ئێمە لەسەر فیکر خەڵکمان لە هەموو حیزبەکان کوشتووە، ئامادەین لە هی خۆشمان بکوژین، واتە نەدەبوو ناکۆکی بیت لەگەڵی، تاکە هێزێك کە ڕای گرتبوو کەسایەتی هەڤاڵ مام جەلال بوو.

دواتر لەگەڵ هەڤالان: مامۆستا پشکۆ نەجمەدین، عومەر شێرەمەڕی، حەمەئاوات و دکتۆر قادردا چووین بۆ سنووری شارباژێر، لەوێ بارەگامان دانا و دەستمان بە جەولە کرد، لەو ماوەیە پێشمەرگەیەکمان بریندار بووبوو، هێندەی دەنکە نۆکێك مۆخی سەری لە نێوچەوانییەوە هاتبووە دەرەوە، بۆ ئێمە کارێکی قورس بوو، پرسمان بە چەندین پزیشك کرد گوتیان ئەوە مۆخە نابێت دەستی لێ بدرێت، بۆ چەندین مانگ بۆمان پێچا و تیمارمان دەکرد، لەوە دەچوو تۆڕی دەوری مۆخی بێت، چونکە هیچ کێشەیەکی نەبوو.

هەر لە پەڕەزان لە نەخۆشخانەی شەهید د. نەبەز بووین ڕۆژێك لە كاتی گواستنەوەی مەفرەزەیەك بە تراكتۆر پێشمەرگەیەك لە دەرگای عارەبانەی تراكتۆرەكەوە بە پشتا كەوتبووە خوارەوە زۆر بە ڕێكەوت بەردێكی تیژ لە كونی كۆمی چەقی بوو، بەجۆرێك ماسولكەی كۆمی دڕاندبوو، هێنایان لەوێ د. هەژار و د. قادر زۆر خزمەتیان كرد، بۆ ماوەیەكی شەش مانگ تیمارم كرد، دەبوو خواردنی تایبەت بخوات تا بۆ پیسایی كێشەی بۆ دروست نەكات، بە هیچ شێوەیەك نەدەبوو تووشی قەبزی ببێت، ڕۆژی دوو جار پاكمان دەكردەوە، بەدرێژایی ئەو ماوەیە لەسەر دەم پاڵ كەوتبوو، لە ڕاستیدا گرانترین دۆخی نەخۆش لایەنە دەروونییەكەیەتی، پێش هەموو شت پێویستە پزیشك خۆی بكات بە هاوڕێی بریندار یا نەخۆشەكە.

لەلایەكی دیكەوە پێشمەرگەیەكی دیكەمان هەبوو بە ناوی جیهانی وەستا حەسەن كە (سەرعی) هەبوو، ڕێنمایی هاوڕێكانیم كرد لە كاتی ئەو دۆخە پێویستە بیخەنە سەر لا تا كێشەی هەناسەدانی نەمێنێت، دواتر كە خەبەری دەبێتەوە نابێت لە چواردەوری بن تا تەریق نەبێتەوە و خراپتر نەبێت، بەداخەوە دواتر خۆی كوشت.

لە ساڵی ١٩٨٣ بارەگامان بردە كانی پانكە، دوای ماوەیەك چوومە نەخۆشخانەی سەرگەڵوو، دواتر سەركردایەتی چووە كانی توو، من چوومە مەرگە، ساتی دروستبوونی ئاڵای شۆڕش بوو، بەڵام من بەشداریان نەبووم، لە مەرگە خەڵكی گوندێك گوێیان قورس بوو واتە كەمبیست بوون، بەڕێكەوت ڕۆژێك گوێی كەسێكیانم پاككردەوە نزیكەی هێندەی یەك هەڵمات قیر لە گوێیدا بوو، گوتم ئەوە بۆ وایت؟ گوتی لە كارگەی قیردا كار دەكەم، گوتم چەند كەسن ئیدی بۆی باس كردم و دواتر هەموو هاتنە نەخۆشخانەكە هەموویانم چارەسەر كرد و كێشەی كەم بیستنیان نەما.

ڕۆژێك ڕژێم تۆپبارانی كردین، بە جۆرێك هەندێك جار داروپەردووی نەخۆشخانەكە دەكەوت بەسەرماندا، بریندارمان زۆر بوو، چارەسەرمان دەكردن، یەك لەوان

پێشمەرگەیەك بـوو، پارچـە لـە سـکی دابـوو، بـە تونـدوتۆڵی و تۆکمەییەکـەی دیـار بـوو گەرمیانی بوو، جگە لەوەش بە ستایلی جلوبەرگ جیامان دەکردەوە، ئێمە نـەمان دەهێشت بریندار هاوەڵی لەگەڵ بێت، بەڵام هـاوەڵی ئـەو پێشمەرگەیە نەچووە دەرەوە، کە کوڕێکی باڵابەرزی تۆکمە بوو هەموو گیانی خوێن بوو، مزەلییەکی پێ بوو دەگریا، دیار بـوو کەسـی نزیکـی بـوو، کـە کراسـی بریندارەکـەمان داگەنـد و خوێنەکـەیمان پـاككردەوە و تیشـووی برینەکـەیمان بـە چـەقۆ بـڕی لـەو چرکە سـاتەدا هاوەڵەکـەی بـە بینـینی ئـەوە ڕاسـتەوخۆ بوورایەوە، مەبەستم ئەوەیە بابەتی خوێن پەیوەندی بە ئازایەتییەوە نییـە، ئیـدی دووانـی دیکەمان چووین سەرقاڵی ئەو بووین.

لەو ساتانەدا هەواڵێکی بەپەلەمان بۆ هات کە هەڤاڵ حەمـەی فـەرەج بەرکەوتووە، بـە برینـداری بردبوویـان لـە گونـدێك دایـان نـابوو، مـن، د. شـوان، د. خالیـد و مـلازم عومـەر چووینە سەری، برینەکەی سەخت بوو، بڕیـاردرا قاچی ببڕینـەوە، بـە مشاری ئاسنبڕ و بـە مۆرفین لە بری سڕکەر بە سەرپەرشتی د. شوان بڕیمانەوە، د. شوان گوتی بیگەیەننە ئێران لەوێش جارێکی دیکە لەسەرووی ئـەو شـوێنەی ئێمـە بـڕی بوومانـەوە بۆیـان بـڕی بـووەوە، دواتر نێردرا بۆ ئەوروپا و قاچی دەستکردیان بۆ دانا.

دواتر کێشەی سیاسییم بۆ دروست بوو، گومانی ئەوەشم لەسەر دروسـت بـوو لـە ئـاڵای شۆڕش نـزیك بووم، هاوکات مەفرەزەیەکی کەسوکار و هاوڕێی خـۆم لەگـەڵ بـوون، بڕیارمـدا بچینە زێوێ نەخۆشخانەیەك بۆ تیپی ٤٧ی پیرەمەگرون بکەینەوە، هـەڤاڵ نـەبەز سـەرتیپ بوو، هەڤاڵ ئاراسی حەمەلاو ئـامر کـەرت بـوو، هـەڤاڵ نـەبـەز هـەواڵی نەخۆشـخانەکەی پـێ خۆش بوو، دواتر داوامان لە مەڵبەندی دوو کرد دەرمانمان بۆ بنێرن، ڕۆژێك هـەڤاڵ نـەبـەز بـانگی کـردم گـوتی ئـەوە تـۆ چـیت کـردووە وا لـە مەڵبەنـدەوە داوامـان دەکـەن! دیـاربوو ڕاپۆرتێکی هەڵەم لەسەر درابوو، ئاگاشم لە هیچ نەبوو تۆمەتی ساردکردنەوەی پێشمەرگەم لە خەبات درابووە پاڵ، هەڤاڵ نەبەز گوتی من دەچم تـۆ بمێنـەرەوە، چاوەڕێی وەڵامـی مـن

ببە، ئەو ڕۆیشت، دواتر بڕیارمدا منیش بچم، بە هاوڕێکانم گوت ئێوە مەیەن، ئەگەر من هەرچیم بەسەرهات تەنها خۆتان ڕادەستی ڕژێم مەکەن، بچن لە گوندێك دابنیشن، د. ئاسۆ کە لە مەفرەزەکەی ئێمە بوو ئەوەی زۆر پێ ناخۆش بوو، لە ڕێگای چوون بۆ گوندێك بۆ ئەوەی دەست جاشەکان نەکەوێت خۆی دەکوژێت، منیش گەیشتمە مەڵبەند بۆ لای هەڤاڵ قادری حاجی عەلی، فەرمانی مەکتەبی سیاسی بوو کە چەك بکرێم، بەڵام زیندانی نەکرێم و لەژێر چاودێریدا بم، سێ تۆمەتم لەسەر بوو یەکەم: گوایە نامەم ناردووە بۆ هەڤاڵ سالار عەزیز بۆ تێکدانی شۆڕش، دووەم: دڵی پێشمەرگەم سارد کردووەتەوە، سێیەم: گوایە مارکسیم، کە هەر سێ تۆمەتەکە ڕاست نەبوو، منیش چەکم پێ بوو، داوایان لێکردم چەکەکەم ڕادەست بکەم، منیش ئامادەییم دەرنەبڕی، چونکە چەککردن دۆخێکی ناخۆشە، هەرچەندە دەیان توانی چەکم بکەن، بەڵام داوایان کرد، منیش قایل نەبووم، گوتم ئەگەر هەر زۆرم لێ دەکەن، دەچم چەکەکەم بە دیاری دەدەم بە د. سەردار، چونکە چەکی خۆمە هی شۆڕش نییە، ئیدی قایل بوون، بەڵام ئاگادار کرام کە نابێت لە سنووری مەڵبەندی دوو بچمە دەرەوە.

لە دەستبەسەریمدا بیستم ئاڵای شۆڕش ڕاگەیەنراوە، خێرا خۆم گەیاندە ئەوان بۆ یاخسەمەر کە نزیکەی حەفتا کەس دەبوون، لەوێوە چووینە شارباژێڕ، بەڵام ی.ن.ك بڕیاری گرتنی ئەو کۆمەڵەیەی دەرکردبوو، نزیکەی دوو سەد چەکداری ی.ن.ك، هەمیشە دوور و نزیك بە دووی ئەو هێزەوە بوون، ئێمەش بە هەڤاڵ مەلا بەختیارمان گوت ئەو هێزە بە دووی ئێمەوە، وا دیارە نیازیان خراپە با بچین گفتوگۆیان لەگەڵ بکەین، توورە بوو گوتی ئێوە نازانن ئەوە بۆیە نێردراون، چونکە حکومەت زانیویەتی ئێمە جیابووینەتەوە نەوەك هێرش بکەنە سەرمان، گوتمان هێرشی چی؟ ئێمە حەفتا کەسین، لە کوێ حکومەت دەتوانێت هێرش بکاتە سەرمان، ئێمە جاری وا هەبووە بە دە بۆ پازدە پێشمەرگەوە هێزێکی گەورەی حکومەتمان کشاندووەتەوە، من وەك خۆم مەبەستم ئەوە

بوو بچمە ئەوبەر و بگەینە قەراغ، ئیدی گەیشتینە گوندی تەکیە و گوتم من دەڕۆم، پێیان ناخۆش بوو، گوتم خۆ من ئالای شۆڕش نیم، بەس لەگەڵتان هاتووم و دەچم لە خاوێ دادەنیشم، کە من چووم، بۆ نزیکی ئێوارە هەموو ئەو هێزەی ئالای شۆڕش دەستگیرکرابوون.

ئیدی من کەمێك ترسم نەما بە خۆمم گوت بەهۆی ئەو دۆخەوە ناپەرژێنە سەر من، ئەو کات هەڤاڵ ئازادی سەگرمە سەرتیپ بوو، من لە گوندی دەرەویان بووم، بەلامدا تێپەڕی، بینیمی، دابەزی و سووکایەتی و جنێوی زۆری پێدام، چواردەورەکەشی پێیان سەیر بوو، چونکە من و هەڤاڵ ئازاد خەڵکی یەك گەڕەکی شاری سلێمانی بووین، گوتم کاکە بۆ جنێو دەدەی، من هاتووم لە خاوێ لە ژێر دەستی خۆتان دابنیشم، هەر بەردەوام بوو، منیش گوتم من بە تەنهام و چەکم پێ نییە، تۆیش بە یەك کەرتی چەکدارەوە هاتووی، ئێستا من چی لە تۆ بکەم، کە وام گوت، فیشەکی بۆ ڕاکێشام منیش پشتم دایە دارێك کە لە پشتمەوە بوو، گوتم ئێستا دەم کوژێت، ئیدی چەند کەسێك لەوانەی دەوروبەری خۆیان دایە بەر لولەی تفەنگەکەی و نەیان هێشت.

ئیدی نەچووم بۆ خاوێ، چونکە فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکردم، گوتی لەم سنوورە ببیت دەتکوژم، هەرچەندە ڕوونم کردەوە کە من ئالای شۆڕش نیم، بەڵام سوودی نەبوو، ئیدی چووم لە گوندی سوێراوا خۆم شاردەوە، چەند جارێکیش چوومەوە ناو شاری سلێمانی.

بە درێژایی ژیانی پێشمەرگایەتیم دوو جار بریندار بووم، لە ڕاپەڕینیش جارێك بریندار بووم، جارێکیش زۆر بە خراپی نەخۆش کەوتووم، بەمشێوازە ژیانم گوزەراند تا گەیشتین بە ڕاپەڕین، لە ناو شاری سلێمانی خۆم شاردەوە، فشاری زۆرم لەسەر بوو، واتە لەلایەك لە حکومەت یاساغ بووم، هەم ی.ن.ك چەندین جار بە ڕادیۆ ئاگادارییان بڵاودەکردەوە کە پەیوەندییان پێوە بکەمەوە، ئیدی لە ناو شاری سلێمانی دەستمان بە

ڕێکخستنەکانی چەپ کرد، کۆمیتەکانی ڕاپەڕینمان دروست کرد، لە ڕاپەڕینیشدا لە فولکەی دەستارەکە لە ٧ی مانگ تەقەی یەکەم من کردم، شێخ وەهاب و شێخ عومەری برای و من سێ تفەنگمان پێ بوو، شەست بۆ حەفتا گەنجمان کۆکردەوە، ئێمەش بە سێ چەکدار پێشیان کەوتین، چوار دەوری شاریش تیپەکان هەموو ئامادەکرابوون، حکومەت دەستی لە ئێمە کردەوە، چونکە سێ چەکدار بووین شکاین، دواتر پێشمەرگە گەیشتە ئیبراهیم پاشا و مەجید بەگ و شار تەقییەوە، ئێمە ڕێکخستنی بچوکی چەپی مارکسی بووین لە ناو شاردا، وەکو: (ڕەوتی کۆمۆنیست، یەکێتی خەبات و سەرنجی کرێکار).

خێزانم کە ناوی (شەونم)ە لە ڕاپەڕیندا یەکێك بوو لە ژنە چەکدارەکان، شەوی ٧ لەسەر ٨ی ڕاپەڕین من لە ماڵی خوشکێکی خێزانم بووم، دکتۆر خالیدی برای خێزانم هات بۆ ئەوێ، نزیکەی دە بۆ دوازدە چەکداری لەگەڵ بوو، گوتی هەڵسە خۆت ببەستە دەچین بازگەکەی تانجەڕۆ دەگرین، ئیدی بەپێ ڕۆیشتین و هەر لە دوورەوە تەقەمان بەسەردا کردن و گوتمان خۆتان ڕادەست بکەن، ئیدی خۆیان ڕادەست کرد، لە ئەنجامدا چەکێکی زۆرمان هێنا.

لە دوای کۆڕەو و لە ١٩٩١دا چووم بۆ دەرەوەی وڵات، تا ساڵی ٢٠١٠ لە سوید بووم، لە نەوەدەکان لە سوید لە دژی حکومەتی بەعس خۆپیشاندانمان ئەنجام دەدا، لەوێ لەلایەن هەواڵگری حکومەتی عێراقەوە بریندار کرام، لە ٢٠١٠ەوە لە سلێمانی دەژیم، لە ساڵی ١٩٨٩ هاوسەرگیریم پێکهێناوە، دوو منداڵم هەیە بە ناوەکانی (ئارا و ئارتین)، لە کۆتاییدا ئەوە دەڵێم: من شانازیی بە تەواوی ژیانی سیاسی و پێشمەرگایەتیمەوە دەکەم و لە یەك چرکەشی پەشیمان نیم، چونکە حکومەتێکی دیکتاتۆر هەبوو یا دەبوو لەگەڵی بیت، یان دەبوو لە دژی بیت، ئێمە لەوانە بووین لە دژی وەستاین، هەموو هێزێکی سیاسیش لە ناوخۆی خۆیدا ناکۆکی هەیە، ناخۆشترین ساتەکانی ژیانیشم شەهیدبوون و ناشتنی

**هاوڕێکانی خۆمان بوو، تاڵترینیان ساتی ژیانم شەهیدبوونی دکتۆر خالید بوو لە ڕاپەڕینـدا لەبەر دەرگی سەرا، ئیدی لەو ساتەوە کەم شت دڵی خۆش کردووم و لە بیرم ناچێتەوە[٦٠].**

---

[٦٠]- **چاوپێکەوتن لەگەڵ د. نەبەز خالید ئەمین، سلێمانی، ٢٠٢٢/٦/٨.**

## نوری سەعید محەمەد ئەمین (د. نوری قەرەناوی)

لە ساڵی ١٩٥٥ لە گوندی قەرەناوی سەر بە شارەدێی شوانی پارێزگای کەرکووک لەدایک بووە، لە ساڵی (١٩٦٤)ەوە چووتە شاری کەرکووک لە گەڕەکی ڕەحیم ئاوا نیشتەجێ بووە، خێزاندار بووە، باوکی دە منداڵ بووە سێ کوڕ و حەوت کچ، قوناغەکانی خوێندنی تا پۆلی چواری سەرەتایی لە شارۆچکەی تەقتەقی نزیک گوندەکەی تەواو کردووە، لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییەوە چووتە کەرکووک و تا پۆلی شەشەمی ئامادەیی بەشی زانستی لە کەرکووک تەواو کردووە.

لە ساڵی ١٩٦٧–١٩٨٣ لە دەرمانخانە کاری کردووە، خولی برینپێچی بینیوە، لە ١٩٨١–١٩٨٣ وەك یەدەگ لە سەربازیدا و لە شەڕی عێراق–ئێران کاری کردووە، بەهۆی بینین و چارەسەرکردنی نەخۆشی جۆراوجۆر و برینداری سووك و سەختەوە بووە بە پزیشکێکی نەترس و هۆکار بووە بۆ سەرکەوتنی لەو بوارەدا، دواتر لە کارە پزیشکییەکانیدا بە بوێرییەوە، لە سنووری تیپی ٢١ی کەرکووك و ٢٥ی خاڵخاڵان و ناوچەی شێخ بزێنی سەروو بە تایبەت گوندەکانی: (قەسرۆك، گردخەبەر و دیارەختیار ...هتد)، برینداری سەخت و برینی قووڵی چارەسەر کردووە، چەندین نەخۆشی لە مردن و دۆخی گانگرین (بڕینەوە) گەڕاندۆتەوە، بە بڕوانامەی ناوەندییەوە وەك فەرمانبەر دامەزراوە، دواتر لە بواری پزیشکیدا خوێندوویەتی و بووە بە (مضمد).

لە کاری سیاسیدا و لە هاوینی ساڵی ١٩٨٢دا پەیوەندیی بە ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)ەوە کردووە و لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٤دا پەیوەندی بە شۆڕشەوە کردووە و لە شۆڕشدا کاری مامۆستایی کردووە، بەڵام دواتر کە زانراوە برینپێچە بە دکتۆر نوری ناوبانگی دەرکردووە، چونکە لەگەڵیدا کاری برینپێچی و چارەسەری نەخۆش و برینداریی ئەنجام داوە، سنووری

کاری چالاکی بریتی بووە لە هەردوو تیپی ٢١ی کەرکووك و ٢٥ی خاڵخالان، وەکو پزیشکی تیپی ٢٥ی خاڵخالان مامەڵەی لەگەڵدا کراوە.

لە دانوستانی (ی.ن.ك) و حکومەتی عێراقیدا و بەهۆی هێمن بوونەوەی دۆخەکە و لە ساڵی ١٩٨٥دا بە هاوکاری یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان و بە پاڵپشتی ئەنجومەنی گوندی دیارەختیاری شێخ بزێنی سەروو یەکەم خوێندنگە بۆ دکتۆر نوری کراوەتەوە، ئیدی لە دواتردا وەکو فشارێك لەسەر ناوچە ئازادکراوەکان حکومەتی عێراقی بڕیاریداوە خوێندنگەکە دابخات، شایەنی باسە هەنگاوی کردنەوەی خوێندنگە و دانانی دکتۆر نوری بە مامۆستا لەو سنوورە لەسەر پێشنیاری هەڤاڵ (هەڵۆ سەعید)ی برای بووە، بەهۆی زۆری ژمارەی ئەندامانی خێزانی و بچووکی منداڵەکانی لە گوندی قەسرۆکدا لە ناو خوێندنگەکەدا نۆرینگەی کردووەتەوە، برینندار و نەخۆشی پێشمەرگە و ڕێکخستن و هاووڵاتی چارەسەر کردووە، لەلایەن هەردوو تیپی ٢١ و ٢٥ و دکتۆر دڵشاد و شەهید دکتۆر هادی و ڕێکخستنەکان و کەسوکاری لە کەرکووك دەرمان و پێداویستی پزیشکی لە هەردوو شاری کەرکووك و هەولێر بۆ دابین کراوە، لە کاری پزیشکیدا جێگەی ڕەزامەندی پێشمەرگە و ڕێکخستن و جەماوەری ناوچەکە بووە، بە درێژایی ساڵانی ١٩٨٤ – ئەیلوولی ١٩٨٨ و دوای ئەنفال لە بوارەکەی خۆیدا خزمەتی شۆڕشی کردووە، لە سەروبەندی ڕووداوەکانی ئەنفالدا لەبەر بوونی مەترسی لەسەر ژیانی بۆ ماوەی دوو مانگ خۆی حەشار داوە، لەو کاتەدا دەرمان و چارەسەری زۆری پێ بووە، هەندێکی بۆ دەستەی پێشمەرگەکانی هەڤاڵ (هەڵۆ سەعید)ی برای دابینکردووە[٦١].

---

[٦١]- ژیانی نوری سەعید محەمەد (د. نوری قەرەناوی)، لە هەڵۆ سەعید محەمەد (هەڵۆ قەرەناوی) وەرگیراوە، هەولێر، ٢٠٢٢/٣/١٥.

## هاوڕێ ئەحمەد محەممەد سلێمان (د. هاوڕێ)

لە یەکەم ڕۆژی ساڵی نوێی ١٩٦١دا لە گەڕەکی جوولەکانی شاری سلێمانی لە ناو خێزانێکی مامناوەندیدا هاتنە ژیانم بۆ ڕەخسا، بۆ ماوەیەکی کەم لە حوجرەکەی ڕەوانشاد (مەلا عەبدوڵڵا)ی وتاربێژی مزگەوتی (عەبدوڵڵا لوتفی) خوێندم، ئەگەرچی لەبەرئەوەی زوو ئایەتەکانم لەبەر دەکرد و زۆر باش دەمخوێندنەوە و زۆر بەکەمی هەڵەم دەکرد، ڕۆژێك بە نەخۆشی چوومە حوجرەکە، بە بینینم گوتی: کوڕم تۆ نەخۆشی و بڕۆ لە ماڵەوە سێ ڕۆژ لە جێگە بکەوە تا زوو چاکبیتەوە، پاش سێ ڕۆژەکە چوومەوە یەکسەر دەری کردم، منیش ئیتر نەگەڕامەوە.

لە سەرەتای خوێندنی ساڵی ١٩٦٩ لە پۆلی یەکی خوێندنگەی سەرەتایی چوارباخ دەستم بە خوێندن کرد، کە مامۆستایانی نەمر ڕەوانشادان: (شێخ نوری شێخ ڕەزا و محەممەد نوری تۆفیق) بەڕێوەبەر و جێگری بەڕێوەبەربوون، لە مانگی ١٩٧٥/٦ واتە هێشتا تارمایی و بێئومێدی بڕیاری تاکڕەوانەی ئاشبەتاڵی شۆڕشی کورد نەڕەوی بووەوە و کاریگەری زۆر مابوو بەشداری تاقیکردنەوەی پۆلی شەشی سەرەتاییم کرد و لە خوێندنی ساڵی نوێدا چوومە پۆلی یەك لە خوێندنگەی ناوەندی سیروان لە گەڕەکی چوارباخ، کە قۆناغێکی نوێ بوو لە ژیانم بەخوێندنەوە و ململانێم لەگەڵ ئتیحادییەکان واتە (اتحاد طلبة العراق) سەر بە حیزبی (بعث)ی دەسەڵاتدار کەوتمە سەرەتای ململانێکان.

ئەو کاریگەریانەی لەسەرم هەبوون بریتی بوون لە: مامۆستا عەبدولڕەحمان کە کوردی پێ دەگوتینەوە بە نووسینەوەی دارشتن و ڕاپۆرت نووسین هانی دەداین، تا دواتر داوای ئامادەکردنی ڕاپۆرتی کرد هەرکەس بە بژاردەی خۆی، ڕاپۆرتەکەم لەسەر دیوانی هۆنراوەکانی (شێخ لەتیف شێخ محمودی نەمر) لەژێر ناوی (گوڵی وەریو)بوو.

له ئەنجامی گفتوگۆکانم لەگەڵ هاوڕێکانم، هەبوون دەیان گوت تۆ شیوعیت، منیش ئەوسا پێمخۆش نەبوو دەموت وانییە، تا ئەنجام خۆم بە خۆمم دەگوت با دەست بکەم بە خوێندنەوەیان و ئیدی لەو کاتەوە تا ئێستاش یەکێکم لە باوەڕدارانی تیۆری مارکسیزم-لینینیزم ئەگەرچی ئەمڕۆ زۆربەی ڕۆشنبیران بە باو نەماو و شکست خواردووی دادەنێن، بەڵام ئەم دۆخەی ئێستای کوردستان و عێراق ڕاستیی ئەو تیۆر و فەلسەفەیە دەسەلمێنێت.

له پۆلی دووەمی ناوەندیدا پاش ئەوەی لە هۆڵی شانۆیی ئامادەیی سلێمانیی کوڕان ژمارەیەکمان بۆ بەشداریکردن لە شانۆگەرییەکدا بۆ فێستڤاڵی ساڵانە تاقیکراینەوە (مەریوان ئیسماعیل، هاوڕێ ئەحمەد محەمەد و ئیکرام سەعید عەبدولڕەحمان) ڕۆڵی سەرەکیمان پێ درا لە شانۆگەریی (تەنگوچەڵەمەی شانۆ) کە چیرۆکێکی چیرۆکنووس ڕەوانشاد (کاکە مەم بۆتانی) بوو مامۆستا (حیکمەت هیندی) کردی بە شانۆ، دواتریش لە چەند کارێکی شانۆیی بەشداریم کرد لەگەڵ مامۆستایان (حیکمەت هندی، ئەحمەد سالار، بورهان جەمال، شەفیق محەمەد، ڕەوانشاد ئاسۆ عومەر سوارە، جەمال، شەماڵ غەمبار و حەمەعەلی خان)، هەر بۆ ئەو مەبەستە بوومە ئەندام لە مەڵبەندی ڕۆشنبیری لە گەڕەکی بەرانان کە بە ناوەندێکی سەر بە حیزبی بەعس ناسرابوو، بەڵام لە ڕاستیدا کەسمان بەعسی نەبووین و تا ساڵی ١٩٨٢ کە بەعسی بوون، بووە مەرج وازمانهێنا.

له قۆناغی ناوەندیدا سەرباری کۆشش و هەوڵ و جێبەجێکردنی ئەرکی ڕۆژانەی خوێندنگە، زۆرباش و چالاك بووم، بەڵام لە تاقیکردنەوە نووسینییەکاندا باش نەبووم بگرە هەندێ جار لە ئاستی خراپدا بووم، بەتایبەت لە وانەی (بیرکاری و جەبر و ئەندازە)دا، تا لە قۆناغی ئامادەیی کە لە ئامادەیی سلێمانی کوڕان لە پۆلی چوارەمی گشتی ساڵێك مامەوە و لە پۆلی شەشەمی زانستی خۆم هێشتەوە بەتایبەت بەهۆی هاوڕێی خوێندن و ڕێکخستنی کۆمەڵە ڕەوانشاد (هاوڕێ شەریف عەلی)، پاش ئەوەی لە

خۆپیشاندانەکانی بەهاری ساڵی ١٩٨٢ پێکەوە بووین لە حەوشەی ئامادەیی لەلایەن تاوانبار و درندە (ملازم موحسین) دەستگیر کرا و بە کێبڵ و شەق ئەشکەنجە دەدرا، تا دوو خوێندکاری تر خۆیان گەیاندە نزیك حەوشەکە بەردیان دەگرتە ملازم محسین و ئەویش کەوتە دوایان، لە هەمان کاتدا من لە پۆلێکدا یەکێك بووم لە دەست بە سەرەکان، دواتر من گەیاندمەوە ماڵەوەیان نەماندەتوانی بیبەینە نەخۆشخانە ڕەوانشادی (مام شەریف)ی باوکی شوفێری گلابە بوو، لە بەڕێوەبەرێتی ڕێگاوبان بە ناوی (مجهود الحربي) گەیاندییە نەخۆشخانەیەکی شاری بەسرە ١٥ ڕۆژ لەژێر چاودێری پزیشکیدا بوو، نەیتوانی بەشداری تاقیکردنەوە وزارییەکانی پۆلی شەش ببێت. شایەنی باسە ناوبراو لە ١٩٨٦/١١/٣٠ لە شەڕگەی (قەیوان - ماوەت) لە گاپیلۆن لەگەڵ سێ پێشمەرگەی تر گەشمردە بوون.

لەو ساڵانەی قۆناغی ناوەندیدا لەلایەن ئەندامانی حیزب و ڕێکخراوە ڕامیارییەکان، جگە لە ك.ڕ.ك، پەیوەندییان پێوە دەکردم، بەمەبەستی بە ئەندام بوون و پەسەندم نەدەکردن.

ساڵی ١٩٧٩ لە ڕێگەی هاوڕێیەکم بە ناوی ساماڵ حەمەڕەشید دانیشتووی سەرچنار پەیوەندیم کرد بە شانەیەکی کەرتی ڕێکخستنی دوکان کە هاوڕێم کاوە رحیم بەرپرسی بوو، لە هەندێ کۆبوونەوە کادیرێکی کەرتەکە کە پێشمەرگە بوو دەهاتە سەرچنار سەرپەرشتی دەکرد، ئەو بەڕێزانە بۆمیان گێڕایەوە کە بەنیاز بوون پەیوەندیم پێوە بکەن، بەڵام هەموو لەو بارەڕەدا بوون کە من پەیوەندیم هەیە و بەرپرسی شانەم.

لە مانگی ١٩٨٠/٤دا لە ڕێگەی گەشمردە هاوڕێ شەریف علی پەیوەندیم کرد بە ریزەکانی ڕێکخراوی سلێمانی لە شانەی سەرەکی گەشمردە ڕێبوار ئەحمەد مستەفا بوومە ئەندام بەناوی نهێنی (هاوڕێ هیوا)، دوای چەند قۆناغێك من بوومە بەرپرسی شانەکە ناوەکەم گۆڕدرا بۆ (هاوڕێ ڕێژین) لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد ساڵح (هاوڕێ سەنگەر) ئەندام

پۆل بووین و مامۆستا شێخ عزیـز بەرپرسی پۆلی (شـەهید خاڵە شیهاب) بـوو، دەبـوو لـە مانگێکـدا چـوار کۆبوونـەوە بـە هـەر شـانەیەك بکرێـت، سـێ دانیشـتن بـۆ ڕۆشـنبیری و چوارەمیان ئامادەکردنی ڕاپۆرتی مانگانە، من مانگانە بۆ هەر شانەیەك هەشت کۆبوونەوەم ئـەنجام دەدا و بـەزۆری لـە مـاڵی ڕەوانشـاد مـام ڕەزا کـەریم (هـاوڕێ ڕیـاز) بـە (مـام ڕەزای زیندان)یش ناوی دەبرا، هەروەها ماڵی خۆمان بە گردی زەرگەتەوە بوو بەرامبـەر بـە مـاڵی ئەمنەکان بووین.

لـە خۆپیشـاندانەکانی بـەهاری سـاڵی ١٩٨٢دا لـە ئامـادەیی سـلێمانی کـوڕان و هـەردوو گەڕەکی سابوونکەران و مامۆستایان ئەنجاممان ئەدا، لە هەر لایەك پاش بەکارهێنانی چەك و هەموو جۆرەکانی ئامێرەکانی ئەشکەنجەدان و ترس و تۆقان و داپڵۆسین سەرکوت ئـەکرا، هـەر زوو خۆمـان دەگەیانـدە شـوێنێکی دیکـە و دەسـتمان پـێ دەکـردەوە، نـابێ ڕۆڵـی ئـەو ماڵانەمان لە بیر بچێ کە کەسێکیان لە نزیك ماڵیان دادەنا بـۆ شـاردنەوەمان و دەیانکردینـە خانووەکانیان و دەیان شاردینەوە، بەداخەوە ئەو کاتانە خۆم نەم دەویست ماڵەکان بـزانم و بیانناسـم، تـا ئەگـەر دەسـتگیرکرام لـە کـاتی ئەشـکەنجەدان و وڕێنـەی بـەدەم خـەوەوە نەیدرکێنم.

لە خوێندنی ساڵی ١٩٨٢-١٩٨٣ قۆناغی ئامادەییم تەواو کرد لـە پـەیمانگای تەندروسـتیی باڵای پیشەیی سلێمانی وەرگیرام. ساڵی خوێندنی ١٩٨٤-١٩٨٥ بڕوانامەی دبلۆمم وەرگرت و لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٦ لە نەخۆشخانەی ناوەنـدی شـەقڵاوە وەرگـیرام، مـاوەی مانگێـك دەوامـم کرد، بەڵام بەهۆی گرژیی دۆخی ڕێکخستنەکانمان لەناو شاری سلێمانی هەوڵێکی زۆرمـدا تـا گوزرامەوە بۆ تەندروستیی سلێمانی کە د. نیهاد زەنگەنە بەڕێوەبـەری گشتی تەندروسـتیی سلێمانی بوو، زۆر داوام لێ کرد لـەناو سلێمانیدا، جێگیرم بکات بـەڵێنی پێـدام مانگێـك لـە نەخۆشـخانەی چـوارتا دەوام بکـەم، ئەگـەر بـە دڵـم نـەبوو کـوێم ویسـت بمنێرێتـە ئـەوێ.

هەروەها دەفەری شارباژێر و چوارتاش بووبووە بەرەی جەنگی عێراق –ئێران، لەبەرئەوە کەس پێی خۆش نەبوو بنێردرێتە چوارتا و سنوورەکەی. لە ڕاستیدا لە نەخۆشخانەی ناوەندی چوارتا ئەزموونێکی باش و پێویست بوو بۆ ئەو پیشەیەم کە بە خوێندن و بڕوانامە بوومە خاوەنی، کە شارەزایی گشتیم لێ بەدەستهێنا، ئەگەرچی د. ئاراس ئیسماعیل و د. تافگە لەوێ بوون ماوەی خۆیان تەواو کرد گوازرانەوە بۆ ناو شار و دوای ئەوان د. عادل یوسف عەتیە نێردرایە نەخۆشخانەکە، کە خەڵکی میسر بوو، منیش جگە لەوەی بەرپرسی دەرمانخانە و دڵنیایی تەندروستی (تأمین الصحی) بووم زۆر لە نەخۆشەکان بۆ چارەسەر دەهاتنە لام، دەتوانم بڵێم لە ڕووی نەشتەرگەریشەوە سوودی باشم بینی بوو، هەروەها هاوڕێیانم مەحموود ڕەزا و سرووە کە هاوقۆناغ و پەیمانگا بووین بەیەکەوە بووین و شارەزایی زۆرباشمان وەرگرت، بەتایبەت هەڤاڵ مەحموود و من توانیمان کاریگەری لەسەر د. عادل لەمەڕ پرسی کورد و هۆکار و خواستەکانی شۆڕشی کورد بەتایبەت بەهۆی تێکدان و بەسەربازگەکردنی گوندی تەگەران و داستانی (قەیوان - ماوەت) بەجۆرێك کە ڕۆژانە ئەمنەکانی چوارتا سەردانیان دەکرد، زۆر بوێرانە قسەی دەکرد و تا لە پشووی نیوەڕۆیەکدا لە ئەنجامی گفتوگۆکانی زۆر بوێرانە ئەو ئەمنانەی ناچار کرد دان بەو ڕاستییەدا بنێن کەرکووك شارێکی کوردییە و لەبەر پرسی نەوت و ئابوورییەکەی لەشاری کوردبوونیان دابڕیوە، دواتر ڕۆژانی ١٥ و ١٦ و ١٩٨٦/١١/١٧ کرایە مۆڵەت دایکمم بردە بەغداد بۆ لای د. فائق سامەڕایی بەمەبەستی چارەسەری نەخۆشیی شێرپەنجە کە دەتوانم بڵێم لە سەرەتایدا بوو.

ڕۆژی ١٩٨٦/١١/١٧ لە بەیانییەوە چوومە دەرەوە بۆ بازاڕەکانی ناوچەی (منصورية) بە مەبەستی کڕینی ئامێری پزیشکی، هەروەها شەکر کە فەرمانبەر (مام عەلی) یەکێك لە کارگوزارانی نەخۆشخانەکە داوای کرد، بەڵام نەمتوانی بیکڕم، چونکە بە فەردە دەیان فرۆشت لەبەرئەوەی بۆ کوردستان قەدەغە بوو لە کاتی گەڕانەوەم لە پاسەکاندا دووجار

گیرام، کە لە وێستگەی پاسەکان سەردەکەوتن داوای پێناسەیان دەکرد کە لە منیان وەرگرت وتیان دابەزە، دووکەسی عەگال بە سەری ڕێکپۆش کە لە کەسایەتی دیار دەچوون وازیان نەهێنا تا ڕزگاریان کردم، هەروەها لە شوێنێکی دیکەش دوو ئەمنی تر سەرکەوتن بە داواکردنی پێناسەکەم دایان بەزاندم کە بمگرن، لەوێ ئەو دوو عەرەبە و لە خوارەوەش کەسێکی تر بوونە فریادڕەسم و وازیان نەهێنا پێناسەکەشم وەرگرتەوە.

گەیشتمەوە میوانخانەکە لەناوچەی کەرخ و بە پلیکانەکاندا سەردەکەوتم، ڕوانیم بەرپرسی کارگێڕی ئوتێلەکە بەجۆرێکی هەستیارانە سەیرم دەکات، چوومە ژوورەوە دایکم بە گریانەوە پێی گوتم کوڕم چەندمان پێ گوتوویت واز لە سیاسەت بهێنە، ماڵی خەزووری کاکە کەمالم تەلەفونیان کرد بوو ئەم بەیانیە ئەمن و قوات خاسە داویانە بە سەر ماڵماندا بۆ دەستگیرکردنم، هەر زوو کەوتمە خۆ و دایکمم لە گەراج بە تەکسییەکی سلێمانی ناردەوە و خۆشم تا شەو لە کۆڵانەکانی کەرخ مامەوە، بە پاس گەڕامەوە سلێمانی چوومە ماڵی خوشکم لە گەڕەکی بەختیاری، هەر زوو لەوێ ڕۆیشتم کە بچم بۆ ماڵی خەسووی خوشکم، لە ڕێگەوە چوومە ماڵی مامۆستا ئەحمەد ساڵح، کە باسەکەم بۆ گێڕایەوە نەیهێشت بڕۆم و لە ماڵی خۆیان هێشتمییەوە، پاشان پێکەوە چووینە دەرەوە ئەو بۆ دەوام و منیش بۆ ماڵی خەسووی خوشکم و ناونیشانی ماڵەکەم پێ دا و لێک جیابووینەوە، لە گەڕەکی حاجیحان تێبینیم کرد کوڕێکی گەنج کە جلێکی کوردی شینی ئاسمانی لەبەربوو لە کۆڵانی نزیک ماڵەکە وەستا بوو، بە بیرمدا هات کە ئەمە سیخوڕ بێ و بە چوونە ژوورەوەم ئاگاداری دەزگای ئەمن بکاتەوە، بۆیە زۆر بە ئاسایی تا هەستم پێ نەکات ڕێگەی خۆمم گرت و چوومە ناو بازاڕ بۆ بینینی هاوڕێکانی دیکەم، کە پەیوەندییان بە منەوە هەیە تا ئاگاداریان بکەم و خۆیان بپارێزن.

**لە ناو بازاڕ (أمن و قوات الخاصة و جیش الشعبي) زۆر بڵاوە پێکرابوون و خەڵکیان ڕادەگرت و دەیان پشکنین و پێناسەیان داوا دەکرد، پاش سەردانەکانم و نەبینینی ئەو هاوڕێیانە توانیم بێومییانە بگەڕێمەوە ماڵی مامۆستا ئەحمەد، هەر بە بینینم باوەشی پیاداکردم و ماچی کردم گوتی: بە لای ماڵی خزمەکەتاندا ڕۆیشم کەسێکی سیخووڕ لەو دەورە وەستا بوو ماوەیەك پێش ئێستا برادەرێك ئاگاداری کردم کە ئەوە سیخوورە و خۆتانی لێ بپارێزن، منیش شێوە و ڕەنگی جلەکانیم پێ گوت، وتی ئەوە خۆیەتی و تۆ زۆر وردبین و زیرەکی.**

**ڕۆژی دواتر ڕێکەوتی ١٩٨٦/١١/١٩ چوومەوە ناو بازاڕ و توانیم هەڤاڵ ڕەزاق لە دوکانەکەی خۆی لە بازاڕی قەیسەری نەقیب ببینم، پێم گوت هەڤاڵ سامی جەمال قەرەداخی و هاوڕێکانی تر ئاگادار بکەنەوە و سبەی لێرە نامێنم دەڕۆم بۆ ئەو دیو. لە ناو بازاڕ پشکنین و داواکردنی پێناس هەبوو بە ئاگایانەوە ڕێگەم بڕی و چوومە سەرچنار بۆ ماڵی گەشمردە (هاوڕێ شەریف عەلی) پێم گوتن من سبەی دەڕۆم بۆ سەرگەڵوو چیتان هەیە بۆ هەڤاڵ هاوڕێی ببەم؟ پارچەیەك کوتاڵی سێ مەتر و نیوی ڕەنگ قاوەییان پێ دام کە لەوێ بە دووریی بدات و ئاگاداریان کردم کە هەڤاڵان: جەزا ئیبراهیم و یاسینی ئاسنگەر دەستگیر کراون و لە ماڵەوە بە شەق و ئەشکەنجەدان بردوویانن.**

**گوتم: هاتوون بۆ گرتنی منیش بەردەستیان نەکەوتبووم لە بەغداد بووم و بەیەکجاری دەچمە دەرەوە و دەبمە پێشمەرگە، ماڵئاواییم لێ کردن و بە پێ بەرەو ماڵی مامۆستا ئەحمەد لە گەڕەکی مامۆستایان بەڕێ کەوتم.**

**ڕۆژی ١٩٨٦/١١/٢٠ پێش کاتژمێر ٧ی بەیانی من و مامۆستا گەیشتینە لای مزگەوتی گەورە لەناو وێستگەی پاسەکانی بەرامبەر مزگەوتی گەورە، کە ئێستا بازاڕی (ئاوباریك)ە و ناسیاوێکی خۆمان و تێکەڵاویمان هەبوو بینی و بەسەرسڕمانەوە سەیری کردم و لێی**

پرسیم لە کوێ بووم و چی دەکەم؟ من گوتم لە چوارتا بووم و دەرۆمەوە و لێی جیابوومەوە و نەمهێشت بزانێت کەسی ترم لەگەڵە، بێ ئەوەی بزانێ چوومە پشتی وێستگەکە ئەویش بەخێرایی ڕۆیشت ئەوەندەی نەبرد پاسی بەکرەجۆ هات و سەرکەوتین زۆر قەرەباڵغ بوو هەرچۆنێك بوو هەریەکەمان جێگەی خۆمان لە نزیك یەکتر گرت و دانیشتین بینیمان لەبەری (کاسۆمۆڵ)ی ئێستاوە لەگەڵ چوار قوات خاسەی بەخۆ بەپەلە بەرەو وێستگەی پاسەکانی چوارتا هەنگاویان دەنا، بە نیازی ئەوەی نێچیرەکەیان پێکاوە و زوو بگەنە سەری و ملی لە لاشەی جیابکەنەوە، یاخود پەلبەستی بکەن بۆ ناو ڕکەکە، (دیارە وایزانیوە من دەچمەوە بۆ چوارتا چونکە زاڵگەکەی قەڵاچوالان لە دوای کاتژمێر ٧ی بەیانی ڕێگای هاتوچۆیان دەکردەوە)، پاسەکە کەوتەڕێ و ئەو برادەرمشمان سپارد بە بێهیوایی کە نێچیرەکەی بەباشی نەپێکراوە!

پاسەکە کەوتە ڕێ، ناو شار ئەمن و هێزەسەرکوتکارەکان بەربڵاوبوون، لە نزیك ماڵی پارێزگارەوە ٣ عەرەب پاسەکەیان ڕاگرت و سەرکەوتن و لەبەر بێ جێگایی بەپێ وەستان کەوتبوونە قسەی سووکایەتیکردن بە خەڵکی ناو پاسەکە و نەدەتوانرا هیچ وەڵامێکیان بدرێتەوە! لە بەکرەجۆ چووینە ماڵی هەڤاڵ محەممەدی پەرتووکخانەی گشتی هەڤاڵ محەممەد منی گەیاندە ماڵێکی گوندی عەواڵ، دواتر پەڕینەوە بۆ یاڵانقۆز و زێوێ، (بەڵام من لێرەدا فیلمەکە دەبڕم و خاڵێك دادەنێم، تا بێئەمەکیم نەکەوێتە بەر شاڵاوی تیشکی هەتاو لەبەر ناوی ئەو ماڵ و بەڕێزانەی ڕۆژگار خستوویەتییە خانەی لە بیرچوونەوەم).

بەیانی ڕۆژی ١٩٨٦/١١/٢٢ لە زێوێوە لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك بەشاخی پیرەمەگروندا هەڵگژاین بۆ دیوی قزلەر، نەوەستامەوە تا بە شاخی دابان سەرکەوتم لە بارەگای تیپی مەڵبەندی دوو لە سەرگەڵوو ئۆقرەم گرت.

۱۹۸٦/۱۱/۲۳ سەردانی ناوەندی (ك.ڕ.ك)م لە بەرگەڵوو کرد، کە ئەو کاتە هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا لە هەندەران بوو، نامەی پشتگیری (ڕێکخراوی سلێمانی)یم دایە دەست هەڤاڵ حەمەتۆفیق ڕەحیم، کە بە پلەی ئەندام کەرت بۆمکرابوو پێشوازی گەرمی لێ کردم، نیازی خۆم باسکرد، کە دەڕۆمە تیپی ٤٧ی پیرەمەگروون و وەك پێشمەرگە و کادیری ڕێکخستن درێژە بە خەبات دەدەم، بەڵام چاوەڕێی هاوڕێ شەریف دەکەم تا بۆچوونی وەربگرم. چاوەڕێم کرد تا بەرەبەیانی زووی ۱۹۸٦/۱۲/۱ لە کانییەکەی خوارمانەوە دەموچاوم شۆرد و خۆم کرد بە زووردا دەبینم هەڤاڵان: (ئاراس ڕەنووف، سوارە محەمەد فەرج، گەشمردە شاهۆ عومەر سابیر و هەڤاڵان) هەستاون، بەپەلە خۆیان کۆ کردەوە و هەستم کرد شتێکم لێ دەشارنەوە، لێم پرسین، سوارە وتی هەتا سەرشاخ دەچین، ئیدی ڕۆیشتن، منیش جیا لەوان بەرێ کەوتم و لە مزگەوتی سەرگەڵوو تەرمی گەشمردە: هاوڕێ شەریف و ئەردەڵان زاژڵەیی لەوێ بوون، کە ئێوارەی ۱۹۸٦/۱۱/۳۰ لە گوندی باڵخ لەگەڵ هەڤاڵان: (عوسمان هەڵەدنی و شەپۆل) گەشمردە بوون و لە گۆڕستانەکەی خوار دابان ناشتمانن هەر لەگەڵ ئەو ٤ گەشمەردیە ٧ پێشمەرگەش بریندار بووبوون.

کاتێك شارم جێهێشت و توێشووی شاخم لە شان نا، چەند تێکۆشەرو هاوڕێیەکی ڕێکخستنم کەوتنە چنگی ڕەش و خوێناوی جەللاد و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی حیزبی بەعس و دەوڵەتەکەی سەدام حسین، ئێستا جەستەیان بەکێبڵ و سۆندە و دار شەقار شەقارە و خوێنیان لێ دەچۆڕێ و ئەوا لێرەش نزیکترین و خۆشەویسترین هاوڕێم بە خوێنە گەشەکەی پێشوازی لێ کردم و چەکەکەی دایەدەستم تا ڕێبازی هەڤاڵ ئارام (شاسوار جەلال) ون نەکەین و چیتر خوێنەکەی ون نەکرێ.

لێرەوە دژ بە ستەم و چەوساندنەوە چینایەتی و نەتەوەییەکان بوومە پێشمەرگە، (ك.ڕ.ك) و نووکی خامە و چەکوشی دەستی کرێکار بوونە چرای ڕۆشنکەرەوەی ڕێگەی

خەباتم و (ی.ن.ك) بوو بە چەك و قەڵغانی بە دەستهێنان و پاراستنی پرسی ڕەوای نەتەوەییم.

ئەگەرچی دەرچووی پەیمانگا و بە بڕوانامە یاریدەدەری پزیشکیم، بەڵام لێرەوە ناوی دکتۆری شۆڕشم پێ بەخشرا و لەگەڵ دووانەی خامە و چەك جانتای پڕ لە دەرمانم لە کۆڵنا، دێ بە دێ و ماڵ بە ماڵ و سەنگەر بە سەنگەر لێم جیا نەدەبووەوە. ئەوەی بەلامەوە گرنگ نەبوو پلە و پۆست بوو، تەنیا کار و خەبات کە مردن لەسەر لەپی دەستم بێت و پێشمەرگەی ئامانج و پرسێکی ڕەوابم چیی لە لێپرسراوێتی پلەداری بکەم؟

سەرباری کارەکەم وەك پێشمەرگە و ڕابەر سیاسی کەرتی ٤ی دۆڵمازەڵە و کادیری ڕێکخستنی کۆمەڵە لە سنوورەکە، وەك کادیری پزیشکیش بەرپرسیارم لە تەندروستی هەر مرۆڤ و پێشمەرگەیەك لە هەر کوێ یەك کە ڕووبەڕووم بێتەوە، بۆ ئەمەش پێویستم بە دەرمان و پێداویستییەکانێتی. سەرچاوەکانیش نەخۆشخانەی شۆڕش لە بەرگەڵوو دکتۆر شوان بەرپرسی بوو هەرگیز نائومێدی نەکردم و تەنانەت بێ خەمی کردم ئەگەر بە پارە دەرمانم بۆ بهێنرێت.

چ لە سەرگەڵوو چ لە قەرەنگوێ و دۆڵمازەڵە، یاخود لە هەر شوێنێك ئامادەبوونم هەبووایە نەخۆشەکان دەهاتنە لام و چارەسەری پێویستم پێ دەدان.

لە داستانی ڕزگاری پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٨٧/٤/١٢ هێزەکانی پێشمەرگە بەڕێ کران و شەو دەست بەهێرش کرا و هەموو ڕەبایەکانمان گرت تەنها ڕەبییەکەی سپیلك نەگیرا، ئەویش بەهۆی زۆری تۆپباران لە قەڵاکەی سووسێ و دەبابەکەی کۆتەڵ و سەربازگەکەی دوکانەوە، هێرشی قۆڵی پیرەمەگروونیش بۆ چەواشەکردنی هێزەکانی دوژمن و سەرقاڵکردنیان لەو سنوورە ئەنجام درا.

ئەو بریندارانەی کە هاتوونەتە بەر دەستم، یاخود پێمزانی بێ بەپێی برینەکەی چارەسەرم بۆ کردوون، یەکێك لەوانە گەشمردە عەلی بەگ ئەوکاتە فەرماندەی کەرت بوو قاچی پارچەی RBG بەرکەوتبوو، من سەرەتا دەچوومە سەنگەرەکان و بەشداری شەڕەکانم دەکرد تا ڕۆژێکیان کە هێرشی دوژمنمان لەسەر بوو هەڤاڵ عەلی بچکۆل کە سەرپەرشتیار و فەرماندەی بەرەی شەڕگەی کلکەی پیرەمەگروون بوو، منی بینی زۆر بەتووڕەیی گوتی تۆ دکتۆرەکە نیت لێرە چی دەکەیت؟ هەر ئێستا نەگەڕێیتە دواوە و پێشمەرگەیەك شەهید ببێ تۆ بە ناپاك دادەنێم. ئەو وشەیەم زۆر پێ ناخۆش بوو ناچار گەڕامەوە بنکەی دواوە و پێیان گوتم تۆ لێرە نەبووی بریندارەکانیان گەیاندە خوارەوە و ئیدی ئەوانەی دواتر چارەسەری پێویستم بۆ کردن. پتر لە ٢٠ ڕۆژ جلەکانم بەخوێنەوە لە بەردا بوو هەڤاڵ عەلی و هەڤاڵ غریب عەسکەری خۆیان پێیان گوتم بڕۆ سێ ڕۆژ پشوو بدە و خۆت و جلەکانت بشۆ و پێتخۆش بوو بگەڕێرەوە. سێیەم ڕۆژ لە گەڕانەوەمدا لە شەدەڵە پێشمەرگە و هونەرمەند عەبدوڵڵای تەمە گوتی: ئەگەر دەچیتەوە سەرشاخ هاوکاریمان بکەیت و ئەم باری هێسترە بیگەیەنیتە لای خۆتان، هەر کە گەیشتمە دامێنی شاخی قووڵەپووشینە نەم دەزانی کە هێستر یەکجار بە ڕێگاکەدا ڕۆیشتبێ، پێویستی بە کەس نییە و منیش هەوڵم دەدا بەو ڕێگایەدا بڕوا، هەوڵم دەدا بڕوا لە جێگەی خۆی نەدەجووڵا تەنانەت وام لێدەهات دەمگوت: (بەقوربان.. باوکم.. برام دەبجووڵێ) ماوەی پتر لە کاژمێرێکی پێچوو تا گەیاندمە بەردەم بنکەکەمان لەبەرەی دواوە.

دواتریش کە ڕۆژەکانیم بیرنەماوە، بەشدارییم کردووە لە هێرشکردنە سەر ڕەبایەکەی سەر سپیلك کە گوندی کانیشۆك لە دامێنی دایە. لە یەکێك لە هێرشەکانمان کە بە فەرماندەیی هەڤاڵ مستەفا سەرگەڵوویی سەرتیپی تیپی مەڵبەند، بەهاوبەشی دەستەیەکی پ.د.ك کە بریتی بوون لە کەمال سابیر، یوسف، ملازم ئەحمەد و عوسمان قادر منەوەر بە

چوونە ناو ڕەبایەکە پێشمەرگەیەکی تازەی تیپەکەمان بەناوی سامی سووورداشی گەشمردە بوو، هەر زوو گەیشتمە سەری، بەڵام لە چەپەوە بۆ ڕاست گوللەی BKC بەر گورچیلەی کەوتبوو زۆر بەداخەوە گیانی سپاردبوو. گەشمردە سامی سووورداشی گەنجێکی بەخۆ و باڵابەرز بوو تەمەنی نزیکەی بیست ساڵ دەبوو ئەو ڕۆژە لە کەرتەکەی هۆمەرقەوم بووین چاوەڕێ بووین ڕۆژ بەرێ بکەین و بەرەو پێشوازی لە شەوی تۆڵە هەنگاو بنێین، هەڤاڵ سامی چەند جارێك دەیگوت: کاك دکتۆر ئەگەر بریندار بووم پێش ئەوەی شەهید ببم باش تیمارم بکە، نزیکەی دە، یاخود بیست ڕۆژ بوو پێشمەرگە بوو، بەو قسەیە زۆر دڵگران بووم ناچار خۆم لێ تووڕە کرد گوتم بەسە ئەی ئەگەر من شەهید بووم چیم لێ ئەکەی؟

گوتی: خەمت نەبێ خۆم هەڵت دەگرم و دەتدەم بە کۆڵمدا.

هەر لەو چالاکی یەدا ڕەوانشاد کەمال سابیر پارچەیەکی لوولبووی گوللە RBG چوو بووە ناو پووزی قاچی لەبەر لوولبوونەکەی بە زەحمەت هەر لە پەنای ڕەبایەکە دەرم هێنا.

لە پێش داستانی ڕزگاری هەر بەسەرپەرشتی هەڤاڵ مستەفا سەرگەڵوویی کە ئەوکاتە جێگر تیپ بوو شەوێکی درەنگ هێرشمان کردە سەر ڕەبییەکەی سپیلك ١١ جاش کوژران و ٢٦ جاشیش بەدیلگیران، بەپەلە بریندارەکانم سارێژ کرد و پاش کۆکردنەوەی دەستکەوتەکان چۆڵمان کردەوە خۆشحاڵانە جگە لە سێ بریندار گەشمردەمان نەبوو.

بەرەبەیانییەکی زووی هاوینی ساڵی ١٩٨٧ بەهێزێکی زۆری تیپی مەڵبەند خۆمان کرد بەناو باخ و پەسارەکانی گوندی کانیخانی سەر ڕێگای دامێنی شاخی (باوێدە)، ئەم چالاکییە لە ڕوانگەی زانیارییەکەوە بوو کە ئەفسەرێکی باڵای سوپای عێراق لەگەڵ بڕی دوو ملیۆن دینار بەو ڕێگایەدا بەرەو هاوینەهەواری دوکان تێدەپەڕێ، لە کاتەکە تێپەڕی و دیارنەبوون هەواڵەکە گەیەنرابوو بە دەزگاکانی (أمن و إستخبارات) لە کاتی پاشەکشەمان و

گەڕانەوەمان بۆ بنکەکانمان هێرشی دوژمن بە کۆپتەر و تۆپباران لە کۆتەڵ و سووسێ و لەگەڵ هێزی زەمینی کرایە سەرمان، خۆمان گەیاندە بناری شاخ و ئەشکەوتی جاسەنە و بەشێکیش بەرەو گوندی تیمار چوون، کە بیستم بریندارمان لە گوندی تیمار هەیە لە ئەشکەوتەکەوە بەڕێ کەوتم، بریندارەکە پێشمەرگە هەڤاڵ کەمال سلێمانی لە کەرتەکەی ڕەوانشاد حەمەعەلی حاجی مەحموودی گەلاڵی بوو بە چەکی BKCیەکەیەوە کەوتبووە ناو پووش و دەغڵ و دانە سووتاوەکەی ناوچەکە، کە کۆپتەرەکانی ڕژێم ئاگریان تێ بەردابوو، جەستەی هەڤاڵ کەمال زۆر سوتابوو تەنانەت سارێژکردنەکەی زۆری خایاند لەلایەن هەڤاڵ عەباس عەبدولڕەزاق (عەباسی ڤیدیۆ) بێ ئەوەی ئاگام لێی بێ بە ڤیدیۆ وێنە گیراوە، جارێکیش چوومە سەردانی لە گوندی (قزلەر).

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٧ لە گوندی (گوێزیلێ) لەلایەن ئێرانییەکانەوە خولێکی کیمیایی کرایەوە من یەکێك بووم لە بەشداربووانی ئەو خولە و هەڵە نەبووبم دە ڕۆژی خایاند.

لە ١٩٨٧/٩/٦ لە ڕەبایەکەی سپیلك بریندار بووم و هەردوو ڕانم بەرکەوت، کە یەکێك لە هەڤاڵان ساماڵ عەبدولڕەحمان، یاخود سوارە حەمە فەرەج بوو لەسەرخۆم فێری برینپێچییانم کرد و هەر ئەو شەوە خستیانمە سەر هێسترێك، بە چوار پێشمەرگە وەك بیرم مابێ یەکێکیان هەڤاڵ شوان موغاغی فەرماندەی کەرتی دوو بوو، لەناو ڕێژنەی گوولەبارانیدا دەربازیان کردم و منیان گەیاندە گوندی شەدەڵە لەلایەن گەشمردە د. عەلی قادر سارێژکاریم بۆ کرایەوە.

لە مانگی ١٩٨٧/١٢ ئەو کاتە لە تیپی مەڵبەندی دوو وازم هێنا بوو، دواتریش لەسەر داوای هەڤاڵ فەرهاد محێدین بەرپرسی ئەوسای دەزگای زیندان چوومە ئەوێ، ژمارەیەکی زۆر سەربازی (قوات الخاصە و مغاویر)یان بەدیل گرتبوو، هێنابوویان و هەندێکیان برینداری قورس بوون و هەموو ڕۆژێ دەچووم بۆ سارێژکردنیان، چۆن پێشمەرگەم سارێژ

دەكرد ئەوانیش هەر بە هەمان شێوە لەبەرئەوە لەژێر دەستم هاواریان دەكرد، من بۆم ڕوون دەكردنەوە هیچ لایەكمان یەكترمان نەدیوە و نەناسیوە تا ببینە دوژمنی یەكتر ئەوەی ئێمەی كردۆتە دوژمنی یەكتر تەنیا دەسەڵاتەكەیە، تەنانەت ئێوەی عەرەبی بە پاساوی شیعە و سوننە، یاخود بەهەر بیانوویەكی دیكە كردووەتە دوژمنی یەكتر، دڵنیابن چۆن پێشمەرگەیەكی خۆمان سارێژ دەكەم، ئێوەش بەو شێوە سارێژ دەكەم، ئەو ئازارەی پێتان دەگات بۆ پاككردنەوەی برینەكەیە نەك ڕقم لێتان بێت. پاش ئەوەی ٣٢ كەسیان بە دووجار ١٥ + ١٧ كەس لێ ئازادكران، وەك بیستم لە سەربازگەكەیان بەهۆی بەرگریكردنیان لە ئێمە كوژران.

لە ١٩٨٨/٣/١٩ بە بڕیاری سەركردایەتی كشاینەوە و چووینە ناو سنووری دەستكردی ئێران لە هەڵەبجەوە، سەركێشیم كرد بەناو ئێراندا بەبێ پسووڵەی ڕێگەپێدان بە چەك و تاقم و كۆڵەپشتەوە بەڕێ كەوتم، لە شاری شنروێ لای هەڤاڵ موراد نوێنەری ی.ن.ك پسووڵەم وەرگرت خۆم گەیاندە ناوچەی خواكورك، لە بارەگای سەرەكی (پارتی گەل) كە سامی عەبدولڕەحمان سكرتێری بوو، زۆر بەڕێزەوە پێشوازیان لە ڕێبواران دەكرد، هەر لەوێ كاك حەسیب و كاك سلاحم ناسی و بووینە هاوڕێ، دوای دوو ڕۆژ مانەوە یوسف حازم محەمەد و مەریوان محەمەد ئەمین خەڵكی كەركووك هاتن و دواتریش سالاری شێخ عومەر، محەمەد غازی، عەبدوڵڵا، گۆران و مەریوان هاتن تا لە بەرەبەیانێكی سەرەتای مانگی حوزەیران لەگەڵ ژمارەیەك پێشمەرگەی ئەوان كە كاك ئەدیب بەرپرسیان بوو لەگەڵ پ.د.ك و چەند كاسبكارێكی سنوورەكە بەرەو دەڤەری بادینانی كوردستانی باشوور ڕێگایەكی سەخت و پڕ لەماندوویی و تینوێتیمان بڕی تا گەیشتینە بارەگای مەڵبەندی چوار، هەر لە خواكورك بووین كە گەشمردە دكتۆر هێمن و ئیسماعیل چوارباخی و ژمارەیەك پێشمەرگە دەگەڕانەوە بەرەو سنووری ئێران تا بچنە سنووری مەڵبەندی هەولێر. هیچ دكتۆر و كادیرێكی پزیشكی لە سنووری مەڵبەندی چوار نەمابوو. بەتایبەت

نەخۆشی گرانەتا و مەلاریا بڵاوبوو بووەوە حەب و گولاج و دەرمان ڕێژمیەکی باشم لەگەڵ خۆم بردبوو، کە دڵنیادەبوومەوە کام نەخۆشییەی گرتووە چارەسەرم دەکرد و دەمتوانی سەرپەرشتی ئەو نەخۆشانە بکەم کە شوێنیان نزیك بوون. هاووڵاتی هەبوو لە پیر و گەنج لە ژن و منداڵ ٤ - ٦ کاژمێر ڕێگەیان دەبڕی تا ئەگەیشتنە لامان بۆ چارەسەر.

هەڤاڵان هەڵۆ و نەوزاد کە لە تیپی ٢١ کەرکووك بوون گەیشتنە لامان، باسیان کرد کە ژمارەیەك پێشمەرگەی گەرمیان بۆ شەڕی پارتیزانی و مانەوەیان لەو سنوورانە گەڕاونەتەوە بۆ گەرمیان، هیوا و ئاواتی خۆمم دەربڕی خۆزگە لەوێ بوومایە و لەگەڵیان بڕۆشتمایە.

لە ڕۆژانی دواتردا هەڤاڵ هەڵۆ زۆر بەسەختی تووشی نەخۆشی (مالاریا) بوو، تا باشبوونی بەردەوام سەرپەرشتیم دەکرد.

ڕۆژێك پیاوێکی بە تەمەن لە گوندی (ڕەشابە)وە هاتبوو دەستی ڕاستی لەگەڵ هەر پێنج پەنجەکەی زۆر ئاوسابوون لەپی دەستیم هەڵدڕی (کێم و جەراعەت)ێکی زۆر دەرپەڕی پاش گەڕان تەڵاشەدارێکم دەرهێنا و دواتر هەموو پەنجە و دەستیم بەگوشین پاك کردەوە، پێم وت ئەگەر ماڵت نزیك بووایە ڕۆژانە سارێژم بۆ دەکردی وتی ئێوە ڕزگارتان کردووم چۆن نایەم.

ڕۆژێکی هاوینی ساڵی ١٩٨٨ لە بارەگای مەڵبەندی ٤ی بادینان لە ژوورەکەم دانیشتبووم ٣ پێشمەرگەی پ.د.ك هاتن و داوای دکتۆریان کرد و فەرمووم لێ کردن، وتیان برینداریکمان هەیە دکتۆرەکەی خۆمان ناتوانێت چارەسەری بۆ بکات، لەگەڵیان بەڕێ کەوتم ماوەیەك ڕێمان بڕی و شوێنێکی بەردەڵان و بەرزاییەکی کەم لە ئەشکەوتێکدا بوون کۆمەڵێك پێشمەرگەی لێ بوون، ئەوەی بێزاری کردم وەڵامی سڵاوەکەم وەك پێویست

نەبوو، یەکێکیان لەو بەرەوە گوتی: تۆ دکتۆریت؟ جەلالیت؟ لە وەڵامدا گوتم: وەکو دکتۆر نەخێر، بەڵام یاریدەدەری پزیشکم و دەرچووی پەیمانگام نەك کۆلێژ، من (ی.ن.ك)م و بەڕێز مام جەلال سکرتێری حیزبەکەمە و جێی شانازیمانە، دواتر گوتم هەر لەبەرئەوەی جەلالیم بەو شێوەیە پێشوازیتان لێ کردم؟ کە خۆشتان هاتوون بەدوامدا! لەبەر کارە مرۆییەکە ئەوەی بۆم بکرێت دەیکەم، بەس جارێکی دیکە داوام نەکەن، دکتۆرەکەیانم بانگکردە لای خۆمەوە هەم بۆ بەردەستی هەم پێم گوت جوان تێبینی بکە چۆن تیماری دەکەم تۆش بەو شێوەیە بکە، بەڵام دوای تەواو بوون و لە کاتی ڕۆیشتنم بەدەممەوە هەستان و پەشیمانیان پێوە دیار بوو کە هەڵە بوون.

لە ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٢٥ ڕژێمەکەی سەدام حسێن قۆناغی ٨ی ئەنفالی بۆ دەڤەری بادینان دەست پێ کرد، بە مەبەستی لەناوبردن، یاخود تەواو لاوازکردنی کورد و شۆڕشەکەی و گۆڕینی دیمۆگرافیای نەتەوەیی کورد لە کوردستانی بە عێراقەوە گرێدراودا. ئێمە وەك پێشمەرگەکانی ی.ن.ك لە بەرنامەماندا بوو کە شەڕی بەرگری بکەین، بەڵام لەبەرئەوەی تەنیا هێزێکی کەمبووین لە سنوور و دەڤەرەکەدا نەدەکرا خۆمان بەگورگانخواردوو بدەین بە پێچەوانەوە ڕووە و کوردستانی باکوور سنووری نێودەوڵەتی تورکیا لە پاشەکشەدا هەنگاومان دەنا.

لەگەڵ تاقم و تفەنگ و کۆڵەپشت و ژمارەیەك پەرتووك هاوشانی هاوڕێکانم لە بارەگای مەڵبەند هەنگاوی ناچاریی پاشەکشەمان لە دۆڵی زێوێ بەرەو کوردستانی باکوور خستە جووڵە، ئەگەر ناوەکەیم لە بیر نەچووبێتەوە لە شاخی ساردکێ کە بارەگای (پارتی گەل)ی لێ بوو لەناو ڕکەبەردی شاخەکەدا شاردمنەوە. هەمیشە لە شوێن گواستنەوەکانمدا ژمارەیەك پەرتووکم دەخستە هەگبەکەم وە کۆڵم دەنا، بە دەڤەری (نێروە)وە بەناو باخ و

بێستانەکاندا دەڕۆیشتین، خەڵکی ناوچەکەش بە پیر و گەنج و ژن و منداڵەوە ڕێگای هات و نەهاتی کۆڕەوی کوردانیان گرتبووە بەر.

لە نیوەشەوێکی درەنگدا لە گوندی (چەمتوو)ی سەر سنوور بووین، لە ڕێگەی ئامێری پەیوەندی بێتەلەوە هەواڵیان پێداین، کە سەرکردە ئازاد هەورامیی لە سنووری مەڵبەندی سێ لە ڕێکەوتی ١٩٨٨/٨/٣١ گەشمردە بووە و گیانی پڕ لە شکۆ و نەمریی سپاردووە.

بەخۆم گوت، ئای ك.ڕ.ك ئەمجارەش نەك سەرکردە، بەڵکو مرۆڤە گەورەکەی ناو هۆنراوەکەی گۆرانت لە دەستچوو... ئاوازی پڕ لە باڵەفرێنی سۆزی کوردانەی دای لە شەقەی باڵ، سروودی (ڕێی خەباتمان)ەکەی (کاك ئارام) دەمانگەشێنێتەوە.

لە کوردستانی باکوور لە چەند گوند و شارۆچکەیەکدا لامان دەدا و دەڕۆیشتین، یەکێك لەوانە پاش ٢١ کاتژمێر ڕێگەبڕین گەیشتینە ناو هەرنیکێ، کە کاتژمێر ٥ی بەیانی بوو، دیوەخانێکی گەورەی لێ بوو، لاماندا و سەر و قاچ تێکەڵاو هەرچۆنێك بوو لێی خەوتین، هێندەی نەبرد لە کاتژمێر ٦ی بەیانی دەنگە دەنگ ناو مێشکمانی دەهاڕی بە لێدان لە دەروازەی دیوەخان و هاواریان دەکرد هەستن جەندرمەکان هاتن و خۆتان ونکەن، هەمیشە بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەستام و خۆمم ئامادە دەکرد، بەڵام ئەو بەیانییە یەك کاتژمێریش نەدەبوو چاوەکانم چوو بوونە خەو، بۆیە پێمخۆش بوو جەندرمە بیگرتمایە و بەگوولە بێژنگرێژیان بکردمایە لەو خەوە هەڵیان نەساندمایە.

لە هەر گوند و شارۆچکەیەك خەڵکەکەی هەواڵی دکتۆریان دەپرسی، دەمبینی زۆربەی زۆری ژنەکان دەستەکانیان بەجۆرێك قڵیشابوون تەواوی دەست و پەنجەکانیان شەقارشەقار بووبوون، باش بوو (وازەنین)م زۆر پێ بوو، کە سوودی باشیان لێ بینی، بەڵام هەر بەشی نەکردن .

دواتــر لەناوچـەی (مەرگـەوەڕ)ەوە گەیشـتینە نــاو سـنووری کوردسـتانی ڕۆژهـەڵات (سنووری نێودەوڵەتی ئێران) لە شارۆچکەی سلیڤانە و ڕاژان، کە کەسانی سمر بـە پ.د.ك و بارزانییەکانی لـێ نیشتـەجێ بووبـوون، دوای نـانخواردنی نیـوەڕۆی ئـەو ڕۆژە مـن و هـەڤاڵ سالاری شێخ عومەر و هاوڕێکانی دیکەمان کـە هێشـتا نەگەیشت بووینـە ناوەڕاستی مـانگی ئەیلوول بەسواری پاس خۆمان گەیاندە شاری (سەقز) لە میوانخانـە ماینـەوە، لـەو ماوەیـەدا چوونە گـەرمیانم کردبـووە مـەراق تـا بـۆ ئـەو مەبەستە نامەیـەکم بـۆ هـەڤاڵ نەوشـیروان مستـەفا نووسـی و بـەرەو قاسمـەڕەش بـەڕێ کـەوتم و سـەردانیم کـرد، کـەمێك دانیشـتم و میوانی هات کە بەهادین نوری (ئەبوسەلام) و ئەوانی تـر لـە ڕاستیدا بـیرم نـەماوە کـە کـێ بوون، پاش پێشوازی و بـەخێرهاتنیان و ناسـاندنی مـن لەلایـەن هـەڤاڵ نەوشـیروانەوە زوو هەسـتام بـڕۆم هـەڤاڵ نەوشیروان نامەکـەمی دایـە دەسـت هـەڤاڵ مـلازم عومـەر عەبـدوڵلا، بەڕێزیشی پێی ڕاگەیاندم لەم ماوەیـەدا هـەڤاڵ مـەحموود سـەنگاوی و هـەڤاڵ کـوردۆ قاسـم لەگـەڵ ژمارەیـەك پێشمەرگە بـەڕێ دەکـەون چـەکێکی کلاشـینکۆف بـەدیاری دامـێ، لەگـەڵ نووسراوێك بۆ دارایی و گوتی ئەو پارەیە وەربگرە و هەفتەیەك لە تاران پشووبدە ماندووی ڕێگەیت، منیش گوتم نەدەچمە تـاران نـە پـارەم دەوێ و پـارەم پێیـە، پـێش دەسـتپێکردنی ئـەنفالی بادینـان پێشمەرگەیەك بـەناوی ئەسـعەد زۆر حـەزی لـە دەمانچـەکەم بـوو، بـیرم نەماوە چ جۆرێکی چواردەخۆر بـوو دواجـار نـەمتوانی دڵـی بشکێنم و ٥٤٠ دینـارم پێـدابوو هەر بەوەندە پێم فرۆشتەوە.

بۆ ئەو مەبەستە مۆڵەتی ڕێگام بۆ ئامادەکرا، چوومە گونـدی دزڵـی نزیـك شارۆچکەی مەریوان لەوێ پەیوەندیم کرد بە هـەڤاڵ شێخ علی بەرپرسی مەڵبەنـدی یـەك و هـەڤالان محمـود سـەنگاوی، کـوردۆ قاسـم، جـەلال جەوهـەر، ئیـدی نـەخۆشـخانەکەی مەڵبەنـد بـووە هەواری هەمیشەیی و لەگەڵ هـەڤاڵ فـارس محەمـەد عەبـدوڵلا– دکتـۆر جووتیـار، دکتـۆری تیپـی ٥٥ی قـەرەداخ سەرپەرشـتیم دەکـرد، پـاش ماوەیـەکیش هـاوڕێی سـەردەمی پـەیمانگام

دکتۆر ئیبراهیم محێدین هەشەزینی هات بە بیرم بێت سەرقاڵی کارکردن بوو بۆ بەردەوامیدان بە خوێندن.

لە دانیشتنێکی ئاساییماندا د.حسێنی برازای هەڤاڵ مام جەلال و برای هەڤاڵ شێخ عەلی باسی ١٠٠ دینارەکەی کردەوە، لێرەدا چیرۆکەکەی دەگێڕمەوە: بەهاری ساڵی ١٩٨٥ بوو سەردانێکی سەرگەڵوو و بەرگەڵووم کرد، دواتر چوومە نەخۆشخانەی بەرگەڵوو، د. حسێن بەرپرسی بوو، بۆ کڕینی دەرمان و پێداویستی پاکژکردنەوە بڕی ١٠٠ دیناری پێدام، منیش کە گەڕامەوە شار لە ڕۆژگارێکی سەختدا ئەو دەرمان و پێداویستییانەم کڕی کە هەر کەسێك بە یەك پارچە حەبەوە بەبێ ڕەچەتەی دکتۆر دەستگیر بکرایە، جگە لە سەربازێکی ون هیچی تر نەدەبوو، منیش بەشێکی ئەو دەرمان و پاکژکەرەوانەم بە پارەی خۆم دەکڕی، کە بە جارێك یەك کارتۆن لە حەب و گولاج و شروبی تێکەڵم لە ڕێگەی هەڤاڵ ئاکۆ محەمەد وەهبییەوە لە دەرمانخانەی شەماڵی شەفامی پیرەمێرد کڕی، کە بە ٦٨ دینار و حەوت سەد فلس بوو، لەسەر شانم دانا و بردمەوە بۆ ماڵەوە، لە گەڕەکی بەرانان کە چەند جارێك وام لێدەهات سەرکێشی بکەم و تاکسی بەکرێ بگرم بڕۆمەوە و گوێ بە کەوتنە بۆسەوە نەدەم، هەندێکجار دەرمانم لە بەشە سەربازییەکەی ئەوسای نەخۆشخانەی فێرکاری سلێمانی دەهێنا، کە بەیانی دەچوومە دەوام سەدرییەکەم هێندە تەنك بوو لە دەستمدا جێگەی دەبووەوە، کەچی ئێوارەش دەگەڕامەوە سەدرییەکەم باوەشێك بوو لەنێوان هەردوو دەستمدا دام دەنا، واتە پڕم دەکرد لە دەرمان، ئەفسەر و پزیشکەکان هەموو ڕۆژێك جوان لێم ورد دەبوونەوە نەمدەزانی بۆچی ڕۆژێك لەو بۆسانەدا بانگیان نەدەکردم و بە کۆشێ دەرمانەوە بمگرن! ئیدی ویستم ئەو دەرمانانە بگەیەنم، بەڵام بەهۆی گرژی و ئاڵۆزی دۆخی ناوشارەوە نەمتوانی خۆم بیگەیەنمە سەرگەڵوو، بەڵکو لە ڕێگەی ڕێکخستنەوە کە مامۆستا شێخ عەزیز بەرپرسی پۆل و مامۆستا ئەحمەد ساڵح ئەندام پۆل

بوو، ئاگادارن لەبری ئەوەی دەرمانەکان بگاتە مەڵبەندی دوو گەیەنرابوونە مەڵبەندی یەك.

لە زستانی ساڵی ١٩٨٩دا شەوێکی شەستەباران و ئەنگوستەچاو بوو لەژوورەکەی خۆم لەگەڵ ژمارەیەك پێشمەرگە دانیشتبووم، چوار پیاوی خەڵکی دزڵی هاتن و پاش بەخێرهاتن و دانیشتن یەکێکیان بۆ دکتۆری شۆڕش پرسی و گوتم فەرموو لە خزمەتتاندام، گوتیان نەخۆشێکمان هەیە نە دەجووڵێ و نە قسە دەکات و بردوومانە بۆ ڕەزائیە (ورمێ) و تاران ئەمڕۆش هاتینەوە و بڕیارە سبەی بیبەین بۆ لای شێخێك لە سنە، بەڵام باسی دکتۆری شۆڕشیان کرد و ئێستا هاتووین نەخۆشەکەمان ببینیت کە چەند ڕۆژێکە منداڵەکەی نەگرتۆتە باوەش.

دیار بوو ماڵێکی خاوەن کەسایەتی دیاربوون، چونکە لە ماڵەکەیدا دیوەخانێکی گەورەی میوانداری هەبوو، کە خەڵکی زۆری لێ بوو، نەخۆشەکە ژنێك بوو ئەو ماوەیەی لەوێ بووم نەجووڵەی هەبوو نەقسە، پاش پرسیار پێم گوتن: سەرمایەکی توندی بووە و لە هەمانکاتدا تووشی ترسێك بووە، بۆ ئەوەش دوو ئەمپول هەیە پێی باش ئەبێ و ئێستا لامان نییە، ئەگەر ئەتوانن لای پاسدارەکان هەیە و بۆم نووسین، ئەوانیش دایپرۆن و دیکادرۆن بوو، کە هاتنەوە بەس دایپیرۆنیان پێدابوو بۆ دیکادرۆنەکە گوتبوویان ناتوانین بەبێ دکتۆری خۆمان پێتان بدەین، دەرزی یەکەمم بۆ کرد و پاش بیست خولەکێك لە پڕ جووڵا و منداڵە دوو ساڵانەکەی ڕاکێشایە باوەشییەوە، هەموو بە دڵخۆشییەوە گوتیان دکتۆر بینیت، گوتم بەڵێ، ئیدی پێم گوتن سبەی بیبەنە لای دکتۆری پاسدارەکان. لە ماوەی دانیشتنەکەماندا لەو ماڵە کە قسەمان دەکرد زۆر داوای لێبووردنیان کرد کە ئێمە لەگەڵ ئێوە خراپ بووین، هەموو هۆکارەکەی قیادە مووەقەتە بوون دەیانگوت جەلالییەکان دێنە ئێرە و جاشی بەعس و سەدامن ڕوویان مەدەنێ و هەڵسوکەوتیان خراپە، بەڵام بۆمان

دەرکەوت درۆیان کردووە و لەو کاتەی هاتوونەتە ئێرە خەڵکی گوندەکەمان هەمووی لێتان ڕازین. لە کاتی ڕۆیشتنیشدا بە زۆر لایتێکی سەربازی ئەمەریکیان پێدام، تا بۆ ناو ئاو و شەوانەش لە نزیك ڕەبییە و سەربازگەی دوژمن بۆ ڕێگا بەکاری بهێنم، کە پێنج شووشەی لەگەڵ بوو، بەداخەوە لە دوای گەردەلوولی تۆڵە کە گەڕاینەوە پیلەکان لەناویا تێك چووبوون و تەلەکانی ناوی ڕزیبوون و بردم بۆ کارەباچی پێیان چاك نەکرا و لە کاتی ماڵ گواستنەوەدا ون بوو.

بەمەبەستی ئامادەکاری بۆ ڕۆیشتن بەرەو سنووری گەرمیان و کفری هەڤاڵ مەنسوور ئەنوەر بەگ کوڕەزای محمود خانی دزڵی کە بەرپرسی پەیوەندییەکانی ی.ن.ك و ئێران بوو لە دزڵی، دیارییەکی بۆ بەرپرسی زالگەکەی دزڵی کڕی تا هاوکارمان بێت لە تێپەڕینی چەند پێشمەرگەیەکمان بۆ سەر شاخی ڕەنگین کە ئەرکیان لەوێ بوو، بە پیکابێکی شۆفرلێت کە دواوەی پیکابەکەمان پڕ کرد لە چەك و سندوقە فیشەك، کە نزیك بووینەوە بینیم لەو لاوە وەستاوە و تەماشامان دەکات، منیش ئاماژەم بۆ کرد بەو ڕێگەیە لادەدەین، ئەویش ئاماژەی بۆ کردین بچینە بەردەم خۆی، بە شوفێرەکەم گوت بەقسەی مەکە و لادە بەرەو ڕەنگین و مەوەستە هەروای کرد، لە ڕێگە پێم گوتن با قسەتان لەگەڵ من یەك بێت ئەگەر زۆرە کە گەڕاینەوە بێت و بە جیا جیا لێمان بپرسێ، ئێوەش بڵێین تۆ خۆت بەدەست ئاماژەت کرد کە بڕۆین، لە گەڕانەوەدا ڕای گرتین و بەتووڕەیی لە منی پرسی و من گوتم پێویست ناکات خۆت توورە بکەیت خۆت بەدەست ئامازەت بۆ کردین بڕۆین و هەر واشمان کرد! پاش ماوەیەك هاتە بارەگا هەواڵی پرسی بووم، گوتم من د. هاوڕێم، گوتی تۆ لە پیکابەکەدا نەبووی وتم بەڵێ؟ گوتی بۆچی نەوەستان؟ خۆ هەر ڕێگەم دەدان بڕۆن چیتان پێ بوو؟ بۆچی ئاوا ڕۆیشتن؟ گوتم هەڤاڵ مەنسوور مۆڵەتی لە ئێوە وەرگرت بوو ئەو پێشمەرگانەی دواوە بوون ئەرکیان هەبوو، دووانی ترمان هێنایەوە بۆ پشووی خۆیان، چووە لای ئەوانیش وەك من وەڵامیان دابووەوە.

سەرەتای بەهاری ١٩٨٩ بوو بە مەبەستی گۆڕینی پێشمەرگە پارتیزانەکانی سنووری گەرمیان لە گوندی دزڵییەوە بەرەو شاخی ڕەنگین بەڕێکەوتین، تا لەوێشەوە بە ناوچەی شارەزووردا بپەڕینەوە ئەو دەفەرە بە فەرماندەیی هەڤاڵ محمود سەنگاوی و هەڤاڵ کوردۆ قاسم لەگەڵ ژمارەیەك کادیری ڕێکخستن و سەربازی و دەستەیەکی حسك بە فەرماندەیی هەڤاڵ ساڵح پارەزانی شەو بەدۆڵی میری سوور و نێوان ڕەبییەکان بەڕێکەوتین، کە شەوێکی تاریکی ئەنگوستەچاو بوو یەك بەدوای یەك دەڕۆیشتین، لەناکاو دەنگی تەقینەوەیەك هات، دوای کەمێك هاواریان کرد کە هەڤاڵ عەبدوڵلا (مامە عەبە) مینی پێ دا تەقیوەتەوە، کە پێشمەرگەی حسك بوو، جگە لە تاقم و تفەنگەکەم دوو کۆڵم پێ بوو یەکێکیان پەرتووك و توێشووی ڕێگا و ئەوی تر دەرمان و پێویستییەکان بوو، ئەوەی یەکەمیان بەدەستمەوە کە دام نا و دووەمیان لە کۆڵمدا بوو، بەڕاکردن گەڕامەوە لای مامە عەبەی پێشمەرگە کە قاچی لە قولەپێیەوە پەڕی بوو، لێرەدا لایتە سەربازییەکە بەکارهات، تا دوژمن هەست بەڕووناکییەکە نەکەن، هەر بۆ دڵنیایی بەتانییەکیش کرایە پەردە، ئەوەی پێویست بوو لە سارێژ و برینپێچی ئەنجامەدا و کۆڵەپشتم کۆ کردەوە و خستمە کۆڵم و قایشێکی پچڕا خۆم سەرقاڵ نەکرد بە چاککردنەوەی، چونکە دەبوو بە تەل بیبەستم بەوەش چەرمەکە دەپچڕایەوە، کۆڵەپشتەکەم هەلگرت و تەقینەوەی دووەم ڕوویدا و فەرماندەی کەرت هەڤاڵ ناجی محەمەد (مامە ناجی) مینێکی پێ دا تەقییەوە خۆم گەیاندە لای ئەویش، هەڤاڵ جەلالی شێخ کریم شێخ عیسا، لالە ناجی لە باوەش گرتبوو مینی دووەم کە تەقییەوە هەر لەو ڕێچکە ڕێگایەدا تەقییەوە کە پێشتر پێیدا ڕۆیشتبووین، ئیدی چوومە لای مامەعەبە، ئەمجارە پێشمەرگەکان بە ئاگاییەوە دەجووڵان، گوتیان ئاگات لە خۆت بێ بچۆرە سەر بەردەکان کۆڵەپشتەکەی دەستم دانا و لە بەردەم مامەناجی دانیشتم قاچی نەپەڕی بوو، بەڵام هەڵوەشابوو، هەرچۆنێك بوو دەماری خوێن و ئێسك و گۆشتیم بەجۆرێك ڕێکخستنەوە و پێچامەوە تا تووشی خوێن بەربوونی ناوەوە نەبێ، بەسواری دوو هێستر

بەرێخران و ئێمەش کەوتینە جووڵە، ڕێنیشاندەرەکان گەڕانەوە و وتیان بۆسەی دوژمن هەیە باشترە دوای بخەین و گەڕاینەوە و هەواڵی (مامە عەبە و مامەناجی)م پرسی گوتیان لە ناوەڕاستی شاخدان لەبەر سەختی ڕێگا نەگەیشتوونەتە سەرەوە بەپەلە سەرکەوتم و پێیان گەیشتمەوە، جارێکی تر پاکژکردنەوە و سارێژ و پێچانەوەم بۆ کردن و بەرێمان خستنەوە و بیستمانەوە کە گەیشتوونەتە نەخۆشخانەی (ألله أکبر) لە شارۆچکەی مەریوان.

لە ئەشکەوتەکەی میری سوور ماینەوە و سەرمایەکی تیژی هەبوو، لەبەرئەوەی بەپەلە بە سەر شاخدا سەرکەوتم تا بگەمەوە بە هەردوو بریندارەکەمان ئارەقێکی زۆرم کردبووەوە خەوێکی ناخۆشم بەسەرماوە بەسەربرد و هەموو گیانم گرژ و ڕەق بوو. پێش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە پێشمەرگەیەکی حسك بەناوی لوقمان چاوشین بەمەبەستی سۆسە و پاککردنەوەی ڕێگا کەوتبووە ڕێ، هەروەها دووکەس یەکێکیان خەزووری سەرۆکجاش خلەی ڕەشەبەحری و ئەویتریان خەزووری خالیدی خولەسوور بوون بەهۆی کیمیابارانەکەی هەڵەبجەوە کەوتبوونە ناو ئێرانەوە و دەگەڕانەوە بۆ عێراق، دواتر لوقمان نەك هەر نەگەڕایەوە بەڵکو سوپای عێراق بە هێزێکی زۆرەوە کەوتە جووڵە و کێومالکردنی سنوورەکە و ئێمەش گەڕاینەوە بۆ دزلی و کانی دینار.

لێرەوە دواخستنی ڕۆیشتنەکەمان درێژەی کێشا و تا لە سەرەتای مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٩ من و هەڤاڵ هوشیار بیاوێڵەیی تیپی ١٥ی هەورامان کە شارەزایی باشی لە هەڵگرتنەوەی میندا هەبوو -ئێستاش ڕۆڵێکی گەورە و کاریگەری هەیە لە پاککردنەوەی زۆربەی ناوچە و شوێنەکان و چەندین ملیۆن مینی هەڵگرتۆتەوە و ژیانی خەڵکانی لە مەترسییەکانی مین پاراستووە و لەو کارە مەزنەشیدا هەردوو قاچی خۆی لەدەستداوە- بەمەبەستی پاککردنەوەی شاخێك کە سەر بە شاری پاوە بوو لە مین تا لەوێوە بەرەو گەرمیان هەنگاوەکانمان بەگوڕ بخەین و بڕۆین، بەڵام ڕۆژی ١٩٨٩/٦/١٣ یەکەم ڕۆژی جەژن

بوو مردنی خومەینی ڕاگەیەنراو دواتریش نەتوانرا مۆڵەتەکە وەربگیرێ، لە کۆمەڵگای سەریاس و باوەجانی ماینەوە، من لە ماڵی کادیری پێشکەوتووی کۆمەڵە هەڤاڵ جافر حاجی ئەولێ مامەوە لە ئەندامێکی ئەو خێزانە مەزنە جیا نەدەکرامەوە، تا هەواڵمان پێگەیشت هەڤاڵ مەحموود سەنگاوی و هەڤاڵ کوردۆ قاسم و پێشمەرگەکان لە ڕێگەی شاری بانە بۆ شاخی گمۆ و چەمپاراو لە سنووری پێنجوێن بەرەو گەرمیان بەڕێکەوتن، پاش دە ڕۆژ ئێمەش لە هەمان ڕێگەوە بەڕێکەوتین کە پێکهاتبووین لە هەڤاڵان یاسین ئەحمەد مستەفا، محەمەد چاوجوان، د. هاوڕێ، سوهاد خانەقینی، ماجد فەیلی و هەڤاڵێکی دیکە، بە هاوکاریی و ڕێنیشاندەریی هەڤاڵان فازل شیرەمەڕی، مامە ڕەئووف حاجی سابیر، کەماڵە خڕە، محەمەد سیاسی و فەخرەدین هەورامیی لە شاخی کەتوو بۆ پشوودان و سەرخەوشکاندن ماینەوە، بەرەبەیان هێزێکی سوپای دوژمنمان لە نزیکەوە بینی، کە سەرقاڵی کێوماڵکردن بوو، ئێمەش تا ئاشکرا نەبین و بتوانین بپەڕێینەوە لە جێگەی خۆمانەوە لە پەنای درەخت و پەسێوەکاندا خۆمان مەڵاسدا، لە بەردەم تینی خۆری هاوین تا کاتژمێر ٦ی ئێوارە ماینەوە و من تووشی خۆربردن بووم، چونکە شوێنەکەی من تەواو خۆر گرتبوویەوە و زەمزەمییەکەم و عەلاگەیەکی ڕەشم پڕکردبوو لە ئاو و بەدرەختەکە هەڵم واسی بوو، هێندە گەرم بوو چای پێ لێ دەنرا هەموو جارێ لە قوومێك پترم پێ نەدەخورا و دەمڕشتەوە، ئێوارە بەڕێکەوتین و سەرکەوتینە سەرشاخ و بەدۆڵەکەدا داکشاین و کەوتینە سەر کانییەك من بە چنگ و بەکڵاوەکەم ئاوم دەخواردەوە دەمڕشت بە سەر و گیانمدا و تەندروستیم بەرەو خراپیی دەڕۆیشت، ئەگەرچی لە نزیك گوندی مووبرە ترشم دەکردەوە و دەمخوارد، بەڵام هەر پەکم کەوتوو تا لە بەرزاییەك کە دەچووینە گوندی پووشێن بە هەڤاڵ محەمەد چاوجوانم گوت دەرزییەکم لێ بدات، چۆنێتی دەرزی لێدانم پێگوت و ئەمپولێکی دایپرۆنم ئامادە کرد و لێیدام، ئیدی بەوە باشبووم.

دواتر چووینە گوندی داڕووخاو و وێرانکراوی پووشێن، لە دوای ئێوارەوە بەڕێکەوتین و شەو لە خوار دەروازەی عەربەتەوە نزیک گوندی دەمرکانەوە پەڕینەوە ئەوبەرەوە، لە ڕاستیدا لە برسا و لە تینوێتیدا دامان بە سەر باخێکدا و شووتیمان خوارد و دواتر چووینە شارەزووری بنار و گوندی وێلەکە، بەردەوام بەرێوەبووین و بە شاخی زەردەدا هەڵگژاین و ڕۆژی دوتر گەیشتینە گوندەکانی تەپەگەڕوس و کچان، جاش بۆسەیان دانابوو هەر چۆنێك بوو دەربازبووین و لە ڕێگە ڕۆیشتن بەردەوام بووین، تا گەیشتینە سنووری سەنگاو و گەیشتینە گوندی پەنجەنگوست و نزیك گوندی حەسەن کەنۆش، لە شوێنی مانەوەمان کە پێی دەوترا هەزاراوا، دوو پێشمەرگە لەوێ نەخۆشی گرانەتایان گرتبوو چارەسەری پێویستم پێ دان و چاکبوونەوە، هەروەها گەشمردە هەڤاڵ تووکنی پەنجەیەکی مووی لێهاتبوو بەهۆی خراپ بەکارهێنانی دەرزی گوایە بۆ دەرهێنانی مووەکەیە، سەرپەنجەکەی تووشی گانگرین بووبوو، ناچار لە یەکەم گرێ جومگەدا لێم کردەوە و لە ئازار و ناڕەحەتییەکانی ڕزگاری بوو.

لە سەردانێکی من و هەڤاڵ مەحموود و گەشمردە حەمەئاخە بۆ لای هەڤاڵ کوردۆ قاسم و هاوڕێکانی، کە بنکەکەیان لە شوێنێك بوو پێی دەوترا مەسیفەکە، لە ڕاستیدا هاوینەهەوارێك بوو لە گەرمای چلەی هاویندا سەرمات دەبوو، هەڤاڵ کوردۆ باری تەندروستیی باش نەبوو تووشی نەخۆشی گرانەتا بوو، سەرباری ئەوەش لەگەڵ گەشمردە هەڵکەوت ئەحمەد غێدان لە جگەرەکێشان سنووریان نەبوو، ئەو ماوەیەش بەهۆی دەستگیرکردنی گەشمردان جەباری حاجی ڕەشید، مامۆستا ئەحمەدی سناعە، عەتای حاجی ئەحمەد و مامۆستایان ئەحمەد سەرسپی، شێخ عەزیز و ئەحمەد ساڵح، لەلایەن دەزگا سەرکوتکەر و تۆقێنەرەکانی بەعسەوە، خواردن و کەرەستەی پێویستمان پێ نەدەگەیشت، لەوانە جگەرە، بۆیە هەردووکیان گەڵاداری وشکەوەبوو لەگەڵ کاغەزو، یاخود پایپیان لە قوڕ دروست دەکرد لەبری جگەرە دەیانکێشا. گولاجی کلۆرامفەنیکۆل و حەبی ئازارشکێنم

پێ دا خۆشحاڵانە بەرەو باشبوون چوو، ئیدی هەر لەو ماوەیەدا کە لە هاتووچۆدا بووین و دەگەڕاینەوە بۆ بنکەکەمان لە هەژاراوا بووین لە سنووری سەنگاو بەهۆی ئاشکرابوونەوە ناچاری چۆڵکردنی بووین.

لە شاخی سەگرمە لە نزیك گوندی زەردەلیکاو، ئەشکەوتێکمان دیاری کرد کە پێشتر لەلایەن هەڤاڵ شێخ میقداد شێخ بەهادین دۆزرابووەوە، هەروەها چارەسەری نەخۆشەکانمان دەکرد، جگە لە قسە بۆ خۆڕاگری، کە هەمیشە لە چارەسەری نەخۆش یەکەم هەنگاوم قسەکردنمە تا لەنەخۆشییەکە نەترسێ و هیچ بیری لێ نەکاتەوە و چارەسەر بەکاربهێنێ و ئەوەی پێویست بێ ئەنجامی بدات.

هەر ئەو ماوەیەی گواستمانەوە ئەشکەوتەکەی نزیك زەردەلیکاو، لەبەرئەوەی خواردن و پێخەف و پێداویستیمان نەبوو، یاخود زۆر کەم بوو، تەنیا من بەشەخۆراکی خۆم دەهێشتەوە بۆ کاتی پێویست و لێقەومان لەنان هەڵگرتندا من نانی باشم هەڵدەگرت لەو ئەشکەوتەش لە نان و شیری نیدۆ شتێك لە نیوە پترم پێمابوو، لەگەڵ نزیکەی پانزدە نان بۆ حەوت کەس و کەشوهەواش شەستە بارانی بەردەوام و سەخت بوو، جارجارەش دەچووین بۆ ڕاو دوو کۆتر بوو، یاخود کەو بوو بە دەستمان دەکەوت، ڕۆژی دواتر هەڤاڵ مەحموود و گەشمردە ئاخە و هەڤاڵ حەمە ئێرانی و دوو هاوڕێی دیکە چوونە دیوی قەرەداخ، گەنم و پێخەف و قاپ و کەوچك و چەندین پێویستییان لە کەلۆمز و ڕکەکانی شاخدا دۆزی بووەوە، کە هی خەڵکی سنوورەکە بووە و لە کاتی ئەنفالەکان ڕایان کردووە و لە ماندوویێتیدا بەجێیان هێشتووە، یاخود ئەنفالکراون، هەڤاڵ محەمەد فەرەج شاسوار (حەمە ئێرانی) بەتانی و قاپ و کەوچکی بۆ منیش هێنا، هەڤاڵ ماجد فەیلی شارەزایی لە دروستکردنی هەریسە هەبوو ئێمەش ناچار گەنمەکەمان دەکرد بە هەریسە و دەمانخوارد،

هەندێکیان حەزیان لێ نەبوو منیش کردبوومە گاڵتە و گەپ و دەموت: (خواردنی هەریسە بۆمان باشە و پشتمان پان ئەکات).

پاش ماوەیەك هەڤاڵ حەمە ئێرانی نەخۆش کەوت، تووشی مەلاریا بوو لە چاودێرییەکەم بۆی بە پێویستم زانی خۆمی لێ جیانەکەمەوە و لەگەڵ ئەودا لە یەك قاپ نان بخۆم، بۆ پاراستنی لەو سەرما و لەرزەی لە گیانیدا هەبوو، لە بەتانییەك پتری پێویست بوو، بۆیە بەشێك لە بەتانییەکەی خۆمم دەدا بە سەر ئەودا، لەبەرئەوە لە یەك پێخەفدا دەخەوتین.

جگە لە ماوەی پارتیزانی پێشتریش گرنگیم بە بەرزڕاگرتنی باری دەروونی نەخۆش دەدا، لە ساڵی ١٩٨٧ کە لە تیپی مەڵبەندی دوو بووم، دوو پێشمەرگە کە برا و خەڵکی گوندی گردجان و گەورەکەیان فەرماندەی کەرت بوو، تووشی نەخۆشی سیل بووبوو، ئەو کاتەش بۆ نانخواردن برنج و شلەیەك بۆ دوو کەس تێ دەکرا و منیش ئەو بەرێزەم هەڵبژارد بوو.

ئێمەی پارتیزانەکان کە بەشێك هەر لە دوای ئەنفالیش لە سنوورەکان مابوونەوە، بەشێکیش دوای بیستنی هەواڵی پێکهێنانی دەستەی پارتیزانی دۆخەکە وای پێویست دەکرد ژمارەی پێشمەرگەکان دیاری کراو بێت و تێپەڕ نەکات، هەروەها لە جموجۆڵی چالاکی و هەڵکوتانەسەر و شەڕ خۆمان بپارێزین، تەنیا وەك بوون و ئامادەکاری بکەین لە بەهاری ساڵی ١٩٩٠ هەڤاڵ عوسمانی حاجی مەحموود و دەستەکەی لە ئامادەکاریدا بوون بۆ هاتنەوە بەرەو دەڤەری گەرمیان و ئێمەش لەگەڵ دەستەکەی هەڤاڵ کوردۆ لە ئامادەکاریدا بووین لە سەرەتای هەفتەی دووەمی مانگی چواردا کەوتینە ڕێی کوردستانی ڕۆژهەڵات بۆ پشوودان.

ئیدی بەڕێکەوتین، باش بیرم نایەت وابزانم لە نزیك مەسۆیی بەرگەچ بووین، بەهۆی برینی گەدەم و ئازاری زۆر، کەفی سپیم دەهێنایەوە، داوام کرد کە مەوەستن و من بەدواتاندا هەر دێم، ڕەوانشاد حەمە ئێرانی لام مایەوە و هاوکاری زۆری کردم، بە بینینی ڕەنگ و ڕووم و هەڵهێنانەوەی کەفە سپییەکە بێئومێدی لە ژیانم لە چاویدا بەدیم دەکرد، گوتم ئازار و هێڵنجەکان بێزاری کردووم، ئەوەش پتر بەهۆی کۆڵنج و سەرماوە تووشم دەبێ، دەرزی و حەبم زۆرکەم هەڵگرت بوو، ئەوەش بۆ ڕێگە کە پێویست لەبەر خۆڕاگریم نەمدەویست بۆ خۆم بەکاری بهێنم، پەرتووکی زۆرم پێ بوو جگە لەوەی زۆریشم لە کەلێنی شاخدا بۆ گەڕانەوەی داهاتووم شاردەوە، پاش شێلانم هیمەتم دایەخۆ و هەرچۆنێ بوو بەدوایاندا ڕۆشتم ئەوان تێپەڕین، لوورەلووری گورگ دەستی پێ کرد، هەستم بە بینینیان کرد لەبەرئەوەی ئێمە زۆر بووین نەجووڵابوون، دیاربوو مرخیان لە تەنیایی من خۆش کردبوو، زوو هەڤاڵان حەمە ئێرانی، مەحموود سەنگاوی، کوردۆ قاسم، ماجد فەیلی و سوهاد خانەقینی هاتن، ماجد فەیلی کۆڵەکەی لێوەرگرتم تا هەنگاوی خێرا بنێم دووانیش بن باڵیان گرتم، بەرەبەیان گەیشتینە هەرسەکەی وێلەکە بەیانی دەرزییەکم بۆ خۆم کرد، لەبەرئەوەی ڕێگەمان زۆری مابوو لەسەر داوای هەڤاڵ مەحموود و هاوڕێیان پەرتووکەکانم شاردەوە، هەڤاڵ مەحموود گوتی: ئێستا سەردەمی پرۆسترۆیکایە و سۆڤێت شکستی هێنا و مارکسییەت باوی نەما. گوتم: هەر لە ستالینەوە سۆڤێت بە سۆسیالیستی نەما و لەناوچوونی بیری مارکسیزم خەوی سەرمایەدارییە. ئێستاش زۆر دەوترێتەوە، بەڵام ئەم دۆخەی خەڵك تێیدا دەژی سەلماندنی ئەو ڕاستییەیە.

ئەو ڕۆژەماینەوە تا شەو داهات لە ڕێگای گشتی سلێمانی - عەربەت پەڕینەوە و دیسان گوندە تەختکراوەکەی پووشێن هەوارگەی پشوودانمان بوو، بۆ خۆ وشککردنەوە و چالێنانێك ئاگرمان کردەوە، دەمەوبەیانی سبەی هەنگاوەکانمان هەڵنا و دیسان هەڵکشان و داکشانی شاخەکە توولەڕێی ڕێگامانە، هەر لەو دەڤەرەش لەگەڵ هەڤاڵ دلاوەر حاجی

عوسمان پێجوێنی و دەستەکەی بەیەك گەیشتین بۆ ڕێنیشاندەریی، لە ئاوی تەنکەبوارماندا ئەو ئاستەی لێماندا و پیایدا پەڕینەوە وا تێگەیشتم تەنکاییە و قووڵ نییە، هەر ئەوەندەم زانی کەوتمە قووڵایی، بەڵام هەڤاڵ دلاوەر هەستی پێ کرد زوو هات بەلامەوە و تا لە قووڵایی دەرچووین و گوتم ئەمە تەنکاییەکەیە؟ بەپێکەنینەوە گوتی ئەی تۆ چیت دەوێ؟ خەڵکی لە ئاوی ئاراس دەدات!

ڕۆژی دوایی بەناوچەیەکدا تێپەڕین (مین)ی زۆر چێنرابوون، بەتایبەت لە جۆری ڤاڵمارای، هەڤاڵ دلاوەر هەڵی دەگرتنەوە و ڕێگاکەی پاك دەکردەوە، لە کاتی ئێوارەدا لە ئاوێکی دیکە پەڕینەوە هەر بەو شەوەزەنگە ڕێمان دەکوتی کە گزوگیا تا ناوقەندمان هاتبوو، هەڤاڵ دلاوەریش بە بوێرییەکەوە بەو تاریکییە بێ بەکارهێنانی لایت مینەکانی سەرکەوتووانە هەڵدەگرتەوە، هەر لەو دەڤەرە سەربازگەیەکی گەورەی عێراقی لێ بوو جا نازانم هەر ئەو سەربازگەیە بوو، یاخود یەکێکی دیکە بوو کە چۆڵکرا بوو گەلەك بیرم لێ کردەوە و یەکلا نەبوومەوە لێی و ئیتر بە شاخی سوورکێودا هەڵگژاین بەرەو دامێن شۆڕبووینەوە بەرەبەیانی زوو گەیشتینە بارەگای مەڵبەندی دووی کەرکووك لە گوندی بلەکێ.

یادەوەرییەکان ئەگەر لەناو تۆمار "تسجیل"ێکدا جارجار بەکاری نەهێنین جێخانەکەی دەگوازێتەوە بۆ لە بیرچوونەوە، لام ڕوون نییە ڕۆژێك، یاخود چەند ڕۆژێکی کەم لە بلەکێ هەواری پشوودانمان هەڵدا و جا چووینەوە بۆ دزڵی و کانی دینار منی قەلەندەر بوومە ئەندامی چەند خێزانێك ئەگەرچی لەگەڵ مامۆستا جەوهەر ئەمین خانووی پەیوەندییەکان شوێنی نیشتەجێمان بوو.

لە کۆتایی مانگ سەردانی مەکتەبی سیاسییمان کرد، لە گوندی قاسمەڕەشی سەر سنوور نزیک ناوزەنگ و شێنێ پێشوازی کراین، بەشێکی ئەو ڕۆژەمان لە لای هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا بە ڕێنماییە پێویستەکانیەوە بەسەربرد.

بە دەنگۆی لێدان لە حکومەتی عێراق پەیوەست بە داگیرکردنی کوێت، سەرکردایەتیی ی.ن.ك دەستی کردە ئامادەسازی بۆ ساتی لێدانەکە و ڕۆڵ بینینی پێویست لە ساتە وەختەکەدا، بۆ ئەمەش لە ناوخۆ و دەرەوەی ی.ن.ك جووڵەکانی وەگەڕخست، لەناوەوە لە چوارچێوەی سیستەمی بەتالیۆندا دەستی بە ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگە کرد، بۆ ئەم مەبەستە مەڵبەندی یەك لە دزڵی کرایە بەتالیۆنی یەك، هەڤاڵ جەمیل هەورامیی بەرپرسی بارەگاکانی لە گوندی (ولەژێر) جێگیر کرا و بەتالیۆنی دوو بەسەرپەرشتی هەڤاڵ مەحموود سەنگاوی کە لە دوای ئەنجامدانی هەڵبژاردن پێکهاتەکانیان دیاری کرا، لەبەر نیگەرانیم لە کاری ڕێکخستن بۆ جاری سێیەم وازم لە ك.ڕ.ك هێنابوو، لە وازنامەکەم ئاماژەمدا تەنیا پێشمەرگەیەکم لە ڕیزەکانی (ی.ن.ك)دا و هیچی دیکە، هەڤاڵ مەحموود سەنگاوی زۆری پێ ناخۆش بوو ناوم لە پێکهاتەی بەتالیۆندا نەبێ و بە سەرپەرشتیاری کیمیایی کە پۆستی وا هەرنەبووە دانام.

بەتالیۆنی ٦ی کەرکووك لە چێوەڕۆ کارمەندی پزیشکییان لانەبوو، هەڤاڵ کۆسرەت و هەڤاڵ عومەر فەتاح لە سەردانێکیان بە جیا داوایان لێ کردم وەك دکتۆری بەتالیۆنەکە بچم پەسەندم نەکرد، لە ڕۆژێکی دیکەدا هەڤاڵ جەبار یاوەر هاتبوو نزیکەی کاتژمێرێك گفتوگۆی لەگەڵ کردم گوتی: چەند پێشمەرگە مینیان پێ دا تەقیوەتەوە، یاخود کەوتوونەتە بۆسەوە گەشمردە بوون، زۆر پێویستە کەسێکی وەك تۆ بچێتە ئەوێ، لەڕاستیدا منیش گەشمردەی هاوڕێم یاسین ئەحمەد مستەفا دۆڵپەموویی کە لە ماوەی پارتیزانیدا بەیەکەوە بووین هاتە بەرچاوم کە لەو دەڤەری شاربازێڕە کەوتبوونە بۆسەوە و

تەقەیان لێ کردبوون، بیرم کردەوە ڕەنگە لەگەڵیان بوومایە، یاخود نزیکی بوومایە ئەگەر هەبوو بمتوانیایە لە مردن ڕزگاری بکەم، ئەنجام پەسەندم کرد و لە مانگی ۱۹۹۰/۱۲ پەیوەندیم بە بەتالیۆنەوە کرد، لەو ماوەیەدا تا بەڕێکەوتنمان بەرەو سلێمانی هیچ بریندار و نەخۆشییەکی توند نەبوون، تەنیا لە شاخی گمۆی ماوەت هەردوو پێشمەرگە خەلیل بیکەیسی و دواتر هەڤاڵ ڕەحیمم لە ڕەقبوونەوەی بەفرەکە ڕزگار کرد، پاشتر خۆم کە تەواو بەهۆی ئەوانەوە ماندوو بووبووم و نەمدەتوانی قاچەکانم بە ئاسانی و تەواو لە بەفرەکە دەربهێنم، کە هەڤاڵ سەرکەوت فەرماندەی کەرت فریام کەوت کۆڵەکەی لێوەرگرتم و تەنیا تاقم و تفەنگم پێما تا نزیك قووتەی شاخەکە گەیاندمی بڕستم دایە خۆم بەرەو خواربوومەوە بۆ ناو بارەگاکان کە خێمەی زۆری لێ هەڵدرابوو.

ئەوێ پێشمەرگەی زۆری لێ بوو جێگە و شوێن نەبوو، بەدڵنیایی خواردنیش نەماوە ئامانجە گرنگەکەش زوو گەیشتنە بۆ ناو شارەکان و بەتالیۆنەکەی ئێمەش بەپەلە بگاتە شاری کەرکوکی گوڕکڵپە، هەم وەك پشتیوانێك بۆ ئەو خۆپیشاندانانەی لە گەرووی تاوسێنی کەرکووکییەکاندا، لە ساتەوەختی تەقینەوەدایە، (ی.ن.ك)یش لەژێر ناوی (بەرەی کوردستانی)ی پوازتێچەقیودا بکاتە هێمای سەرکەوتنی کوردایەتی، هەر ئەو شەوە هەنگاوەکانمان گورجتر کردەوە، هەموو ئەو هێزانە لەلایەن هەڤاڵ ملازم عومەر عەبدوڵڵا سەرپەرشتی دەکرا لە کۆبوونەوەیەکی بەر ڕەهێڵە و شەستەی بارانددا ڕای گەیاند ئەمڕۆ ڕۆژی ئاشتبوونەوەی گشتییە و تۆڵەکردنەوە و تاڵانکاری سزای توندی بەدوا دێت.

درەنگانێکی شەو گەیشتینە مزگەوتی عەلی کەمال، خەڵك هەموو خرۆشا و لە هاتوچۆدا بوون، ژمارەیەك تەرمی لە کفن پێچراوی لێ بوون، خەڵکەکە دڵخۆشبوون بە هاتنی پێشمەرگە، هاوڕێیەکم بینی بەناوی گۆران، کە تا پێش ئەنفالەکان پێشمەرگە بوو لە بارەگای هەڤاڵ نەوشیروان مستەفا بوو، کلاشینکۆفەکەم کە دیاری هەڤاڵ ملازم عومەر بوو

لەگەڵ تاقمەکەم کە ٨ مەخزەنی پلاسکۆ بوون هی گەشمردە هاوڕێ شەریف عەلی بوو کە لە ١٩٨٦/١١/٣٠ لە گاپیلۆن لەگەڵ هەڤالان عوسمان هەڵەدنی، شەپۆل، ئەردەلان گەشمردەبوون و من ئەو مەخزەنانەیم کڕییەوە، تا وەك دیاری هەڵیان بگرم، هەروەها چەند سابوونێکی ڕەنگ جیاوازی ئەڵمانی لە ئێران کڕی بووم دام بە هەڤاڵ گۆران و ناونیشانی ماڵی هەڤاڵ کەمالم پێ گوت تا بیگەیەنێت، ئەویش ئەو زەحمەتەی کێشا بوو.

بەیانی بوو ناردیانین بۆ ئەمنەسوورەکە و لە ڕێگە ناڕاستەکە گۆڕدرا بۆ کارگەی شەکرەکە، چونکە ئەمنەسوورەکە کۆتایی پێهاتبوو. ڕۆژانی دوایی نێردراین بۆ بازیان و چەمچەماڵ و قەرەهەنجیر پاشان سێجار چووینە بن هەنگڵی کەرکووك جاری یەکەم و دووەم پێش دەرکەوتنی ڕووناکی پاشەکشەمان پێ دەکرا، تا دواجار لە شەوی نەورۆزدا چووینە ناو کەرکووکەوە و لە شەڕەکانی ئیمام قاسم و کەیوان و فڕۆکەخانە بەشداربووم، لە ڕاستیدا لە هیچ یەکێ لەم شەڕانە ڕۆڵی پزیشکیم نەبوو جگە لە هەڤاڵ مستەفا چاڵاویی لە ئیمام قاسم گوللە بەر مەچەکی کەوتبوو سارێژکاریم بۆ کرد و پێچامەوە، دیار بوو هەر بریندارێك هەبووە یەکسەر بە ئۆتومبێلی فریاکەوتن دەیانگەیاندە بنکە و نەخۆشخانەکان، لەگەڵ هەڤاڵ سیروانی کوێخا نەجم ئەو بە RBG و من بەکلاشینکۆف کەوتینە شەڕێکی قورسەوە گوللە بەسەرماندا وەك دەڵێن بڕێشکەی دەکرد، هەڤاڵ سیروان داوای BKC کرد لای ئەو پێشمەرگانە بوو کە ماوەی دواتر پەیوەندییان کرد بوو، لە دەرەوەی بینای خوێندنگاکە بوون، چەند داوام کرد نەیانهێنا، سەرکەشانە بەدیوارەکەدا هەڵزنام و لێم وەرگرتن و گەیاندمە دەستی کوێخا سیروان لە هەموو لایەکەوە شەڕەکە گەرمتر بوو، ئەو هێزەی دوژمن شکا و فڕۆکەخانەی کەیوان دەستی بە سەردا گیرا، زۆربەداخەوە نەمانتوانی دەست بە سەر لەشکری تاڵانچیاندا بگرین و من دەستمکرد بە کۆکردنەوەی پەرتووکە سەربازییەکان کە لە دامەزراندنی کولێژی سەربازی هەموویم پێشکەشکردن، ئەمە جگە لە

چەند دەمانچەیەكی میكارۆڤ تازە، تەنیا یەك دانەم بۆ خۆم هەلگرت و ئەوانەی ترم بەخشی.

هەوڵێكی گشتی هەبوو تا هەموو هێزەكانی پێشمەرگە بۆ گرتنی ناوچەی ڕیاز و یایچین بچن، تەنانەت هێزەكانی هەڤاڵ محەمەد بازیانی زۆر باش نزیكببوونەوە هێزەكانی عێراق و جاش موجاهدینەكان لە شكست و هەلاتندا بوون بەرەو پێشەوە هەڵمەتمان دەبرد، لە پڕ لە نزیكمەوە بێ هیچ هۆیەك یەكێك لە پێشمەرگەكانی حسك كە نوری ناوێك بەرپرسیان بووە، دەستی كردە هاوار بگەڕێنەوە و بكشێنەوە بكشێنەوە... ئێمە دەكشێینەوە پێشمەرگە كەوتنە كشانەوە و جاش موجاهیدینەكانیش ئەوەی سەنگەری بەجێهێشت بوو گەڕانەوە و زۆر بە توندی دەستیانكردە ڕووبەڕووبوونەوە بە هاوەن و دۆشكەوە ئاسمانیان لێ كردینە بڕێشكەی گوللە و دایان بێژاین تەنانەت لە هێزەكەی هەڤاڵ حەمە بازیانی چەند گەشمردە و بریندار بەجێما، ئەمەش دەستێك بوو بۆ شكست پێهێنانی هێرشەكە دڵنیاشم ئەو كەسە لەناو (حسك)دا خۆی حەشاردابوو.

هەڤاڵ ڕزگار علی كە ڕابەر سیاسی بەتالیۆن بوو لەگەڵ پێشمەرگە نزار فریق لەناو گەرمەی تەقە و گوللەبارانی هاوەن و دۆشكەدا منی بەجێ نەدەهێشت، چەند داوام كرد كە بڕۆن من ناتوانم زۆر ڕابكەم بەهۆی بوونی پەراسوویەكی زیادە كە گوشار دەخاتە سەر سییەكانم هەناسەبڕكێم پێ دەكات، بەلام هەر بەجێیان نەهێشم خۆشبەختانە بێوەی دەرباز بووین.

لەوێ زیاتر سەرقاڵی بوارە پێشمەرگایەتییەكە بووم، لەبەرئەوەی شوێنی جێگیرمان نەبووە و هەرساتەی لە شوێنێك بووین بریندارەكانیش دەگەیەنرانە بنكە تەندروستی و نەخۆشخانەكان كە شوێنیان دیاربووە، لەبەرئەوە نامەوێ بچمە سەرباری شەڕ و پاشەكشەكانی دیكەمان تا گەیشتینە دوا پلیكانەی خوارەوەی پەیژەكە بینیمان لەسەر

ڕێگای سەرەکی سلێمانی–دوکان جگە لە ئیفا و ئوتۆمبێلی دیکەی سەربازی سوپای عێراق هیچی تر بەدی نەدەکرا، هەرچۆنێك بێت پەڕینەوە ئەوبەر و چووینە گوندی تیمار لە بناری شاخی چەرماوەند خەڵکێکی زۆر لە پێشمەرگە و هاووڵاتی بە ژن و پیاو و گەنج و پیرەوە لەگەڵ گەیشتنمان داوای دکتۆریان کرد، گوتم فەرموون پیرەژنێك نەخۆش بوو، پاش کەمێك خواردن تا بەسکی برسی دەرزی بۆ نەکەم و ئیدی دەرزیم بۆ کرد، تا لەوێ بووین بەرەو باشی دەچوو.

ئیتر بەرەو سووورداش و هۆمەرقەوم و شەدەڵە چووین، هەر ئەو شەوە چووینە سەر شاخی دابان بەدرێژایی ئەو ڕێگایە تا سەر ڕێگەی هەڵەدن ڕاخەر و بەڕە و پێخەفی جۆراوجۆر فرێدرابوون ئەو شەوە لە ڕەبییەکەی سەر دابانماینەوە کە پێکهاتبووین لە هەڤاڵان سیروان کوێخا نەجم، فەقێ وشیار، کامەران ئەحمەد خدر و چەند هەڤاڵێکی دیکە، ڕەشەبا و زریان بوو منیش ئازارێکی زۆر لە دانە پڕ کراوەکەم پەیدا بوو کە لە خۆڕاگری تێپەڕی ناچار هەوڵی دەرهێنانیمدا وازم نەهێنا و شکاندم لەتێکیم دەرهێنا و لەتەکەی تری تا ئێستاش لەژێر پووکم ماوەتەوە.

ئەو شەوە باسی ڕۆیشتن بەرەو ئێران کرا، گوتم: ئەگەر ئێوە پەسەندی بکەن و گومانم لێ نەکەن، من لێرە دەمێنمەوە و هەندێ ئەشکەوت دەزانم تیایاندا دەژیم و دەمێنمەوە، تا ئەو کاتەی هێزی پێشمەرگە دەگەڕێتەوە بۆ ئەمدیو، برادەرانیش پێیانخۆش بوو هەستم دەکرد نەیاندەویست بەبێ بڕیاری هەڤاڵ مام جەلال و مەکتەبی سیاسی ئەو بڕیارە بدەن، بەیانی هەستاین دووکەڵمان لە بەرگەڵووەوە بینی هەڤاڵان، سیروانی کوێخا نەجم و کامەران ئەحمەد خدر داکشانە خوارەوە بەرەو بەرگەڵوو، ئەوەی بیرم مابێ هەڤاڵ خالید ڕەمزا ئەمین هەردوولا بەبینینی یەکتر دڵخۆش بوون و لە ڕێگەی بێ تەلەوە هەواڵەکە بە هەڤاڵان مام جەلال و نەوشیروان مستەفا درا، هەڤاڵ مام جەلال گوتبووی: لە شوێنی خۆتان بمێننەوە و

چیتان پێویست بوو بۆتان دابین دەکەین، کە گەڕانەوە و هاتنەوە سەر شاخ کامەران وتی:
دکتۆر ئەگەر ئێمە بڕۆین تۆ دەمێنیتەوە؟
گوتم: بەڵێ، ئەگەر وەك بەتالیۆن بەکێشەی نەزانن و پێیان خۆش بێ.
گوتی: بڕیار درا کە ئێمەش بمێنینەوە.

لێرەوە گەڕاینەوە بۆ ناو شەدەڵە و لە خانووە ڕووخاوەکان بارەگامان دانا و منیش دەستم کرد بە دانانی بنکەیەکی تەندروستی، هەر زوو چووینە قەڵاچوالان لە ڕێگە لاماندایە مالوومە لە نەخۆشخانەکە دەرمانی باشی لێ بوو، بەشێکی باشم لێ جیا کردەوە، هەروەها دوو کەسیان هێنا مینیان پێداتەقی بوو، یەکێکیان هەڤاڵ بەرزانی کوڕی شێخ ئەنوەری خاوەنی پەرتووکخانەی نالی بوو سارێژکاریم بۆ ئەنجامدا و بەڕێکەوتین پاش چوونە قەڵاچوالان و گەڕانەوەمان دەرمانەکانم هەڵگرتن و گەیشتینەوە شەدەڵە.

شەدەڵە پێشمەرگەی زۆری بۆ هات، بەتالیۆنەکەمان دۆخی ئاسایی خۆی وەرگرتەوە، بنکە تەندروستییەکەش بەگەواهیدانی پێشمەرگەکان گەشەم پێدا.

شەوێك ئاگاداریان کردم هەڤاڵ ڕەسووڵ جێگری کەرت هیلاکە کە سەردانم کرد بۆم دەرکەوت تووشی هەستیاری توند بووە، بەهۆی ئەوەی کرمی هەڕەی (جۆرە کرمێکی تووکاوییە و لە بەهاراندا زۆرتر دەردەکەون وەك شارەمێرووله بەتایبەت لە نزیك درەخت و گژوگیای بنچکدار دەژی) پێ دا هەڵگەڕابوو ئەمپوولێکی (دیکادرۆن)م بۆ کرد، دواتر چوومە بنکەکە، لە نیوەشەوێکی درەنگدا بەخێرایی هاتنەوە و بانگیان کردم فریای مام ڕەسووڵ بکەوم، چونکە هەر بینیم بۆ دڵنەوایی بە بزەوە گوتم هیچ نییە و کاریگەری ئەمپوولەکەیە تا بەیانی باش دەبێ.

ڕۆژێك هەڤاڵ فەقێ وشیار بۆ ڕاوەماسی چوو بووە چەمەکەی شەدەڵە، لە ئەنجامی هەڵدانی نارنجۆکێك کە بەرز هەڵی دابوو نەگەیشتبووە ئاوەکە و بەهەواوە تەقی بوویەوە و بریندار بوو، خۆشبەختانە برینەکەی سووك بوو، چارەسەرم بۆ کرد.

پاش ماوەیەکی دیکە پێشمەرگە و خەڵکی تر هاتن، لەوانە هەڤاڵ عەلی قادر خەڵکی سووورداش کادیرێکی پزیشکی و دڵسۆز بوو، ماوەیەکی باش بەیەکەوە ماینەوە و هەلێك بوو بۆ من کە ئیتر بچمە شوێنێکی دیکە، بۆ ئەو مەبەستە چوومە بارەگای مەکتەبی سیاسی لە قەڵاچوالان بە بوونی هاوڕێی خۆشەویستم هەڤاڵ بەختیاری مەلا عێزەت شاد بووم، وەك هەر یەکێك لەو پێشمەرگانە ئیش و کارم دەکرد، لەو ماوەیەش هەڤاڵ عومەر فەتاح چەند جارێك داوای کرد کە منی دیاری کردووە بۆ بەرپرسی ئیدارەی مەکتەبی سیاسی، بەڵام من پەسەندم نەکرد و هۆکارەکەیم بە هەڤاڵ بەختیار گوت. دوای ئەوە پێی گوتم دەچیتە گومرگ لەوێ دەبیتە بەرپرسی بنکەیەك، ئەگەرچی دڵیشم پێوەی نەبوو، پێم خۆش نەبوو پەسەندی بکەم ئیتر نێردرامە کانیخان لەسەر سنووری پێنجوێن، دوو پێشمەرگەشم لەگەڵ دانرا کە ناوەکەیانم لە ئێستادا بیرنەماوە یەکێکیانم نارد بۆ کڕینی پێداویستی هەر ئەو شەوە پیکابێکی پڕ لە تەلی مس و لۆری یەکی شەش تایە هێنرا تا ئاودیوی بکەن، بۆ تەلەکە دووهەزار دینار و لۆری یەکەش بڕی پەنجا هەزار دیناریان خستە بەرچاوم، تا ڕێگەیان بدەم، بەڵام ئاگادارم کردن مەگەر بە سەر لاشەکەمدا بڕۆن، کە دەمناردنەوە بۆ بنکەی ناوەندی لەوێوە لە شوێنانی دیکەوە ئاودیو دەکرا، ژمارەیەك پێشمەرگەی دیکەیشیان بۆ ناردم یەکێك لەوانە هەڤاڵ مستەفای برا گەورەم بوو.

تا لەوێ بووم هیچ ئاودیوکردنێك لە کانی خانەوە ڕووی نەدا، لە گومرگی باڵاوە هاتن داوایان لێ کردم بچمە سەیرانبەن، بە مەرجێك گەڕانەوەم پەسەندم کرد کە تەواوی پێشمەرگەکان بە کاکیشمەوە لێرە بمێننەوە.

یەکەم شەوی سەیرانبەن دوو لۆریان هێنا و یەکێکیان لە ڕێگەیەکی ناو ماڵە ئاوارەکان کە خۆڵەکەیان بە شۆفڵ لابرد بوو گەیانـدبووە ئـەودیو تەلبەنەکەوە، پێشمەرگەیەك هات پێی گوتم کە لۆرییەکی لەودیو تەلبەنەکە دیـوە، لەگـەڵ پێشـمەرگەکان بەچـەکەوە چووین بە سەربازە ئێرانییـەکانم گوت هـەر ئێستا بیکەنـەوە بـەم دیـودا، دواتـر خاوەنەکـەی بـڕی هەفتا هەزار دینار بۆ خۆم و هەر پێشمەرگەیەك ڤاتێك جلوبەرگ، بەڵام بە ئەمانیشم گوت مەگەر بە سەر لاشەکەمدا بڕۆن.

لـەو ماوەیـەدا نووسـینێکم لـە بـارەی ئـاودیوکردنی کـاڵا و ئامێرەکانـەوە نووسـی، کـە دەبێتە لەدەستدانی پێداویستییەکان و خستنەوەی گرانی، پێویسـتە هـەوڵی دروسـتکردن و بەگەڕخسـتنی کارگـەی سـەرەتایی بـۆ دروسـتکردنەوەی شمەکـە لەکارکـەوتووەکان بـدرێت، لەوانە ڤەوانـە فیشـەك کـە دەتـوانرێ چـەند پێداویسـتی لـێ بەرهـەم بهێنـرێ بردبـووم بـۆ مەڵبەندی یەکی ڕێکخستنی سلێمانی دام بە هەڤاڵ تەحسین قـادر، پـاش خوێندنـەوەی پێـی باش بوو لە سیمینارێکدا بخوێندرێتەوە، لە وەڵامدا گوتم لەم کاتـەی ئێستا کـە نامـەوێ لـە سنوورەکەی منەوە ئـاودیوکردن هـەبێ و چـۆڵی بکـەم بـواری ئامادەسـازیم نییـە مەگـەر لـە هەلێکدا ئەوە بوو هەر نەڕەخسا.

گومرگی باڵا جارێکی تر داوایان لێ کردم ئەمجارە بچمە بنکـەی گـۆخلان، بـەڵام لـەوێ هەموو ڕۆژێك لەگەڵ ئاودیوچییەکاندا لە ڕووبەڕووبوونەوەدا بـووم، کە بەدەسـتە چـەکدار دەهـاتن چـەك و میلـی کلاشـینکۆفیان لـێ دەهێنامـەوە، ئەگـەر بەرپرسـەکەیانم لـە نزیـك خۆمەوە ڕانەگرتایە زۆر ئاسان بوو بمکوژن.

شەوێك ئازارێکی زۆری سەرم هەبوو ناچار چوومە بنکە تەندروستییەکە ئـەمپولێکی (ڤالیۆم)یان لێدام، بەیانی لە خەو هەستام بیستم دوو قەمەرەی تۆیۆتـا کـرۆلا ئـاودیوکراوە هـەردووکیانم گەڕانـدەوە، گـەلێك هەوڵیانـدا ڕێگـەم پێنـەدان ئـاودیوی بکەنـەوە، هـەر

ئۆتومبیلێك دەمگرت بەخۆیاندا دەمناردن بۆ گومرگی باڵا دەچوون، یاخود نا من هیچ کێشەم نەبوو، بەڵام ئەمان هەر وازیان نەدەهێنا خۆم و فەرماندەی کەرت هەڤاڵ فاروق عزیز (وەستا فاروقی سەرتاش) لەگەڵ پێشمەرگەیەکی حسك ناوەکەیم لە ئێستادا لە بیر نییە ڕۆیشتین، کە گەیشتینە (نزارە - پێنجوێن) ڕێیان لێگرتین چەکدارەکانیشیان پەنابەرد بە پەنا بەرد دامەزرابوون، پێم گوتن لە بیرم چووەوە ئێرە پێنجوێنە وامزانی لە بانی مەقان و کەرکووکین! بۆ کێ دامەزراون؟ دوای شەڕێکی دەستەویەخە و ناوبژیوانی دەچنە گومرگی باڵا.

هەر لەو ماوەیەدا وازم لە گومرگ هێنا و هەڤاڵ نەوزاد نوری بەگ زۆر هەوڵیدا کە پێویستە بچمەوە گومرگ پەسەندم نەکرد، لە ماڵەوە مامەوە تا هەڤاڵ قادری حاجی علی داوای کردبووم سەردانی بکەم لە کارگێڕی بەرەی کوردستانی-سلێمانی کە بەرپرسی بوو، پێی ڕاگەیاندم کە وەك بەرپرسی کارگێڕی و دارایی دەوام بکەم، ئیدی لە مانگی تشرینی یەکەم ۱۹۹۱ تا دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و هەڵوەشانەوەی بەرەی کوردستانی مامەوە.

دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ۱۹۹۱، حکومەتی عێراق پاش شکست و پاشەکشەی هێزە سەربازیی و دەزگا تۆقێنەر و داپڵۆسێنەرەکانی بڕیاری کشانەوەی فەرمانگە و دەزگا کارگێڕییەکانیشی دەرکرد، ئیدی بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکە، ی.ن.ك بەناوی بەرەی کوردستانییەوە، ئەو ئەرکەی بە هەموو کێشە و ئاڵنگارییەکانییەوە لە ئەستۆنا، تا ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی گشتی نوێنەرانی گەل بەمەبەستی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی خۆبەڕێوەبەریی فەرمی لە چوارچێوەی قەوارەی هەرێمی کوردستاندا و لە ۱۹۹۲/٥/۱۹ بەهەموو کەموکوڕی و کۆسۆپەکانییەوە بەئەنجام گەیەندراو دواتر لە ۱۹۹۲/۷/٤ حکومەتی هەرێمی کوردستان ڕاگەیەنرا.

دوای پێکهێنانی وەزارەت "شالیار"ی پێشمەرگە و دامەزراندنی یەکە سەربازییەکان بەناوی (قیادة منطقة) بۆ هەر پارێزگایەکی هەرێم کرایەوە، لە (قیادة منطقة)ی سلێمانی بە ئەفسەری هەواڵگریی (فوج الدیفاع والواجبات) دانرام، لە هاوینی ساڵی ١٩٩٤ لەسەر پێشنیاری هاوڕێی خۆشەویستم کاوەی مامە عەبە پەیوەندیم کرد بە دەزگای (لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان) و تا هاوینی ساڵی ٢٠٠٧ بەرپرسی بەشێك بووم، لەو ساڵەوە خۆمم خانەنشین کرد[٦٢].

---

[٦٢]– هاوڕێ ئەحمەد محەمەد سلێمان (د. هاوڕێ)، سلێمانی، ٢٠٢٢/٤/١٣.

# هەژار عوسمان مەعروف عەبدولڕەحمان (د. هەژار)

ساڵی ١٩٥٤ لە شاری سلێمانی لەدایك بووم، دوو خوشك و شەش براین، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییم لە شاری سلێمانی تەواو کردووە، لە پۆلی شەشی ئامادەیی سێیەمی سەر پارێزگای سلێمانی بووم، بۆیە ڕاستەوخۆ لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی بەغداد وەرگیرام، لە پۆلی پێنجی ئامادەیی نزیکی سیاسەت بوومەوە، لە کاتی وەستانی شەڕی کورد و حکومەت لە سەرەتای حەفتاکاندا هاوڕێیەکم داوای لێ کردم پەیوەندی بە ڕیزەکانی پ.د.ك بکەم، هەروەها گوتی دواتر زەمالەی خوێندنت بۆ دەکەن و دەتنێرن بۆ ئەوروپا بۆ خوێندن، کە بەو شێوازە خەڵکیان ڕادەکێشا زۆرم پێ ناخۆش بوو، من بە نیازی کوردایەتی ویستم دەست پێ بکەم و بیرم لە بەرژەوەندی کەسی نەدەکردەوە.

هەر لە قۆناغی ئامادەییدا بووم هەواڵ هات گوایە پێویستیان بە چاودێرە بۆ سەر سندووقەکانی سەرژمێری لە شاری کەرکووك، من ڕەزامەندیم نیشاندا و گوتیان بەعس لە سەرژمێرییەکەدا فێڵ دەکات، بۆیە ئێمە وەکو کورد پێویستمان بە خوێندەواری کوردە خولیان بۆ دەکەینەوە تا چاوکراوە بن، ئیدی من لەو ڕێگەیەوە دەستم بە کاری سیاسی کرد، ڕۆژێك هەڤاڵ سالار عەزیز هات بۆ خوێندنگەکەمان و کۆی کردینەوە و باسی پێویستی ئاگاداربوونی لە فێڵەکانی حکومەت کرد.

یەکێکی دیکە لەو هۆکارانەی کە هانیدام بۆ کاری سیاسی، دوای ئەوەی چوومە بەغداد بینیم هەرچی کاری قورس هەیە لە بۆیاغی پێڵاو و حەماڵی و کرێکاری قورس بە کوردی دەکەن، کە زۆرینە کوردی فەیلی بوون، واتە وەك هاووڵاتیی پلە دوو تەماشای کورد دەکرا، ئیدی ئەمە گوژمێکی دیکەیدا بە هەستی نەتەوایەتی و چینایەتی من، تا ئێستاش ناتوانم پێڵاوەکانم لای بۆیاغچی بۆیاغ بکەم.

دواتر گوتیان زەماله هەیه بۆ خوێندنی ئەندازیاری نەوت بۆ لەندەن، من پێشکەشم کرد، که چووم سەیرم کرد له فایلەکاندا وانووسراوه که من بەعسی نیم و داوایان لێ کردم ببم به بەعسی، ئیدی ڕازی نەبووم و ئەو هەلەم له دەست چوو.

ئیدی له زانکۆی بەغداد دەستم به خوێندنەکەم کرد و له ساڵی ١٩٧٤ که شەڕ دروست بووەوه من بۆ هەفتەیەك مۆڵەتم وەرگرت و بەمەبەستی پەیوەندیکردن به پێشمەرگەوه هاتمەوه کوردستان، ئیدی خاڵێکم له هەڵەبجه نەیهێشت و پەشیمانی کردمەوه، تێی گەیاندم، ئەم شۆڕشه، ئەو شۆڕشه نییه، که تۆ به زۆرباشی دەزانی، باش بوو پەشیمانی کردمەوه و به نهێنی گەڕامەوه بەغداد و دەستم کردەوه به خوێندن و تا له ساڵی ١٩٧٨–١٩٧٩ کۆلێژی پزیشکی زانکۆی بەغدادم تەواوکرد، ڕاستەوخۆ وەك پزیشك دامەزرام و ساڵێکم تەواو نەکرد، چوومه دەرەوه و بووم به پێشمەرگه.

من نزیکەی یازده مانگ و هەفتەیەك بوو وەك پزیشك دامەزرابووم، واته پزیشکی موقیم بووم له نەخۆشخانەکانی شاری سلێمانی، لەو کاته زۆر سەرنجم دەدایه خەباتی (ك.ڕ.ك) و به خەباتی کۆمەڵه و ی.ن.ك سەرسام بووم لەو کاتەدا، هەوڵێکیشمدا پەیوەندی بکەم به ڕێکخراوی (ك.ڕ.ك)ەوه، بەڵام سەرینەگرت، بەڕاستی نەمدەوێرا لەگەڵ هەموو کەس باسی ئەو ویستەم بکەم، چونکه دۆخەکه مەترسیدار بوو، له ڕووی ئەوەی ئەو کەسه نەك هەواڵم لێ بدات، هەروەها پێم وابوو ئەگەر ببم به ڕێکخستن و له چالاکیدا بگیرێم و نەك له ئەشکەنجەدا دانبنێم به ڕێکخستنەکاندا و هاوڕێکانم ئاشکرا بکەم، بیرم لەوەش دەکردەوه زۆر قورس بوو له لام، لەبەرئەوه هەوڵەکانم زۆر چڕ نەکردەوه یەك هەوڵمدا، که سەرینەگرت ئیدی وازم هێنا.

له لایەکی دیکەوه گەڕان به وڵاتەکەمدا خەونی من بوو، که هەر پارچەیەکی وەك خانەیەکی دڵم تەماشام دەکرد، واته دڵ بۆ خۆی له چوارخانه پێکهاتووه، هەروەها کەشەکەی ئازادانه بوو، بۆیه له ١٩٧٩/٧/٢٩ له شاری سلێمانی دەرچووم، له ڕێگەی

دەریاچەی دەربەندیخانەوە بە بەلەم خۆم گەیاندنە شاری پاوەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، نزیکەی دە ڕۆژ لە شارەکانی پاوە و بۆکان و سنەوە سەقز و مەهاباد مامەوە، ئەوکاتە شۆڕشی گەلانی ئێران تازە سەرکەوتنی بەدەستهێنابوو، کوردستانی ئێران زۆر خۆش و ئازاد بوو، کورد خۆی خاوەنی خۆی بوو، کەس لێی نەپرسیم ئایا پاسەپۆرتم پێیە، یان نا؟ چونکە حکومەتی ناوەندی لە تاران زۆر لاواز بووبوو، شارە کوردییەکان بەدەستی کورد خۆیەوە بوو، ئەو کاتە دوو حیزبی سەرەکی لە ئێران هەبوو، ح.د.ك و حیزبی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران.

لە مانگی ٨ی ١٩٧٩ خۆم گەیاندە بنکەکانی حیزبەکانی باشووری کوردستان کە لە ڕۆژهەڵات بوون، من نیازی چوونی ڕاستەوخۆم هەبوو بۆ بنکەکانی ی.ن.ك بەڵام بەڕێکەوت تووشی کوردێکی قەڵادزێ بووم پرسیاری ڕێگەم لێ کرد، گوتی بەسەرچاو، کەچی فێڵی لێ کردم چونکە خۆی پێشمەرگەی حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان بوو، لەبری بارەگای ی.ن.ك بردمی بۆ بارەگای خۆیان بە ئۆتۆمبێل بە ڕێگای مەهاباد و سەردەشت و خانێ بردمی بۆ بارەگای خۆیان، گەیشتینە شوێنێك پێیان دەگوت مردواوێ لەوێ بەپێ ڕۆیشتین ڕەشماڵی ئاژەڵدارەکانی ئەوێی لێ بوو، پێشمەرگەی حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستانی لێ بوو دابەش بووبوون بە سەر ماڵەکانی ئەوێدا، ئەوانەی لەوێ بینیم بریتی بوون لە هەڤاڵان ڕەسووڵ مامەند و ملازم تاهیری عەلی والی، منی پێ ناساندن، بەس نەیگوت دەیەوێت ببێت بە پێشمەرگەی ی.ن.ك، گوتی دەیەوێت ببێت بە پێشمەرگە، منیش تازە بووم نەمدەزانی ئەوانە کێن، واتە نەمزانی سەر بە ی.ن.ك نین، لە دوایی بۆم دەرکەوت، بێگومان خۆشیان پێشتر سەر بە ی.ن.ك بوون تازە جوودا بووبوونەوە، هەر چوار مانگێك بوو.

ملازم تاهیر بنەماڵەکەمانی ناسیوە، ئێمە خزم دەرچووین، نامەیەکی بۆ نووسیم گوتی بچۆ بۆ لای د. مەحموود عوسمان، گەیشتمە لای د. مەحموود و نامەکەی خوێندەوە زۆری

**پێ خۆش بوو، هێشتا هەر نەمدەزانی کە سەر بە ی.ن.ك نین، لای ئەو بۆم ڕوون بووەوە، ئیدی لێرەوە هەرچی کاری پزیشکی هەبوو د. مەحموود دایە دەستی من و خۆی دەستی لەو کارە هەلگرت، لەوێ چەند بارەگایەکیان هەبوو، خەلکی زۆری ئەو گوندانەی ئەوێی لێ بوو، ڕێگای سنووری قاچاغچییەکانیش بوو، هەروەها پێشمەرگەی ح.د.ك لێ بوو، شوێنەکە دەراوی دۆڵەتوو بوو واتە بەتەواوی سەر سنووری باشوور و ڕۆژهەلات بوو، شوێنێکی سەخت بوو، ئیدی من بێ جیاوازی دەستم کرد بە خزمەتی هەمووان.**

**لەوێ چەندین نەخۆشی جۆراوجۆر دەهاتنە بەردەستم، ڕۆژێك دەنگی هەلیکۆپتەر هات، ئێمەش لە ڕەشماڵەکان هاتینە دەرێ، چونکە ئەگەری بۆردومانکردنمان هەبوو، چووینە نزیکی بەردەکانی دەوروپشتی خۆمان، بەچاوی خۆمان بینیمان ئەو هەلیکۆپتەرانە دابەزینە سەر گوندی دۆڵەتوو، دەستیان کرد بە بۆردومانێکی چڕی گوندەکە، ئیدی ئەوکاتە ئەو گوندە ٤٠ بۆ ٥٠ ماڵێك دەبوو، هەروەها پێشمەرگەی ح.د.ك تیابوو، دوای زانیمان هەواڵیان لێدراوە کە پێشمەرگە و کادیری و سەرکردەی حیزبەکەشی لێیە، ئەو هەواڵە مسۆگەرە لەلایەن ئەو کەسانەوە درابوو کە لەو گوندە لە زیندانی (ح.د.ك)دا دابوون دوای ئازادبوونیان لەو گوندە هەواڵیان دابوو، واتە پێشتر تەواوی زانیاری شوێن و زیندانییەکەیان گەیاندبوو، ئەمەش بەلگەی سادەیی مرۆڤی کورد دەردەخات، کە بێ هیچ خوێندنەوەیەك بۆ دۆخەکە زیندانییەکانی دوژمنیان ئازادکردبوو.**

**من لەگەڵ مەفرەزەیەکی پێشمەرگەدا بۆ سەر ڕێگای دۆڵەتوو بەرەو عێراق ڕۆیشتم، چونکە زانیمان لەو بۆردومانە بریندارێان هەبووە و ئێستا دەیبەن بۆ عێراق، چونکە قەلادزێ نزیکترین شوێن بوو، کە گەیشتینە سەر ڕێگەکەیان پێیان گەیشتین، من کۆڵەپشتەکەم کردەوە لە حەب و دەرزی و پێویستی پاکەرەوە و موغەزی هەموویم پێ بوو لەو ڕێگەیە هەرچی پێویستی سەرەتایی بوو بۆم کردن، هەم پێشمەرگە هەم هاوولاتیی گوندەکە بوون، تەنانەت بەرپرسێکی ح.د.ك تێدا بوو، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی ح.د.ك**

بوو بەناوی سەیید ڕەسووڵ، کارەکانم بریتی بوون لە دوورینەوی بـرین، وەستاندنی خـوێن بەربوون، پاککردنەوەی برین بۆ پاراستنی لە هـەوکردن، تەنانـەت دەرزی کـەزازم لابـوو کـە دژی بـەکتریای سـەر بـرین بـەکاردێت، هـەروەها دەرزی و حـەبی ئـازارم پـێ دەدان لەگـەڵ موغەزی، جگە لە هاندانی دەروونی بۆیان تـا زاڵ بـن بـە سـەر برینەکانیانـدا، ئـەوە یەکـەم ڕووداوی شـەڕ و برینـداری و کـاری پزیشـکیم بـوو، زۆر سـەیر بـوو بەلامـەوە، زۆر کـاری تـێ کردم، جگە لەوە بە دڵنیایی لە ناو گوندەکە شەهیدیش هەبوو، ئیدی ڕەوانەم کردن.

دوای سێ مانگ بۆم دەرکەوت کە لە نێوان ح.ز.ی.ك و ی.ن.ك نـاکۆکی هەیـە، هـەر لـە سەرەتاوە دەیانزانی مـن دەڕۆم بـۆ نـاو ڕیزەکـانی ی.ن.ك لەبـەر دوو هۆکـار هەسـتم دەکـرد ڕێگەم نادەن، یەکەم بۆ کاری پزیشکی، دووەم وابیریان دەکردەوە ڕەنگە بە تێپەڕبوونی کـات بۆچوونم بگۆڕێت و بچمە ڕیزەکانی ئەوانەوە، هـەروەها متمانەشـیان پـێم نـەبوو بەڵگەشـم ئەوەیە ئەوەندە لەوێ بووم تەنانـەت چەکی کلاشینکۆف یـان دەمانچەشـیان پـێ نـەدام، ئـەو چەك پێنەدانە سـتەمێکی گـەورە بـوو لـە مـن کـرا، چونکە دۆخەکـە زۆر مەترسـیدار بـوو، پێویست بوو چەکم پێ بێت، هەرچەندە هاوڕێیەتی د. مەحموود زۆر خـۆش بـوو، پیـاوێکی بەڕێز بوو، لەگەڵ ئەو و پاسەوانێکیدا لە ژێر ڕەشماڵێکدا دەماینەوە، بەڵام لە کۆتـایی سـاڵی ١٩٧٩ ئەوانم جێهێشت و پەیوەندیم کرد بە ڕیزەکانی (ی.ن.ك)ەوە.

مـن نـاوی ڕاسـتیم عەبدولڕەحمانـە، کـە بـووم بـە پێشـمەرگە و پەیوەنـدیم کـرد بـە ڕیزەکانی (ی.ن.ك)ەوە، ناوی خۆم نا (هەژار) سەرەتا نازناو بوو بۆ من، بەمەبەستی ئـەوەی ببم بە دکتۆری چینی هـەژار و نـەدار و لێقـەوماو و چـینی خـوارەوەی کوردسـتان، ئەمـەش بەهۆی کاریگەری (ك.ڕ.ك)ەوە بوو، دواتر کردم بە ناوی سەرەکی خۆم، بۆیە ئێستا کەس بە ناوی عەبدولڕەحمان من ناناسێت.

دوای گەیشتنم بە ڕیزەکانی ی.ن.ك ناردیانم بۆ لای د.خـدر مەعسوم، کە لێپرسـراوی بەشی تەندروستی بوو، ئیدی من لەو بارەگایەدا کە لە زەڵێ بـوو لەگـەڵ ئـەو مامـەوە، دوای

من د. شادمان فوئاد مەستی هات کە لە یۆگسلافیای جارانەوە بۆ کوردستان گەڕابووەوە، بووین بە سێ پزیشك، من لە دوای شەهید دکتۆر بەختیار دووەم پزیشك بووم کە لە شارەکانی کوردستانی عێراقەوە چوومەتە شاخ، د. بەختیار لە ساڵیادی شەهید ئارامدا لە ناو شار ویستبوویان جەمال ڕۆنگۆ بکوژن، لەو چالاکییەدا خۆی شەهیدبوو، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە ئەگەر باس لە یەکەم پزیشك بکەین د.خدر مەعیسوم یەکەم پزیشکە، بەڵام ئەو لە دەرەوە گەڕابووەوە، من مەبەستم ناوخۆی وڵاتە، ئیدی لە زەڵێ خولی فریاگەوتنی سەرەتاییمان بۆ کادیرەکانی ی.ن.ك دەکردەوە نزیکەی چوار هەفتەی دەخایاند، زۆر کادیرمان فێری برین دوورینەوەو و برین پاککردنەوە و دەرزی لێدان کرد، وەستاندی خوێن بەربوون و موغەزی هەڵواسین (خۆراکی ئاوی)، ئەوەندەی من لەوێ بووم دوو خولی چوار هەفتەییمان کردەوە، بەشداربووانیش دە بۆ دوازدە پێشمەرگە دەبوون، تێیاندا بوو دەرچووی زانکۆ بوو، یان ناوەندی، بۆیە خوێندەواری مەرجێك بوو، لایەنی کەم شەشی سەرەتایی.

لەو ماوەیەدا نەخۆشی هاووڵاتی و بریندارانی پێشمەرگەش دەهاتنە لامان، یەك لەو بریندارانە هەڤاڵ محەمەدی حاجی مەحموود بوو، دەستی بریندار بوو، من تیمارم کرد، لەوەوە بووین بە هاوڕێ، هەندێك بریندار پێویستی بە ئێران بوو دەماننارد.

ڕۆژێك کوڕێکی بەخۆی باڵابەرز هات بۆ لامان گەنج بوو برای شەهید ئەحمەد مەولود بوو خەڵکی باڵەکایەتی بوو، کەم خوێن بوو زۆر نەخۆش بوو، من و د. شادمان لە نێوزەنگ بووین نەخۆشخانەیەکمان لەوێ دروست کردبوو، ئێمە شارەزای خوێنپێدان بووین، جگە لەوەی کیسی خوێنپێدانمان پێ بوو، جۆرێکی پشکنین هەیە بێ ئامێر جۆری خوێنەکە دەدۆزیتەوە کە بریتییە لە تێکەڵکردنی دوو خوێن کاتی خۆی لە کۆلێژی پزیشکی فێری ئەوە بووبووین، هەم بۆ خوێنبەخش هەم بۆ خوێنوەرگر، ئیدی کەس نەبوو ناچار خۆم خوێنەکەم پێدا.

لە پایزی ساڵی ١٩٨٠ (قیادة المؤقتة)ی پ.د.ك لەگەڵ حسك بەمەبەستی هێرشکردن لە بارەگاکانی ی.ن.ك نزیکبوونەوە و هاتنە گوندی دۆڵەتوو، تەنانەت مەسعود بارزانی خۆی هاتبوو، هاوکات لە لایەکی دیکەوە حکومەت و جاشیش هێرشی بۆ کردین، لە هەموو لایەکەوە هێرشیان کرد، بیرمە ملازم عومەر بەپەلە هات بۆ نەخۆشخانەکەی ئێمە گوتی هێرشمان لەسەرە و دۆخەکە خراپە، دکتۆرەکان خۆتان ببەستن و کۆڵەپشتەکەتان بهێنن و وەرن بەرەو مامەندە و لووتکەیەکی مامەندە لەلایەن حکومەتەوە گیراوە دەبێت نەهێڵین بگەنە لووتکەی دیکە، ئیدی ئێمە خۆمان کۆکردەوە و من چونکە قەڵەو نەبووم لاقیشم درێژ بوو لە ڕێگا زۆر خێرابووم بۆیە زوو گەیشتم ئاگام لە دکتۆرەکانی دیکە نەما، کەوتمە ناو شەڕەکەوە، ئەوەش دەڵێم شەڕی ڕاستەقینە تەواو بووبوو لە کۆتاییدا بوو، پێشمەرگە جاشی شکاندبوو، لووتکەکەیان گرتبووەوە، جاش و سوپا پاشەکشەیان کردبوو، سروشتی پاشەکشە وایە دوای خۆیان هاوەنباران دەکەن، بۆ ئەوەی شوێن کەوتنیان ئاسان نەبێت، گەیشتنی من کاتی هەڵدانی هاوەنەکان بوو، من چەند برینداریکم تیمار کرد، پێشمەرگەیەك بەناوی هەڤاڵ غەفوور خەڵکی گەڕەکی داروغای سلێمانی بوو، واتە هاوگەڕەك بووین یەکمان دەناسی شانی بریندار بووبوو، کە گەیشتمە سەری گوتی کاك دکتۆر من کوڕەکەی جاران نەماوم ئێستا مرۆڤێکی دیکەم، دوای ئەوە بانگیان کردمە سەر پێشمەرگەیەك پێیاندەگووت هەڤاڵ مستەفای سەعید زۆراب، خەڵکی پێنجوێن بوو، پلەداریش بوو، پێش ئەوە چەندین جار پێکەوە دەرچوونمان هەبوو لە نزیکەوە هاوڕێم بوو کوڕێکی گەنجی ٢٥ بۆ ٢٦ ساڵ بوو، دیار بوو لە پێشی ئەو پێشمەرگانەوە بووە کە لووتکەکەیان گرتبووەوە، بینیم لە پەنا بەردێکدا خەڵتانی خوێنە گوللەیەك لەسەری دابوو، هەرچەندە لە مردندا بوو، بەڵام دوو سێ دەرزی ئازارم بۆ کرد بە خۆم گوت هیچ نەبێت با بەئازارەوە شەهید نەبێت، قسەم بۆ دەکرد و ئیدی لە باوەشی خۆمدا شەهید بوو، پێش چەند ڕۆژێك پێکەوە بووین کە بەو دۆخەشەوە بینیم و شەهید بوو دۆخێك بوو هەرگیز

بە سەرم نەهاتبوو زۆر بێتاقەتی کردم، ئیدی وردە وردە دونیا بەرەو تاریکی ڕۆیشت و هاوەنبارانیش بەرەو کۆتایی هاتن دەچوو، دیار بوو د. شادمانیش بریندارەکانی خۆی تیمار کردبوو.

ئیدی لە بەهاری ساڵی ١٩٨٠ لەگەڵ هەڤاڵ محەممەدی حاجی مەحموود چووینە خوارەوە، چونکە بووبووین بە هاوڕێ، دواتر چوومە مەریوان ئەو کاتە ی.ن.ك لەگەڵ کۆمەڵەی ئێران پەیوەندی باش بوو، هەرچی دکتۆری هندی و پاکستانی سەردەمی شا بوو کە نەخۆشخانەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانیان بەڕێوە دەبرد بە ڕووخانی شا گەڕابوونەوە وڵاتی خۆیان ئیدی ئەو شارانە بێ پزیشك مابوونەوە، نەخۆشخانەکەی شاری مەریوان هیچ پزیکشێکی لێ نەمابوو، من کە گەیشتمە ئەوێ بەکلاشینکۆفێکەوە ناڕاستەوخۆ بووم بە بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە و لەوێ مامەوە، ئیدی شوێنێك هەبوو پێیان دەگوت شێروخورشید واتە هاوشێوەی بنکەکانی خاچی سوور وابوو، ژێر زەمینی ئەو شوێنەمان کرد بە نەخۆشخانە پزیشکێکی ئازەریمان لەگەڵ بوو ناوی د. سیما بوو سەر بە چریکەی فیدایی خەڵق بوو، لەگەڵ د. قادر حاجی حەمەشەریف یاریدەدەری دەرمانساز بوو لە بەغداد خوێندبووی، کادیرێکی دێرینی کۆمەڵە بوو خەڵکی هەڵەبجە بوو، لەگەڵ د. هۆشمەند کە یاریدەدەری پزیشکی بوو هەڤاڵێکی دیکەمان لەگەڵ بوو ئەم پێنج کەسە ئەو نەخۆشخانەیەمان بەڕێوە دەبرد، کە پێشمەرگەی ی.ن.ك و ح.د.ك و کۆمەڵەی لێ بوو، دواتر د. هۆشمەند شەهید بوو.

لێرەوە من لە مەریوان زۆر مامەوە، گوندەکان تۆپباران دەکرا دەچووین بۆ ماڵەکان، مەریوان بەزۆری چۆڵ کرابوو، بەدەست پێشمەرگەوە بوو حکومەت دەیویست بیگرێتەوە، بۆیە بەهۆی تۆپبارانەوە بەرەو چۆڵ بوون دەچوو، ئیدی خەڵکی بەتەمەن نەیدەتوانی بڕوات، ئێمە هاوکاریمان دەکردن، ڕۆژێك پێشمەرگەیەکی کۆمەڵەی ئێرانیان هێنا ڕانی شکابوو، هێشتا لەگەڵ عێراق پەیوەندییان گرێ نەدابوو، فریاگوزاری سەرەتاییم بۆ کرد

گوتم بیبەن بۆ پێنجوێن، گوتیان چۆن وادەڵێیت خۆ تۆ سەر بە ڕیزەکانی (ی.ن.ک)یت و دژی حکومەتی عێراقی، گوتم کاکە ئەمە بریندارە پەیوەندی بە حکومەتەوە چییە، دواتر لەگەڵ حکومەتی عێراقیش ڕێکەوتنیان ئەنجامدا.

کارێکی دیکەی من هێنانی دەرمان بوو، ئۆتۆمبێلێکی جێب هەبوو، دەم برد و دەچووم بۆ سنە لە هۆڵێکی گەورەی پڕ لە دەرمان جێبەکەم پڕ دەکرد و لە دەرمان و دەگەڕامەوە، کە بووە ئەزموونیکی خۆش بوو من.

هێندە دۆخەکە تێکەڵ و ئاڵۆز بوو، ڕۆژێك مەفرەزەیەکی کۆمەڵەی ئێران هێرشیان کردە سەر خاڵێکی سوپای ئێران، بە ڕێکەوت کەوتمە ناو ئەو مەفرەزەیەوە و کۆڵەپشتەکەم پێ بوو گوتیان لەگەڵمان وەرە بێ ئەوەی بزانم بۆ کوێ دەچن لەگەڵیان چووم، دوای کاتژمێرێك ڕۆیشتن بە پێ منیان لەسەر حەوز و ئاو (ئەستێلك)ێك دانا، پاش کەمێك بوو بە تەقە، زانیم شەڕە، دوای ئەوەی هاتنەوە بینیم جەستەی پێشمەرگەیەکیان پێ بوو بە ناوی عەبدوڵلا کە لێپرسراویان بوو تا گەیشتە لام شەهید بووبوو، نەمتوانی فریای بکەوم.

دوای ئەوەی کە ئێران مەریوانی گرتەوە، هەڤاڵ مام جەلال بروسکەی بۆ کردین کە پێشمەرگەکانی ی.ن.ك بکشێننەوە، ئەو کات هەڤاڵ بەکری حاجی سەفەر بەرپرسی من بوو نامەی بۆ ناردم بکشێمەوە، وەڵامم دایەوە کە بروسکەکەم بیستووە بەڵام من وەکو پزیشك نابێت ئەم بریندارانە بەجێبهێڵم، ئیدی لێی قبووڵ کردم، گەواهی ئەوە دەدەم هەڤاڵ بەکر پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو، منیش نەگەڕامەوە دواوە، تا بە تەواوی دەست بە سەر مەریواندا گیرایەوە، ئیدی ناچاربووم بگەڕێمەوە، لەگەڵ هەڤاڵ بەکری حاجی سەفەر هاتینە گوندی بلەکێی سەر سنووری نزیکی بانە، لە بلەکێ لەسەر پێشنیاری هەڤاڵ بەکر بە بەرد و دارو قوڕ لە ماوەیەکی زۆر کەمدا نەخۆشخانەیەکمان دروست کرد، کە بریتی بوو لە ژوور و هەیوانێکی زۆر گەورە، ئەمە بووە نەخۆشخانەی پشتەوەی پێشمەرگە کە لە شارباژێر و گەرمیان و قەراغ و شارەزوورەوە دەهاتنەوە بۆ ئەوێ، ستافی نەخۆشخانەکە بریتی بوون لە

دوو کارمەندی پزیشکی د. شەماڵ (عومەر) و د. شازاد (ئاراس)، لەگەڵ من وەك پزیشك، ئیدی بریندار و نەخۆش و هاووڵاتی و قاچاغچی و سەربازی هەڵهاتوو دەهاتن، ئەوەی ئێمە بۆمان دەکرا دەمانکرد، ئەوەی نەکرایە دەماننارد بۆ بانە، لەو نزیکانە کۆمەڵەی ئێرانیش دوو پزیشکی هەبوو ناویان (د. ئەحمەد و د. عوسمان) بوو.

ڕۆژێکی زستان کە بەفر تا ئەژنۆ باری بوو، پیاوێکی گەنج هێسترێکی پێ بوو بە گریان و پاڕانەوە هات گوتی دکتۆر فریامان بکەوە، گوتم چییە، گوتی هاوسەرم سکی هەیە و منداڵی نۆبەرەی دەبێت هەشت بۆ نۆ کاتژمێرە لە ژاندایە و ڕزگاری نابێت، گوتم دۆخەکەیم بۆ باس بکە با لە هۆکارەکەی تێبگەم، لەسەر ئەو بنەمایە دەرزییەك هەیە پێی دەڵێن سینتۆسینۆن کە ژنێك ژانەکەی لاواز بێت و نەتوانێت منداڵەکەی ببێت ئەو دەرزییەی بۆ بەکاردەهێنرێت و ژانەکەی بەهێز دەکات، من خۆم نەچووم، بەس د. شازادم ئاڕاستە کرد کە بچێت موغەزی بۆ هەڵبواسێت و ئەو دەرزییە بکاتە موغەزییەکەوە و هانی بدات و کەمێك سکی بشێلێت، ئیدی ڕۆیشتن و دوای چەند کاتژمێرێك هاتنەوە و بۆیان گێڕامەوە و گوتیان هەر وادەرچوو کە تۆ پێت وتین، پیاوەکە قاچاغچی بوو زۆر دەوڵەمەند بوو د. شازاد گوتی لە خۆشیدا تورەکەیەك سەد تمەنی بۆ هێنام و پێی گوتم چەندت دەوێ بۆ خۆت هەڵی گرە، ئێمەش بە هیچ جۆرێك پارەمان لە کەس وەرنەدەگرت و خۆمان بە خزمەتکار دەزانی، بە هەمان شێوە هەوڵیدا پارە بدات بە من، بەڵام ڕەتم کردەوە. گوتم ئەگەر هەر حەز دەکەی ئاژەڵێك بهێنە بۆ بارەگاکە با پێشمەرگەکان سەری ببڕن و بیخۆن، ڕۆیشت و پێم وابێ دوو بۆ سێ مەڕ و بزنی هێنا و بوو بە جەژن چونکە زۆرمان برسی بوو.

لە ڕووداوێکی دیکەدا کە یەکەم جار بوو دابەزم بۆ ناوچەی شارەزوور لەگەڵ هەڤاڵان: شەوکەتی حاجی موشیر، حامیدی حاجی غالی، مەلا بەختیار بەهێزێکەوە چووین بۆ شارەزوور هەرچەندە بە دەست حکومەتەوە بوو، بۆیە چوون بۆ ئەو ناوچانە قورس بوو،

له گوندی ناوگردانی نزیکی سەیدسادق پێشمەرگەیەك هەبوو فەرماندەی کەرت بوو بە ناوی دلێر جاف پێیان گوتم فریای بکەوە هەڤاڵ دلێر میزی گیراوە، دوو ڕۆژ بوو میزی نەکردبوو، پێشتریش جارێکی دیکە بە بریندار بینی بووم، پەسیدینم بۆ بەکارهێنا و دوو تەلی چەترم هێنا خستمە ناو سۆندەی لاستیکەوە چونکە بە تەنها نەرمە نەدەڕۆیشت بە ئەندامی نێرینەیدا ڕەتم کرد و میزگیرانەکەیم بەردا و ڕزگاری بوو، شوێنەکەشی مەترسیدار بوو، ئەگەر بزانرایە لەوێیە دوور نەبوو هێز بنێرنە سەری، چەند ساڵێك دواتر هەڤاڵ دلێر شەهید بوو.

ئیدی هەشت بۆ نۆ مانگ لەوێ بووم بەجێمهێشت و چوومە شارباژێر و لەگەڵ پێشمەرگەدا دەستم بە جەولە کرد لەوانە هەڤاڵان: (بەکری حاجی سەفەر، وەهاب، جەمالی حەمەی خواکەرەم، شەهید سەلاحی موهەندیس)، برینداریشم چارەسەر دەکرد، لە پایزی ساڵی ١٩٨٣ هەڤاڵ مەلا بەختیار ئۆتۆمبێلێکی لاندکرۆزەری پێدام و دەرمانم تێ کرد و گوندەکان دەگەڕام، ئیدی بە ئاسانی بۆ چارەسەری نەخۆش و برینداری پێشمەرگە دەگەیشتمە گوندەکان، هەر کاتێك ئاگاداربکرامایەتەوە دەچووم، هەرچەندە ئەو ئۆتۆمبێلە لەسەر ڕێگا سەرەکییەکانی دەرەوەی شار بەهۆی بۆردومانی فڕۆکەوە مەترسی بوو لەسەر ژیانم.

لە پایزی ساڵی ١٩٨٣ ژیانی هاوسەرگیریم پێکهێنا، لەبەرئەوەی یەکلابووم تازە من لەم شۆڕشەدام، ئەگەری شەهیدبوونم زۆر بوو، با هیچ نەبێت کەسێکم لێ جێبمێنێت و منداڵێکم هەبێت و دایکم و کەسوکارم بڵێن ئەمە یادگاری ئەوە،

یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی پەیداکردنی دەرمان بریتی بوو لە بڕینی بنکە تەندروستییەکانی حکومەت، ڕۆژێك هەڤاڵان نەخۆشخانەی شیرەکەی سلێمانیان بڕی بوو، دەرمانێکی زۆریان هێنابوو، منیش کە دەچوومە هەر گوندێك خەڵك بە گشتی لێم کۆدەبوومەوە، واتە نۆرینگەیەکی گوێزراوە بوو، لە گوندێك ژنێك هات منداڵێکی پێ بوو ئەو

هەواڵەی بیستبوو کە دەرمانی نەخۆشخانەی شیرەکە هێنراوە نەخۆشخانەکەش تایبەتە بە منداڵان، هات داوای شیری کرد، گوتم دەرمانم لایە بەس شیرم لا نییە، گوتی ئەی بۆچی دەڵێن نەخۆشخانەی شیرەکەتان بڕیوە، وای زانیبوو لەو نەخۆشخانەیە شیر دەدەن بە منداڵ، ئەمە بەسەرهاتێکی خۆشی ژیانی پێشمەرگایەتییە.

من کە هاتمە خوارەوە بەرەو شارباژێر لە ناوچەی شارباژێر لە گوندی پەڕمزان و سروچک نەخۆشخانەمان دروست کرد، ماڵی هەڤاڵ بەکری حاجی سەفەر لە شارەوە هاتبوونە ئەوێ، گوندەکە بینای نەخۆشخانەی هەبوو، بەڵام چۆڵکرابوو، ئێمە ئاوەدانمان کردەوە و دارەڕامان کرد، د. قادر، هەڤاڵ هیوا، هەڤاڵ ستار و هەڤاڵ غەفوور ڕۆڵی دیاریان هەبوو، ئیدی فریای خەڵکی ئەو گوندانە کەوتین، واتە نەخۆشخانەی هەرێمی سێی ی.ن.ك بوو.

دواتر لە دوای کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە کە من بەشداربووم، مەڵبەندەکان دروست بوون، کوردستان بوو بە چوار مەڵبەند، ئێمە چووینە سەر مەڵبەندی یەك کە لە حاجی مامەند دانرا، بنکەی سەرەکی مەڵبەند و دادگای مەڵبەند و نەخۆشخانەی مەڵبەندی لێ دانرا، هەڤاڵ مەلا بەختیار بوو بە لێپرسراوی مەڵبەند، دواتر هەڤاڵێکیان بۆ ناردین بەناوی کامیلی مەلا مەحموودی خەراجیانی کارمەندی پزیشکی بوو، خوشکەزایەکی خۆم هات تا سێی ناوەندی خوێندبوو خولی ڕاهێنانی پزیشکیمان بۆ کردەوە ناوی هیوا بوو، بوون بە یاریدەدەرم، د. قادریش کە لە جەولە دەهاتەوە و دەهاتە نەخۆشخانەکە یارمەتی دەداین، دواتر هەڤاڵێکی دیکە هات بە ناوی ستار (جیهانگیر)، ئیدی نەخۆشخانەکەمان بەڕێوە دەبرد.

لەو ماوەیە شەڕێك دروست بوو حسیك و پاسداری ئێران و پ.د.ك پێکەوە لە دژی ی.ن.ك یەکیان گرت کە بە شەڕی ڕەزڵە ناسراوە، لەو شەڕە ئەو بەرەیە زۆر بەخراپی شکان، وەك دواتر باس کرا نزیکەی بیست کەسیان لێ کوژرا، لە ی.ن.ك دوو بۆ سێ کەس

شەهید بوون، ئەو بەرمیە چەندین برینداریان هەبوو تەنانەت بریندارەکانیان بۆ ئێمە هێنا کە پێشمەرگەی پ.د.ك بوون، ئێمە جیاوازیمان نەدەکردن، برینداری هەردوولامان چارەسەر دەکرد، چونکە چار نەبوو شوێن نەبوو بیانبەن، تەنانەت لە پاڵی یەك دامان نان و چارەسەرمان بۆ دەکردن و لە تەنیشت یەکدی دەخەوتن، پێشمەرگەیەك گوتی دەبێت ئاگامان لێیان بێت خۆ هەندێکیان دۆخیان باشە، پێشمەرگەیەکی دیکەی ی.ن.ك کە ئەویش بریندار بوو لە تەنیشت ئەوان پاڵکەوتبوو، گوتی کاك دکتۆر خەمت نەبێت من (میقات)م لەگەڵیاندا، (واتە ئاگام لە هەموو شتێکیانە).

یەکێك لەو پێشمەرگە بریندارانە پێشمەرگەی پ.د.ك بوو گونی بریندار بووبوو، نەشتەرگەریم بۆ کرد، زۆر مەبەستی بوو دەپاڕایەوە کە گونی لەدەست نەدات، منیش زۆر بە دڵسۆزی چارەسەرم کرد و خستمەوە شوێنی خۆی، چاکیش بووەوە، دواتر هەموویان ئازاد کران، کە چوو بووەوە سوورێن زۆر ستایشی ئەو نەخۆشخانەیەی ئێمەی کردبوو، گوتبوویان ئەوانە لە کۆمەڵە و یەکێتیی ناچن، هەر لەو شەڕە هەڤاڵ حەمەڕەش بریندار بووبوو، لایەکی دەموچاوی هاتبووە خوارەوە، بە شێوازێکی زۆر تایبەتی دووریمەوە نەمهێشت پێوەی دیار بێت، کە دواتر شەهید بوو، ئەو دوو نەشتەرگەرییە منی زۆر بە ناوبانگ کرد.

لەو ماوەیە هەواڵمان بۆ هات کە هەڤاڵ شێخ حسێنە سوور لە گوندی باراوە بریندار بووە گوللەیەك لە سنگی دابوو، ئیدی بەپەلە چووین، برینەکەی مەترسیدار بوو، لە پێناو ئەوەی شەهید نەبێت تا ڕادەیەك سەرکێشیم کرد سۆندەم بۆ دانا کە زۆر قورسە و ناکرێت تا خوێن و هەناسەی دەرچێت نەگینا دەمرێت، هەرچەندە ئەو سۆندەیەم نەبوو، کەسوکاری چوون بۆیان هێنام، منیش هەموو کات دەرزی پەسیدین و مۆڵفینم هەبوو ئیدی چارەسەرم بۆ کرد.

